# ئەڤینی ئیمان

فاتح مەلا ڕەسوڵ شارستێنی

١٤٣٤ک، ٢٠١٤ز

ناوی کتێب: ئەڤینی ئیمان
نووسەر: فاتح مەلا ڕەسوڵ شارستێنی
بابەت: ئایینی
بەرگ: گۆڤاری بڕیار
ساڵی چاپ: ١٤٣٥ك، ٢٠١٤ز
تیراژ: ٥٠٠ دانە
چاپ: چاپی یەکەم
دیزاین: گۆڤاری بڕیار
چاپخانە: پیرەمێرد

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی(١٠٨٦)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە

پێشکەشە بە:

* دایكو باوکی خۆشەویستم.

* هەموو ئەو کەسانەی کە لەخزمەتیاندا خوێندوومە.

* رۆحی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەریس، ئەو کەسەی بۆ یەکەمجار لەکوردستاندا؛ وتاری رۆژی هەینی بەزمانی شیرینی کوردی بۆ گەلی کورد خوێندەوە.

* بەهاوسەری بەرێزو هاوڕێبازم.

* نوری چاوانم محەمەدو ئیبراهیمو ئاسوودەو ئەڤین.

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆخوای تاکو تەنیاو بێ شەریك، درودو سڵاوی خوا لەسەر پێشەواو سەروەرمان نوری چاومان شەفیعی مەحشەرمان محمد المصطفى (ﷺ) بێت.

ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لەسەر یاران و شوێنکەوتووانی تاقیامەت.

بەڕێزان: ئەوەی لەدووتویی ئەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە: بەرگی یەکەمی ئەڤینی ئیمانە کـــە وتاری ڕۆژانی هەینییەو خوێندومەتەوەو بە (سی دی) بڵاوکراونەتەوە، پاشان بەشێوەی نووسینی کتێب دارێژراوەتەوە، منیش خستنمە بەردەستی خۆشەویستان و بەڕێزان لەوتاربێژان و بانگخوازان، بەئومێدی ئەوەی لەدوعای خێر بێبەشمان نەکەن، ئەوەی ڕاست و ڕەوان بوو، ئەوە فەزڵی خوایە بەسەرمانەوەو ئەوەش کە هەڵەو کەموکوڕی بوو، لەلایەن بەندەومیەو داوای لێبوردن لەو خوایە دەکەم کە تەنیا هەرئەوە تووشی هەڵە نابێت و لەهەڵەی بەندەکانی دەبووری..

خوای گەورە پشتو پەنای هەموو لایەك بێت.

مەلا فاتح

# ناوەرۆك

# ووتاری یەکەم
# بۆ مانگی موحەڕڕەم
# چی لەکۆچ کردنی
# پێغەمبەری پێشەوامان‌دا
# فێردەبین؟!
# بەشی یەکەم

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِنَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: وا چوینەتە ساڵی تازەی کۆچی (.....) یەوە. مێژووی ئیسلام کە بەساڵی کۆچی حیسابی بۆ دەکرێ. ئەم مێژووە لە کۆچکردنی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لە مەککەی پیرۆزەوە بۆ مەدینەی موبارەكو پرشنگدار دەست پێ دەکات. زۆر سوپاسی خوای پەروەردگارمان دەکەین. کە تەوفیقی داین لەساڵانی ڕابردودا باسی شێوازی کۆچکردنی خۆشەویستو یاری غارو هاوەڵە بەرزو بەقەدەرەکانیمان کرد. بەپشتیوانی خوا لەیادی کۆچکردنی سەروەر و سەردارمان. حەزرەتی محمدی مصطفی دا (ﷺ) ئەمساڵ باسی ئەوە دەکەین کە هیجرەت چیمان فێردەکات، وە چۆن ڕووداوی گەورەی هیجرەت بوو بەخاڵی وەرچەرخان لەمێژووی ئیسلامدا. دەفەرموون لەگەڵ ئەم بابەتە شیرینە.**

**بەڕێزان: ژیاننامەی گەورە پیاوانی مێژوو، یان خۆیان نووسیویانەتەوە وەکو یاداشتی ڕۆژانـەی ژیانیان. یان کەسێك دوای خۆیان لەسەری نوسیون. وەتەنها وەکو سەرچاوەیەك بۆ زانیاری و زانینی بارودۆخی ئەو سەردەمە و زەمانە تەماشا دەکرێ، خۆ ئەگەر ڕێککەوتنامەیەکی ئیمزا کردبێ، دوای ئەوەی (٣٠) ساڵی بەسەردا تێپەڕی دەبێتە بەڵگەنامەی مێژوویی. بەڵام ناکرێ و ناگونجێ ژیانی ئەمڕۆو سەردەمەکانی دوایی لەسەر بنیات بنرێ. چونکە ئەم سەردەمە و کاتەی ئێستا لەگەڵ پێشوو زۆر جیاوازە و زۆرجار ئەو سەرکردە هەڵەی سیاسی کردوەو ناکرێ هەڵەکانی دووبارە بکرێنەوە.**

**بەڵام: پێشەواو ڕابەرو پێغەمبەری ئێمە کە حەزرەتی محمدە (ﷺ)، یەك ووشەی لەبارەی خۆیەوە نەنوسیوە، چونکە نەخوێندەوار بووە، بەڵکو خوای گەورە بۆ خۆی** (سُبحانَهُو تعالى) **ژیاننامەکەی لە قورئاندا**

تۆمارکردووه و هەتا هەتایە بەزیندویەتیو بەبێ جیاوازی لەنێوان ئەم مێژوو نووس و ئەم مێژوو نووسو ئەو گێڕەرەوە تۆمارکراوە. وە هەرکات دەیخوێنیتەوە و دیراسەی دەکەی (بەڵام نەك وەکو چیرۆك و بەسەرهات خوێندنەوە!) دەڵێ ی ئێستا ڕوویداوەو بۆ هەموو هەنگاوێکمان وەڵامی پێویستی پێ یە.. بەڵێ، ژیانی پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) جیاوازە لەگەڵ ژیانی هەموو گەورە پیاوان و ناودارانی مێژوو، لەسەرکردە و چاك سازان، لەوەدا کە: ژیانی ئەو پێغمبەرە خۆشەویستەمان (ﷺ) بەهەموو قسەو گوفتارەکانی یەوە. بەهەموو کاروکردەوەکانی یەوە. بەهەموو هەنگاو و هەڵوێستەکانیەوە. بەهەموو هەورازو نشێویەکانی ژیانی یەوە. بۆتە جێگای پێشەنگی و پێشەوایەتیو چاولێکردن و ڕابەرایەتی و یاساو دەستوری ژیانی مرۆڤایەتی. چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورە خۆی پاراستویەتی لەهەموو هەڵەو لاڕێ بونێك لەقسەو کردارو هەنگاوو هەڵوێستێکدا.

لەهەموو ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) قسەیەکی هەڵە. هەنگاوێکی نابەجێ، هەڵوێستێکی وا کەجێگای ڕەخنە هەڵگرتن بێ نابینرێ. چونکە خوای گەورە خۆی فەرمویەتی: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾ النجم: ٣ — ٤.

واتە: قسەو گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) کە قورئانە، لەئارەزو بازیو هەواو هەوەسەوە نییە، ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خواییيە..

هەربۆیە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوین کە ئەوەی ئەو سەروەرە فەرموی وەری بگرن بەبێ دوودڵی و ئەوەی فەرمووی وازی لێبێنن، بەبێ موناقەشەکردن وازی لێ بێنین چونکە هەمووی پڕە لەزانست و حیکمەت و چاکەی دونیاو قیامەت. خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ الحشر: ٧.

**واتــه: ئــەوەی پێغەمبەر(ﷺ) پێی بەخشیون، وەری بگرن، هەرفەرمانێکی پێدان بەگوێی بکەن. قەدەغەی هەرشتێکی لێکردن مەیکەن، لەخوا بترسن، چونکە بەڕاستی خوا بەتوندی تۆڵە دەسێنێت..**

**بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری ئێمە و سەرجەم پێغەمبەران (عليهم السلام) دووکاری هەرە گەورەیان کردووەو دوو ئەرکی هەرە پیرۆزیان لەسەرشان بووە:**

١. (مُهِمَّةُ التَّبْلِيغِ وَ التَّبيِنِ): **کارو بەرپرسیاریەتی ڕاگەیاندنو ڕونکردنەوەی ئاینی خوا. کە دینی خوا بەهەموو کەس بگەیەنێو بەجوانی ڕوونــی بکەنەوەو وەڵامـی پرسیارەکانی ناو دڵو دەرونی خەڵکی بدەنەوە. خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴾ المائدة: ٦٧.

**واتە: ئەی پێغەمبەرو فروستادە، هەرچی فەرمانو پەیامێکت بۆ دابەزیوە لەلایەن پەروەردگارتەوە، بێ دوودڵی، بێ ماتڵی، ڕای بگەیەنە..**

٢. (مُهِمَّةُ القُدْوَةِ وَ الأُسْوَةِ): **بەرپرسیایەتی بونە پێشەنگ و چاوساغی، کە دەبێ هەموو ئیمانداران چاویان لێبکەنو ئەوان بکەنە سەر مەشقو ڕابەر، خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ أحزاب: ١٢

**واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا، چاکترین نمونەی تەواوو ڕێكو پێك هەیە تا چاوی لێبکەین و شوێنی بکەوین، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشەو بـەردەوام یادی خوا بـەزۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.**

**کە بەڕاستی ئەم ئایەتە، ئەمڕۆ وەڵامە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە**

بیردەگەنەوە و دەپرسن: باشە لەم زەمەنی شالاوی بێ دینی کردنەدا، چۆن ئیمانەکەمان سەلامەت بێ، چۆن بەڕووی سپی بەخوا بگەین، چۆن بەدەستی قورس و توێشەبەرەی پڕەوە بچینە سەر تەرازوی کردەوەکانی قیامەت و چۆن بتوانین هەموو دەم زیکری خوا بکەین، ئایا چی بکەین و چاو لەکێ بکەین بۆ ئەم مەبەستە؟! خوای گەورە وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێ: چاو لەپێغەمبەر بکەن. هەموو ئەو ئاوات و ئومێدانەتان دێتەدی.

بەڵێ، لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) قودوەو پێشەوایە. دەبێ هەموو ئەو بارودۆخ و زروفانەی دێنە ڕێگای، ئەوانەبن کەبەدرێژایی مێژووو موسوڵمانان تووشیان دەبێ و دێتە ڕێگایان. بۆیە دەبینین سیرەی پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی هەموو پرسیارێکی تێدایە بۆ هەموو ڕۆژگارێك، سیرەو ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) بیرەوەری گێڕانەوە نی‌یەو چیرۆك خوێندنەوە نی یە. بەڵکو بۆ هەموو سەردەمو زەمان و زەمەنێك کە موسوڵمانان تێیدا دەژین و پیا تێپەڕ دەبن، مەشخەڵی ڕێیە. وە بەهۆی ئەوەشەوە کە ململانێ ی نێوان حەق و باتڵ. وە خێرو شەڕ، وە ئیمان و کوفر، ململانێیەکی کۆنەو لەمێژینەیە، وە بەردەوامیش دەبێت تا ژیان و ژینگە و مرۆڤ بمێنێ. وە مرۆڤیش هەر مرۆڤە لەهەر زەمانو زەمینێکدا بێ. بەردەوام خۆی دووبارە دەکاتەوە لەوەی کە بەرزدەبێتەوەو نزم دەبێتەوە، بەهێز دەبێ و لاواز دەبێ، ئیماندار دەبێ و کافر دەبێ، لەبەر ئەوە هەڵوێستەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەئاست ئەو بارو دۆخەی کە دەوری دابوو. وە ئەو ڕووداوانەی کە ڕووبەڕووی دەبونەوە، هەمان هەڵوێستن کە خوای گەورە لە ئێمەی دەوێ لەئاستیاندا بەهەڵوێست بین. هەرکاتێ ئێمەش لەڕۆژگاری ژیانماندا ئەو بارودۆخانە دەوریان داین، یان ئەو ڕووداوانە

**بەرەو ڕومان بونەوە!. کەسەیری ژیانی پێغەمبەری خوامان کرد ﷺ یەکسەر هەڵوێستی خۆمان دەدۆزینەوەو تێ دەگەین کە چۆن هەنگاو بنێینو سەرمان لێ تێك ناچێ.**

**بەڕێزان: ئێمە ئێستا لەسەری ساڵی کۆچی (...) داین. کە ساڵی کۆچی وەکو ووتمان لەکۆچکردنی پێغەمبەری خواو هاوەڵانی یەوە دەست پێ دەکات لەمەککەوە بۆ مەدینە. لەم یادە گەورە و پڕشکۆیەدا، دەڵێین:**

**خۆشەویستم..**

**ئەی ڕەونەقی جەرگ و هەناوی** (ئامینە)

**ئەی مزگێنی**

**شەبەقی چاوی** (عَبْدُالله)

**ئەی گەنجینەو هەتاوی ماڵی (حەلیمە)و**

**پاکترین هەناسەی سینە**

**ئەی هاوەڵی مێردمناڵی دوانزە ساڵی (ئەبو طالیب)**

**باوەڕ پێکراوی (خەدیجە)و**

**خاڵیی لە زەهری خیانەتو بوخڵو کینە**

**ئەی لاوی دامەزراوی**

**زرینگ و بەزیپکو گورج و گۆڵ**

**ئەمینداری**

**کۆمەڵگایەکی گەندەڵو هێڕو هڕۆڵ...**

******************************

**خاکە لێوەی تێڕامان و**

**وورد بونەوەی تەنیایی ئەشکەوتی (حیراء)**

**دڵی بێدار**

**ئەی تروسکایی هەقیقەتی بەردەم هەزارەها داهۆڵ**

**گوڵدانی دەستی حیکمەت و وەحی و (إقْرَأ) و جوبرەئیل**
**تافگەی بەفراوی بەزەیی**
**چاوی خۆرو دەستی سپی و سۆڵ**
********************************
**پەیڤە نەرم و نورانیەکانی بانگەواز**
**ڕێکخەری کۆبونەوەکانی ماڵی (ئەرقەم)**
**سیاسەتمەداری کارامەو سەر ڕاست و بەجم و جوڵ**
**گەمارۆدراوی گەمارۆی**
**هەمە لایەنەو سێ ساڵەی نێو شیوو دۆڵ**
**ئەی میوانی بەرد بارانکراوی دیوانی**
**خانەخوێ یە خوێن تاڵەکانی (طائیف) و**
**گەشتیاری گەشتی (ئەقصا) و ئاسمانەکان و شەو ڕەوی**
**هاوڕێی (بۆڕاق) ی توندو تۆڵ...**
********************************
**ڕابەری وورەو متمانەو**
**نزای (شاهت الوجوهُ) و پرژانی خۆڵ**
**بەوری سەفەری هیجرەت و ئەشکەوتی (ثور)**
**بیابانی چۆڵ...**
**ئەندازیاری یەکەم دەوڵەتی (مەدینە)**
**وەرزی برایەتیو تەبایی**
**توێنەرەوەی شەختەو سەهۆڵ...**
********************************
**بەهێزترینی فەرماندەی جەنگو ئاشتی**
**جوامێرترینی سەرکردە**

کاریگەرترین ئینسانو
ئەی خاوەنی جوانترین ڕۆڵ
ساتێك بەنێو چخوردی جەنگەڵدا هاتی
ساتێك لەنێو، دڵی بەردینی شەوی جەهلەوە هەڵهاتی
لەگەڵ شنەی ژیانەوەدا
چاو لەچاو بوی‌و قۆڵ لەقۆڵ
خۆشەویستم لەو کاتەوە
خەمی هەموو مرۆڤایەتیت ناوەتە کۆڵ...
******************************

ئیمانداران: ئێمە لەم یادی هیجرەتەدا ناچینە ناو گێڕانەوەو چۆنیەتی کۆچکردنەکە بەدرێژی، بەڵام ئاماژە بەچەند وانەیەك دەکەین(إنشاءالله) لەژێر ناونیشانی (هیجرەت چیمان فێردەکات؟).

خاڵی یەکەم: یان بڵێین وانەی یەکەم کەلە هیجرەتەوە فێری دەبین ئەوەیە: مەبدەئو بیروباوەڕ لەهەموو شتێ گەورەترە. لەبەرئەوەی مرۆڤ خوای گەورە بەحەکیمی و کاربەجێیی خۆی کۆمەڵی غەریزەی لەمرۆڤدا دروست کردووە. وەکو خۆشەویستی ئەو خاکەی کە لەسەری لەدایك بووە و تێیدا ژیاوەو گەورە بووەو تێگەیشتووەو پێگەیشتوە، جا کاتێ مرۆڤ لەزێدی لەدایك بوون و گەورە بوونی خۆی. کە دەیان و سەدان یادگاری تێدا هەیە. هەڵدەکەنرێ و دوور دەکەوێتەوە، هەست بەدڵ تەنگی دەکات، غەم و پەژارەکانی تاڵ دەکات. تەنانەت جاری واهەیە مرۆڤ حەز دەکات بمرێت، نەك شوێنی نیشتەجێ بوونی چەند ساڵەی بەجێ بهێڵێت و ئاوارە و بێ ماڵو حاڵو کارو کەسابەت ببێ. بۆیە قورئانی پیرۆز ئاماژە بەو ڕاستی یە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ

مِّنْهُمْ ﴾ النساء: ٦٦.

واته: خۆئەگەر بەڕاستی ئێمە پێویستمان بکردایە لەسەریان کە خۆتان بکوژن، یان لەووڵات و نیشتمانتان دەرچن، ئەوەیان نەدەکرد. مەگەر کەمێکیان نەبێت.

جا سەرنج بدەن، خوای گەورە دوو شتی بەیەکەوە باس کردوە:

١. خۆکوشتن بەدەستی خۆت.

٢. چونە دەرەوە و بەجێهێشتنی نیشتمان.

ئەوەتا کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیجرەت دەکاتو لەمەککەو لەشوێنی لەدایك بوون و گەورەبوون و گرِوگاڵو یاری ناو منالانو شوانیو پەروەردە بوونی دووردەکەوێتەوە، واتە لەشاری مەککە دوور دەکەوێتەوە. ئەو مەککەیەی کە هیچ خۆشیەکی وای تێدا نەبینی جگە لەبێ باوکی، بێ دایکی، مردنی باپیری. فرمێسك لەدوای فرمێسك، مردنی خەدیجەی هاوسەری پاڵپشت و خۆشەویستی. بەهەژاری لەمەککەدا ژیا. تا ئێوارە شوانی دەکرد بەرامبەر پارەیەکی کەم. کاتێ بووش بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە ماوەی (١٣) ساڵە ڕۆژێك شەوێك نەیانهێشتووە خۆیی و برِواداران پشوویەك بدەن. لەو ماوەیەدا (عامُ الحُزْن) ی بینی بەهۆی مردنی خەدیجەی خۆشەویستی و أبوطالبی مامی دڵسۆزی. لەبەرچاویدا خاتوو سومەییە و یاسری شوێن کەوتەی تەنها لەسەر موسوڵمان بوون شەهید کران. داوای کرد یەك نوێژ لە کەعبەدا بکات، ڕێگایان پێ نەدا، سێ ساڵی ڕەبەق لە مەککە دەریان کردن بۆ شیوی أبوطالب، مەنعیان کرد کەس شتیان لێ بکرِێ و شتیان پێ بفرۆشێ. ژنیان بداتێ و ژنیان لێ بخوازێ. لەبرساندا صەحابە پێستی ئاژەڵیان دەکردە ئاوی گەرمەوەو دەیانمژی!! واپیلانی کوشتی لە (دارالنَّدوة)دا دارِێـژراوە و (١٠) گەنجی قورەیشی هەڵبژاردەی ناو

هەموو هۆزەکان لەبەردەرگای ڕاوەستاون کە لەگەڵ هاتنە دەرەوەیدا شەهیدی بکەن. وە بەیەك جار بە(١٠) شمشێری تیژ لێی بدەن و وای لێ بکەن هەر پارچەیەکی لاشەی بکەوێتە شوێنێك!! پیلانەکە ئەوەندە ژەهراوی و نامەردانەیە، کەبەتەواوی ژیانی ئەو نورو ڕوناکی و هیدایەتە لەمەترسی دایە. بۆیە خوای گەورە حەزرەتی جوبریل دەنێرێتە خزمەتی و بۆی ڕوون دەکاتەوە و فەرمانی کۆچکردن و بەجێ هێشتنی مەککەی پێ دەدات.

دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴾ الأنفال: ٣٠.

واتە: ئەی محمدﷺ یادی ئەوکاتە بکەوە، کاتێك ئەوانەی بێباوەڕ بوون پیلانیان دەگێڕا دژی تۆ بۆ ئەوەی بەندت بکەن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن، ئەوان پیلانی خۆیان دەگێڕن و خوایش پلانی خۆی دەخاتەکار (بەپووچکردنەوەی کارەکانیان). دڵنیابن خوای گەورە چاکترینی هەموو پلانسازو نەخشەسازانە، نایەڵێ پیلانیان سەربگرێ.

بەڵێ ئائەمەیە خۆشیەکان و یادگاریەکانی مەککە، کەچی خۆشەویستی نیشتمان و شوێنی لەدایك بوون. ئەوەندە لەدڵی مرۆڤدا شیرینە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەلە مەککە دوورکەوتەوە لەسەر شاخەکەوە ئاوڕێکی بۆ مەککەدایەوەو بەچاوی پڕ لەفرمێسكو دڵی مەحزونەوە فەرمووی: (وَاللهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللهِ، وَ أَحَبُّ أَرْضِ اللهِ إلى اللهِ، وَلَوْلا أَنِّي أُخرِجْتُ مِنْكِ ما خَرَجْتُ). رَواهُ التِرمِذي (٣٩٢٥) وَ أَحمد (٣٠٥/٤) وَ إِبْنُ ماجَّة (٣١٠٨)

واتە: سوێند بەخوا، ئەی مەککە بەڕاستی و بەدڵنیایی یەوە تۆ چاکترین زەوی خوای، وە خۆشەویسترین زەوی خوای لەلای خوای گەورە، سوێند بەخوا ئەگەر لەباوەشی تۆ دەریان نەکردمایە و ناچاریان نەکردمایە بەجێت بهێڵم، هەرگیز جێم نەدەهێشتی! خوای گەورە

فەرمووی: (إِذْ أَخرَجَهُ الّذينَ كَفَرُوا) کاتێ کافرەکان لەمەککە ناچار بەچونە دەرەوەو ڕۆیشتنیان کرد. نەك بەئارەزوی خۆی ڕۆیشتبێ!

وە صەحابەکانیش کە چونە مەدینە زۆر بۆ مەککە وەڕس و بێتاقەت بوون، یەکێکی وەکو (بیلالی حەبەشی) کە هەموو ژیانی پێش موسوڵمان بوونی بەکۆیلایەتی و عەبدایەتی و خزمەتکاری لەمەککەدا بەسەر برد، وە لەدوای موسوڵمان بونیشی لە مەککەدا بەرەو ڕووی توندترین سزا بۆوە، کە ئەوەبوو بەردی گەورەیان دەخستە سەرسکی و لەناو لمی گەرمدا ڕایان دەکێشا، کەچی هەر دەیفەرموو: (أَحد، أَحد)... ئێستا بە هیجرەت بیلال ڕزگاری بووەو لەمەدینە موعەزەزو موکەڕەم دەژی، کەچی وا لەژورێکدا ڕاکشاوەو تای لێهاتووەو بیری مەککە دەکاتەوە کەهەر چەندە بیلال لەمەککە لەدایك نەبووە و خەڵکی حەبەشەیە (ئەثیوبیا)ی ئێستا. بەڵام چونکە لەمناڵی یەوە لەوێ ژیاوەو گەوە بووە، لێی بۆتە زێدو نیشتمانی خۆی، حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ: ئیزنم لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت و چوم بۆ سەردانی (باوکم- حەزرەتی أبوبکرو عامری کوڕی فەهیرەو بیلالی حەبەشی) کەلە ژورێکدا بەیەکەوە دەژیان و نەخۆش کەوتبوون و بەهۆی نەگونجانی ئاوو هەوای مەدینەوە لەگەڵ ئەوان، توشی گرانەتا هاتبوون و لەجێگادا کەوتبوون و قسەیان دەکرد دەیاننالاند، هەریەکەیان بەجۆرێ باسی غەریبی خۆی دەکرد. بیلال بەدەم تاوە بەدەنگی بەرز دەیگوت:

أَلا لَيْتَ شعْري هَلْ أَبيتَنَّ لَيْلَةً .... بواد وَحَوْلي إذخرٌ وَجَليلُ.

وَهَلْ أَرِدَنْ يَوماً مياه مجَنَّة ..... وَهَلْ يَبْدُوَنْ لي شامَةٌ وَطَفيلُ.

واتە: ئاوات دەخوازم و داخەکەم تۆ بڵێی شەوێك بێت بێمەوە لە شیوەکەی دەوروبەری مەککەداو گیا سەوزو بۆن خۆشەکانی خەلیلەم لەدەوربێ. تۆ بڵێی ڕۆژێك من بگەمەوە سەر کانیاوی (مەجەننە)،

**تۆبڵێی ڕۆژێك بێت، دوو بەرزایی (شامە و طوفەیل)م پێش چاو بکەوێتەوە!!.**

**خاتوو عائیشە دەفەرموێ: کە ئەوەم لێ بینین گەڕامەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خواو ئەوەی بینیبوم و بیستبوم بۆم گێڕایەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:** (اللّهُمَّ حَبِّبْ إلِيْنا المَدينَة كَما حَبَّبْتَ إلِيْنا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، وانْقُلْ حُمّاها إلى الجُحْفَةِ، اللّهُمَّ بارِكْ لَنا في مُدِّنا، وَصاعِنا). رَواهُ البُخاري (٩٨٨١) وَ مُسْلِم (٦٧٣١).

**واتە: خوای پەروەردگار مەدینەمان لەدڵ شیرین و خۆشەویست بکە، هەروەکو چۆن مەککەت خۆشەویست کردووە لەلامان، یان زیاتر لە خۆشەویستی مەککە. مەدینەمان لەلاخۆشەویست بکە. خوایە گیان لەرزو تاکەی مەدینە بگوازەرەوە بۆ جوحفە- کە ئەوکاتە شوێنێکی چۆڵ بووە و کەسی لێ نەژیاوە. وە خوای گەورە بەرەکەت بخەرە کێشانەو پێوانەمانەوە. بەرەکەت بخەرە ڕزق و ڕۆزی و کارو کەسابەتمانەوە.**

**بەڵێ ئیمانداران: بەڕاستی غەریبی و دورکەوتنەوە لەنیشتمان و زێدی لەدایك بوون ئەوەندە سەختە لەسەر دڵو دەرونی مرۆڤ، کە مردن لەغەریبی پاداشتی گەورەی هەیە. پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرمویەتی:** (إنَّ الرَّجُلَ إذا ماتَ في غَيْرِ مَوْلِدِه قُيِّسَ لهُ مِنْ مَوْلِدِهِ إلى مُنْقَطِعِ اَثَرِهِ في الجَنَّةِ). حَديثٌ حَسَن، حَسَّنَهُ الألباني في صَحيح سُنَن إبْنُ ماجَّة) (١٣٠٩).

**واتە: ئەگەر مرۆڤ لەغەریبی دا، لەو شوێنەدا کەشوێنی لەدایك بوونی نیەو وولاتی خۆی نیە، بمرێ. لەبەهەشتدا بەئەندازەی دووری نێوان شوێنی لەدایك بوونو شوێنی مردنی لەغەریبی دا. لەبەهەشتدا پێی دەدرێ. لەپاداشتی ئەو مردنەی لەغەریبی دا!...**

**بەڵێ نیشتمانو شوێنی لەدایکبوون ئەوەندە خۆشەویستە ئەوەتا صەحابەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوانەی کەلەدەرەوەی مەککەو**

مەدینەوە هاتوون. هەموویان ناوی وولاتەکەی خۆیانیان پێوەیە. بۆ نمونە: سەلمان، فارسی یەکەی هەرپێوە ماوە. کەلە وولاتانی فارسەوە هاتووە، دەوترێ سەلمانی فارسی. بەهەمان شێوە: بیلالی (حەبەشی)، وە: (صوهەیبی ڕۆمی)، وەکو خۆشەویستیەك بۆ نیشتیمانەکەیان.

دەی بەڕێزان: خالی یەکەمی هیجرەت بەجێهێشتنی ئەو نیشتیمانەی خۆتە، پاشان (ماڵو سەروەتو سامان) کە خوای گەورە ماڵو سامانی کردۆتە هۆکاری بەردەوام بوونی ژیان. خوای گەورە لەقورئاندا (ڕۆح و ماڵی) بەیەکەوە باس کردووە لەزۆر جێگای قورئاندا دەفەرموێ: (أَنْفُسَهُمْ و أَمْوالَهُمْ) ...

ئیمانداری بەڕێز: بیهێنە بەرچاوت، پارەیەك چەند ساڵ بێ، لەو زەمەنی بێ پارەییەدا کۆت کردبێتەوە..زەوی کشتوکاڵی و باخ و باخات کە لەباوك و باپیرتەوە بۆت ماوەتەوە ... خانووی خۆت کە بێ منەتانە خۆت و ماڵو منداڵت تێیدا دەژی. بازاڕو پیشەو دوکانت کەژیانی ماڵو منالتی پێ دابین دەکەی، (ئەوەش نییە، ئەشیاو کەلوپەلی دوکانەکەت بپێچیتەوەو لەگەڵ خۆت بیبەی، بەڵکو ئێوارە دوکانی داخستووەو شەو بەدەستی خالی جێی هێشتووە!!) ئەوەی ئەهلی کەسابەتو ناوبازاڕو دوکاندارە بابیهێنێتە بەرچاوی خۆی بزانێ چەند گرانە!!، چەند هەڵوێستی دەوێ و لێبوردنی دەوێ ڕەنجی چەند ساڵەت بەجێ بهێڵی...

هەروەها مانگاو مەڕو حوشتر، چەند ساڵە خزمەتی کردوەو ژیانو گوزەرانی لەسەریەتی ئێستا غەیری گۆچانەکەی دەستی هیچی بۆ لەگەڵ خۆی نابرێ بۆ مەدینە! هەموو ئاژەڵو حەیوانەکانی کەچاوی پێیان ڕۆشن دەبۆوەو دڵی پێیان دەکرایەوە، جێیان دێڵێ و هەمووی دەکەوێتە دەستی کافری زاڵم ...

بەڕێزان: ئەم کارەساتە قورسانە میللەتی کوردی ئێمە لەهەموو

کەس باشتر هەستی پێ دەکات. چونکە لەکاتی تێکچونی گوندەکان و ئەنفالەکاندا، بەچاوی خۆی بینیویەتی کەچۆن بەدەستی خاڵیو گیرفانی بەتاڵ، لەماڵ هاتۆتە دەرەوەو هیچی نەماوە!..

بەڵێ ئیمانداران: سەرەڕای ئەوەش، زۆر بەنهێنی و ترسێکی زۆرەوە دەبوایە هیجرەتیان بکردایە. چونکە ئەوەی بگیرایە، یان کوشتن یان کافر بونەوە، یان سجن کردن لەشوێنێکدا بەشی دەبوو. کەئەو شوێنی سجن کردنە چەند مەتر بەرزبوو. دەرگاو پەنجەرەی هەڵچنرابوو. بەڵام سەری نەگیرابوو، بۆئەوەی لەسەرەوە ڕاستەوخۆ تیشکی خۆر لێیان بدات و گەرما بیانپڕوکێنێ. وەئاوی گەرمیان دەدانێو خواردنی خراپ و کەمیان دەدانێ و بەقسەی ناخۆشو گاڵتە پێکردن ئازاری ڕۆح و دەرونیان دەدان. بەڵێ. خۆشەویستی نیشتمان. خۆشەویستی ماڵو سامان. خۆشەویستی خانوو باخو دوکانو بازاڕو مەڕو ماڵاتو پیشەکەت، ئەمە لەلایەك ...

لەلایەکی ترەوە: مرۆڤی ئیماندار موکەلەفە بەوەی کە بەندایەتیو پەرستش بۆ خوای خۆی بکات. لەڕێگەی ناسینی خوای گەورەو ناسینی مەنهەجی خواوەو جێ بەجێ کردنی لەژیانیدا. وە مرۆڤی ئیماندار موکەلەفە بەوەی کە بەندایەتی پەروەردگاری بکات لەڕێگەی دروشمەکانی ئیسلامەوە. وەکو نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەج، وەهەروەها پابەند بوون بەپەیدا کردنی بژێوی حەڵاڵو خۆپاراستن لەکەسایەتی حەرامو خواردنی حەرام. وە کردنی کارو کردەوەی جوانو ڕەوشت بەرزانە. کەئەمەش هەمووی بەندایەتی خوایەو مرۆڤیش هەر بۆ ئەوە دروست بووە کە بەندایەتی خوا بکات.

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦.

بەڵی پێغەمبەری خواﷺ دەیفەرموو: (قُولُوا لا إِله إِلاّ اللهُ تُفْلِحُوا).

بەڵام موشریکەکانی وەکو ئەبو جەهل و سەرانی کوفر دەیانزانی (لا إله إلاّ اللهُ) ووتن، هەر تەنها ووتنی ووشەیەك نی یە. بەڵکو مانای گۆڕانی مرۆڤە. مانای سەرلەنویێ لەدایك بوونەوەیە، مانای ئەوەیە ئیتر کەس نابێ کۆیلەی کەس بێ، نابێ سەرکردە عەرەق بخوات و ئافرەت ڕەقسی لەبەردەمدا بکات و نابێ کاتێ دەسەڵاتدار شتێك. کەل و پەلێکی لەهەژارێك کڕیو پارەکەی نەدایە، هەژارەکە نەتوانێ داوای بکات.. دەیانزانی (لا إله إلاّ اللهُ) مانای ئەوەیە، دەبێ واز لەبتەکانیان بهێننو تەنها خوای تاك و تەنهاو بێ شەریك بپەرستن ... بۆیە ئەمەیان پێ قبوڵ نەکرا، وە ئەنجامی (١٣) ساڵ بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ)، تەنها ئەوەندە کەسە کەمە ئیمانیان هێناو ئیتر ئومێدی ئەوە نەما کەکەسی تر موسوڵمان ببێ، وە قورەیشی بت پەرست بەکوشتنی پیاوان و ژنانی صەحابە نەوەستان، بەڵکو پیلانی کوشتنی پێغەمبەریان(ﷺ) داناو، ئالەم کاتەدا خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەری خوا کرد. کە مەککە بەجێ بهێڵێ و کۆچ بکات..

کەواتە: هیجرەت هەڵبژاردنی یەکێ لەم دووانە بوو، نیشتمانو شوێنی لەدایك بوونو پارەو سامانو موڵکو خانوو باخو مەڕو ماڵات، لەگەڵ بەزەلیلی ژیانو لەدەست دانی بیرو باوەڕو مەبدەءو، یان کۆچکردن بۆ شوێنێك کە دینداری بەئازادی تێدا بکرێ و شەرعی خوای تێدا جێ بەجێ بکرێ، کە بێ گومان دەبێ ئەوەی دووەمیان هەڵبژێرێ. کەواتە: یەکەم وانە لەهیجرەتەوە فێری دەبین ئەوەیە کە: هەرکاتێ مرۆڤ کەوتە نێوان دوو داواکاری یەوە کەخۆشیو ئارەزووەکانی سەرزەوین. لەگەڵ بانگەوازی ئاسمان کە بانگی مرۆڤ دەکات کەبەختەوەری دونیاو قیامەت بێ. پێویستە لەسەر مرۆڤی ئیماندار کەلایەنی بەرزو بەپێزو بەڕێزی ئاسمانی هەڵبژێرێ. بەسەر لایەنی نزمیو کاتی سەرزەویدا..

سەرەنجامی هیجرەت و کۆچکردنیش ئـەوەبـوو کەئەهلی ئیمان سەرکەوتنو ئەوە چەسپا کەهەرکاتێ مەبدەئو بیروباوەڕ پارێزراو بوو. ئەوا نیشتمانیش دەبێتەوە، موڵك و سامانیش دەست دەکەوێتەوە. خوای گەورە بەڵێنو موژدەی داوە: ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا ﴾ النساء: ١٠٠.

واتە: جا ئەوەی کۆچ بکات لەپێناوی خوادا، لەو زەویەی کە کۆچی بۆ دەکات، سەربەرزیەك بۆخۆی و ڕیسواییەکی زۆریش بۆ دوژمنانی دروست دەکات. بەرەکەت و فراوانی ڕزق و ڕۆزی ڕووی تێدەکات.

یاخود دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي اللَّهِ مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ النحل: ٤١.

واتە: ئەو کەسانەی لەبەرخواو بۆ خوا کۆچیان کرد، بۆ پاراستنی ئیمانەکەیان- دوای ئەوەی کە ستەمیان لێکرابوو، ئەوە هەر لەدونیادا بەچاکیو ڕێزەوە نیشتەجێ یان دەکەین، بێگومان پاداشتی ئەو جیهان گەورەترو فراوانترە بۆیان، ئەگەر دەیانزانی.. بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە کەهەمومان. هەموو موسوڵمانان تا قیامەت ئاگایان لێی بێ ئەوەیە کەئەو کۆچ و هیجرەتە (في الله) بێ. تەنهاو تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا بێ. بۆ هیچ مەبەست و ئامانجێکی دونیایی نەبێ.. بەڵێ ئەگەر هیجرەت تەنها بۆ خوا بوو. ئەوا سەرکەوتن بەشی موسوڵمانان دەبێ. ئەوەتا موسوڵمانان بەسەربەرزیەوە گەڕانەوە مەککەو فەتحیان کرد، خوای گەورە دەوڵەمەندی کردن، چەندین قاتی مەککەی زیاتر پێ بەخشینەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر لەوکاتەدا کە ماڵەکانیان داگیر دەکراو پارەکانیان لێ دەسەنرا، دەیفەرموو بەصەحابەکان: قازانجیان کرد!! بۆ نمونە: کاتێ صوهەیبی ڕۆمی، کەکاتێ منداڵبوو، هۆزەکەی تالان کراو بەدیل گیراو، کرا بەکۆیلەو شاربەشار فرۆشرا، هەتا (عَبْدُالله

ی کوڕی جُدعان) **کڕی و پاشان لەبەرامبەر پارەیەکی زۆردا کەصوهەیب بۆی پەیدا بکات. ئازادی کردو صوهەیب لەدەرکەوتنی نوری ئیسلامدا، موسوڵمان بوو. صوهەیب هەر لەمناڵی یەوە ئیشی دەکرد، تاپارەیەکی باشی کۆکردەوە. هەموو پارەکانی هەڵگرت و بەرەو مەدینە بەدزی یەوە بەڕێ کەوت. هێشتا لەسنووری مەککە دەرنەچووبوو، قوڕەیش لەبۆسەدا گرتیان و پێیان ووت:** (أَتَيْتَناها هُنا صُعْلُوكاً، حَقيراً، فَكَثُرَ مالُكَ عِنْدَنا، وَبَلَغْتَ، ثُمَّ تَنْطَلِق بِنَفْسِكَ وَمالِكَ؟! وَاللهِ لايَكُونُ ذلِكَ)..

**واتە: ئەو کەسانەی لەبەرخواو بۆ خوا کۆچیان کرد- بۆ پاراستنی ئیمانەکەیان- دوای ئەوەی کە ستەمیان لێکرابوو، ئەوە هەر لەدونیادا بەچاکیو ڕێزەوە نیشتەجێ یان دەکەین، بێگومان پاداشتی ئەو جیهان گەورەترو فراوانترە بۆیان، ئەگەر دەیانزانی.. بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە کەهەمومان. هەموو موسوڵمانان تا قیامەت ئاگایان لێی بێ ئەوەیە کەئەو کۆچ و هیجرەتە (فی الله) بێ. تەنهاو تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا بێ. بۆ هیچ مەبەست و ئامانجێکی دونیایی نەبێ.. بەڵێ ئەگەر هیجرەت تەنها بۆ خوا بوو. ئەوا سەرکەوتن بەشی موسوڵمانان دەبێ. ئەوەتا موسوڵمانان بەسەربەرزیەوە گەڕانەوە مەککەو فەتحیان کرد، خوای گەورە دەوڵەمەندی کردن، چەندین قاتی مەککەی زیاتر پێ بەخشینەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر لەوکاتەدا کە ماڵەکانیان داگیر دەکراو پارەکانیان لێ دەسەنرا، دەیفەرموو بەصەحابەکان: قازانجیان کرد!! بۆ نمونە: کاتێ صوهەیبی ڕۆمی، کەکاتێ مناڵا بوو، هۆزەکەی تاڵان کراو بەدیل گیراو، کرا بەکۆیلەو شاربەشار فرۆشرا، هەتا** (عَبْدُالله

ی کوڕی جُدعان) **کڕی و پاشان لەبەرامبەر پارەیەکی زۆردا کەصوهەیب بۆی پەیدا بکات. ئازادی کردو صوهەیب لەدەرکەوتنی نوری ئیسلامدا، موسوڵمان بوو. صوهەیب هەر لەمناڵی یەوە ئیشی دەکرد، تاپارەیەکی**

باشی کۆکردەوە. هەموو پارەکانی هەڵگرت و بەرەو مەدینە بەدزی یەوە بەڕێ کەوت. هێشتا لەسنووری مەککە دەرنەچووبوو، قورەیش لەبۆسەدا گرتیان و پێیان ووت:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾ البقرة: ٢٠٧.

واتە: هەندێ کەس هەن لەخەڵکی، خۆیان دەفرۆشن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، خوای گەورەش بەسۆزو میهرەبانە بەرامبەر ئەو جۆرە بەندانەی.. بەڵێ ئەم ئایەتە هەموو ئەو جۆرە بەندانەش دەگرێتەوە کەوەکو صوهەیب هەر لەدونیادا قازانجی کردو پاش ماوەیەك لەمەدینەش دەستی کرد بەکارو کەسابەتو زۆر دەوڵەمەند بوو..

ئیمانداران: فەرموون بابەیەکەوە گوێ بگرین بۆ صەحابەیەکی زۆر بەڕێزی پێغەمبەری خواﷺ کەباسی بەخزمەت گەیشتنی پێغەمبەری خوامان(ﷺ) بۆ دەگێڕێتەوە ئەو هاوەڵەش ناوی (عوقبەی کوڕی عامری جوهەینی) یە. دەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەشریفی گەیشتە مەدینە. من لەناو پاوانێکدا بووم کەچەند بەرخۆلەم تێدا دەلەوەڕاند. هەرکەهەواڵی گەیشتنی پێغەمبەری خوام بیست گۆچانی شوانیم فڕێداو بەرخۆلەکانم بەجێ هێشت و ڕام کرد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاوڕم بەلای هیچدا نەدایەوە. کاتێ گەیشتمە خزمەتی عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خواﷺ. ئایا پەیمانم لێ وەردەگریو بەیعەتت پێ بدەم؟! پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: تۆ کێ ی؟! ووتم: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنیم. فەرموی: (يا عُقْبَة، أَيُّهُما أَحَبُّ إِلَيْكَ، أَنْ تُبايعَني بَيْعَةً أَعرابِيَّة. أَمْ بَيْعَة هِجْرَةٍ؟). ئەی عوقبە ئایا کامیانت بەلاوە خۆشەویسترە، بەیعەتم پێ بدەی بەبەیعەتی ئەعرابیانە، وەکو خەڵکی چاولێکەر. هەرئاوا چاوت لەخەڵکی کردوەو هاتووی بەیعەتم پێ دەدەی؟! یان

پەیمان و بەیعەتی ڕاستەقینەی کۆچکردنم پێ دەدەی کەپێش ئەوەی بەلاشەت بێ ی بەرەو ئیسلام بەدڵو بەگیان بگۆڕێ ی؟! ووتم: پەیمانی کۆچکردنی ڕاستەقینەت پێ دەدەم .. عوقبە دەفەرموێ: ئێمە (١٢) کەس بووین کەموسوڵمان بووین و لەدووری شاری مەدینە نیشتەجێ بووین و لەو شیوو دۆڵانەدا مەڕمان دەلەوەڕاندو ماڵە مەڕدار بووین. ئەو دوانزە کەسە لەناو خۆماندا کەوتینە گفتوگۆو بەخۆمانمان ووت: بەخوا هیچ خێرێك لەئێمەدا نی یە. ئەگەر بەردەوام پەیوەندیمان بەپێغەمبەری خواوە نەبێ و ڕۆژانە شارەزا نەبین لەئیسلامەکەمان و نەزانین لەلایەن خـوای گـەورە چی بەوەحی پێ وتــراوەو چی لەقورئان بۆهاتووە. بۆئەوەی ئێمەش وەری بگرین و لەبەری بکەین. بۆیە بڕیارماندا، هەر ڕۆژەی یەکێکمان بڕوات بەرەو شاری مەدینەو لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بێ و پاشان بۆ ڕۆژی دوایی بگەڕێتەوەو ئەوەی بیستویەتی بەئێمەشی بڵێ و ڕۆژی دواتر کەسێکی تر بچێ بۆ مەدینە. وە ئێمە بە هەمووەمان خزمەتی مەڕومالاَتی ئەو کەسە بکەین. کەدەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەتا دەگەڕێتەوە. بەلاَم من لەبەرئەوەی ئەوەندە مەڕەکانمو بەرخۆلەکانمم خۆش دەویست دڵم نەدەهات بەکەسیان بسپێرمو دڵم ئاوی نـەدەخواردەوە. ئەگەر خۆم نەیانلەوەڕێنم و ئاویان نەدەمو سەرپەرشتیان نەکەم. لەبەرئەوە هاوەڵە مەڕدارەکانم هەموویان یەك لـەدوای یەك دەچونە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەنها من مامەوە، کەلەدەمی ئەوانەوە قورئانم دەبیستو فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) بۆ دەگێڕامەوە. بەلاَم زۆری پێ نەچوو. کەبەنەفسی خۆمدا چومەوەو بەنەفسی خۆمم ووت: هاوار بۆ تۆ ئەی نەفس. ئایا لەپێناوی چەند بەرخۆلەیەکدا، کە کەڵکێکت بۆ قیامەت پێ ناگەیەنن، هاوەڵیەتی و هاودەمی پێغەمبەری

سەروەر لەدەست دەدەی و خۆت لەوە بێ بەش دەکەی کەڕاستەوخۆ، بەبێ کەسێکی ناوەند، لەدەمی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) قورئان ببیستی و چاوت بەبینینی نورو جەمالی حەزرەتی رەسول الله ڕۆشن ببێتەوە؟!! لەبەر ئەوە هەر ئەوکات بەرخۆلەو مەڕەکانم بەجێ هێشتو ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

(ئایا تۆی ئیمانداریش هیچ جار بەخۆتت ووتوە، ئایا لەپێناوی دوکانەکەمدا، ئاژەڵەکەمدا، خەوی ناو جێگە گەرمەکەمدا، لەپێناوی لاشەکەمدا کەسەرماو گەرمای نەبێ، ئایا ڕەوایە بەشوێن ووتاری باش‌و بەسووددا نەگەڕێم و بەکەم‌و کورت ڕازی ببم؟!!)...

بەڵێ، کاتێ ئەم گەنجە دڵ پڕ لەئیمانە (عوقبەی کوڕی عامر) گۆچانی شوانی فڕێداو بەرخۆلەو مەڕەکانی بەجێهێشت و، هاوەڵیەتی شەوو ڕۆژی پێغەمبەری خوای(ﷺ) هەڵبژارد. لەو کاتەدا کەئەم بڕیارە دلێرو بوێرانەی دا، هیچ کات بەخەیاڵیشا نەهاتبوو کەدوای تێپەڕبوونی زەمەنێك، دەبێتە یەکێك لەزاناو عالمە ناودارەکانی ناو صەحابە. وە دەبێتە یەکێك لەمامۆستایانی قورئان خوێندن و قورئان فێرکردن. وەیەکێ لەسەرکردەکانی لەشکری ئازادی بەخشی ئیسلامی.. وەهەرگیز بەخەیاڵیشا نەهاتبوو کەڕۆژێ لەڕۆژان ببێتە یەکێ لەوالیە بێ وێنەکانی ئیسلام. بەڵێ ئەو وەختەی کەعوقبەی کوڕی عامر. بەرخۆلەکانی بەجێهێشت و مەردانەو لێبڕاوانە بڕیاری دا کەببێتە خزمەتکاری پێغەمبەری خواو هاوەڵی ئەو بەهیچ شتێ نەگۆڕێتەوە. هیچ کات بەبیریدا نەهاتبوو کەڕۆژێك لەڕۆژان دەبێتە پێشەنگی ئەو سوپایەو لەشکرەی کەدایکی ئەو ڕۆژەی دونیا. واتە: (شاری دیمەشق لەشام) فەتح دەکات!. وەلە (باب توما) کەخۆشترین شوێنی دیمەشقە لەناو باخچەیەکی ڕازاوەدا کۆشکێکی نایابی دەبێت!.. وەهەرگیز

ئەوەی بەخەیاڵیشدا نەهاتبوو کەلەشوانی مەڕو ماڵات و بەرخۆڵەوە. ببێتە یەکێ لەفەرماندە قارەمانەکانی ڕزگار کردنی (میصر)و لەسەر شاخەکانیدا خانوو کۆشکێك دروست بکات. وەدوای ئەمە ئەم صەحابیە بەڕێزە بەشداری کرد لەسوپای دەریایی ئیسلامدا. کەلەهەڵمەتێکی شێرانەدا- جەزیرەی ڕودس- ی لەدەریای سپی ناوەڕاستدا فەتح کرد. بەڵێ بەهۆی ئەم دڵسۆزی و لێبڕانەوە (عوقبەی کوڕی عامر) هەتا هەتایە ناوی بەزیندویەتی مایەوەو چەندین کتێبەکانی فەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) ناوی ئەم صەحابەیە دەبرێ و لەمێژووی پڕشنگداری ئیسلامدا، هەتا ڕۆژی دوایی بەشانازیەوە ناوی دەبرێ. بەڵێ وەعدو بەڵێنی خوایە:

﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً﴾ النساء: ١٠٠.

پێغەمبەری خواش ﷺ موژدەی داوەو فەرمویەتی: (إِنَّكَ لَنْ تَدَعْ شَيْئاً لِلهِ عَزَّوَجَلَّ، إلاّ أَبْدَلَكَ اللهُ بِهِ ماهُوَ خَيْرٌ لَكَ مِنْهُ). صَحيح، رَواهُ أَحمد في مُسْنَدِهِ. (٢٠٦/٧).

واتە: تۆ هەر شتێك لەبەرخاتری خوا وازلێبێنی، ئەوە دڵنیابە خوای گەورە باشتر لەوەت پێ دەبەخشێ کەتۆ بۆ خوا وازت لێ هێناوە.

وەلەفەرمودەیەکی قودسیدا هاتووە کە خوای گەورە فەرمویەتی: (مَنْ شَغَلَهُ ذِكْري عَنْ مَسْأَلَتي، أَعْطَيْتُهُ فَوْقَ ما أعطي السّائِلِينَ) رَواهُ البُخاري.

واتە: هەرکەسێ بەهۆی سەرقاڵبوونی زۆری بەیادو زیکری من و خزمەتکردنی دینەکەم نەیپەرژێتە سەرئەوەی کە داوام لێبکات بۆ کاروبارەکانی دونیای. واتە: ئەوەندە خەمی بانگەواز کردنیەتی بۆ لای خوا. بیری چۆتەوە کەژیانی دونیایی خۆی چۆنەو چی کەموکوڕیەکی هەیە. خوای گەورە دەفەرموێ: ئەوە من بەو کەسە دەبەخشم لەسەرو ئەوەی کەدەیبەخشم بەو کەسانەی کەداوام لێ دەکەن!، بەڵێ هەرکەسێ

ئەوەندە لەخەمی بەرزی و بڵندی ئەم ئیسلامەدا بێ، وای لێ بێ لەبیری نەبێ داوای هەموو پێویستیەکانی لەخوا بکات. خوای گەورە خۆی باشتر لەوکەسەی پێ دەبەخشێ کەزۆر بەئیسراحەت بیری کردۆتەوەو داوای کردووە کەخوای گەورە ئەوەو ئەوەی پێ ببەخشێ و پێشی بەخشیوە!!.

ئیماندارانی بەڕێز: ئێمە کەباسی هیجرەت دەکەین، وەکو سەرەتا ووتمان، گێڕانەوەی چیرۆك و بەسەرهاتێك نی یە. بەڵکو ئەمە ململانێیەکی نێوان حەق و ناحەقە، نێوان ڕووناکی و تاریکیە، ململانێی نێوان خێرو شەڕە، بەڵام هەرچەندە حەق ماوەیەك کزبێ، سەرکوت بکرێ، شەڕ پێش لەبڵاوبونەوەی خێر بگرێ. تاریکی شەو هەرچەندە درێژ بێ، ڕۆژ هەر هەڵدێ. ئاو ئەگەر بەردێك بەری بگرێ، زیاتر پەنگ دەخواتەوە و هەرکەبەربوو. هیچ پیسیەك خۆی بۆ ناگرێ. بەڵام گرنگ ئەوەیە ئیمانداران خۆڕاگربن.

خۆشەویستم
هەرچەند ڕێگات سەخت و هەڵدێرو عاسێ یە
کەچی سات لەساتێ چاتر
پێت بەگوڕترن لەم ڕێ یە
خۆشەویستم
ئەتۆ نورو تەوحیدو ڕەحمەتت پێ یە
کەچی (جەزیرەتول عەرەب)
هەزاران (ئەبولەهەب)و
(كَعْبَةُ الله)ش
سێ سەدو شەست بتی لێ یە
خۆشەویستم

ئەتۆ هیدایەتی خواییت لەئامێزە
پڕی سینەت
سۆزو خۆشەویستی و ڕێزە
کەچی ئەبوجەهلی دێزە
لوتی لەتەوقی ئاسمانەو
سەریشی بۆ (لات) و (عوززا) لەعەرزێ یە
ئەمە مێژوو
مێژووی پێشوو، ئێستاو ئایندەو داهاتوو
وا تێمەگەن ئەم ململانێ یە نوێ یە
چاوتان تیژو وورە پۆلاو ڕێگاش ڕۆشن
ئاشکرایە سەرەنجامیش
سەرکەوتنی هەتاهەتایی بۆ کێیە....
**************************
ئیمانداران: ڕەنگە کەسێك بڵێ، خۆزگە من لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا بومایەو لەخزمەتیدا هیجرەتم بکردایەو ئەو شەرەفە گەورەم بەنسیب بوایە. ئالێرەوە پرسیارێك دروست دەبێ، ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەمڕۆ لەسەدەی بیستو یەکدا دەتوانرێ هیجرەت بکرێ و مرۆڤی موسوڵمان بچێتە ڕیزی کۆچکەرانەوە؟!

لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێین: بەڕاستی هیجرەت لەخودی خۆیدا هەڵوێستێکی دەرونی یە، پێش ئەوەی گەشتێکی لاشەیی بێت. هیجرەت بریتیە لە: کۆچکردنو پشت هەڵگرتن لەباطل و ئینتیماو یەکلابونەوە بۆ حەقو ڕاستی. هیجرەت مانای ئەوەیە دورکەوتنەوە لەبێ شەرعیەکانو ئەنجامدانی کردەوە پەسەندو شەرعیەکان. پاشان لەگەڵ ئەمانەدا، گواستنەوەیە لە (دارُ الكُفْر)ەوە بۆ (دارُ الأِسْلام).

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی:** (المُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المُسْلِمُون مِنْ لِسانِهِ وَيَدِه وَالمُهاجِرُ مَنْ هَجَرَ مانَهَى الله عَنْهُ) رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم ...

**واتە: موسوڵمان ئەو کەسەیە کەموسوڵمانان لەزمانو دەستی سەلامەت بن. کۆچکردوش ئەو کەسەیە کەپشت هەڵکات لەهەرشتێ کەخوا نەهیٚلێ کردوەو قەدەغەی کردووە.**

**بەڵێ ئەگەر چی دەرگای هیجرەت بەچون لەمەککەوە بۆ مەدینە لەدوای (فەتحی مەککەوە) کۆتایی هات، لەبەر فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەفەرموی:** (لاهجرَة بعدَ الفتح) **لەدوای فەتحی مەککەوە ئیتر دەرگای کۆچکردن داخرا. بەڵام لەڕاستیدا دەرگای کۆچ و هیجرەت کراوەیە لەنێوان هەموو دوو شارێکدا کەوەکو مەککەو مەدینە وابن، لەدژایەتی کردنی ئیسلام و باوەش کردن بەئیسلامدا.**

**بەڵێ کۆچکردن لەکۆمەڵگایەکەوە کەبێ شەرعی بەئاشکرا تێدا دەکرێ بۆ کۆمەڵگایەك ناو کۆمەڵە کەسانێك کەبەڕاستیو بەجوانی پەیڕەوی ئاینی ئیسلام دەکەن. ئەم جۆرە هیجرەتە هەتا قیامەت هەر باقیە.. بەڵکو عیبادەت و بەندایەتی خوای گەورە لەزەمەن و کاتێکا کەفیتنەو بێ دینی و ئارەزوو بازی خراپەکاری و بێ ڕەحمی بڵاوبۆوە. ئالەو کاتەدا. خواناسی و بەندایەتی کردن بۆ خوا، بەڕاستگۆیانە لەسەر شەرعی خوا. دور لەبیدعەت، بارتەقای هیجرەتە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی:** (عِبادَةٌ فِي الهَرَجِ - أَي فِي زَمَنِ الفِتَنِ- كَهِجْرَةٍ إِلَيَّ). رَواهُ مُسْلِم (٢٩٨٤) والترمذي (٢٢٠٣) وإبنُ ماجَّة (٣٩٨٥).

**واتە: عیبادەت و خواناسی لەسەردەمی بڵاوبوونەوەی فیتنەو بێ دینیدا، وەکو ئەوە وایە ئەو کەسە خواناسە هیجرەتی کردبێ بۆلای من..!**

دەی موژدەتان لێ بێ ئەو کەسانەی کە: لەنادیو ئەرەق خواردنەوەوە هیجرەتتان کرد بەرەو مزگەوت، لەبتو بت پەرستی سەردەمی ئەمڕۆوە، بۆ تەوحیدو خوا بەیەك گرتن هیجرەتتان کرد ... لەدەست بڕین و حەرام خۆرییەوە بۆ پاکیو حەڵاڵ خۆری کۆچتان کرد. پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر بەئێوە دڵخۆشە، هەروەکو بەو دوو گەنجە دڵخۆش بوو، کەلەکاتی هیجرەتدا پێش گەیشتن بەمەدینە، تووشی دوو گەنج بوو. ئەوانەی کەلەخزمەتی دا بوون و خەڵکی مەدینە بوون. عەرزیان کرد: قوربان ڕوو مەکەرە ئەو دوو لاوە، چونکە ئەوە دوو دزن، دوو حەرام خۆرو دەست بڕن! بەڵام پێغەمبەری ڕەحمەت(ﷺ) بانگی کردنو فەرموی: حەزدەکەم باسی ئیسلام و یەکتا پەرستیتان بۆ بکەم، ئەگەر گوێم لێ بگرن. ئەو دوو گەنجەش زۆر بەلایانەوە سەیر بوو. باشە خۆ ئەمان کەس لێیان نزیك نابێتەوە، خەڵکی خۆیان دوورە پەرێز دەگرن لێیان! ئیتر چۆن ئەم پیاوە کەپێغەمبەری خوایە(ﷺ)، ئاوا بەڕێزەوە قسەیان لەگەڵا دەکات!! لەبەر ئەوە ئەم دووگەنجە پێشتر دزە ئێستا تۆبەکارە زۆر بەشادمانی یەوە هاتنەناو ئایینی ئیسلامەوەو هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواو گوێیان بۆ گرتو سوپاس بۆ خوا هەردوکیان موسوڵمان بوون، پاش موسوڵمان بونیان ئەمجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێی پرسین، ناوتان چی یە؟ ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناومان (المُهانان)ە، واتە: دوو بێ نرخەکە. دوو نەفرەت لێکراوەکە، دوو ڕێگرەکە! هێندەیان خراپە کردبوو، خەڵکی ئەوەندەیان پێ وتبون، لای خۆشیان ببوو بەناویان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: (بَلْ أَنْتُما المُكْرَمانِ) نەخێر ئێوە بێ نرخ نین. بەڵکو ئێوە دوو گەنجە ڕێزدارەکەن. ناوینان: (ڕێزدار) وە فەرموی: دەبێ بێن بۆ مەدینە بۆلام و بەردەوام یەکتری ببینین.

**(ئەم بەسەرهاتە)** رَواهُ أَحمد **(٧٤/٤).**

**ئیمانداری بەڕێز: بیهێنە بەرچاوی خۆت کەمەککە چی تێدا دەکرا، وا موسوڵمانان بەجێیان هێشت و هیجرەتیان کرد. مەککە ئاوابوو: بت پەرستی، عەرەق خۆری، داوێن پیسی، زۆردار ماڵی هەژاری داگیر دەکرد، سیلەی ڕەحم کزببوو، کەئەمەش هەموو سەردەمێك هەیەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێی بێ بەریە. مەککە ئابەو شێوەیە بوو کە (جەعفەری کوڕی أَبوطالب) لەبەردەم (نەجاشی) پاشای حەبەشەدا باسی کرد:** (اَیُّها المَلِك: کُنّا قَوْماً أَهلَ جاهِلِیَّة) **ئەی پاشا. ئێمە قەومێك بووین کەئەهلی جاهیلیەت و نەفامی و نەزانین بوین. پاشان جەعفەر صیفات و ڕەوشتەکانی باس کرد کەبۆتە هۆی ئەوەی لەجەهالەتدا بژین- کەبەڕاستی جاهیلیەت ئائەمەیە، ئەگەر لەسەدەی بیست و یەکیشدا بکرێ- فەرمووی: ئێمە پێش هاتنی ئەم ئیسلامە قەومێك بووین:** (نَعْبُدُ الاَصْنامَ) **بتمان دەپەرست. دارو بەردمان بەدەستی خۆمان دەتاشی و دەمانکرد بەهاوبەش بۆخواو داوای نەفع و لابردنی شەڕمان لێ دەکرد.** (ونَأْکُلُ المیْتَةَ) **مرداره‌وەبوومان دەخوارد** (وَنَأتِي الفَواحِش) **کاری بەدڕەوشتیمان بە ئاشکرا دەکرد** (ونقْطَعُ الاَرْحام) **پەیوەندی خزمایەتیمان دەپچڕاند،** (ونُسيء الجِوار) **خراپەمان لەگەڵ دراوسێ دەکرد.** (ویأْکُلُ القَويُّ مِنّ الضَّعیف) **بەهێزمان بێ هێزمانی دەخواردو دەیچەوساندەوەو مافی پێشێل دەکرد..**

**دەی ئیمانداران ئەمڕۆ لەزۆربەی جیهانداو لەوڵاتی خۆشماندا. بەداخەوە ئەم ڕەوشتە جاهیلیانە. کەکۆمەڵگا دەکات بەکۆمەڵگایەکی جاهیلی، دەبینرێن، بت پەرستی ئەو کاتە داروبەرد بوو، کەوەکو سودی نەبوو. زەرەریشی لەڕووی دونیایی یەوە نەبوو. بەڵام بتی ئەمڕۆ کەبریتی‌یە لەسەرکردە پەرستی بەکوێرانە. حیزب پەرستی، پەڕۆ**

پەرستی. عەشرەت پەرستی. ڕەگەز پەرستی، وەكو مرۆڤ خەسارەتمەندی قیامەت دەكات دەستخەڕۆی دونیاشی دەكاتو هەموو كاتێ لەزەرەردایە پێوەی. ئەمڕۆ مردارەوەبوو بریتی یە لەحەرام خۆری. شتی بەسەرچوو و خراپ بوو. فرۆشتن. فاحیشەگەری بەئاشكرا دەكرێ. بەیاسا ڕێك دەخرێ!! لەجیاتی دابخرێ! ڕووت و قوتی سەرەتایە بۆ فاحیشەگەری، كەناڵی خراپ، گۆڤاری خراپ، ڕەقس و سەماو حەفلەو ڕەشبەڵەك، هەمووی بەئاشكرا دەكرێ و هەمووی سەرەتایە بۆ فاحیشەگەری. بەداخەوە سیلەی ڕەحمو خزمایەتی پشت گوێ خراوە. خزمی چاك ئەوەیە دەوڵەمەندبێ و دۆلاری لێ ببارێ، ئەینا خزمی هەژارو داماو كێ بەخزمی دەزانێ!!، دراوسێ ئازاری دراوسێ دەدات، لەماڵا نەبێ ماڵی تاڵان دەكات! بەچاوی خیانەت تەماشای عائیلەی دەكات! هەیە چەند ساڵە دراوسێ یە، دیواری بەدیواریەوەیەتی نازانێ دراوسێكەی ناوی چی یە!! بەئاشكرا دەبینین بەهێزمان لاوازمان دەخوات. ماڵی دەخوات. ژیانی دەخوات.

كاربەدەستەو لەجیاتی خزمەتی میللەت. كەبەدەنگی ئەو چۆتە سەر ئەو كورسی یە. خیانەت لەبودجەی ئەو میللەتە دەكات! كۆشكو تەلار بەخوێنی كوڕی خەڵك بنیات دەنێ.

بەڕێزان: ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان هەموو ئەمانە دەبینین، دەی هەركەسێك پێچەوانەی ئەمانە بكات. لەم ڕۆژەدا (إن‌شاءالله) وەكو صەحابەی موهاجیر حیسابی بۆ دەكرێ لەلای خوای گەورە:

١. غەیری خوا كەس مەپەرستە. بتی سەردەم لە بتی زەمانی مەككە زۆرترە!..

٢. مردارەوەبوو خواردن. حەرام خۆری یە. شتی بەسەچوو فرۆشتنە، تەزویر كردنە، بەسوێندی درۆ قەناعەت بەكڕیار بكەی و خراپی

بەچاك پێ بفرۆشی. ئەوە هەر مردارەوەبوو خواردنەکەی جاهیلیەتی پێش ئیسلامە. دەی تۆی کاسبکار، بازرگان حەرامەکە بەئاسانی هاتە بەردەستت و لەبەرخوا نەتخوارد، ئەوە پلەی موهاجیرینت هەیە.

٣. دووربە لەبەدڕەوشتیو فاحیشە، موژدەتان لێ بێ ئەی ئەو کوڕوکچانەی کەبەژیانی موسوڵمانانەی قورئانیانە، لەسەر سوننەتی پێغەمبەر دەژین. ئەو کچ و ژنانەی کەوازتان لەسفوری جلی ناشەرعی هێناو بونە بالآ پۆش. ئێوە هیجرەتتان کردوە بۆ داوێن پاکی. بۆ ڕێزو قەدر، بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٤. لەگەڵ خزمو کەس‌وکارت چاك بە. لەهەڵەی خراپەکاریان ببورە، یارمەتی نەداریان بدە.

٥. دراوسێیەکی بەڕێزو دەست پاك بەو، ئەمین بە بەرامبەر بەدراوسێ یەکەت. کەسێکی وابە بۆ دراوسێیەتی. کەلەهەموو شوێنێك دراوسێ کەت لەپاشملە بڵێ: یارەبی خوا لێی ڕازی بێ. بەڕاستی لەهەموو خزم و کەسوکارم بۆم باشترەو زیاتر جێگای متمانەیە.

٦. یا ئەو کەسەی کەدەتوانێ زوڵم و ستەم بکات. ماڵی خەڵکی بخوات، ئیشی هاووڵاتی ڕایی نەکات، بەڵام کاتێ لێپرسراوە دەست پاکە بەرامبەر ماڵی میللەت، دڵسۆزە بۆ کارەکەی و گەندەڵ نی یە. ڕێز لەهەژارو بێکەس دەگرێ و فەرقی ناکات لەگەڵ دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارەکە لەڕووی کاری یاسایی یەوە. ئەم لێپرسراوەش موهاجیرەو ئەو جەهالەتەی بەجێ هێشتووە. کە صەحابەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەجێیان هێشت..

ئیمانداران: بەوردی تەماشا کەن. باسی نوێژو ڕۆژوو حەج نەکراوە. بەڵکو ئەوەی باسکراوە باسی پەیوەندی مرۆڤەکانە لەگەڵ یەکتر.. دەی موژدەبێ لەتۆبەکاران. کە (المُهاجِرُ مَنْ هَجَرَ مانَهَى اللهُ عَنْهُ).

هەركاتێ بێ شەرعیەك هاتە بەردەستت و بەئاسانی بۆت ئەنجام دەدرا. بەڵام لەبەرخوا وازت لێهێناو شەرمت لەخوا كرد، ئەوە تۆ لەپێناوی خوادا كۆچت كردوە بۆلای ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەكەی (ﷺ)ئەوكاتە تۆی تۆبەكار. كە گەڕایتەوە بۆلای خوا. ئەومندە بەڕێز دەبی كەخوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ النساء: ١٠٠.

واتە: جا ئەوكەسەی كەلەپێناوی ڕەزامەندی خوادا كۆچ بكات، ومماڵو حاڵی خۆی بەجێ بهێڵێت و لەپێناو خواو پێغەمبەرەكەیدا دەرچێت و كۆچ بكات . پاشان مردن یەخەی پێ بگرێت، ئەوە ئیتر ئەو كەسە پاداشتەكەی كەوتۆتە سەرخوا. هەرخۆی دەزانێت چۆن پاداشتی دەداتەوە. خوای گەورە هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە..

بەڵێ هەركەسەو بەرەو لای خوای گەورە بڕوات و پشت لەخراپە بكات و ڕوو بكاتە ڕێبازی خوا ئەوە خوای گەورە لەڕابردووی خۆش دەبێت و ڕەحمی پێ دەكات بۆ قەبرو قیامەتی .. ئای چەند خۆشە لەوكاتەدا كەبەرەو مزگەوت دێی بمری. یان لەناو مزگەوتا بمری!. یان وەكو هەندێ لەپیاو چاكان لەسوژدەی نوێژدا بمری!! ئای چەند خۆشە لەوكاتەدا كەلەماڵ دێتەدەرەوە، نیەتێكی خێر لەدڵتابێ و لەو ڕێگای خێرو چاكەدا بمری... ئای چ سەرفرازیەكە لەو وەختەدا كەخەم لەم ئیسلامەتیە دەخۆی خۆزگە دەخوازی ڕۆژێك بێ ئیسلام حوكمە دلاپەروەریەكەی ژیانی مرۆڤایەتی لەزەحمەتەوە بەرەو ڕەحمەت ببردایەو هەموو خەڵكی بەخۆشی و شادی بژیانایەو دونیاو قیامەتیان بەختەوەری بوایە. ئالەوكاتەدا كەدڵت پڕە لەم هەموو خێرە بمری .. ئای چ بەختەوەریەكە، لەو وەختەدا كەبیر لەقەبرو قیامەتی خۆت دەكەیەوەو فرمێسكی پەشیمانی لەتاوانەكانت هەڵدەوەرێنی و

تەوبەی نەصوح دەكەی‌و دەڵێی، خوایە وابەدەم بانگەوازەكەی تۆوە هاتم كەدەفەرمووی: (فَفِرُّوا إِلى اللهِ). ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) كاتێ تۆ بانگم دەكەی‌و دەڵێی: وەرن ڕاكەن بەرەو خوا. ڕامەكەن لەخوا، وا خوایەگیان من ڕامكرد بەرەو قاپی ڕەحمەتت. ئای چ خۆشە ئالەو ساتەدا مردن یەخەت بگرێ‌و (فَقَدْ وُقَعَ أَجْرُه عَلى الله)ت بەنسب ببێ...

سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن: سەردەم و زەمان سەردەمی زێڕینی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) موسوڵمانان خەریكی غـەزای خەیبەرن. گەنجێكی ڕەش پێست، بەڵام دڵ سپی و پاك خەڵكی حەبەشە بوو. شوانی جولەكەكانی خەیبەر بوو. ئەم شوانە لەجولەكەكانی پرسی: بۆچی ئاوا شپرزەن و خۆتان ئامادە دەكەن. ووتیان: نیازی شەڕمانە لەگەڵ كەسێكدا كەخۆی بەپێغەمبەری ئاخر زەمان دەزانێ و ناوی (محمد)ە... ئەم شوانە گەنجە، مەڕەكانی پێش خۆی داو لەسوپای پێغەمبەر(ﷺ) نزیك بۆوە. پاشان چووە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)و پرسیاری لێ كرد، ئایا تۆ پێغەمبەری؟! ئایا پێغەمبەرایەتی چی یە؟! ئیسلامەتی چی یە؟! ئێغەمبەری خواش(ﷺ)، بەهێمنی‌و بەنەرمی‌و كورت و پوخت بۆی باس كرد. هەرلەوێدا شوانەكە موسوڵمان بوو. ئەمجا نەیدەزانی چی لەمەڕو ماڵاتەكە بكات، كە ئەمانەتی خەڵكی بوون لەلای، (پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیفەرموو مادام موسوڵمان بووی، بێنە مەڕەكەش بدە دەست ئێمە، چونكە هیی ئەو جولەكانەن كە دوژمنی ئێمەن‌و واچەند سەعاتێكی تر لەمەیدانی جەنگدا بەیەك دەگەین)... نەخێر شتی وای نەفەرموو، چونكە لەدینی خـوادا نابێ جەنگو سیاسەت، ئەخلاق و بنەما ڕەوشتیە پەسەندەكان، كەگەورەترینیان ئەمانەت پارێزیە لەكەدار بكات..

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ڕانە مەڕەكە بەرەو ڕووی قەڵای

جولەکەکان ڕابگرەو لەسەرەخۆ لێیان بخورە، دەبینی خۆیان ملی ڕێ دەگرنو دەڕۆنەوە بۆماڵی خاوەنەکەیان، تۆش لای ئێمە بمێنەوە، بەڵێ هەرواببوو، مەڕو مالاتەکە ملی ڕێیان گرتو تانەچونەوە ماڵی خاوەنەکەیان لەهیچ جێگایەك لایان نەدا!! ئەم شوانەش لەدوای موسوڵمان بوونی، فریا نەکەوت تەنیا یەك سوژدە بۆ خوا بباتو نوێژێك بکات. کە پەلاماری جولەکەکان بۆ سەر موسوڵمانەکان دەستی پێکردو جەنگ بەرپابوو، ئەم شوانە گەنجە لەڕیزی موسوڵماناندا جەنگاو شەهید بوو. بەهەشتی بۆخۆی مسۆگەر کرد! پێغەمبەر(ﷺ) بەهاوەڵانی فەرموو، بەڕاستی خوا ڕێزی لەم بەندەیە گرتو هێنای بەرەو خێر وادەبینم دوو حۆری لەژوور سەریەوەنی و هاتونە پێشوازی. لەکاتێکدا یەك سوژدەشی بۆ خوا نەبردووە!...

دەی خوایەگیان ئێمەش عاقیبەت خێر بکەیو ڕومان لەخێرو پشتمان لەخراپەو بێ شەرعیەکان بێو بەخزمەت پێغەمبەری خواو هاوەڵانی بەڕێزی بگەین لەبەهەشتداو خوای گەورە لەئێمەو سەرجەم موسوڵمانان ببورێو لەدونیاو دوارۆژدا بەشمان چاکە بێ. اللّهُمَ آمين.

## سەرچاوەکان:


١. تەفسیری ئاسان، م. بورهان محمد أمين.

٢. خۆشەویستی خۆشەویست (ﷺ) **شیعری: شەریف وەرزێر**، ل١٤، ل١٢.

٣. السيَرة النَبَوِيَّة، د.على محمد محمد الصّلابي، ج١ ص٤٩٣، ص ٤٤٧، ص ٤٨٨، ص٣٥٢.

٤. ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)، محمد مەلا فایەق. **ب١ ل٢٨٧، ل١٢٢**.

٥. مردن و ژیانی ناوگۆڕ، محمد مەلافایەق، **ل٤٧.**
٦. تَأَمُّلاتٌ  فِي الأِسْلام، د.محمد راتب النابْلُسي، ص**٢٨٤.**
٧. بەهاری دڵان، ئەندازیار عثمان، ل٢٤٣.

# ووتاری دووەم

# بۆ مانگی موحەڕڕەم هیجرەت چیمان فێردەکات؟!

## بەشی دووەم

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّــلامُ عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّــدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانـــداران: لەووتـــاری ڕابـــردودا هەنـــدێ لەبـــارەی کۆچکردن و هیجرەتـــی پێغەمبـــەر (ﷺ) لەمەککـــەوە بۆ مەدینە قســـەمان کرد. ئەمـــڕۆش بەپشـــتیوانی خوای گەورە درێژە بەوبـــاس و بابەتە گرنگە دەدەیـــن و دەڵێیـــن: هیجرەت ڕاکردن نەبوو لەترســـی زوڵم و ســـتەم بەتەنهاو تەنها خۆڕزگارکردنی گیان و لاشـــە نەبـــوو، بەڵکو هیجرەت گۆڕانکارییەکی گەورەبوو لەئیســـلامدا لەســـەردەمی مەککەدا بناغەی بیروبـــاوەڕو عەقیدە دامـــەزرا، پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) لەماوەی (١٣) ســـاڵی مەککەدا، کەســـانێکی پێگەیاند کەبتوانن ئەوەندە ئیمان قایم و خۆڕاگربن و بەناو بۆتەی تاقیکردنەوەدا بڕۆن. کەلەداهاتوودا بەرگەی هەڵگرتنـــی دەوڵەتـــی مەدینەو گەیاندنی پەیامی ئـــەم دینە بەهەموو جیهان بگرن.**

**بەڕێـــزان: ڕەنگـــە زۆرجـــار بیرتان لـــەوە کردبێتەوەو پرســـیارتان لەخۆتان کردبێ کە: باشـــە بۆچی موسوڵمانان لەمەککەدا تووشی ئەو هەموو ئەشـــکەنجەو ئازارە بوون؟! باشـــە بۆچی خوای گەورە هەموو جۆرەکانـــی ئازاردانی هێنایە پێش ئەو صەحابە ئازیزانە، وەکو: لێدان بەقامچی، ســـجن کردن، بەردی گەورە لەسەر ســـك دانان و لەناو لمی ســـورەوە بووی گەرمی عەرەبستاندا ڕاکێشان- وەکو ئوتو لەلەش دانی ئەمڕۆی ناو زیندانەکان، کوشـــتن- وەکو کوشـــتنی یاســـرو سومەییە- گەمارۆ لەســـەر دانان و برســـی کردن، ســـێ ساڵی شـــیوی ئەبو طالب، باشـــە بۆچی خـــوای گەورە چاوی کافرەکانی لەئاســـت کوێرنەکردن؟!، دەستی ڕەق نەکردن، چۆن کەسێك بەپێلاو ئەوەندەی لەدەم و چاوی (ئەبوبەکری صدیق)دا، تا بورایەوەو بێ هۆش بوو!! باشـــە چۆن خوای گـــەورە هـــەر لەوێدا تۆڵەی لـــەو کافرە دڵ ڕەقە دڕندانـــە نەکردەوەو**

لاشـــەی نەکردن بەبەرد؟!! باشـــە بۆچی خوای گەورە هەر لەسەرەتاوە ئەم هیجرەتەی بۆ مەدینە بۆ رێك نەدەخستن تا رزگاریان ببێ؟! باشە بۆچی سەردەمی چەوسانەوەی ناو مەککە (١٣) ساڵەو سەردەمی ئازادی و دەسەڵاتداری مەدینە (١٠) ساڵەو کەمترە؟! ئەمانەو چەندین پرسیاری تر کەبەمێشکی مرۆڤی موسوڵماندا دێن. کاتێ کەباسی هیجرەت دەکرێ.

بۆ وەڵامی ئەو پرســـیارانە (إنْشـــاءالله) دەڵێین: ئەم ئیســـلامە خوای گەورە بۆ مرۆڤی ناردووە، نەك بۆ فریشتە. وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامۆستاو پێشەنگە بۆ مرۆڤایەتی (لَقَدْ كانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسوَةٌ حَسَنَةٌ ...) وە صەحابەکانیش هەریەکەیان، ژیاننامەکەیان پێشەنگیو پێشەوایەتی و چاوساغی بۆ ئێمە تێدایە. جائەگەر ئەوان ژیانیان هەر بەموعجیزەو کەرامـــات. بچوایەتە ســـەر، ئیتر چـــۆن ئێمە چاومان لـــێ بکردنایە؟! وەئایـــا خۆڕاگری و ئازایەتی لەکوێدا دەردەکـــەوت؟! وەچۆن هیممەت بەرزو بەزیوو لەیەکتر جیادەبوونەوە!. ئەم صەحابانە هەڵگرتنی ئەم دینەیان دەکەوێتە سەرشـــان، ئیتر ئەگەر خۆیان ئێسکە نەرمەیان بێ لەلۆکـــەدا بەخێو کرابن و ســـاردو گەرمی ژیانیان نەچەشـــتبێ، چۆن دوایـــی دەتوانـــن بەرگەی غەریبـــی و دووره وولاتی و غـــەزای بەدرو شکستی ئوحودو گەمارۆی خەندەق و سامناکی جەنگی موئتەو فەتحی خەیبەر بگرن؟!

بەڵێ ئیمانداران، هەروەکو چۆن نەخۆشـــی دەبێتە هۆی بەهێزبونی لاشـــەو ئەگەر میکرۆب نەچێتە لاشـــەوە، خڕۆکە سپیەکانی ناو خوێن بەئاگانایەنەوەو هەردەخەون تادەمرن!! دکتۆرو پزیشکەکان دەفەرمون: منـــاڵ ئەگەر نەخۆش نەبێت و جاروبار تایـــەك نەیگرێ، ئەوا مرۆڤ هەرگیز گەورە نەدەبوو. وەقاچی نەدەگرت و ئاوا بەهێز نەدەبوو.

کەواتە: ئەو هەموو ئازارو ئەشـــکەنجەدان و شـــەهید بونەی تووشی

صەحابەکان بوو لەمەککە، هەر خۆشەویستی خوا بوو بۆیان، وەجۆرێکی تر بوو لەپشــتیوانی کردنیان، کەئامادەی کــردن بۆ قۆناغی مەدینەو بڵاوکردنەوەی ئەم دینە، ســەرباز کەمەشــقی پێ دەکــرێ و ئەوەندە نارەحەت دەکرێ، تەنانەت سەربازی وابووە لەمەشقا مردووە! خۆماناى ئەوەنیــە، ئەو مەشــق پێ کردنە بۆ ئەزیەت دانیەتــی. نەخێر بەڵکو ئەوە ئامادەکردنەو ئەو عەزیەت دانە، خۆشەویستی فەرماندەیە بۆی و جۆرێکە لەخۆشەویستی و ڕێزلێنان کەلەدوارۆژدا ئەنجامەکەی دەبینێ.

وەســەردەمی مەککە (١٣) ساڵ بوو، وەســەردەمی مەدینە (١٠) ساڵ بوو. لەبەرئەوەی ســەردەم و قۆناغی مەککە بناغەیەو بەڵگە نەویستە ئەبــێ بناغــە پتەوترو پانتربێ لەدیوارو ســەقف. ئەینا ئەو خانوو و بینایە دەڕوخێ، قۆناغی مەککەش بناغەی ئەم ئیســلامەیەو پێویستە زۆر پــان و مەحکــەم و پتەو بێ، ئەمەش ئــەو وانەیەمان فێردەکات کەهەرکاتێ موســوڵمانان زۆر چەوســێنرانەوە. ئەوە نیشانەی ئەوەیە سەرکەوتنی ئیسلامو بەهێزبوونی نزیك بۆتەوە. إنْشاءَالله.

ئیمانداران: ئەم ئیسلامە دینێك نی یە تەنها بۆ گۆشەگیریو تەریکە دنیایی بێ، بەڵکو ئیسلام سێ قۆناغی هەیە:

١. قۆناغــی بانگەواز: کە تێیدا موســوڵمانان وا پــەروەردە دەکرێن کەهەموو شــتێك بەقوربانی بیروباوەڕەکەیان بکەن، وەبەقاچ لەســەر زەوی بڕۆن، بەڵام بەڕۆح لەبەهەشتدا بن بۆیە دەبینین ئەو قورئانەی کەلە مەککە هاتۆتە خوارەوە، هەمووی باس لەدروســت بوونی مرۆڤو ئاســمانەکان و زەوی و مانــگ و خــۆرو دەریا دەکات. هەمووی باســی مــردنو بەهەشــتو دۆزەخ دەکات. کەبــەم ئایەتانە مرۆڤــی ئیماندار بناغــەی ئیمانەکەی دادەمــەزرێ کەئیمانیش لەدڵدا جێگیر بوو، ئیتر بەجێهێنانــی نوێــژو ڕۆژوو زەکاتو حەجو جیهــادو جێبەجێ کردنی

بڕیارەکانی شەرع بۆی دەبێتە مایەی حەسانەوەی ڕۆح و لاشەی ماندویو لەزەتو چێژ لەعیبادەت دەبینێ. بۆیە صەحابەکان بەڕۆژ ماندوی ناو مەیدانی جیهاد بوون، کەچی نیوەی شەو بەخەبەر بوون بۆ شەونوێژ ئێمە بەلامانەوە سەیرە، کەچی ئەوان بەشەو نوێژو دوعای نیوەشەوانە ئیسراحەتیان دەکردو دەبوو بەپشوو بۆ ئەوان.. کەبەڕاستی هەرکەسێ ئەم قۆناغە بەجوانی نەبڕێ زوو ماندوو دەبێ لەعیبادەت، لەخزمەتی ئیسلام، کە بناغە پتەو نەبوو دیوار بەبچوکترین لەرینەوەو لەرزە درز دەبات و دەجولێ ..

٢. قۆناغی دەوڵەت: بەڵێ ئیسلام کەدین و ژینە بۆ مرۆڤ، دەبێ دەوڵەتی هەبێ، هەتا ئەو هەموو ڕێساو یاسایەی کەتێیدایە لەدەوڵەتێکدا جێبەجێ بکرێ، وەلەچوارچێوەی نوسینەوە ببێتە کردار جا بەئەنجامدانی هیجرەت بانگەوازی ئیسلامی پێی نایە بازنەی دووهەمەوە. کەبریتیە لەدروست بوونی دەوڵەت ... پاشان، پاش تێپەڕبوونی (١٠) ساڵ لەمەدینە، (١٠) ساڵی پڕ لەجیهادو جەنگ و نەسرەوتن، سەرکەوتنی گەورە بەدەست هێنراو شاری مەککە فەتح کراو نیوە دوورگەی عەرەب هاتە ژێر ئالأی ئیسلامەوە .. دوابەدوای ئەوە هەنگاونان بەرەو بازنەو قۆناغی سێ یەم دەستی پێ کرد، واتە بازنەی (شارستانیەتی ئیسلامی) کەزیاتر لە چواردە سەدەیە ڕەوتی مێژووی مرۆڤایەتی گۆڕیوەو سەرزەوی ئاوەدن کردۆتەوەو شوێنکاری بەسەر هەموو ڕووپەڕەیەکی ژیانەوە دیارەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕووناکی ڕاستیەکانی ئاشکراتر دەبێت، بەلأم دەبێت ئەوە زۆرجوان تێبگەین کەدروست کردنی دەوڵەت و کیانێك کەشەریعەتی خوای گەورەی تێدا جێبەجێ بکرێ، هەروا بەقسەو عاطیفە و خۆزگە نابێ. بەڵکو هیجرەت هەموو ئەو وانانەمان فێردەکات کەدەبێ موسوڵمانان بیگرنە

بــەر بۆئــەوەی حوكمی خوا لەســەر زەویدا جێبەجێ بكــەن. ووتاری ڕابردوو باسی یەكەم وانەمان كرد كەلەهیجرەتەوە فێری بووین. ئەویش ئەوەبوو كەدەبێ: دین و ئیمان لای ئیماندار لەهەموو شــتێ بەنرخ تر بێ و لەپێناوی پاراســتن و عیزەتی ئیمانەكەیدا، خۆشەویســت ترین شــتی كە نیشتمانو خاكە، پارەو ســامانە، ماڵ و موڵكو خانوو باخە، مەڕو و ماڵاتە، بەجێ بهێڵێ بەڵام ئیمانەكەی دەرباز بكات. هەروەكو بەسەر (ئەبوسەلەمەو ئوموسولەمەو كچە بچكۆلەكەیان "سەلەمە") دا هات لەكاتی هیجرەتدا.

وانــەی دووەم: كەلە هیجرەتەوە فێری دەبین ئەوەیە، موســوڵمان لەگەڵ ئەوەدا كەپشــتو پەنای تەنها بەخوایە. بەڵام هیچ كارێكی بێ نەخشەو بەرنامە نییە، وە بەو پەڕی ووردبینیەوە هەنگاو هەڵدەگرێ .. بابزانیــن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم ســەفەرەی هیجرەتیدا چەند بەوردیو نهێنی و ئیحتیاطە وە هەنگاوی ناوە:

١. لەنیــوەڕۆدا چوو بۆ ماڵی حەزرەتی أبوبكر تا هەواڵی كۆچكردنی بداتێ. بۆچی لەمكاتەدا؟ چونكە:

أ. لــەم كاتەدا لەبەر بەهێزی گەرمــا كەس لەماڵ نایەتە دەرەوە، تا پێغەمبەر (ﷺ) ببینێ.

ب. پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز لەم كاتەدا نەچۆتە ماڵی أبوبكر، بۆیە كاتــێ بەحەزرەتی أبوبكریــان ووت: ئەوە پێغەمبەری خوایەو بۆ ماڵی ئێمــە هــات. فەرمووی: (فِداءً له أَبي و أُمِّي، واللهِ ماجاءَ بِهِ في هذهِ السّــاعَة إِلا أَمْرٌ).

واتە: باوك و دیكم بەقوربانی بێ. سوێند بەخوا، لەم كاتەدا كەپێشتر هیچ كات لەم وەختەدا نەهاتووە بۆ ماڵمان. كارێكی گرنگو گەورە وای لێكــردووە لەم كاتەدا بێت. پێغەمبــەری خوا (ﷺ) ئیحتیاطی ئەوەی

کرد کەئەگەر کافرەکان چاودێریشــی بکەن، لــەم گەرمای نیوەڕۆیەدا چاودێــری ناکەن، چونکە دەزانن پێشــتر هەرگیز لەم کاتەدا نەچۆتە ماڵی أبوبکر.

٢. پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێشتا هەر ئیحتیاط دەکاتو کاتێ دەچێ بــۆ ماڵی أبوبکر، دەمو چاوی خۆی دادەپۆشــێ، بۆئەوەی ئەگەر هاتوو کەسێکیش بینی نەیناسێتەوە.

٣. کاتێ چووە ماڵــی حەزرەتی أبوبکرەوە فەرموی: (أَخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ) ئەی أبوبکر هەرکەس لەم ماڵەدایە فەرمان بکە بابڕواتە دەرەوە. نەوەك کەسێکی تر لەژوورەکان بێو جێی متمانە نەبێو ئەم پێی نەزانیبێو لەزمان ئەو کەسەوە، دەنگوباسی کۆچو هیجرەتەکەیان بڵاوببێتەوە.

٤. پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ هەواڵی دا بەحەزرەتی أبوبکر کەخۆی ئامادە بکات بۆ کۆچکردن تەنها هەرئەوەی فەرموو کە: (إِنِّی قَدْ أُذِنَ لِي فِي الخُروجِ). ئەی أبوبکر بەڕاســتی من ئیزنی کۆچکردنم پێدراوە لەلایەن خــواوە. ئیتر هیچی تری نــەوت وەکو ئەوەی بفەرموێ چۆن دەڕۆینو دەچینە کوێو چی دەکەین. چونکە ئەمە جارێ پێویست بەباس کردن ناکاتو بائەم نهێنییە نەدرکێ. حەزرەتی أبوبکریش نەیفەرموو کەیو چۆنو بەچ شــێوەیەكو لەکوێوە دەڕۆین بەڵکو ئەوەی کەبەلای ئەوەوە گرنــگ بــوو تەنها ئەوەبوو لەخزمــەت پێغەمبەری خــوادا بێ، بۆیە تەنها ئەوەندەی فەرمــوو: (الصُّحْبَةُ بأَبی أَنتَ یارَسُــول الله؟!) بەباوکمەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، توخوا هاوڕێ ی ســەفەر دەبینو لەخزمەتتا دەبم؟!

پێغەمبــەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ. واتە: حەزرەتی أبوبکر فەرموی: گرنگ ئەوەیە لەخزمەتی تۆدا بم ئەی پێغەمبەری خواو لێت دانەبڕێم، ئیتر ئەوە ئیشــی من نــیە، چۆن دەڕۆیو کەی دەڕۆی. تا پرســیارت

لێبکەم لەبارەیەوە!..

٥. پێغەمبەر (ﷺ) بانگی (ئەسمائی کچی أبوبکر)ی کردو فەرمووی: ئەی ئەسماو دوای دەرچونمان وەرە بۆ لامان بۆ ئەشکەوتی (ثور)و لەوێ هەندێ کارت پێ دەسپێرم ئێستا کاتی نییە پێت بڵێم. کەهاتی بۆ ئەوێ هەمووت تێدەگەیەنم! لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دروست دەبێ، ئەویش ئەوەیە: باشە بۆچی لەناو هەموو صەحابەدا، ئەسمائی هەڵبژارد؟! لەبەرئەوەی:

أ. ئەسماء زۆر نهێنی پارێزەو خۆڕاگرەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) باش دەیناسیو دەزانێ هەرگیز قسە لەدەمی داناکەوێ. چونکە هەشە زۆر موسوڵمانو بەدینە. بەڵام قسەی پێ ناپارێزرێ.

ب. ئەسماء حامیلەیەو سکەکەی (٧) مانگە! کەس لەکافرەکان گومانی ئەوەی لێ ناکات بەم حاڵەتی دووگیانیەوە، لەنزیکی مناڵبووندا، بگاتە ئەشکەوتی (ثور) کەسێ تا چوار سەعات لەمەککەوە دوورەو لەسەر شاخێکی بەرزو عاسێیە!

وەلەم نهێنی سپاردنەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەئەسماء، متمانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەردەخات بەرامبەر بەژن. کەئەو نهێنی یە کەس نایزانێ غەیری ئەسماء..

٦. لەشەوی دەرچونددا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی عەلی تۆ لەجێگاکەی من بخەوەو بەتانیەکە بەسەر سەرتدا بدە. بادەمو چاوت بەدەرەوە نەبێ. ئەمەش بۆ دوو مەبەست:

أ. بۆ ئەوەی ئەو (١٠) گەنجەی بۆ کوشتنی بەردەرگایان لێ گرتووە، هەرچەندە پێغەمبەر (ﷺ) مشتێ خۆڵی هەڵگرت و سورەتی (یس)ی بەسەردا خوێند تاگەیشتە ئایەتی:

﴿ وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا

يُبْصِرُونَ ﴾ يس: ٨ – ٩.

ئەمجا خۆڵەكەی بەچاودا كردنو بەناویاندا هاتە دەرەوەو. یەك كەسیان چاوی نەیبینی. بەڵام فەرمووی ئەی عەلی دەبێ تۆ هەر لەجێگاكەمدا بخەوی. چونكە ئەمانە هەتا ڕۆژهەڵات هەرچاوەڕێ دەبن من بێمە دەرەوە. چونكە وادەزانن ئەوەی لەجێگاكەدا خەوتوە منم، خۆ ئەگەر عەلی لەوێ نەبوایەو لەناو جێگاكەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خۆی دانەپۆشیایەو كافرەكان هەركەدنیا تۆزێ ڕووناك بۆوە، جێگەكەیان بەچۆڵی دەبینی و ئیتر ئەوسا دەیانزانی دەرچووەو هەر بەو بەیانییە زووە ناو مەككەیان پڕ دەكردو پێغەمبەری خواو حەزرەتی أبوبكر فریا نەدەكەوتن لەمەككە دەرچنو بگەنە ئەشكەوتەكە كەكافرەكان دەگەیشتنە سەریان. بەڵام بەم پلانە، هەتا ڕۆژهەڵاتێكی درەنگ نەیانزانی كە پێغەمبەر (ﷺ) دەرچووەو ئەو كاتەش پێغەمبەری خواو حەزرەتی أبوبكر نزیكی ئەشكەوتەكە بوونەوە!

ب. بۆ ئەوەی حەزرەتی عەلی لەدوای دەرچوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمانەتەكان تەسلیم بەخاوەنەكانیان بكاتەوە كەكافرن و كەچی لەكەس ئەمین نین، كەواتە دروست نی یە خیانەت لەئامانەتی كافری دوژمنیشت بكەی!!

٧. هیچ كەس لەو صەحابانەی كەلەمەككەدا مابوونەوە ئەوانەش كە دەرچووبوون بەرەو مەدینە بەم كۆچكردنەی پێغەمبەریان (ﷺ) نەزانی جگە لەحەزرەتی أبوبكر، عەلی، ئەسماو. چونكە پێویست نییە كەسی تر پێ بزانێ، وەكاری نهێنی و مەترسیدار تاكەمترین كەس پێ ی بزانێ، ترسی ئاشكرابوونی كەمترە!..

٨. لەكاتی دەرچوندا كەبەرەبەیان بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ أبوبكری هاوڕێیدا لەكونێكی بچكۆلەی پشتی خانووەكەوە چونە

دەرەوەو لەبەشـی پێشـەوەی خانوەکە کەدەرگای لـێ بوو. هەربەوێدا هاتووچــۆ دەکرا. دەرنەچونـــە دەرەوە. ئەمەش وەکو خۆپارێزیەکی تر لەوەی کەنەوەکا کافرەکان لەبەر دەرگاوە چاودێری ماڵی أبوبکر بکەن.

٩. بەڕێگایەکـی باریکدا چوونە ئەشـکەوتی (ثـور) کەبەپێچەوانەی ئاراســتەی مەدینەیەو نزیکی (٣-٤) سـەعات لەمەککەوە دوورەو زۆر دەگمـــەن گومانی قوڕەیش بــۆ ئەوە دەچێت کەچوبنە ئەشــکەوتێکی ئاواوەو بەرەو مەدینە نەڕۆشتبن.

١٠. کەگەیشـــتنە ئەشکەوتەکە حەزرەتی أبوبکر فەرموی: من دەچمە ئەشــکەوتەکەوەو خاوێنــی دەکەمـــەوە، نەوەکو مارێك. دووپشــکێکی تێدابێت و ئازارمان بدات. پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرمو. نا پێویست نــاکات. (تَوَكَّلْ عَلى الله) بابرۆینە ژوورەوە. بەڵکو فەرموی: باشــە پێش چوونە ژوورەوە بادڵنیابین کەهیچی زیاننەمەندی تێدا نی یە.

١١. ئەسماء خۆی گەیاندە ئەشکەوتەکەو خواردنی بۆ بردن و لەوێدا کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵی کرا، پێغەمبەری خوا (ﷺ)،حەزرەتی أبوبکر، ئەسماء، دوای ڕاگۆڕینەوە، ئەم بڕیارانە دەرکران‌و بەئەسماء سپێردران کەجێبەجێیان بکات‌و چاودێرییان بکات.

کەواتە: ئەســماء بوو بەلێپرسراوی ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار، ئایا کام حیزبی مۆدێرن‌و سەردەمی بەناو داکۆکی کردن لەمافی ژنان، ئاوا پلەی گرنگی چارەنوس ســازی بەژن بەخشــیوە؟! کارەکانیش بەم شێوەیە بوون:

أ. عبداللــە ی کــوڕی أبوبکری صدیق، ڕابســپێردرێ وەکو گەنجێکی چــالاك دەوری هەواڵگری ببینـــێ و چاودێری جموجۆڵی دوژمن بکات. بۆچی عبدالله بۆ ئەم کارە دیاری کرا؟! چونکە عبدالله گەنجێکی تازە پێگەیشـــتوی زیرەکی ووریاو بەئاگابوو. بەوردی گوێی لەشت دەگرتو

جــوان حالــی دەبوو، عبدالله ڕۆژانە دەچووە نــاو خەڵكو وورد گوێی هەڵدەخستو هەركەدنیا تاریك دەبوو. هەواڵی ئەو ڕۆژەی بۆ دەبردنو بەیانی پێش ڕووناكبوونەوەی شــەو، خۆی دەكردەوە بەمەككەداو هیچ كەس هەستی پێ نەدەكرد كەشەو لەماڵ نەبووە. واتە: عبداللەی كوڕی أبوبكر، هەموو شــەوێك (٧-٨) سەعات بەپێ ڕۆیشتووە بۆ ئەشكەوتی (ثور) هاتوۆتەوە بۆ مەككە هەر لەوشەوەدا! جا بۆئەوەی جێ پێیەكانی عبدالله ڕەش ببنەوەو شوێنەواری جێ پێیەكانی دیار نەمێنێ كەبەناو پۆشدا ڕۆیشتووە، بڕیارێكی تر دەركرا كە:

ب. عامری كوڕی فەهیرە، شــوانێكی ماڵی أبوبكری صدیق بوو. ئەم كارانەی پێ سپێردرابوو:

١. ڕانەمەڕەكەی بەرێتە دەوروبەری ئەشــكەوتەكە بۆ ئەوەی شــیرو گۆشت بۆ پێغەمبەری خواو حەزرەتی أبوبكر بەرێ بۆناو ئەشكەوتەكە.

٢. جــێ پێیەكانــی عبداللــە كوڕی أبوبكــر ڕەش بكاتــەوە، بەوەی كەمەڕەكــەی بــەو ڕێگایــەدا دەبردو شــوێن پێیەكانی لەپوشــەكەدا نەدەهێشتو دوژمن لەكاتی گەڕانو پشكنیندا نەیدەتوانی ئەوە ئاشكرا بكات كەكەسێك بەم ڕێگایەدا ڕۆیشتوەو بەرەو ئەشكەوتەكە چووە.

بەڵێ ئەم شوانە هەڵدەســتا بەدەورێكی زۆر كاریگەر، كەبریتی بوو لە (یارمەتیدانو خۆراك دابین كردن و سەر لەدوژمن تێكدان (إلا مداد، التَّموين، التَّعْمِيَة).

كەواتە: لەئیسلامدا هیچ كەس نیە كارێكی گەورەی پێ نەكرێو ئەو شوانە ئەوكارە گەورەیەی دەكرد كەبەكەسی تر نەدەكرا.

جــ. هــەر لەكۆبوونەوەی نــاو ئەشــكەوتەكەدا بڕیاری ئــەوە درا. كەپێویســتە كەسێكی شیاوو شارەزا بدۆزێتەوە كەڕێگای بیابانو كەنار دەریاو ڕێگا نهێنییەكان شــارەزا بێ، كەبەسەلامەتی پێغەمبەری خواو

**حەزرەتی أبوبکر بگەیەنێتە مەدینە. ووتیان: کەس نیە تەنها پیاوێکی موشـــریك نەبێ کەناوی (عبداللەی کـــوڕی ئورەیقیطە). بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کەموسوڵمان نییە. کەسێکی ئەمینو زمان سەلامەتە وە ناسراوە بە** (بـيرُ الصّحْـراء). **پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: متمانـــەی پێ دەکەینو ئەسماء تۆ بڕۆ بۆلایو قسەی لەگەڵ بکەو دوو حوشترەکەش کە أبوبکر دەمێکە ئامادەی کردون بۆ ئەم ســـەفەری کۆچکردنە، دوای سێ ڕۆژی تر بیدە دەســـتیو پێی بڵێ بابیهێنێ بۆ ئەشـــکەوتەکە، کەواتە: لێرەدا ئەو وانەیە فێربوین کەلەئیســـلامدا متمانە بەکافری ئەمین دەکرێ و یارمەتی لێ وەردەگیرێ، بەمەرجێ ئەمین و شـــارەزا بێ، کەواتە: نابێ بەبـــێ دەلیلی ڕێگا، بەکوێرانەو نەشـــارەزاییانە بەڕێگادا بڕۆی . بەڵێ ئەسماء زۆر بەجوانی کارەکانی ئەنجامداو زۆر سەرکەوتو بوو.**

**ئیمانـــداران: بـــەم شـــێوەیە پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) کۆچـــی کرد لەمەککـــەوە بـــۆ مەدینـــەو بناغەی دەوڵەتـــی مەدینـــەی دامەزراندو بەهیجـــرەت موســـوڵمانان لەقۆناغێکـــەوە چوونە قۆناغێکـــی ترەوەو لەبەرگرنگـــی هیجرەت بوو، حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب. ڕووداوی هیجرەتی هەڵبژارد بەســـەرەتای ساڵی کۆچیو صەحابەکانیش هەموو هـــاوڕای بوون. داواکارین لەخـــوای پەروەردگار ئیمانمـــان زیاد بکاتو سەرفرازی دنیاو قیامەتمان بکاتو عاقیبەتمان بەخێر بگێڕێ.**

(رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنيا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَة حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّار) أللّهُمَّ آمين ...

**سەرچاوەکان:**


١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمين.

٢. السيرة النَبَويّة، د. علي محمد محمد الصّلابي، ج١ ص٤٦٢، ص٤٧٩، ٤٨١.

# ووتاری سێیەم
# بۆ مانگی موحەڕڕەم
# ژیانی دونیا بەم شێوەیە خۆشە

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ:

**ئیمانداران: ژیان لەسەر زەوی هەدیەی خوایە بۆ مرۆڤ، چونكە خوای گەورە پێش ئەوەی مرۆڤ لەسەر زەویدا نیشتەجێ بكات. چی پێویستی ژیانی مرۆڤەو دەبێتە هۆی ئاسودەبوونی ژیانی بۆی دروستكردووە لەسەر زەوی و لەناخی زەوی داو لەبەرگەهەوای سەرزەویداو بگرە هەرچی كۆمەڵەی خۆرە لەخزمەتی ژیانی ئەم مرۆڤەدایەو خوای گەورە ئەوەندە خێروبێری لەم سەرزەویو ناوزەویو ئاسمانەدا بڵاوكردۆتەوە. كەلەیەكەم مرۆڤەوە تادوا مرۆڤی سەرزەوی لێی بخوات. هەرگیز كۆتایی نایەت، بەڵكو بەپێچەوانەوە ساڵ لەدوای ساڵ. سەدە لەدوای سەدە. ژیان لەسەر زەوی خۆشتر دەبێو بەهۆی پێشكەوتنی زانستەوەو دروست بوونی ئامێری پێشكەوتووەوە ئەمجا خێروبێری سەرزەوی و ناوزەوی زیاتر دێتە بەرهەم و مرۆڤ لەڕووی گوزەرانو ماددەوە ژیانی خۆشتر دەبێت. كەواتە خوای گەورە كە مرۆڤی لەسەر زەوی نیشتەجێ كردوەو ئاوەدان كردنەوەی سەر زەوی پێ سپاردوەو كردویەتی بەگەورەو سەرداری بونەوەرو ئەوەی دیارەو نادیارە لەخزمەت مرۆڤدایە. بۆ ئەوەیە كەمرۆڤ ژیانێكی بەمانای ژیان بباتە سەرو لەم بەهشتۆلكەی دونیایەوە بەرەو بەهەشتی هەتاهەتایی بەڕێ بكەوێت. نەك خوانەخواستە خوای گەورە ڕقی لەمرۆڤ بێو بۆیە هێنابێتیە سەرزەوی بۆ ئەوەی تووشی ئەشكەنجەو ئازار ببێو لەحیاتی (ژیان) (ژان) بەشی بێو مەینەتی چارەنوسی بێ!**

**بەڵێ، ژیانی دونیا مەیدانی تاقیكردنەوەیە، ئێمە بۆیە لەو سەرزەویە دەژین تاوەكو وانەی ژیان بخوێنینو نمرەی چاكەكردن بەدەست بهێنینو لەسەركارتی كۆتایی دەورەكەمان نوسرابێ** (أُدْخُلوها بِسَلام، ذالكَ يَوْمُ الخُلُود) **بڕۆنە بەهەشتەوە. بەئاشتی و ئارامی و نەمری و ژیانی**

هەتاهەتایی.

کەواتە: کاتێ ژیانی ئەم سەرزەویە خوێندنگایە، (لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً) ئایا کەس هەیە بڵێ و بەبیریا بێ کەقوتابخانەو زانکۆو پەیمانگا بۆ عەزیەت دانو ئازاردانی خوێندکاران دروست کراوە؟! بێگومان نەخێر.

بەڵام، لەدرێژایی ژیانی مرۆڤدا لەسەرزەوی، هەندێ فەترەو سەردەم بەسەر مرۆڤدا هاتووە، کەوایانزانیوە کارکردن بۆ قیامەت و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خواو بەهەشتی بەرین بەوە دەبێ کەمرۆڤ بەتەواوەتی دەست لەدونیا بەرداو دوورە پەرێز لەخەڵکی بژیو کەس نەیبینێو پیس خۆرو چڵکنو کوڵکنو شڕۆڵو کزۆڵ بێ. لەڕوانگەی ئەو کەسانەوە، مرۆڤی دیندار یەعنی ئەو کەسەی کەهیچ شتێ دەربارەی دونیاو بارودۆخی سیاسیو ئابووری و کۆمەڵایەتی نازانێو ئیشی تەنها ئەوەیە لەماڵەوە دەچێتە مزگەوتو لەمزگەوتەوە دەچێتە ماڵەوەو خەڵك خێرو خێراتی دەدەنێو چاوەڕێ ی دەستی خەڵکە شتێکی بدەنێ بیخوات! بەداخەوە ئەم تێگەیشتنە نادروست و سەقەتە بووە هۆی دواکەوتویی موسوڵمانانو تێکشکانیان لەمەیدانەکانی ژیانداو پەراوێز خستنیان لەدونیای سەردەمداو لەجیاتی ببنە ئیمام بوونە مەئموم!!..

بەڵام بەلای موسوڵمانی ووشیارەوە، دونیا بۆ خۆشی ئێمە دروست کراوە،

﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً ﴾ البقرة: ٢٢

ئیتر بۆچی دەبێ هەدیەی خوا وەرنەگیرێ و ڕەت بکرێتەوە؟! بۆچی ئەم دونیایە بەهەموو خۆشیەکانیەوە بەکارنەهێنین و سوپاسی خوای پەروەردگاری لەسەر نەکەین؟!...

لەئایینی ئیسلامدا. کەئاینو بەرنامەیەکی وایە، کالآیەکەو پڕ

**بەباڵای مرۆڤە. موسوڵمان لەژیان ومڕسو بێتاقەت نییەو بێ ئومێدو ڕەش بین نییە. چونکە پێغەمبەرە پێشەواکەی (ﷺ) وای فێرکردوە کە:** (إذا قامَتِ السّاعَةُ وَفي يَدِ أَحَدِكُمْ فَسلَةً فَإِنِ اسْتَطاعَ أَنْ لاتَقُومَ حَتى يَغْرِسَها، فَلْيَغْرِسْها). حَديْثٌ صَحيح، رَواهُ أحمد وَمُسْلِم - صَحيح الجامِع: (١٤٢٤).

**واتە: ئەگەر قیامەت داهات و گوێتان لەنەفخی صور بوو. کە ئیسرافیل فوی پێدا کردو زەوی لەرزەیەکی وای کرد کە خانوەکان لەڕەگ دەرکێشران. ئالەوکاتەدا کەکۆتا ساتی ژیانە لەسەرزەوی. لەوکاتەدا موسوڵمانێك نەمامێکی بەدەستەوە بوو چاڵێکی بۆ هەڵکەندبوو. خەریکی ناشتنی بوو. بانەمامەکەی بنێژێو نەڵێ تازە خۆ دنیا وێران بوو. ئیتر نەمامی چی بنێژم!.. نەخێر موسوڵمان دەبێ ئەوەندە بەگەشبینیەوە بڕوانێ بۆ ژیان و بوون، کەوێران بوونی دونیاش نائومێدی نەکات.**

**زاناو نوسەرو بانگخوازی بەناوبانگ (شێخ محمد الغزالی) دەفەرموێ:** (إنَّ الحَياةَ وَالعِلْمَ وَالنُّورَ وَالمَتاعَ، مُتَلازِماتٌ في الحَضارَة النّاضِجَة، وَقَدْ أَشارت إِلَيْها القُرْآن في قَوْلِهِ:

﴿ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۝ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ۝ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ۝ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ﴾ فاطر: ١٩ - ٢٢.

**واتە: بەڕاستی ژیانو زانستو ڕووناکیو خۆشگوزەرانی، تەواوکەری یەکترین لەشارستانیەتی پێگەیشتودا. ئەمەش قورئان ئامازەی پێکردووە. کاتێ دەفەرموێ: (کوێرو چاوساغ وەکو یەك نین. تاریکیەکانو ڕووناکیش چونیەك نین، سێبەرو خۆرەتاویش وەك یەك نین، زیندوانو مردوانیش هاوتای یەك نین).**

**بەڵام بەڕێزان: ئەمڕۆ بەرەکەت لەتەمەن و ژیاندا نەماوە، کەس دڵخۆش نی یە. شاعیر جوانی فەرمووەو باشی پێکاوە کەدەڵێ:** (كُلُّ مَنْ في الكَوْنِ يَشْكُوا دَهْرَه ............ لَيْتَ شِعْري هذهِ الدُّنيا لِمَنْ)

واته: هەرچی لەم کەونەدایە، شکاتی هەیەو ناڕازی یە لەدەست ژیانو ڕۆژگاری. کەس بە ژیانی خۆی ڕازی نی یە. خۆزگایە دەمزانی ئەم دنیایە بۆکێ یەو کێی تێدا ئیسراحەتە.

بەڵێ، ئەمڕۆ لەگەڵ هەرکەس دادەنیشی دەبینی ناڕەزایی دەردەبڕێ لەژیان، هەمووی بێزارە، هەمووی غەمبارە. هەر بەدەوڵەمەندەوە. بەهەژارەوە. بەکاربەدەستەوە. بەزاڵمەوە. بەمەزلومەوە. بەساغەوە. بەنەخۆشەوە. ئەی باشە کێ دڵخۆشە؟! ئەی باشە هۆی چی یە کەخەڵکی دڵتەنگە؟! باشە هۆی چی یە ژیان بووە بەژان؟!

پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) وەڵامی ئەم پرسیارەو ئەم گرێی سەردڵە دەداتەوەو بۆمان ڕوون دەکاتەوە کەی دونیا خۆش دەبێ و ژیان شیرین و بەتام دەبێ. وەژیان لەسەر زەوی بەمانای کەلیمە ژیانەو، چ کاتێکیش ژیان لەسەر زەوی دەبێ بەژانو تامی ژیانی تێدا نامێنێ. بەچەند ووشەیەکی کەم. بەڵام زۆر پڕماناو دەرسو بنەما. ئەم گرێ کوێرەیەمان بۆ دەکاتەوەو دەفەرموێ: (إذا كانَتْ أُمَرَءكُمْ خيارَكُمْ، وَأَغْنِياؤُكُمْ سُمَحائَكُمْ، وَأَمْرُكُمْ شُورى بَيْنَكُمْ، فَظَهْرُ الأَرْضِ خَيْرٌ مِنْ بَطْنِها، وَإذا كانَتْ أُمَراؤُكُمْ شِرارَكُمْ، وَأَغْنِياؤُكَمْ * بُخَلائَكُمْ، وَأَمْرُكُمْ * إِلى نِسائِكُمْ فَبَطْنُ الأَرْضِ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ ظَهْرِها) رَواهُ التِرمِذي ..

دەی فەموون بایەك بەیەك بچینە خزمەت ئەو خاڵانەی کەپێغەمبەر (ﷺ) دیاری کردن:

خاڵی یەکەم: کەدەبێتە هۆی خۆش بووی ژیان لەسەر زەوی‌و مرۆڤی ئیماندار هەتا زیاتر بژی خێرو بەرەکەت زیاتر ڕووی تێدەکاتو ژیانی باشترە لەمردنی.

بریتییە لە (کاربەدەستی چاك). فەرموی: هەرکاتێ کاربەدەستو فەرمانڕەواکانتان لەباشترینتان بوون. چونکە لەئیسلامدا موسوڵمانان

**نابێ بێ سەرکردە بن، لەفەرموودەدا هاتووە: ئەگەر سێ کەس بەیەکەوە بن لەسەفەرێکدا، دەبێ یەکێکیان لەناوخۆیاندا هەڵبژێرن کەقسە بەدەستو لێپرسراویان بێو مشور خۆریان بێ! ئەمە ئەگەر بۆ سێ کەس لەسەفەرێکی کورتی چەند ڕۆژیدا، بوونی لێپرسراو ئاوا گرنگ بێ. ئەی ئەگەر گەل و میللەتێك هەبێ، چۆن دەبێ بێ فەرمانڕەواو سەرکردە بێ؟! هەربۆیە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) موسوڵمانان یەك ڕۆژ بێ سەرکردە نەبوون فەرموون بابچینەوە بۆ ئەو سەردەمەو سەرێك لەشاری پڕنورو بەرەکەتی مەدینەی مونەوەرە بدەین، دوای تێپەڕبوونی (٦٣) ساڵ لەتەمەنی پیرۆزی فەخری عالەم، سەرداری پێغەمبەران، نوری چاومان. حەزرەتی محمد (ﷺ)، دوای (٢٣)ساڵ پێغەمبەرایەتی. شەوێکیان لەنیوەشەودا لەگەڵ صەحابەی بەڕێز (ئەبومویهیبە) چوو بۆ گۆڕستانی (بەقیع)، سەلامی لەمردوانی ناو گۆڕستانەکە کردو دوعای بۆ کردن و پاشان کەگەڕایەوە بەرەو ماڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ئەی ئەبومویهیبە،** (إنِّي قَدْ أُعْطيتُ مَفاتيحَ خَزائِنِ الدُّنيا وَالخُلْدَ فيها، فَخيرتُ بَيْنَ ذالكَ وَبَيْنَ لِقاءَ رَبِّي وَالجَنَّةَ).

**واتە: بەڕاستی لەلایەن خوای گەورەوە کلیلی خەزێنەکانی دونیام درایە دەستو پێم وترا کە بەنەمریش لەدونیا دەمێنمەوە هەتا قیامەت. جا ئەمەم خرایە بەرچاوو سەرپشك کرام لەهەڵبژاردنی ئەمە لەگەڵ گەیشتنەوەم بەلیقای خواو بەجێهێشتنی دونیاو بەهەشتی بەرین.. کامیان هەڵبژێرم ئارەزوی خۆم بێو خوای گەورە بێ دڵیم ناکات.**

**ئەبو موهیبە دەفەرموێ: ووتم بەخۆمو دایکمو باوکمەوە فیدات بین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ):** (خُذْ مَفاتيحَ خَزائِنِ الدُّنيا وَتَخَلَّدْ فيها، ثَمَّ الجَنَّة).

**ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). کلیلی خەزێنەکانی دونیا بگرەو**

بەنەمری لەژیاندا بمێنەوەو پاشانیش بچۆرە بەهەشتەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (لا وَاللهِ ياأَبا مُوَيهيبه، قَدْ إِخْتَرْتُ لِقاءَ رَبِّي وَ الجَنَّة).

فەرموی: نا ئەی ئەبومویهیبە، سوێند بەخوا گەیشتن بەلیقای خواو بەهەشتم هەڵبژارد .. پاشان کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ژانە سەرێکی توندی گرت، فەرموی: تام لێهاتووەو لەحەوت بیری جیاجیا ئاوم بۆ بێننو لەتەشتێکدا دامبنێن و ئاوەکەم بەسەردا بکەن. پاشان هەربەو نەخۆشیە وەفاتی کردو لەژوورەکەی خاتوو عائیشەدا دانراو پەردەیەکی بەسەردا درا، بەڵێ ئائەمە دونیایە. شاعیر دەڵێ: (لَوْكانَتِ الدُّنيا تَدُومُ لِواحِدٍ ............ لَكانَ رَسُول اللهِ فيها مُخَلَّداً)

حەزرەتی أبوبکر کەلەو کاتەدا لەوێ نەبوو، هاتە سەر لاشەی پیرۆزی پێغەمبەری خواو (ﷺ) فەرمووی: (وانَبيّاه) ئای پێغەمبەرم ڕۆ ... (واصَفِيّا) ئازیزی هەڵبژێردراوم ڕۆ... (واخَليلاه) دۆستو خۆشەویستی ڕاستەقینەم ڕۆ...، پاشان پەردەکەی لاداو نێوچەوانی ماچ کردو فەرمووی: (طِبْتَ حَيّاً وَمَيِّتاً يارَسُولَ اللهِ). ئای بۆنت چەند خۆشە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ بەزیندویی چ بەمردویی.

صەحابە هەموو شڵەژان، چەندین کەس بورانەوە. شاری مەدینە تەنها دەنگی گریانی لێ دەبیسترا، چ ڕۆژێکی ڕەش بوو لەبەرچاوی موسوڵمانان، ئەو صەحابە ماندوو هەژارو بێ ئەنوایانە، کەئێواران لەمزگەوتا بەخزمەت پێغەمبەری خوا دەگەیشتن تەنها بەتەماشاکردنی نوری ڕوخساری هەموو ماندوبونێکیان لەیاد دەکرد..

بەڵام: لەم کاتەدا لەم دۆخە خەمناکەدا. لەو دڵ بریندارییەدا، بیریان لەوەکردەوە کەنابێ بێ سەرکردە بن. وولات نابێ بێ سەرپەرشتو بێ ئیدارە بێ، هێشتا لاشەی پیرۆزی حەزرەت نەشاردرابۆوە کەئەنصارەکانی مەدینەیی (سەعدی کوڕی عوبادە) یان کاندیدکرد

بۆ جێنشینی پێغەمبەری خوا(ﷺ) موهاجیرینی مەککەش (أبوبکرو عومەرو ئەبوعوبەیدەیان) کاندیدکرد، سەرئەنجام دانیشتنێك ئەنجام دراو گفتوگۆیەکی گەرم دەستیپێکردو هەردوولا داکۆکیان لەوە دەکرد کەجێنشین لەوان بێت .. کەواتە: شتێکی ڕەوایە ململانێو مونافەسە هەبێ لەسەر ئەوەی کێ زیاتر لەخۆی ڕادەبینێ کەخزمەت بکات، هەوڵ بدات ئەو جڵەوی فەرمانڕەوایی وولات بگرێتە دەست. واتە صەحابەکان دانەنیشتن تەعزیەو پرسە دابنێن و دەستەو ئەژنۆ دابنیشن، لەگەڵ ئەو هەموو دڵ بەخەمیەدا کەوتنە گفتوگۆ بۆ دانانی خەلیفە. ئەنصارەکانی مەدینەیی فەرمویان: (نَحْنُ أَنْصارُ اللهِ وَكتيبة الإسلام).

واتە: ئێمە شایستەترین بۆ جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چونکە ئێمە پشتیوانانی دینی خوا بووینو کەتیبەکانی ئیسلام بووینو دائیمەن گیان لەسەر دەست بووین.

حەزرەتی أبوبکر فەرمووی: ئێمە دەزانین کەئێوەی ئەنصار ئەوەندە گەورەنو ئەوەندە خۆشەویستی پێغەمبەر بوونو ئەوەندە فیداکار بوون بۆ ئیسلام. من شایەتم کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمەحدی ئێوەدا، فەرمووی: (لَوْ سَلَكَ النّاسُ وادِياً وَسَلَكَتِ الأَنْصارُ وادِياً، لَسَلَكْتُ واديَ الأَنْصارِ).

واتە: ئەگەر خەڵکی هەمووی بەشیوو دۆڵێکدا بڕۆنو مەدینەییەکان بەشیوو دۆڵێکدا بڕۆن. من بەو شیوەدا دەڕۆم کەمەدینەییەکان (ئەنصارەکان)ی پێدا دەڕۆن، کەواتە: حەزرەتی أبوبکر پێش ئەوەی باسی خۆیان وەکو موهاجرین بکات. باسی بەڕێزی و ڕۆڵی ئەنصارەکانی کردو ڕێزو حورمەتی بەرامبەرەکەی گرت.

پاشان حەزرەتی أبوبکر فەرمووی: بەڵام خوای گەورە ئێمەی موهاجیری بە (الصّادِقون) ناوبردووە، لەئایەتی: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ

وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾ الحشر: ٨.

**دەی هەرلەقورئانیشدا، خوای گەورە فەرموویەتی لەگەڵ** (الصّادِقينَ) **بن. وەکو دەفەرموێ:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ التوبه: ١١٩.

**کەواتە: وای بەپێویست دەزانین کەئێوەی** (ئەنصار) **لەگەڵ ئێمەی** (مُهاجرين) **بن. پاشان ئەوەبوو بەڕاوێژی هەردوولا، حەزرەتی أبوبکری صدیق بەخەلیفە هەڵبژێردرا. ئەوەبو حەزرەتی أبوبکر، یەکەم ووتاری پێشکەش کردو فەرموی: لەدوای سوپاس و ستایش بۆخواو درود بۆ ڕۆحی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ):** (أَمّا بَعْدُ أَيُّها النَاسُ، فَأَنِّي قَدْ وَلَّيْتُ عَلَيْكُمْ وَلَسْتُ بِخَيْرِكُمْ، إِنْ أَحْسَنْتُ فَأَعينُوني، وَإِنْ أَسَأْتُ فَقَوِّمُوني، الصِّدْقُ أَمانةٌ، وَالكَذِبُ خِيانَةٌ، الضَّعيفُ فيكُمْ قَوِيٌّ عِندي حَتَّى أُريحَ عَلَيْهِ حَقَّهُ إِنْشاءَاللهُ. والقَوِيُّ فيكُمْ ضَعيفٌ عِندي حَتَّى آخُذَ الحَقَّ مِنْهُ إِنْشاءَاللهُ. أَطيعُوني ماأَطَعْتُ اللهَ وَرَسُولَهُ، فَأَنْ عَصَيْتُ اللهَ وَرَسُولَهُ، فَلا طاعَةَ لِي عَلَيْكُمْ).

**واتە: ئەی خەڵکینە، من بووم بەلێپرسراوی ئێوە، لەکاتێکا لەئێوە چاکترنیم، جائەگەر چاکەم کرد یارمەتیم بدەن و پشتم بگرن لەسەر چاکە، ئەگەر خراپەم کرد ڕاستم بکەنەوە، مەهێڵن لەسەر ئەو لارو لەوێرییە بەردەوام بم، ڕاستگۆیی ئەمانەتەو درۆ خیانەتە، کەسی بێهێزو بێ کەسیی ناوتان، لەلای من بەهێزو دەسەڵاتدارە هەتا ئەو کاتەی بەپشتیوانی و ویستی خوا حەقەکەی کەلێی زەوت کراوە بۆی وەردەگرمەوە، وەبەهێزو کەس دارو خاوەن پلەتان لەلای من زەعیف و بێ دەسەڵاتە هەتا ئەو کاتەی ئەو مافو حەقەی خەڵکی کەلەسەریەتی لێی وەردەگرمەوە بەپشتیوانی خوای گەورە، فەرموی** (إِنْشاءَالله) **بەویست و پشتیوانی خوا نەك ئازایەتیو لێهاتویی و جەربەزەیی خۆم، دەبێ سەرکردە ئاوا هەموو شتەکان بخاتە پاڵ دەسەڵاتی خوا. ئەمجا بەهێز**

دەبێ و دادگەر دەبێ و دوور دەبێ لەدیکتاتۆریەتو خۆسەپێنی{}...

وەفەرمووی: هەتا ئەو کاتەی من گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا دەکەم. ئێوەش گوێڕایەڵیم بکەن، خۆئەگەر من سەرپێچی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوام کرد (کەیاسی وولاتە) ئەوە ئیتر گوێڕایەڵیتان بۆم پێویست نەماوەو نابێ گوێڕایەڵیم بکەن.

((واتە نابێ پەیوەندی نێوان سەرکردەو میللەت لەسەر بەڵێ قوربانی کوێرانەو کەڕانەبێ، بەڵکو دەبێ گوێڕایەڵی سەرکردەی موسوڵمانان تائەوکاتە بێ. کەئەو پابەندی شەریعەتی ئیسلامیە)).

ئەمجا صەحابەکان بەیەکەوە چوون پێغەمبەری خوایان (ﷺ) ناشت.

کەواتە: لەئیسلامدا نابێ وولات بێ ئیدارەو سەرکردە بێ، چونکە دوژمنو ناحەز لەبێ ئیدارەییدا زەفەر دێنێ.. بەڵێ سەرکردەو کاربەدەست، یان چاکترینی میللەتە، دڵسۆزترینیانە، دادگەرترینیانە، بەرچاو ڕوون ترینیانە، وەبەدەنگی میللەت هاتۆتە سەر حوکم، یان دیکتاتۆرو بێ دینو ستەمکارە.

حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب، کاتێ بوو بەخەلیفە پرس و ڕاوێژی دەکرد بەهەموو کەس، بۆ ئەوەی بزانێ ئایا کاربەدەستێکی دادگەرە، یان زاڵمە. تاوەکو پرسی بە (سەلمانی فارسی) کرد: فەرمووی: ئەی سەلمان ئایا من پاشام یان خەلیفە؟!

سەلمان فەرمووی: تۆخەلیفەی نەك پاشا. چونکە:

١. بەدادپەروەری لەنێوان موسوڵماناندا دەجوڵێیتەوە.

٢. ماڵو سامان بەیەکسانی لەنێوانیاندا دابەش دەکەیت.

٣. وەکو کەسێکی بەبەزەیی کەزۆر بەڕەحمە بەرامبەر ئەولادو ماڵو منداڵی خۆی، ئاوەها بەزەییت پیایاندا دێتەوەو ڕەحم و سۆزت

بۆتاکەتاکەی خەڵکی هەیە.

٤. بەپێی کتێبی خوا (کەقورئانە) بڕیار دەدەیت، نەك بەئارەزووی خۆت.

بەڵێ حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب، بەردەوام لەڕاوێژکردندا بوو، لەگەڵ هاووڵاتیاندا بۆ چارەسەری کێشەکان. ئەوەبوو شەوێکیان، لەکاتێکدا بەناو کوچەو کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا دەگەڕاو پاسەوانی موسوڵمانانی دەکرد، گوێی لەدەنگێك بوو، دەنگی ئافرەتێك بوو کەلەدووری مێردەکەی بەتەنها لەژوورەوە شیعری دەخوێندەوە، شیعرەکە مەشهورە کەدەڵێ: (تَطاول هذا اللَّيْلُ واسودَ جانبُهُ .... الخ)

کەباسی ئەوە دەکات هاوسەرەکەی لێی دوورکەوتۆتەوەو زۆر تامەزرۆیەتی و حەزی دەکرد ئالەو کاتەدا لەلایەوە بوایەو ئەگەر لەترسی چاودێری خواو پاشان پاراستنی ڕێزو حورمەتی مێردەکەی نەبوایە کەهەرگیز خیانەتی لێ ناکات. ئەوا پیاوێکی لەتەنیشتەوە دەبوو!...

حەزرەتی عومەر وەکو سەرکردەیەکی خەمخۆر، نەك جاسوس‌و سەرکوتکەر، لەجیاتی ئەوەی هەڵبکوتێتە سەرماڵی ئەو ئافرەتەو بڵێ: ئەوە عەیب ناکەی، ئەگەر بەتەنهاش بی قسەی ئاوا دەکەی، ئەوە حەیات لێ هەڵگیراوە. سەدان ژنی وەکو تۆهەن مێردیشیان لەماڵا نیەو بۆڵیەکیشیان لێوەنایەت. تۆ زۆر تامەزرۆی پیاوی، داوەشێی!...

نەخێر ئەم قسانەی هیچی نەووت. بەڵکو لەدڵی خۆیدا ئافەرینی هەڵوێستی مەردانەی ئەو ژنە دلێرو بوێرو ڕاستگۆو شاعیرو ئەدیبەی کرد، وەگەڕا بۆ چارەسەری ئەم گرێ دەرونی یە. بۆ بەخشینەوەی ئەم مافە زەوت کراوە (کەنابێ ژنێك بێ هاوسەرەکەی ئاخ هەڵکێشێ) بۆیە ماڵەکەی دیاری کردو پاشان کە پرسیاری کرد، زانی ئەم ژنە

تازە هاوسەرگیری کردووەو مێردەکەی لەسوپادا سەربازەو زۆر دەمێکە نەهاتۆتەوە بۆماڵەوە. بۆیە حەزرەتی عومەر چوو بۆلای (حەفصە)ی کچی کەخێزانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)و لێی پرسی: ئەی حەفصە. ئایا ئافرەت تاچەند دەتوانێ بەبێ مێرد ئارام بگرێ؟! حەفصە شەرمی کرد! بەڵام دواتر زانی ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بەمافی کەسانێکەوە هەیە. فەرمووی: تانزیکەی شەش مانگ خۆی ڕادەگرێ. یەکسەر حەزرەتی عومەر بڕیاری دا کەنابێت لەمەودوا هیچ سەربازێك لەشەش مانگ زیاتر بمێنێتەوە لەبەرەکانی جەنگداو دەبێ پێش ئەو ماوەیە بگەڕێتەوە بۆ لای هاوسەرەکەی. وەئەم بڕیارەی گەیاندە هەموو ڕیزەکانی سوپاو کاری پێکراو مێردی ئەو ژنەش گەڕایەوە!.

بەڕێزان: لەم بەسەرهاتەوە تێدەگەین، کەسەرکردەی خەمخۆری میللەت پێویستە ڕاوێژکاری ئافرەتی هەبێ بۆ ئەوەی لەمەسەلەکانی پەیوەست بەژنانەوە ڕاوێژی پێ بکات. وەتێ دەگەین کەئیسلام نایەوێ خەڵکی بکوژێ بەبیانوی ئەوەی کەئارەزوی جنسی هەیە. بەڵکو دەفەرموێ: ئەوە مافی هەموو نێرو مێ یەکەو دەبێ ئەم غەریزەی جنسیەی خوای گەورە لەمرۆڤدا دروستی کردوە، دەبێ چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوەو گرفتی لاوان لەبواری جنسی یەوە بەڕێگەی شەرعیو حەڵاڵ حەل بکات..

وەلەم بەسەرهاتەوە ئەوە تێ دەگەین کەسەرکردە پێویستە لەسەری هەموو گرفتێکی میللەتی بەلاوە گرنگ بێ و نەڵێ ئەوە کێشەی من نییە. نەخێر مادام لێپرسراویەتیت وەرگرتوە. کێشەی تۆیە. وەکاتێ سەرکردە زانی کێشە هەیە، پێویستە چارەسەریشی بۆ دابنێ!...

بەڵێ ئیمانداران: بەڕاستی کاربەدەست بەدادپەروەری دەبێت بەخۆشەویستی میللەتەکەی و میللەت هەمووی تێکڕا دەبن بەپاسەوانیو

وەكو چاویان دەپارێزن.

لەمێژوودا دەڵێ: كاتێ (هورمزان) سەركردەی فارسەكان بەدیل گیراو تەسلیم بوو هێنایان بۆ مەدینە. بردیان بۆلای خەلیفەی موسوڵمانان حەزرەتی عومەری كوڕی خطاب. كەچوون لەماڵەوە نەبوو. دواتر چوون بۆ مزگەوت، تەماشایان كرد وا لەكۆڵانی مزگەوت لەسێبەرێكدا خەوتوە. خەوێكی زۆر خۆش‌و پڕ لەدڵنیایی. بەبێ ترس‌و دڵەڕاوكێ، بەبێ پاسەوان. (هورمزان)ی فارس كەئەوەی بینی، ئەوەی هاتەوە پێش چاو كەپاشای فارس لەكاتی خەوتندا، لەناوجێگای گەرم‌و لەكۆشكی بەرزداو بەپاسەوانی سەدان سەرباز دەورە دراوە. ئەمجا دەخەوێ. بەڵام هەرگیز خەوێكی ئاوا خۆش نا، كەچی خەلیفەی موسوڵمانان لەسەر ئەو زەوی یە ڕەقە. بەبێ ڕاخەر. بەردێكی لەژێر سەری ناوەو لەجیاتی سەرین. بێ پاسەوان. لێی خەوتووە. بەبێ ترس و دوودڵی، ئالەوێدا (هورمزان) ئەم دێڕە پڕ لەمانایەی ووت كەبەڕاستی گەلێ بەنرخەو حەقە هەموو كەس لەبەری بكات. كەووتی: (عَدِلْتَ، فَأَمِنْتَ، فَنِمْتَ)، بەخوا دادپەروەری بۆیە لەخۆت ئەمینی‌و حەرەس‌و حیمایەت نی‌یە، هەموو میللەتەكە بەپاسەوانی خۆت دەزانی. بۆیەش ئاوا بەجوانی لێی خەوتوی‌و هیچ ترس‌و دڵەڕاوكێت نی یە!..

دەی كاربەدەستان. ئەگەر دەتانەوێ هەموو هاووڵاتیەكی ووڵاتەكەتان پاسەوانی تایبەتتان بێ‌و لەكاتی خەوتن‌و چوونە سەرئاویشدا بەردەرگاتان پاسەوانی لێ نەبێ، ئەوا دادپەروەر بن‌و عەدالەت بڵاوبكەنەوەو بچەسپێنن لەناو میللەتداو زوڵم‌و ستەم مەهێڵن..

بەڵێ بەڕێزان: كاربەدەستی چالاك، كەخاڵی یەكەمی خۆشكردنی ژیانی خەڵكە، یەكێ لەصیفەتە هەرە گرنگەكانی ئەوەیە كەحەز دەكات ئەگەر ستەم كرا. مەزڵومەكە دەنگی لێوەبێ، تەنانەت ئەگەر مەزڵومەكە

دەنگیشی بەسەردا بەرز بکاتەوە. قورئانی پیرۆز دەفەرمویٚ: (لایُحِبُّ اللهُ الجَهْرَ بالسُّوء مِنَ القَوْلِ إلاّ مَنْ ظُلِمَ). خوای گەورە ڕقی لەدەنگی بەرزو قیژەو هاتو هاوارە. مەگەر دەنگی مەزلۆم نەبیٚ. مەزلۆمو ستەم لیٚکراو بۆی هەیە دەنگ بەرز بکاتەوەو هاتو هاوار بکاتو بقیژیٚنیٚ بەسەر کاربەدەستو فەرمان ڕەوادا بۆئەوەی مافی داگیرکراوی بۆ بگیٚرِیٚتەوە.

وەبزانن: هەرکاتیٚ کاربەدەست لەپلەی بالآدا پیاوی چاکبوو. ئەوە خەلّکانی خوارەوە لەووردە کاربەدەستەکان کەسی چاکن. پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إذا أَرادَ اللهُ بالأمير خَيراً، جَعَلَ لَهُ وَزيرَ صِدْقٍ، إن نَسِيَ ذَكَّرَه، وَّإنْ ذَكَرَ أَعانَهُ، وَإذا أَرادَ اللهُ بِهِ غَيْرَ ذالكَ، جَعَلَ لَهُ وَزيرَ سُوءٍ، إنْ نَسِيَ لَمْ يُذَكِّرهُ، وَإنْ ذَكَرَ لَمْ يُعِنْهُ). رَواهُ أَبوُ داود.

واتە: هەرکاتیٚ خوای گەورە ویستی لیٚپرسراوی یەکەمی وولآت تووشی خیٚربکات، وەزیرو یاریدەدەرو ڕاویٚژکاری ڕاستگۆو دلّسۆزی بۆ دەنیٚریٚ. ئەگەر ئەمیرو سەرکردە شتیٚکی لەچاکەو خیٚرو خزمەتی میللەتەکەی لەبیرچوو، ئەم وەزیرە یادی دەخاتەوە. ئەگەر سەرکردە بەبیری هاتەوە کەپیٚویستە ئەم خیٚرەو ئەم خزمەتە بەو خەلّکەو بەو خاکە بکریٚ کەئەم لیٚپرسراویانە. بەلآم نەیدەزانی میکانیزمی جیٚبەجیٚکردنەکەی چۆنە ئەم وەزیرە دلّسۆزە یارمەتی دەدات و ڕیٚگای نیشان دەدات و ڕیٚنمایی دەکات. وەئەگەر خوای گەورە غەیری ئەمەی بۆ سەرکردەو لیٚپرسراوی یەکەمی وولآت وویست، چونکە کەسیٚکی خراپەکارو دەرون بۆگەن و موتەکەبیر بوو. شایەنی پۆستی سەرکردەیی نەبوو، خوای گەورە بۆ ڕیسواکردنی و هەلّسانی میللەت لیٚی و دەرپەڕاندنی. ئاوای لیٚ دەکات کەلەهاوچەشنی خۆی وەزیریٚکی خراپی بۆ دەنیٚریٚ. کەهەرچەندە ئەم سەرکردە بیری چۆتەوە خزمەتی میللەت بکات. چونکە هەر خەریکی خۆیەتی، خۆی پڕدەکات لەسەر فڕکردنی خەلّکەکە. کۆشکەکانو

شوقەو ڤێلاكانی لەناوەوەو دەرەوەی وولات لەسەر حیسابی پارەو پولو بودجەی خەڵك زیاتر دەكات. بەرزتر دەكات. ئەم وەزیرو ڕاوێژكارو یاریدەدەری دەوریشی لەجیاتی بەبیری بخاتەوە ئەمە وانابێو ئەمە سەرەنجامو عاقیبەتی خراپە. لەجیاتی ئەوە زیاتر ماستاوی بۆ دەكاو دەست خۆشی لێدەكاتو بەبالآیا دەخوێنێو پیرۆزبایی لێ دەكات.. خۆ ئەگەر جاوربارێكیش سەركردە بۆ خۆدەرخستنو موناسەباتو خۆ نواندن و ئینتیخابات و كاتی هەڵبژاردن ویستی خێرێك. چاكەیەك، پرۆژەیەكی بەسوود پێشكەش بەمیللەت بكات، ئەوانەی لەخوار خۆیەوەن لەوەزیرو ڕاوێژكارو مودیری عام و مودیرو....هتد. نەك هەر یارمەتی نادەن تا ئەم كەمە خێرە بكات، بەڵكو ڕێگری لێ دەكەنو خۆیان پرۆژەكە وەردەگرن و خۆیان دەبنە مقاولیو خۆیان پارەكەی دەخۆن و پرۆژەیەكی ئەوەندە سەقەتو بێ مەنفەعەت پێشكەش بەجەماوەر دەكەن. كەلەجیاتی دڵخۆش كردنی جەماوەر ئەوەندەی تر ڕقی هەڵدەستێنێ و ئەوەندەی تر لەفەسادی ئیداری و گەندەڵی سەركردەو دارو دەستەكەی بێزار دەبنو سەرەنجام ئەو پەستانی ناو ناخەیان ڕۆژێ تەحەمول ناكرێ و دەتەقێتەوەو سەروتاجی سەركردە لادەبات و ماستاوچی و ڕاوێژكارەكان و وەزیرەكانی كەئیشیان تەنها پارە خواردن بووەو موچە كوشتن بووە. ئەوانیش ڕۆژیان لێ دەبێ بەشەوو كونە مشكیان لێ دەبێت بەقەیسەری .. هەروەكو بینیمان و بەردەوامیش دەبینین..

جارێكیان: پیاوێك بە ئیمامی عەلی ووت: ئەی پێشەوای موسوڵمانان، باشە بۆچی لەسەردەمی أبوبكرو حەزرەتی عومەردا، وولات ئاوا ئاسایش بوو. دنیا ئارام بوو. كەچی لەسەردەمی تۆو عثماندا. وولات نائارامەو كێشەو گرفتی ناوخۆ زۆرە؟! ئیمامی عەلی فەرمووی: ئاخر حەزرەتی

أبوبكرو عومەر پیاوو ڕاوێژکاری وەکو حەزرەتی عثمانو بەندەیان هەبوو بەڵام ئێمە پیاوو چواردەورو ڕاوێژکاری وەکو تۆمان هەیە!!

بەڵێ بەڕێزان: کاربەدەستی دیندارو چاکو پاك ژیانی سەرزەوی دەکاتە باخچەیەکی بەهەشت بۆ خەڵکی و هەموو کەس بەبوون و عیزەت و شکۆمەندی خۆی دەکات..

بۆ خۆشی: تالەژیاندایە بیلبیلەی چاوی خەڵکەو پارێزگاری لێ دەکەن. دوای مردنیشی ڕەحمەتی بۆ دەچێ، ئامان ئەی کاربەدەست ئاگادار بە باکورسیەکەت ناودڵی میللەت بێ، چونکە میللەت هەردەمێنێ. بەڵام کورسیو مێزو مۆری دونیایی بێ وەفایەو دەڕوات. ئەگەر تێبگەیو وردبیبەوە لەسەر مێزەکەی بەردەمتو کوسیەکەی ژێرت نوسراوە: (لَوْدامَ لِغَيْرِكَ ماوصَلَ إلَيْكَ). ئەگەر بۆ غەیری تۆ بمایەو وەفادار بوایە، نەدەگەیشتە تۆ، تۆ ئێستا لەسەری دانەدەنیشتی. تۆش ڕۆژێ جێی دێڵی.

بەڕاستی ئەگەر کاربەدەست دادگەر بێ لەگەڵ میللەتەکەیدا، باشترین خوا پەرستە، لەفەرمودەدا هاتووە کە: یەك سەعات دادگەری فەرمانڕەوا، خێری زیاترە لەعیبادەتی (٦٠) ساڵ عیبادەتی سوننەت!! وەلەڕۆژی قامەتیشدا. ئەو کاربەدەستو فەرمانڕەوایانەی کەلە دنیادا میللەت. لەسایەو سێبەری عەدالەتیاندا، دڵسۆزیاندا، خەمخۆریاندا حەساوەتەوە. بۆخۆیان لەژێر سێبەری عەرشی خوادا ئیسراحەت دەکەن. هەروەکو لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە حەوت تاقم لەژێر سێبەری عەرشی خوادان لەو ڕۆژەدا کەهیچ سایەو سێبەرێك نیە. سایەو سێبەری خوا نەبێ. یەکەم تاقم و دەستە: (إمامٌ عادِلٌ) .. پێشەوای دادگەر.

دووەم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی کۆمەڵگای خۆشبەخت و

ژیانی بەختەوەرەوە فەرمووی، ئەوەیە: دەوڵەمەندەکانیان دەست کراوە بن، سەخی بن، ئەو ماڵەی لەژێر دەستیاندایە، بەهی خوای بزانن کەبەئامانەت و بۆ تاقی کردنەوە پێی بەخشیون. ئەو دەوڵەمەندانەی کەپارەو سامانەکەیان لەدەست و گیرفانیاندایە نەك لەدڵیاندا .. بەڕاستی دەوڵەمەندی سەخی گەلێك گرفتی خەڵکی پێ حەل دەبێ. دەی خۆش بەحاڵی ئەو دەوڵەمەندەی کەبەو ماڵە لەژێر دەستیایەتی دڵی هەزارێك خۆش دەکات، قەرزی قەرزارێك دەفع دەکات، بەمزگەوت و قوتابخانە دروست کردن، ناوی لەناو دڵی میللەتدا زیندوو دەمێنێتەوە.

دەوڵەمەندی بەڕێز:

بەدوای دونیادا ڕامەکە، مردن بەدواتا ڕادەکا .... عاقڵ کەسێکە براکەم، تەنها کردەوەی چاك دەکا. ماڵی دنیات گەلێ زۆرەو بەردەوام کۆی دەکەیتەوە.... گۆڕت تەنگ و تاریك، وێران، بۆ بیری لێ ناکەیتەوە. تەمەن وەکو بەفرو سەهۆڵ، هێدی هێدی دەتوێتەوە .... بەرەو گۆڕی تەنگ و تارت دەڕۆیت و سەردەنێیتەوە.

بەڕێزان: لەووڵاتی تورکیا. کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند، بەناوی (صەبانچی) بەهۆی نەخۆشیەوە چوو بۆ ئەمریکاو لەوێ مرد. ئەم پیاوە ئەوەندە دەوڵەمەند بوو. قەرزی دەدا بەحکومەتی تورکیا!! کاتێ لەسەرە مەرگا بوو، دوو وەصیەتی کردو نوسی و خستیە دوو زەرفەوەو دایخستن و ووتی: هەرکاتێ مردم ئەمجا زەرفی یەکەم بکەنەوە. پاشان کەچوونە سەرقەبران و گەڕانەوە زەرفی دووەمیش کەوەصیەتی دووەمی تێدایە ئەویش بکەنەوە. بەڵێ، کاتێ مردو هێنایانەوە بۆ تورکیاو بردیانە سەر مردوو شۆر. وەصیەتی یەکەمیان کردەوە. تەماشایان کرد هەرئەوەندەی لێ نوسراوە: (توخوا لەگەڵ کفنەکەمدا جووتێ گۆرەویم لەپێ بکەن!!)

بەڵام کاتێ مامۆستا ئاینییەکان تاوتوێی ئەم قسانەیان کرد، ووتیان: نابێ ئەم وەصیەتە جێبەجێ بکرێ چونکە ناشەرعیەو نابێ لەکفن کردندا کەس جیاوازی لەگەڵ کەس هەبێ. لەبەرئەوە گۆرەویەکەیان لەپێ نەکردو بردیان بۆسەر قەبران و بەخاکیان سپارد، کاتێ لەناشتنی بونەوە، کاتێ هەڵپچڕینی زەرفی دووەم بوو کەوەصیەتی دووەمی تێدابوو. کاتێ کردیانەوەو خوێندیانەوە تەماشا دەکەن لێی نوسراوە: دەمزانی گۆرەویەکەم لەپێ ناکەن و ناشەرعی یە. جاتوخوا سەروەت و سامان و ماڵی دونیایەك کەتەنها یەك جووت گۆرەویت لەگەڵ نەیەت بۆ ناو قەبری تاریك و تەنهاییت. توخوا حەیف نیە دڵی پێ ببەستی و پشتت پێی قایم بێ و پێ ی خۆش حاڵ بی؟!...

دەی فرسەتە بەوماڵەی بەردەستت، ماڵی هەژاران و نەخۆشان نەداران ئاوەدان بکەوە. تاخوای گەورە ماڵی دونیاو قیامەتت ئاوەدان بکاتەوە ...

سێ یەم: (وأَمْرُكُمْ شُورى بَيْنَكُمْ). بەڵێ نیشانەی بەختەوەرییە بۆ خێزان بۆ هۆزو نەتەوە. بۆ شارو شارۆچکە، بۆ گەل و میللەت. کەپرس و ڕاوێژیان لەنێودابێت. ئای چەند جوانە ڕاوێژ لەنێوان کاربەدەستان و میللەتدا هەبێ، هەموو عەقڵەکان بخرێنە پاڵ یەکتر بۆئەوەی بڕیاری دروست بدەن.

شێخ عبدالقادری گەیلانی فەرموویەتی: هەرگیز مەڵێ پێویستم بەڕاو بۆچونی تۆ نی یە، چونکە هەرکەس تەنها ڕای خۆی بەڕاست بزانێ گومڕا دەبێت و پێ ی هەڵدەخلیسکێ.

ئەی گەنجان تکایە بەبێ پرسو ڕاوێژی دایكو باوکتان گەورو ڕیش سپیەکانتان، هیچ کارێك مەکەن و بڕیارێك مەدەن. ئێوەش ئەی دایك و باوك و کەسە بەتەمەن و خاوەن ئەزمونەکان گوێ بۆگەنج

**و لاوەكان ڕابگرن و پرسیان پێ بكەنو لەهێزو تواناو زانستی نوێیان كەڵك وەربگرن. ئەوكاتە بەئەقڵو ئەزمونی پیرەكانو هێزو توانای گەنجەكان. بەپشتیوانیو ویستی خوا هەموو كارەكان سەركەوتوانە بەئەنجام دەگەن و لەپەشیمانی بەدوور دەبین.**

**زانایان فەرموویانە:** (شاوِرْ مَنْ جَرَّبَ الاُمُورَ، فإِنَّهُ يَعْطيكَ مِنْ رَأْيِهِ ماقامَ عَلَيْهِ بالْغَلاء، وَأَنْتَ تَأخُذُه مَجاناً).

**واتە: پرسو ڕاوێژ بەكەسانی بەئەزمونو خاوەن تەجروبەی ڕۆژگار بكە. كەهەورازو نشێوی زۆری بینیوەو سەرماو گەرمای ژیانی لێ دراوەو لەهەر خەسارەتێك عەقڵێكی وەرگرتووە. چونكە ئەو نرخی زۆری داوە تائەو تەجروبانەی لەژیان وەرگرتووە. بەڵام تۆ كەپرسو ڕاوێژی پێ دەكەیتو ئەویش سەرنج و تێبینی خۆی دەردەبڕێو پێشكەشتی دەكات. تۆ بەخۆڕایی ئەو هەموو ئەقڵە وەردەگری لەماوەیەكی زۆر كورت داو لێی سوودمەند دەبی، كەبەهۆیەوە سەرفراز دەبی.**

**ئیمانداران: بەسە بۆ گەورەیی پرسو ڕاوێژ، كەیەك سوڕەتی قورئانەكەمان ناوی** (الشُّورى)**یە... بەسە بۆ گەورەیی ڕاوێژ. كەخوا بەسەرداری هەموو پێغەمبەران دەفەرموێ:** (وشاوِرْهُمْ فِي الاَمْرِ) **لەكاتێكدا عەقڵی پێغەمبەر (ﷺ)، لەعەقڵی هەموو عەقڵمەندێك گەورەترە. لەهەموو ژیرێك ژیرترە، دوربین ترە. هەڵە ناكات. چونكە** (مايَنْطِقُ عَنِ الهَوى إنْ هُوَ إلاّ وَحْيٌ يوحى) ..

**ئیمانداری بەڕێز، تكایە ئاگاداربە، هەركات پرست پێكرا، كلیلی دەرگای خێربەو قفڵی دەرگای شەڕبە، بۆئەوەی بەر ئەو موژدە گەورەیە بكەوی كەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:** (إنَ مِنَ النّاسِ مَفاتيحَ لِلْخَيْرِ، مَغاليقَ لِلْشَرِّ، وَ إنَّ مِنَ النّاسِ مَفاتيحَ لِلْشَرِّ، مَغاليقَ لِلْخَيْرِ، فَطُوبَى لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفاتيحَ الخَيْرِ عَلى يَدَيْهِ، وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفاتيحَ الشَرِّ عَلى يَدَيْهِ) رَواهُ إبنُ ماجَّة.

واتە: بەڕاستی لەناو خەڵکی دا، کەسی واهەیە. کلیلی کردنەوەی دەرگای خێرە. لەهەر مەسەلەیەکدا قسە بکات. دەبێتە هۆی بەرپا کردنی خێرو داخستنی دەرگای شەڕو خراپەو فیتنە. هەرکەس پرسی پێبکات. هانی دەدات بۆ چاکە. بۆ پیاوەتی، بۆ لێبوردن. بۆ نەرمی. بۆ خۆشەویستی. وەوای لێدەکات کەبیر لەتۆڵەکردنەوە، لەدوژمنایەتی، لەڕقەبەری. لەپەیوەندی پچڕین. لەستەمکاری نەکاتەوەو، بەم شێوەیە ئەم کەسە دەبێتە هەوێنی ئاشتیو بەیەکەوە ژیان و خۆشەویستی ئەو کۆمەڵگایە. بەپێچەوانەشەوە کەسی وا هەیە کەکلیلی کردنەوەی دەرگای شەڕو فیتنەو خراپەیە وەقفڵی داخستنی دەرگای خێروچاکەیە. لەهەرمەسەلەیەکدا قسە بکات و بۆهەر کارێك پرسی پێ بکرێ. دەبێتە مایەی نانەوەی ئاشوب و فیتنە، کێشەیەکی بچوك بەهۆی قسەی ئەمەوە دەبێتە فیتنەیەکی گەورە کەدواتر ئەم دەرگای شەڕە زۆر بەگران دابخرێ. وەئەگەر ڕێگایەك هەبێو مابێ بۆ بەیەکەوە ژیان. بۆ برایەتی. بۆ ئاشی. بۆ تەباییو خێروچاکەو خۆشبەختیو خۆشەویستی. ئەم دایدەخاتو ناهێڵێ ئەو دەرگای خێرو ئیصلاحە بکرێتەوە. جاپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خۆشبەختی دونیاو قیامەت بۆ ئەو کەسەی کەدەبێتە کلیلی کردنەوەی دەرگای خێرو قفڵی داخستنی دەرگای شەڕ، هاوارو واوەیلاو نەگبەتیو ڕیسوایی دونیاو قەبرو قیامەتیش بۆ ئەوکەسەی کەدەبێتە قفڵی دەرگای خێرو کلیلی دەرگای شەڕو خراپە..

خوای پەروەردگار لێت دەپاڕێینەوە، کاربەدەستانمان لەباشترین کەسمان بن، دەوڵەمەندەکانمان سەخیو بەخشندەبن. کاروبارو ژیانمان بەپرسو ڕاوێژ لەنێوانماندا بەڕێوەبچێو ژیانمان خۆشو قیامەتمان بەختەوەریو بەهەشت جێگامان بێت. (رَبَّنا آتنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَة

حَسَنَةً وَقنا عَذابَ النّار) أللّهُمَّ آمين ...

**سەرچاوەكان:**


١. صَحيح وَصايا الرَّسُول (ﷺ) سَعْد يوسف أبُوعَزيز، ج٣، ص١٤٥.

٢. مِنْهاجُ الصّالِحين، عِزَّالدِّين بليق، ص٩٣٤، ص٣٧٤.

٣. ژياننامەی پێغەمبەر (ﷺ) عَبْدُالعَزيز عَلاءَالدِّين، ل٠٩٤، ل٩٩٤، ل٢٠٥.

٤. ژيانى أبوبكرى صديق، حَبيب محمد سەعيد، ل٢٥، ل٥٥.

٥. ژيانى حەزرەتى عومەرى كوڕى خَطّاب، حَبيب محمد سەعيد، ل٧١

٦. فِقْهُ السُّنَة- السَّيد سابق، ج٢، ص٩٨١.

٧. ڕووداوەكانى ڕۆژگار، عَبْدُاللّطيف (كەمئەندام)، ب١، ل١٧.

٨. فەرهەنگى بانگخوازان، ئەندازيار عُثمان، ل٩٧.

٩. مُرْشِدُ الخَطيب، عبدالرَّحْمن المَصطاوي، ص٦٥١.

# ووتاری چوارەم
# بۆ مانگی موحەڕەم
# گەورەیی نیەتی
# پاکو چاك

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ:

**ئیمانداران: ژیانی دونیا زۆر کورتە، چونکە بەمردن کۆتایی بەقۆناغی ژیانی دونیای مرۆڤ دێتو هیچ کەس نیە گومانی هەبێت لەمردن. کەسیش نازانێ کەی دەمرێ، کەواتە: هەموو کاتێ تۆی مرۆڤ موعەڕەزی بۆئەوەی مردن یەخەت بگرێ. لەولاوە گەنجێك کەئەو پەڕی هیوای بەژیانە، بێ ئەوەی نەخۆش بێت، هیچ گرفتێکی تەندروستی هەبێ، بێئەوەی لەڕووداوێکی هاتوچۆی دڵتەزێندا بمرێت. هەر لەساغی، لەکاتی قسەکردن و گفتوگۆو کڕینو فرۆشتندا، مردن یەخەی دەگرێ و بەلادا دێ. گەنجی واهەبووە کەخۆمان ناسیومانە. لەمزگەوت بەشداری پرسەی کردووە. لەمزگەوتەکە چۆتە دەرەوەو مردووە!. هی واهەبووە. لەناو پرسەکەدا دانیشتوەو گەنجو ساغو سەلامەت بووە. لەپڕدا بەلادا هاتووەو مردووە! لەم کوردستانەی خۆماندا، کەسی واهەبووە لەگەڵ جەنازەدا چووە بۆسەر قەبران. کەچی لەکاتی بەخاك سپاردنەکەدا ئەم کەوتوەو کەهەڵیان گرتۆتەوە مردووەو بەوداره مەیتەی کەمردوەکەیان پێ بردوە بۆسەر قەبران. جەنازەی ئەویان هێناوەتەوە بۆناو ئاواییو شتویانەو کفنیان کردوەو نوێژیان لەسەرکردوەو بردویانەتەوە بۆ گۆڕستان!..**

**بەڵێ، ئەگەر تەمەنی نوحت هەبێ هەردەبێ بمری، خۆئەگەر لەڕۆژی دروست بوونی ئادەمەوە تا (نەفخیصور) لەدنیادا بژی. هێشتا هەموو دونیا لەچاو قیامەتەوە وەکو پەنجەتەڕکردنە لەدەریایەکی بێ پەی!..**

**جائێمەی موسوڵمانان إنشاءالله بەئومێدی بەهەشتین، بەلاّم ئایا بەم تەمەنە کورتەو ئەم کەمە عیبادەتە، چەند نوێژو ڕۆژوی ڕەمەزانێك، ئایا بایی چی بەهەشت دەکەین؟! هەروەکو لەدنیادا، ئەوەی پارەی کەمە دەڵێ بەخوا بەهەموو تەمەنم ئەو پارەیەم پەیدا**

کردووه، بایی تەنها ئەو بەردانە نی یە کەدیکۆری ئەو خانوە گەورەی پێ کراوە! ئەی خۆ کۆشکەکانی بەهەشت. هەرخشتێکی لەزێڕەو یەکی لەزیووە. چیمەنتۆکەی میسکە. وردە بەردوچەوەکانی لۆلۆو مەرجانە! لەفەرمودەدا هاتووە. تەنها بەقەدەر گۆچانێك لەبەهەشتدا. هەموو دونیاو ئەوەی لەسەریەتیو ئەوەی لەناخیایەتی لەئاڵتونو نەوتو سەدان مەعدەنی گران بەهای تر، دێنیو هێشتا نرخی ئەو جێگا گۆچانەی بەهەشت بەنرخترە چونکە ئەوەی لەسەری نیشتەجێ بێ، هەرگیز بەجێی ناهێڵێ..

دەی باشە ئێمە بەم تەمەنە کورتەو عیبادەتە زۆرزۆر کەمەوە چۆن بتوانین جێ پێ یەك لەبەهەشتا بۆخۆمان مسۆگەر بکەین، ئەگەر چی هیچ کەسێك نی یە بەکردەوەی خۆی بچێتە بەهەشت. مەگەر بەڕەحم و لوتفی خوا. تەنانەت پێغەمبەری خواش (ﷺ).

بەڵام خوای گەورە بەلوتفی خۆی، بەڕەحمی خۆی شتێکی پێ بەخشیوین، کەکەم زۆر دەکات، تەمەن پڕ بەرەکەت دەکات. ئەگەر کەسێك تەمەنی (٢٠) ساڵ بێ، ئەگەر داراو خاوەنی ئەمە بێ، تەمەنی دەبێتە (٢٠٠٠) ساڵ تەمەن!!. ئەویش (نیەتە) هەروەکو ووتراوە: (يَبْلَغُ المَرْءُ بِنِيَّتِه مالايَبْلُغْهُ بِعَمَلِهِ). مرۆڤی ئیماندار بەنیەتی پاکو ئیخلاصو دڵسۆزی بۆ خوا. دەگاتە پلەو پایەیەك کەهەرگیز بەکارو کردەوە نەیدەگەیشتێ. زانای گەورەو بەڕێز. مامۆستای فەرمودە ناسی، پێشەوا (ئەبوداود) فەرمویەتی: (٥٠٠) هەزار فەرمودەم نوسیەوە. بەڵام زانیم خەڵکی هەمووی بۆ لەبەرناکرێ و ناخوێندرێ، بۆیە هاتم (٤٨٠٠) فەرمودەم لێ هەڵبژارد. بەڵام فەرمووی: ئەگەر کەسێك نەیتوانی ئەو (٤٨٠٠) فەرمودەیش بخوێنێ. ئەوا تەنها (٤) فەرمودەی بەسە. ئەگەر بەجوانی دەستی پێوەبگرێو بەردەوام لەیادی بێ و کاری پێ بکات.

ئەم چوار فەرمودە گەوهەرینەش کەلەو گەوهەرستانەی فەرمودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هەڵی بژاردون. ئەمانەن:

١. (إِنَّما الْاَعمالُ بالنِّياتِ) واتە: بەڕاستی هەرچی کارو کرەوەیە بەنیەتی ناو دڵە، بەڕاستی ئەم فەرموودەیە ئەوەندە گرنگە. کەوای لەزانایەکی وەکو (ئیمامی نەوەوی) کردوە کەهەرسێ کتێبە هەرە بەنرخەکانی خۆی (الْاَذكار)، (الْاَربَعِينَ النَوْوِيَّة)، (رِياضُ الصّالِحِين) بەم فەرمودەیە دەست پێ بکات.

٢. فەرمودەی هەڵبژێردراوی دووەم: (من حسن إسلام المرء تركه ما لا يعنيه) لەجوانترین ڕەوشتەکانی موسوڵمان. کەبیسەلمێنێ موسوڵمانێکی ڕێکوپێکەو جوان لەئیسلام گەیشتووە. ئەوەیە کەهەرشتێ پەیوەندی بەوەوە نەبێ وازی لێ بێنێو لێی نەپرسێو بەدوایا نەچێو خۆی پێوە خەریك نەکات.

٣. فەرمودەی سێ یەم: (لايُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَى يُحِبَّ لِاَخِيِهِ مايُحِبُّ لِنَفْسِهِ). ئیمانی هیچ کەس لەئێوە تەواو نابێت هەتا بۆ براکەی پێ ی خۆش نەبێت لەوەی کەبۆخۆی پێی خۆشە.

٤. فەرمودەی چوارەم: (الحَلالُ بَيِّنٌ وَالحَرامُ بَيِّنٌ ... الخ) حەڵاڵ دیارەو ڕوونو ئاشکرایە، حەرامیش بەهەمان شێوە ڕوونو ئاشکرایە. لەنێوانیاندا، شتانێك هەن نەتەواو حەڵاڵن نەتەواو حەرامنو جێگای گومانن. جاهەرکەسێ واز لەشتە گوماناویەکان بهێنێ. ئەوە ڕێزو حورمەتو دینو ئیمانی پارێزراو دەبێت..

هەزاران ڕەحمەتی خوات لێ بێ ئەی ئیمامی ئەبوداود کەئەو چوار فەرمودەیەت هەڵبژارد. باوەڕ بکەن، سرو نهێنی هۆکاری یەکەمی پێشکەوتنی ماددیو بواری تەکنەلۆجیای ئەو ئەمریکاو ئەوروپایە. بەجێبەجێ کردنی ئەم چوار فەرمودەیەوە بەندە ..

**ئیمانداران: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەندین فەرمودەی هەیە لەسەر بەرەکەتی نیەت وەکو:**

١. (مَنْ سَأَلَ اللهَ القَتْلَ في سَبيلِ اللهِ صادقاً مِنْ قَلْبِهِ، أَعطاهُ اللهُ أَجْرَ شَهيدٍ وإِنْ ماتَ عَلى فِراشِهِ).

**واتە: هەرکەسێ لەناخی دڵەوە. بەنیەتێکی پاکەوە داوا لەخوا بکات. کەلەپێناوی خوای گەورەدا شەهید بکرێ و لەمەیدانا بەدەستی کافران بکوژرێ. خوای گەورە بەهۆی ئەو نیەتە پاکەیەوە ئەجرو پاداشتی شەهیدی پێ دەبەخشێ. ئەگەر چی لەسەر جێگای خەوتنی خۆی، لەناومالی خۆیدا بمرێ! بەڵێ لەرۆژی قیامەتدا زۆرکەس دەبینرێن کەلەگەڵ شەهیدانی رێبازی خوادا حەشر دەکرێنو مەدالیای رێزلێنانی شەهیدیان لەمل دایە. بەڵام خۆئەمان لەدونیادا نەکوژراونو بریندار نەکراونو لەسەر جێگای خۆیان مردون. بەڵام چونکە لەدنیادا بەدڵێکی خاوێنو نیەتێکی راستگۆیانەوە داوای شەهیدیان لەخوا کردوە، خوای گەورە پلەی شەهیدیان هەرپێ دەبەخشێ!..**

٢. **پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:** (مَنْ أتى فِراشَهُ وهو يَنْوي أَنْ يَقُومَ يُصَلِّي مِنَ الَّيْلِ، فَغَلَبَتهُ عَيْناهُ حَتَّي أَصْبَحَ كُتِبَ لَهُ مانَوي، وكانَ نَوْمُهُ صَدَقَةٌ مِنْ رَبِّهِ عَزَّوجَلَّ).

**واتە: هەرکەسێ (پیاوبێ یان ژن، کوربێ یان کچ) کاتێ دەچێتە سەر جێگای خەوتنەکەی نیەتی ئەوە بێنێ کەهەڵسێ شەونوێژ بکاتو لەوسەری شەوەوە پێش بانگی بەیانی لەجێگای خەوەکەی بێتە دەرەوەو شەونوێژ بکات، هەرکەسێ بەم نیەتەوە خەوت، بەڵام بەهۆی ماندویەتی، یان هەر هۆکارێکی ترەوە. خەو بەسەریا زاڵ بوو. هەتا بەدەنگی بانگی بەیانی نەبێ خەبەری نەبۆوەو شەونوێژەکەی نەکرد. ئەوە خوای گەورە بەهۆی ئەو نیەتە پاکەی ناو دڵی یەوە. ئەجرو**

**پاداشتی تەواوی ئەو ڕکاتە شەونوێژانەی کەلەدڵیا بووە بیانکات. خوای گەورە هەمووی بۆ دەنوسێ. وەنوستنەکەشی دەبێتە بەخشش و خێر لەسەری لەلایەن خوای پەروەردگاریەوە!!**

**ئیمانداران: خوای گەورە بەئەندازەی پاکی ناو دڵەکەت یارمەتیت دەدات. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:** (مَنْ أَدَّى دَيْناً يَنْوِي قَضاءَه، أَدَّاهُ اللهُ عَنْهُ يَوْمَ القِيامَةِ).

**واتە: هەرکەسێ بەهۆی موحتاجی یەوە تووشی قەرزکردن ببێ و لەوکاتەدا کەقەرزەکە وەردەگرێ. لەناو دڵیا نیەتی ئەوەی هەبێ. کەبەپشتیوانی خوا لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا. قەرزەکە دەداتەوە. بەڵام بەسەردا مردو فریا نەکەوت قەرزەکە بداتەوەو لەدوای خۆشی ئەم قەرزە لەبیرکراو نەدرایەوە، ئەوە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا قەرزی ئەو قەرزارە دەداتەوە بەخاوەن قەرز، بەوەی لەبەهەشتا ئەوەندەی پێ دەبەخشێ لەبەشی خۆی زیاتر کەوا دڵی قەناعەت بکات و لەقەرزارەکە خۆش ببێ. ئەمە بەهۆی ئەوەی کەلەناو نیەتی قەرزارەکەدا هەبووە بەڕاستی و دروستی قەرزەکە بداتەوەو نیازو نیەتی خواردن و دەست بڕینی نەبووە!..**

**هەرلەمەسەلەی نیەتدا. ئەو دوو کەسەی کەدەچنە ناوبژی نێوان ژن و مێردێکی ناکۆکەوە. ئەگەر نیەتیان پاك و خاوێن و پاك بێو ئاگر بکوژێنەوەو فیتنەیی خۆش نەکەن خوای گەورەش بەرەکەت دەخاتە قسەکەیانەوە. ئاشتەوایی ڕوودەدات لەنێوان ئەو ژن و مێردەدا کەخەریکە لەیەکتری جیادەبنەوە. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴾ النساء: ٣٥.

**ئێوەی بەڕێز سەرنج بدەن، جاران کەسێکی ڕیش سپی لەناو**

ئاوەدانیەکدا، لەناو هۆزو عەشرەتەکەیدا. چونکە بەنیەتێکی پاک و ڕەزامەندی خوا صوڵحی نێوان خەڵکی دەکرد، تەنها بەگۆچانەکەی دەستی گەورەترین دووبەرەکیو ناکۆکیو شەڕی کۆتایی پێ دێناو هەموو لایەك گوێیان بۆ قسەکانی دەگرتو گوێڕایەڵی دەبوون، خوای گەورە بەرەکەتی دەخستە کارو گوفتارییەوە. بەڵام ئەمڕۆ چەندین دەزگای کۆمەڵایەتی بەحیساب بۆ چارەسەری کێشەی خەڵکی دانراون. بەڵام چونکە بۆ گیرفان پڕکردنو موچە خواردنو ژەم بەڕێ کردنە! بەدوو ساڵ ئاشتەوایی نێوان دوو منداڵیان پێ ناکرێ. چونکە نیەتەکەیان بۆ ڕەزامەندی خوا نیە و چاویان بڕیوەتە لایەنە مادییەکەی..

بەڕێزان: تەنانەت لەقسەکرنیشدا نیەت کاریگەری گەورەی لەسەر قسە کردنەکە هەیە. ئیبراهیمی نەخەعی دەفەرموێ: کەسی وا هەیە قسە دەکات. ووتار دەخوێنێتەوە. ئامۆژگاری خەڵکی دەکات. بەڵام هەتا بڵێی دڵی پاکەو تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خوایە نەك خۆ دەرخستنو ڕیاکردن. ئەم کەسە ئەگەر چی هەڵەش بکات لەکاتی قسەکردندا. جاری واهەیە قسەیەکی وادەکات. کەبەشێوەیەکی نەشیاو لێکدەدرێتەوە. کەچی خەڵکی عوزری بۆ دەهێننەوەو دەڵێن: (ماأرادَ بِکَلامِهِ هذا إلاّ الخَیْرَ). بەخوا فلاّن کەس مەبەستی لەو قسانەی جگە لەخێرو چاکە هیچ شتێکی تر نەبووە، کەسی واش هەیە کاتێك قسە دەکات، زۆر فەصیحە، بەلیغە، زۆر بەئەدەبیانەو شاعیرانە قسەدەکات. بەڵام چونکە لەناخەوە حەزی لەخۆ دەرخستنو فیزو دەعیەو پۆز لێدانە. خەڵکی هەرلەخۆیانەوە ڕقیان لەقسەکانی دەبێتەوەو دەڵێن: بەڕاستی فلاّن کەس تام لەقسەکانیدا نییە. ئەمە هەمووی بەنیەت دەگۆڕێ.

بەڕێزان: کاربەدەستو فەرمانڕەوای وولاّت ئەگەر بەنیەتی خزمەتی

میللەت کاربەدەستیو پۆستو پلەی وەرگرت، ئەوە خوای گەورە کاری ڕاست دەکاو بەرەکەت دەخاتە ئیش و کاریەوەو دڵی میللەتی لێ ڕازی دەبێ، جافەرقی نی یە ئەو کاربەدەستە. کافر بێ یان موسوڵمان. ئەگەر موسوڵمان بێ مادام بەنیەتێکی پاك بۆ خزمەتکردنی خەڵك و خاکەکەی حەزبکات کاربەدەست بێ. نەك خاك و خەڵك بکات بەخزمەتکاری بەرژەوەندیەکانی خۆی. ئەوە بەو نیەتە پاکەی. ئەو کاربەدەستە موسوڵمانە دەوامی ناو ئیدارەکەشی بەعیبادەت بۆ حیسابەو لەقیامەتا پاداشتی هەرەگەورەی لەسەر وەردەگرێ، خۆ ئەگەر ئەو کاربەدەستە لەڕووی بیروباوەڕەوە کافر بێ. بەڵام بۆ میللەتی خۆی دڵسۆز بێ، خزمەت بکات بەفەقیرو هەژارو دزی لەماڵی میللەت نەکات، ئەمە هەرچەندە بۆ قیامەت هیچ سودی پێ ناگەیەنێ، چونکە خۆی بڕوای پێ نەبوەو نەیویستوە. بەڵام خوای گەورە لەدنیادا کاری پڕ بەرەکەت دەکات، هەموو ئەو پێشکەوتنە ماددی یەی کەلەووڵاتانی ئەوروپی دا هەیە. هی نیەتی پاکی کاربەدەستەکانیانە لەگەڵ ووڵات و میللەتەکەی خۆیاندا، کەدەیەوێ خزمەت بکات و هەرکات کەماوەکەی تەواو بوو. بەبێ جەنگ و هەراو کودەتای سەربازی و خۆ پیشاندان بۆ لابردنی، خۆی کورسیەکە جێ دێڵێ و دەڕواتەوە سەر کاری پێشووی و لەوێ خزمەت دەکات. بەڵام ئەگەر کاربەدەست تەنها بۆ بەرزبونەوەی پلەی حیزبی خۆی، ئەویش بۆئەوەی زیاتر خۆی دەوڵەمەند بکات. بەو نیەتەوە خزمەتی خەڵکی دەکرد، نەك لەناخی دڵەوە خۆشی بوێن و بەکاری سەرشانی خۆی بزانێ. ئەوا خوای گەورە بەرەکەت لەکاری هەڵدەگرێ و خەڵکی ڕقیان لێ ی دەبێ و قسەی ڕاستیشی بەدرۆ دەزانن! ناودڵی خاوەنەکەی جیاوازی دەبێ لەگەڵ خراپەو ناپاکی دا. بۆنمونە: شایەتمان ئەگەر کەسێك بەدڵو بەگیان شایەتمان بێنێ و

بلێ: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِله إلاّ الله و أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُول الله) ئەوە ئەو شایەتمانە ڕزگاری دەکات. بەڵام هەر هەمان شایەتمان. کەهەمان ووشەیە بەبێ زیادو کەم. ئەگەر لەدڵێکی ناپاك و ناڕاستەوە بوترێ. دەبێتە دووڕویی. دەبێتە دووڕیی نیفاقو سزاکەی لەکافری خراپترە..

یان: خۆشتن، کەسێك بۆ لابردنی چڵك و پیسی لاشەی، یان خۆفێنك کردنەوە چووە حەمام و خۆی شت، کەسێکی تریش هەربەهەمان شێوە خۆی شت، بەڵام: بەنیەتی لابردنی لەش گرانی، یان بەجێهێنانی سوننەتی جومعەو چەژنەکان. یان خۆشتنە سوننەتەکانی تر، ئەمیان کەبەم نیەتە خۆی شتوەدەیان چاکەی بۆ دەنوسرێ کە بۆ ئەوی تریان کەخۆی شتوەو نیەتێکی لەدڵدا نەبوە نانوسرێ.

یاخود: دووکەس بێنە بەرچاوی خۆت، یەکیان لەبەیانیەوە تا ئێوارە هیچ شتێ ناخواتو ناخواتەوە. بەمەبەستی خۆلاوازکردنو دابەزاندنی کێشی لەشی. (ڕێجیم کردن). کەسێکی تریش لەهەمان ڕۆژدا. هەروەکو ئەو خواردنو خواردنەوە ناخوات، بەڵام بەنیەتی بەڕۆژوو بوون. تەنها بەنیەتی ناو دڵەکەیان ئەمیان بەڕۆژووەو هەرخوا دەزانێ پاداشتی چەندەو ئەویان هیچی بۆ نانوسرێ. مەگەر چەند چاکەیەك کەخوای گەورە خۆی پێی ببەخشێ، چونکە خزمەت کردنی لاشەش‌و پارێزگاری کردنی تەندروستی خۆت، خوای گەورە پێی خۆشەو پاداشتت دەداتەوەوە. بەڵام هەرگیز ناگاتە پاداشتی ڕۆژوو گرتن..

نمونەیەکی تر: خێرو صەدەقەکردن، هەتا نیەتەکەت پاکتر بێو مەبەستت ڕەزامەندی خودا بێ، خوای گەورە پاداشتی زیاترت دەداتەوەو بەدەم داواکەتەوە دێت، خوای گەورە دەفەرموێ:(لَنْ يَنالَ الله لُحُومُها وَلا دِماؤُها، وَلكِنْ يَنالُهُ التَّقْوى مِنْكُمْ). لەو حەیوانانەی کەبۆ قوربانیو خێروخێرات سەریان دەبڕن، نەگۆشتەکەیو نەخوێنەکەی

ناگات بەخواو خوا پێویستی پیّ ی نییە. بەڵکو ئەوەی خوای گەورە دەیەویّ تەقوای ئەو کەسەیە کەحەیوانەکە دەکاتە قوربانی یان خێرو خێرات. تەقواش شتێك نی یە بەقسە بوتریّ. بەڵکو لەنیەتی ناودڵدایە. هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیّ جار لەسەریەك فەرموی: (التَّقْوى هاهُنا) پاشان (وأَشارَ إلي صَدْرِهِ). واتە: تەقوا ئالێرەدایە. وەئاماژەی بۆ سنگی کرد.

کەواتە: ئیمانداری بەڕێز، هەرکاتیّ خێرێکت بڕیاریدا. جۆری خێرەکەت مەگۆڕە، بۆنمونە: بزنێك. مەڕێکت کردوە بەخێر. مەیگۆڕە بەمریشك. بڵێ ی هەزار زیاتر لیّ ی سودمەند دەبیّ، نەخێر. خوا سەیری پاکو ئیخلاصی نیەتی ناو دڵەکەت دەکاتو ئەو خێرە کەمە، بەنیەتی خاوێن لای خوا بەزۆر وەردەگیریّ!.

سەرنجی ئەم ڕوداوە ڕاستەقینەیە بدەن: پیاوێك کەژنی دەبیّو منالێکیشی دەبیّ، منالەکەی کوڕ دەبیّ. ئەم منالە نەخۆش دەکەوێتو دکتۆرو عەیادە نامێنیّ ئەم دایكو باوکە پیّ ی نەکەنو پشکنینی بۆنەکەنو دەرمانی بۆ نەنوسن، چەند جار ئاژەڵی وەکو مەڕو بزنی بۆدەکەن بەصەدەقەو خێرو دابەشی دەکەن بەسەر دراوسیّو مالە هەژارەکاندا، بەلاّم ئەم منالە نەك هەرچاك نابیّ، بەڵکو ڕۆژ بەڕۆژ بارودۆخی تەندروستی خراپتر دەبیّ. بەیانیەکان کەوەرزی زستان دەبیّ، دونیا زۆر ساردەو بەفرێکی زۆر ئەستور باریوە. باوکی ئەم منالە دەست نوێژ دەگریّو دەچێتە لای منالە نەخۆشەکەیەوەو دەستی لێدەدات، دەبینیّ تایەکی زۆر قورسی هەیە. هەندیّ ساردی دەکاتەوەو دەچیّ بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی. هەرکە دەرگای مەدخەلەکەیان دەکاتەوە، سیّ پشیلە پەلاماری قاچی دەدەنو بەزمانی حالّ لیّ ی دەپاڕێنەوەو داوای خواردنی لیّ دەکەن. چونکە دونیا هەمووی بەفرەو

هیچیان دەست نەکەوتوە. لەسەرمانو لەبرساندا خۆیان بەقاچی ئەم پیاوەدا دەخەن. کابرا زۆر بەزەیی پێیاندا دێتەوەو ئەچێتە ژورەوە! دەرەواتە سەر موجەمیدەکەیانو سێ پارچە گۆشتی نەرمەی گەورەیان بۆ دەردێنێو بۆیان خاو دەکاتەوەو دەیخاتە بەردەمی سێ پشیلەکە. ئەوانیش زۆر بەتاسوقەوەو بە بەتامە زرۆییەکی زۆرەوە. پەلاماریان داو گۆشتەکەیان خوارد. بەڵێ ئیمانداران لەگەڵمان بنو چیرۆکەکە ماویەتی، نیەتی ئەم پیاوە، باوکی ئەم منالە، لەم کاتەی نیوەشەودا، کەئەو خێرە گەورەی لەگەڵ ئەو سێ پشیلە تێدا کرد. خالیصەن بۆ خوابوو، چونکە خۆکەس چاوی لێ نەبوو، تامەدحی بکاتو ئەمیش مەدحی کەسی نەدەویست، بابزانین ئەم خێرو صەدەقەیە، بەم نیەت پاکییە چۆن جێگە دەگرێ!! بەڵێ کاتێ باوکی منالەکە دەچێتە مزگەوتو دوای نوێژی بەیانی بەجەماعەت، لەمزگەوت دەگەڕێتەوە. تەماشا دەکات پشیلەکان ئەمجارەیان تێرنو لەسەر بەفرەکە لەناو حەوشەکەیاندا بۆخۆیان یاری دەکەن، کابرای خاوەن ماڵ چوە ژورەوەو بەرەو لای کوڕەکەی ڕۆیشت بزانێ حالی چۆنە. سەیری کرد کوڕەکەی بەتەواوی تایەکەی دابەزیوەو بۆ باوکی پێدەکەنێو زەردەخەنەی بۆ دەکات! باوکی منالەکە لەخۆشیاندا ژنکەی لەخەو هەڵساندو ژنەکەی هەڵساو ووتی: ئای پیاوەکە ئێستا چ خەونێکی سەیرم بینی، ووتی: خەونی چی؟ ژنەکە ووتی: لەخەوما هەڵۆیەك لەئاسمانەوە دەهاتو دەیویست دەنوك لەسەری کوڕەکەمان بداتو سەری بکوڵێ، بەڵام بینیم کەوا سێ پشیلە پەلاماریان دەداو هەڵۆکەیان دورخستەوە! ئاخری پشیلەکان هەڵۆکەیان بەزاندو ڕاویان نا! باوکی منالەکە ووتی: ئافرەت خەونەکەت تەعبیرو لێکدانەوەی خەوننامەی ناوێو بەسەرهاتەکەی لەگەڵ پشیلەکاندا لەکاتی چوون بۆ نوێژی بەیانی بەسەری هاتبوو بۆ

گێڕایەوە!.. بەڵێ ئەو سێ پارچە گۆشتە بەو نیەتە خاوێنەوە کەتەنها لەبەر خاتری خوابوو بۆ ئەوسێ پشیلەیە، خوای گەورە قبوڵی کردو شیفای کوڕەکەی نارد.

بەڕێزان: بوارێکی تری نیەتی پاك. لەبواری خێزاندایە. لەژیانی هاوسەریدایە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (وفي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَة). لەجووت بوونی هەریەکەتان لەگەڵ خێزانی حەلاڵی خۆی دا، ئەجرو پاداشت هەیە. بەلاّم پێویستە ئەم نیەتە خاوێنانە لەناو دڵو دەرونی ئەو ژنو پیاوەدا بن. کەجووتبوونی شەرعی ئەنجام دەدەن!..

١. پاراستنی دینەکەی. بەوەی کەلە ڕێگە شەرعیەوە. کەبەنیکاحی شەرعی ژیانی هاوسەری پێکهێناوە، خۆی لەداوێن پیسی و ناشەرعی بپارێزێ.

٢. ڕازی کردنی دڵی هاوژینەکەیو ئەنجامدانی کاری شەرعی لەگەڵی بۆ ئەوەی لەخراپە بیپارێزێو مافی هاوسەرێتی لەبواری سەرجێگایی دا لەگەڵ جێبەجێ بکات.

٣. گەیشتن بەنەوەی صالحو منالی خواناس کەلەم جیماعە شەرعیەوە دروست دەبێ.

ئەمە کەبەم نیەتە پاکەوە لەگەڵ هاوسەری جووت دەبێ دەیان و سەدان چاکەی بۆ دەنوسرێ. کەسێکی تریش تەنها مەبەستی لەزەت وەرگرتنە، ئەو ئەجرەی بۆ نانوسرێ.

هەروەها لەسەر نانخواردن: (ولَسْتَ تُنْفِقُ نَفَقَةً تَبْتَغي بِها وجْهَ اللهِ إلا أجَرَكَ اللهُ بِها حَتَّي اللُّقْمَةُ تَجْعَلُها في فِيِّ إمْرَأَتِكَ).

واتە: تۆ هەرشتێ ببەخشی بەلاّم مەبەستت ڕەزامەندی خودا بێ، ئەوا خوای گەورە پاداشتت دەداتەوە، تەنانەت ئەو پاروەش کەتۆ دەیخەیتە دەمی خێزانەکەتەوە. سەرنجی فەرمودەکە بدەن کەدەفەرموێ: (تَبْتَغي

بِها وجْهَ اللهِ). لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوا ئەم پاروە بخەیتە دەمی خێزانەکەتەوە. هاوبەشی ژیانتەوە. بەم نیەتانە:

١. منداڵەکانت چاویان لێ بێ و لەوکارەوە فێری خۆشەویستی و ڕێزی دایکیان ببن.

٢. خۆشەویستی دروست ببێ لەناوخێزانداو تامو چێژی زیاتر لەنان خواردنەکە بکەن.

٣. بەم پاروە نانە کەمێردەکە بەدەستی خۆی دەیخاتە دەمی ژنەکەیەوە. بەزمانی حاڵ پێ ی دەڵێ: ئەی هاوسەرم نەك منەتت بەسەردا ناکەم کەکاسپیم کردوەو ئەم نان و خوانەم بۆ ئامادە کردون. بەڵکو ئەم سفرەو نان و خوانە بەهۆی ئێوەوە خوای گەورە بەمنی بەخشیوە، ... دەی ئەم نان خواردنە بەم کۆمەڵە نیەتەوە کەعادەتەو مرۆڤ بەبێ نان خواردن نازی دەبێتە عیبادەت.

کەواتە: موسوڵمان لەسەر سفرەشی وەکو مزگەوتێکی بچکۆلانە هەر لەعیبادەتایە. بەڵام کەسێکی تریش پارو دەخاتە دەمی خێزانیەوە. بەڵام هەروەکو لاسایی کردنەوەی ئەوروپیەکان ئەم کارە دەکات. نەك بەو نیەتە جوانانەی کەباسمان کردن، هیچ پاداشتی بۆ نانوسرێ!. کەواتە: بەڕاستی دەوری نیەت لەکارەکاندا دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی پاداشت یان نا.

ئیمانداران: زانایان فەرمویانە: (الجَمْعُ بَيْنَ النِّياتِ في العَمَلِ الواحِدِ تِجارَةُ العُلَماءِ الرَّابِحَةِ). کۆکردنەوەی چەند نیەتێکی پاك و جوان لەیەك کردەوەدا. بازرگانی قازانجکردوی زاناو شارەزایانە بەشەرع.

بۆ نمونە: دانیشتن لەناو مزگەوتدا، کەسێك لەناو مزگەوتدا دادەنیشێ و ئەم نیەتانەی هەیە:

١. ئەوەی لەناو دڵدایە. کەمزگەوت ماڵی خوایەو ئەم دەبێتە میوانی

خوا.

٢. بەونیەتەوە لەمزگەوتا دانیشتوەو چاوەڕێ ی نوێژی جەماعەت دەكات. كەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: هەركەسێ لەمزگەوتا دانیشێ بەنیەتی ئەوەی چاوەڕێ ی بانگ بكاو پاشان جەماعەتەكەی بكات. ئەوە وەكو ئەوە وایە بەردەوام لەنوێژ كردندا بێ.

٣. بەنیەتی (الاِعْتِكاف) لەمزگەوتدا بمێنێتەوەو قسەی دونیایی نەكات.

٤. بەنیەتی فێربوونی زانستی شەرعی لەمزگەوتا بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی بەرفەرمودەی پێغەمبەری خوا(ظ) بكەوێت كە فەرمویەتی: (مَنْ غَدا إلي المَسْجِدِ لايُريدُ إلاّ أنْ يَتَعَلَّمَ خَيْراً أَوْ يعَلِّمَهُ كانَ لَهُ كَأَجْرِ حاجٍ تامَّاً حَجَّةً).

واتە: هەركەسێ بڕوات بۆ مزگەوت، هیچ مەبەستێكی نەبێ تەنها ئەوە نەبێ كەفێری چاكەو خێر ببێ، بەگوێگرتن لەووتاری ئایینی مامۆستای مزگەوت یان خێرێك، زانستێك فێری خەڵكی بكات. ئەوە ئەجرو پاداشتی حەجێكی تەواوی بۆ دەنوسرێت، دیارە مەبەست لەحەجی سوننەتە..

٥. بەو نیەتەوە بچێ بۆ مزگەوت كەچاوی بەدۆستانو ئەهلی گەڕەك بكەوێو هەواڵ پرسی موسوڵمانان بكاتو لێیان دانەبڕێو ئەگەر گرفتارێكی بینی هاوكاری بكات.

٦. بەنیەتی تەماحی قیامەتەوە بچێ بۆ مزگەوت، كەهەر نوێژێكی بەجەماعەتی بە (٢٧) نوێژە.

ئەم كەسە بەم نیەتە پاك و جوانانەیەوە دەیان چاكە بەدەست دێنێ، لەكاتێكا كەسێكی تریش، هەروەكو ئەم هاتووە بۆ مزگەوت، بەڵام زۆر پەلەیەتی كەزوو جەماعەتەكەی بكات و بڕوات. یان تەنها بۆ ئەوە هاتووە نوێژە جەماعەتەكەی بكات و بڕوات. ئەوە كەسی یەكەم كەئەو (شەش) نیەتەی هەبوو. پێنج قاتی ئەم كەسەی دووەم كەتەنها

هەریەك نیەتی لەدڵدا بووە. ئەجرو پاداشتی بۆ دەنوسرێ لەکاتێکا هەریەك کردەوەشیان کردوە!!..

نمونەیەکی تر: عەتر بەخۆکردن و خۆ بۆنخۆش کردن: ئەمە خۆی لەخۆیدا موباحە. بەڵام موسوڵمانی ژیرو بەئاگا دەتوانێ بەم نیەتانە. چەندین چاکەی پێ بەدەست بێنێ:

١. بەو نیەتەوە عەتر بەخۆی بکات کەسوننەتی پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێ).

٢. بەو نیەتەوە خۆی بۆنخۆش بکات کەپێغەمبەری خۆمان (ﷺ) پێی خۆشبوەو فەرمویەتی: (حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنياكُمْ ثَلاثٌ: الطِّيبُ، والنِّساءُ، وقُرَّةُ عَيْني في الصّلاة). واتە: خۆشەویست کراوە لەو دنیایەی ئێوە، بەلای منەوە سێ شتی، سۆمای چاوەکانم لەنوێژەکانمدایە، ئافرەتی ڕێکو پێكو دیندار، بۆنی خۆش. دەی تۆ بەو نیەتەوە عەتر بەخۆت بکەی کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ ی خۆش بووە.

٣. ڕێزگرتنی فریشتەکان. لەبەر ئەو فەرمودەیەی کە خۆشەویستمان دەفەرموێ: (إنَّ المَلائِكَة تَتَأَذّي مِمّا يَتَأَذَي مِنْهُ ابْنُ أَدَمَ). رَواهُ البُخاري وَمُسْلِمْ.

واتە: بەڕاستی فریشتە، ناڕەحەت دەبێو ئازاری پێ دەگات بەوەی کەمرۆڤ پێی ناڕەحەت دەبێ. دەی بێگومان مرۆڤ بەبۆنی خۆشو چڵكو چەپەڵی ئازاری پێ دەگاتو پێ ی دڵگرانو ناڕەحەت دەبێتو بەبۆنی خۆشیش شادمانو دڵ گوشاد دەبێتو فریشتەش بەهەمان شێوە... جاتۆ بەو نیەتە عەتر بەخۆت بکەی کەفریشتەکان پێی شادبن.

٤. ئەو کەسەی کەلای دادەنیشێ بۆنی خۆشی بۆ بچێ، ئەوەش هەر صەدەقەیە.

٥. بەونیەتەوە خۆی بۆن خۆش بکات کەعەقڵی زیاد بێ، چونکە

وتراوە: (مَنْ طابَ رِيحَهُ زادَ عَقْلَهُ) هەرکەس بۆنی خۆش بێ، عەقڵیشی زیاد دەکات.

٦. بەونیەتەوە بۆنی خۆش بەخۆی بکات. کەدەرگای غەیبەت کردن لەسەری دابخات. هەرکەس خۆی والێبکات کەغەیبەتی بکرێ بشتوانێ خۆی بپارێزێ لەوەی کەغەیبەتی بکرێ (بۆنمونە کەسێك چڵکو چەپەڵی پێوە بێو خۆی نەشوات، تاوای لێ بێ خەڵکی لەبەر بۆگەنی لاشەی بێزار بنو ناچاربن کەپاشملە باسی بکەنو غەیبەتی بکەن. لەکاتێکدا کەدەیتوانی خۆی بشواتو خۆی پاکوخاوێن ڕابگرێو خۆی بۆنخۆش بکاتو خەڵکی زەمی نەکەنو غەیبەتی نەکەن، کەسێك ئاوا لەخۆی بکات کەخەڵکی ناچار بەغەیبەت کردنو پاشملە باسکردن ببن، ئەوە ئەو کەسە غەیبەتکراوە هاوبەشی گوناهی ئەو غەیبەتکردنەیە، کەغەیبەتیان کردووە!)

بەڵێ ئەم کەسە کەبەم (شەش) نیەتەوە عەتر بەخۆی دەکات و خۆی بۆنخۆش دەکات إنشاءالله دەیان و سەدان ئەجرو پاداشتی لای خوا بۆ دەنوسرێ.

لەبەرامبەردا: کەسێکی تر. هاوتەمەنو هاوپیشەی ئەو، بەهەمان عەتر خۆی بۆنخۆش دەکات. بەڵام ئەم بەنیەتی ئەوە خۆی بۆنخۆش دەکات کە: سەرنجی ئافرەتی نامەحرەم بۆلای خۆی ڕابکێشێ، وە تەکەبوری پێوە لێبدات بەسەر خەڵکیدا. ئەمەیان دەیان گوناهو خراپەی لەسەر دەنوسرێ. بەهۆی ئەو خۆ بۆنخۆشکردنەوە.

بەڵێ هەریەك کردەوە بەهۆی نیەتەوە چاك یان خراپ دەبێ.

بەڵێ ئیمانداران: نیەتی ناو دڵی مرۆڤ، چ چاك بێ چ خراپ هیچی کەمتر نیە لەکردەوەکە. کەئەو مرۆڤە لەژیانیدا ئەنجامی دەدات. پێغەمبەری سەرومرمان (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّما الدُّنيا لِأَرْبَعَةِ نَفَرٍ). دونیا

بۆ چوار کەسە، چوار جۆر لەمرۆڤ لەدنیادا هەن. هەموو ئەو خەڵکە لەم تەوەرەیەدا دەسوڕێنەوە:

١. عَبْدٌ رَزَقَهُ اللهُ مالاً وعِلماً، فَهو يَتَّقي رَبَّهُ فيهِ، ويَصِلُ بِهِ رَحِمَهُ، ويَعْلَمُ لِلّهِ فيهِ حَقاً، فَهذا بِأفْضَلِ المَنازِلِ.

واتە: بەندەیەکە کەخوای گەورە ماڵو سەروەتو سامانی پێ بەخشیوە. وەلە گەڵیا زانستیشی پێ بەخشیوە، زانست بەمانای دەزانێ حەڵاڵو حەرام چییەو مافی فەقیرو هەژاران لەماڵەکەیدا چیە وەکو زەکات و صەدەقەی سوننەتو زانایە بەقیامەت و موحتاجی قیامەتیو بەم سامانەی زیاتر خۆی بۆ خواپەرستی یەکلایی دەکاتەوەو یارمەتی خزمو کەس و کاری خۆی پێ دەداو هەموو خزم و نزیکانی لەماڵەکەی ئەم سودمەندبوون، بەڕاستی ئەم جۆرە کەسە لەبەرزترینو باشترین مەنزڵو جێگاو پلەوپایەدایە. لەدونیاو لەقیامەتدا.

٢. وعَبْدٌ رَزَقَهُ اللهُ عِلْماً، ولَمْ يَرْزُقْهُ مالاً، فَهُو صادِقُ النِّيَةِ، يَقولُ: لَوْ أَنَّ لِي مالاً لَعَمِلْتُ فيهِ بِعَمَلِ فُلانٍ، فَهُو بِنِيَّتِهِ، فأَجْرُهُما سَواءِ.

واتە: جۆری دووەم لەمرۆڤەکان. بەندەیەکی خوایە. کەخوای گەورە زانستی پێ بەخشیوە. زانست بەمانای ئەوەنا شەهادەی هەبێ. خوێندەوار بێ. نەخێر، چونکە زۆرکەس هەیە شەهادەی باڵای هەیە. بەڵام ئەم زانستەی نیە کەفەرمودەکە باسی دەکات. ئەم زانستەی ئەم بەندەیە هەیەتی ئەوەیە کە: دەزانێ هەموو شتێ هی خوایەو ئازایەتی مرۆڤی تێدانیی یەو بۆتاقیکردنەوە دەیخاتە دەستی بەندەکانی. دەزانێ مافی خوا لەماڵو ساماندا چییەو سیلەی ڕەحمو خزمایەتی چەند گەورەیە. ئەمانە هەمووی دەزانێ بەڵام ماڵو سامانی نییە. بۆیە کاتێ دەوڵەمەندێکی خواناس. دەوڵەمەندێکی دڵ دەوڵەمەندی بەرچاو تێردەبینێ وا بەهەموو لایەکا ماڵەکەی لەخزمەتی ئیسلامو

موسوڵمانانندا خەرج دەكاتو زەكات دەداتو یارمەتی ئەم هەتیوو ئەو هەژارو ئەو نەخۆش دەداو فرمێسكی چاوی ئەم دەسڕێ و زەردەخەنە دەخاتە سەر لێوی ئەم غەمبار، یارمەتی ئەو خزمی دەداو سەردانی ئەو دۆستی دەكات لەبەرخوا. ئەمیش كەماڵی نییە، بەڵام ئەم دەوڵەمەندە سەخی یە دەبینێ، دەڵێ: خۆزگە خوایە منیش ئاوا سەروەتو سامانی حەڵاڵم ببوایەو وەكو فلان كەسی خێرەومەند، منیش دەستی بەخشینم ببوایەو دەستبارێكی ئەو برا دەوڵەمەندەم بدایەو منیش لەگۆشەیەكەوە خەریكی خزمەتی ئیسلامو موسوڵمانان بومایە. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: هەرچەندە ئەم پیاوە هیچی نیە، وەهیچی نەكردووە بەخێرو یارمەتی كەسی نەداوە، بەڵام خوای گەورە كە ئاگادارە بەخەتەرەی ناو دڵەكان، ئاگادارە كەئەم بەندەیە ئەم خۆزگەو ئاواتەی لەناخی دڵەوە دێ و ئەگەر ماڵو سامانی هەبوایە ئاوا وەكو ئەو دەوڵەمەندەی كەئەم خۆزگەی پێ دەخوازێ، ئاوا خێرەومەندو پیاوچاك دەبوو. خوای گەورە بەنیەتی پاك و ڕاستی خۆی پاداشت بۆ ئەمیش دەنوسێو ئەمو ئەمو كەسی یەكەم لەپاداشتا وەكویەكن!! ... سُبْحانَ الله لەبەرەكەتی نیەتی خاوێن.

٣. وعَبْدٌ رَزَقَهُ اللهُ مالاً، ولَمْ يَرْزُقْهُ عِلماً، فَهُوَ يَخْبِطُ في مالِهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ، لايَتَّقي فيهِ رَبَّهُ، ولايَصِلُ فيهِ رَحِمَهُ، ولايَعْلَمُ لِلّهِ فيهِ حَقّاً فَهُو بِأَخْبَثِ المَنازِلِ ...

واتە: جۆری سێ یەم كەسێكە كەخوای گەورە ماڵو سامانێكی زۆری پێ بەخشیوە. بەڵام زانستی نیە. زانستی حەڵاڵو حەرام نازانێ. ئەم ماڵە بەهی خوا نازانێ. (جاهی واهەیە چەندین شەهادەی بەرزی لەزانكۆ بەناوبانگەكان وەرگرتوە. بەڵام نەزانە، بەپێی ئەم فەرمودەیە. چونكە عیلمی حەڵاڵو حەرام نازانێ). ئیتر ئەم دەوڵەمەندە بەڵام لەدینو ئیمانو ویژدانا هەژارو فەقیرە. شێتانە دەكەوێتە تەخشان پەخشانی

ئەم ماڵو سامانەی. بەڵام بۆ خێرنا. بەڵکو بۆ شەڕو خراپەو ناشەرعی، ئەم دەوڵەمەندە بێ دینە، خوا لەخۆی دەڕەنجێنێ. بەعەرەق خۆری و قومارچیەتی و خراپەکاری و سیلەی ڕەحم جێبەجێ نەکاتو مەرحەبای خزمێکی، براو خوشکێکی هەژاری ناکات. وەئەگەر مەرحەبای بکەن جوابیان ناداتەوە، دەڵێ نەوەك داوای پارەم لێ بکەن. زۆرجار براو خوشكو کەسوکاری هەژاری دەست کورتی ئەم دەوڵەمەندە. بونەتە قوربانی سەروەتو سامانەکەی ئەم. چونکە خەڵکی خێرخوازیش یارمەتیان نادات. چونکە دەڵێ: چۆن برای فلاّن کەس، ئامۆزای فلاّن کەس هەژارو موحتاجەو پارەی عەیادەی دکتۆرێکی پێ نییە. خۆفلاّن کەسی برای، یان ئامۆزای. لەیەك دەعوەتی عەرەق خۆری دا. لەفلاّن سەیرانگا چەندین (گەلاّ)ی صەرف کرد بۆ هاوڕێکانی!! بەڵام نازانێ تا ئێستا نازانێ براو خوشکەکەی، خزمەنزیکەکەی لەکام گەڕەگ کرێ چیە، چونکە دەرگای ماڵی نەکردۆتەوە!!، وە ئەم دەوڵەمەندە بێ دینە، هەرنازانێ زەکات چی یەو مافی فەقیرو هەژار هەیە یان نا!..

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەم کەسە خراپترین جێگاو مەنزڵو پلەی هەیە، لەدنیاو قیامەت دا، چونکە بەماڵی خۆی ماڵی خۆی وێران کرد..

٤. وَعَبْدٌ لَمْ يَرْزَقَهُ اللهُ مالاً، ولا عِلْماً، فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مالاً لَعَمِلْتُ فيهِ بِعَمَلِ فُلانٍ، فَهُو بِنِيَّتِهِ، فَوِزْرُهُما سواء ...

واتە: جۆی چوارەم کەسێکە نەماڵو سامانی هەیە. نەدینداریو خواناسیو ناسینی حەلاڵو حەرام. گیرفانی پوچە، دڵی پوچە لەئیمان. بەڵام بەردەوام هەر لەخەیالاّتدایەو تەماشای ئەو دەوڵەمەندەی سێیەم دەکات کەباسمان کرد چۆن شێتانە ماڵەکەی لەبێ فەرمانی خوادا خەرج دەکاتو هەر خەریکی عەرەق خۆری و خراپەکاری یە. ئەمیش بەگیرفانی بەتاڵو دەمی ووشکەوە دەڵێ: ئای خۆزگایە

منیش وەکو فلان کەس ماڵو سامان و سەیارەم هەبوایە. ئاوا هەر ڕۆژەی لەسەیرانگاو ڕێستۆرانتێك خەریكی عەرەق خۆریو ڕەقسو سەماو قومارکردن بومایە لەگەڵ ئەو برادەرانەو پاشان بەئوتومبیلە دوا مۆدیلەکەم پۆزم بەسەر خەڵکدا لێدایەو براکەم لەداخان شەقی ببردایەو خزمەکەم لوتی بشکایە! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ئەم کەسەش بەکردەوە هیچ خراپەیەکی نەکردوە، بەڵام خوای گەورە ئاگای لەنیەتی ناو دڵیەتی، کەچەند بەدڵ ئەم خۆزگەیە دەخوازێو ئەگەر ماڵو سامانی هەبێ، ڕێك وەکو فلان کەس بێشەرعی دەکات. ئەمیش بەم نیەتە پیسەی خۆی هەمان گوناهی لەسەر دەنوسرێو لەتاوان و گوناهباریدا لەگەڵ دەوڵەمەندە بێ دینەکەدا وەکو یەکنو یەکسانن..

جا بەڕێزان دەبێ زۆر ئاگاداری نیەتی ناو دڵەکانمان بین، ئاها چەند مەترسیدارە نیەتی خراپو خۆزگە بەبێ دین خواستن! لەبەرئەوە ئامان باخوشكێك خۆزگە نەخوازێ کەوەکو فلان ئافرەتی سەر تەلەفیزیۆنەکە، دوا مۆدی جلی سفوری ناشەرعی لەبەردا بوایە وەکو ئەو خۆی دەرخستایە. چونکە ئەم تاوانەی لەسەر دەنوسرێ، لەبەرئەوە ئەگەر بۆی بلوایەو دەرفەتی بۆ بڕەخسایە، ئاوای دەکرد، یان گەنجێك تەماشا دەکات کەسێك بەفیزو دەعیەو تەکەبورەوە لەئۆتۆمبێلێکی گرانبەها دادەبەزێو چەند حیمایەو پاسەوان لەملاولایەوە دەڕۆن و لوتی لەئاسمانەوەو سەلام لەخەڵك ناکات و فەرمان دەردەکات. ئەمیش بەپێ دەڕواو هیچی لەگیرفاندا نی یەو بەحیمایەش قبوڵی ناکەن، کەچی لەناخەوە خۆزگە بەو دەوڵەمەندە بێ دینە موتەکەبیرە دەخوازێ کەوەکو ئەو بوایەو ئاوا ڕەفتاری بکردایە. بەڕاستی ئەگەر تەوبە نەکات. بەو نیەتەی ناودڵی وەکو ئەو خراپەکارە گوناهی لەسەر دەنوسرێ!...

**بەڵێ ئیمانداران: بەسە بۆ گەورەیی نیەت کەلەفەرمودەی نیەت کەلەفەرمودەی سەروەرماندا هاتووە:**

(يُحْشَرُ النّاسُ عَلي نِيّاتِهِمْ)، يان: (يُبْعَثُ النّاسُ عَلي نِيّاتِهِمْ).

**خەڵکی بەنیەتی ناو دڵیان حەشر دەکرێن، یان زیندوو دەکرێنەوە.. بەڵێ نیەت ئەوەندە گەورەو گرنگە. کاتێك کەسێك نیەتی هێناوە بچێ بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، بەڵام لەماڵەکەی خۆیدا کتوپڕ مردوە، لەگەڵ ئەو کەسەی کەلەناو مزگەوتا لەنوێژدا مردووە، وەکو یەك حەشر دەکرێن!!!.**

**ئیماندارانی بەڕێز: پرسیارێکی زۆر گرنگ هەیەو بەمێشکی هەموو مرۆڤێکدا دێت، ئەویش ئەوەیە: باشە بۆچی کافر هەتا هەتایە لەجەهەنەمدا دەمێنێتەوە؟! باشە ئەگەر کافرێك تەمەنی (٧٠) ساڵ بێ. ئایا ئەگەر (٧٠) ساڵ لەجەهەنەمدا مایەوە بەس نی یە و ئیتر بمرێ و ڕزگاری ببێ لەو عەزابەی کەباس ناکرێ؟! لەوەڵامدا دەڵێین:** واللهُ أَعْلَم.

**لەبەر نیەتی ناودڵی کافرەکەیە. چونکە ئەو کافرە نیەتی ئەوەی هەبووە، ئەگەر هەتا هەتایە بژی و هەرگیز نەمرێ، هەر لەسەر ئەو کوفرو بێ باوەڕیەی خۆی بێ، بۆیە بەو نیەتەی ناودڵی وەکو ئەوە وایە کەهەتا هەتایە خراپەو کوفری کردبێ، قورئان دەفەرموێ:** ﴿ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾ الأنعام: ٢٨.

**موسوڵمانیش بەهەمان شێوە نیەتی وایە کەهەتا هەتایە لەسەر نیەتی خواناسیو هاتوچۆی مزگەوتدا بژی، کەواتە: بەم نیەتە پاکەی بەردەوام ژیانی لەبەهەشتدا نەمری دەبێو ئەمە نهێنی ئەوەیە کەژیانی بەهەشتو دۆزەخ نەمریو هەتاهەتاییە.**

**کۆتایی ووتارەکەمان بەم ووتە شیرینو بەهێزو بەپێزانەی (قازی**

**بەیضاوی) دێنین کەفەرمویەتی:** (الَاَعْمالُ لاتَصِحُّ بِلا نِيَة، لَانَّ النِيَّةِ بِلا عَمَل، يُثابُ عَلَيْها، والعَمَلُ بِلانِيَّة هَباء، ومِثالُ النِّيَةِ في العَمَلِ كالروحِ في الجَسَدِ، فَلا بَقاءَ لِلْجَسَدِ بِلارُوح، ولا ظُهُورَ لِلْرُّوحِ في هذا العالَمِ مِنْ غَيْرِ تَعَلُّقٍ بِجَسَدٍ) ...

**واتە: کردوەکان بەبێ بوونی نیەتی پاکوخاوێن دروست نابنو لای خوای گەورە قبوڵ نابن، لەبەرئەوەی نیەتی باش، ئەگەر کردەوەکەشی لەگەڵ ئەنجام نەدرێ، پاداشتی لەسەر دەدرێتەوە. بەڵام کردەوەی چاك بەبێ بوونی نیەتی پاك بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە. تۆزی بابردوە، نمونەی نیەت لەناو کردەوەدا وەکو نمونەی ڕوحە لەجەستەدا، دەی مانەوە نیە بۆ جەستەیەك کەڕوحی تیا نەمابێ. دوای چەند سەعاتو چەند ڕۆژێ بۆگەن دەکاتو دەپوکێتەوە. ڕوحیش شوێنەوای دەرناکەوێ لەم گەردونەدا. لەم جیهانەدا. بەبێ ئەوەی کەلەجەستەیەکدا بێ-مەبەستی ئەوەیە زۆرکەس دەڵێ، هەر نیەت حیسابە. من دڵم پاکەو دڵم باشە. بەڵام بەکردەوە نایکەم، دەی چۆن گەورەیی‌و گرنگی ڕوح لەجەستەدا نەبێ نابینرێ، نیەتی باش‌و دڵی پاکیش دەبێ لەکردەوەدا دەرکەوێ. وەکردەوە کە بیسەلمێنێ کەبەرهەمی ئەو نیەتە پاکەی ناودڵی ئەو مرۆڤەیە ...**

**خوای پەروەردگار ڕەحممان پێ بکاو کردەوەکانمان شەرعی بێ‌و نیەتمان پاکوخاوێن بێ‌و دڵمان پڕ لەئیخلاص بێ بۆ خوای گەورە..** أمین.

سەرچاوەکان:

١. حَدیْثُ الأِخْلاص، د. السِّید العَفّاني، **٣٤ص، ٥١ص، ٤٦ص، ٧١ص، ٢٦ص.**

٢. الوافي في شَرْح الأَرْبَعين النَوَوِيَّة، د. مصطفى البغا، محيالدِّين مستو، ص٤١.

# ووتاری پێنجەم

# بۆ مانگی موحەڕڕەم

# گەورەیی و بەرەکەتی

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم

## بەشی یەکەم

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانداران: كاتێ قورئانی پیرۆز دەكەیتەوە. یەكەم ووشە، یەكەم ڕستە، یەكەم ئایەت كە دێتە بەرچاوت،** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **... قورئانی پیرۆز كەبە** (بِسْمِ الله) **دەستی پێ كردوە، دەیان و سەدان نهێنی گەورەی لەخۆ گرتووە. بۆ نمونە** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **لە (١٩) نۆزدە پیت پێك هاتووە. جائەم (١٩) پیتە وەكو كلیلێك وایە بۆ كردنەوەی سورِەتەكانی قورئان و چەندین نهێنی لەخۆی گرتوە. وەكو ئەوەی كە:** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **لەچوار برِگە پێكهاتووە.** (إِسْم، الله، الرَّحْمن، الرَّحيم). **جا سەرنج بدە دەبینی هەریەك لەم چوارە. لەقورئاندا (١٩) جار یان چەند جارەی (١٩) هاتووە. ئەوەتا ووشەی:** (إِسْم) **لەهەموو قورئاندا (١٩) جار هاتووەو دابەش دەبێ بەسەر (١٩) پیتەكەی** (بِسْمِ الله) **دا.**

**- ووشەی** (الله) **لەهەموو قورئاندا (٢٦٩٨) جار هاتووەو دابەشی (١٩) دەبێو دەكاتە (١٤٢).**

**- ووشەی** (الرَّحْمن) **لەقورئاندا (٥٧) جار هاتووەو ئەگەر دابەشی (١٩) ی بكەی یەكسان دەبێ بە (٣).**

**- ووشەی** (الرَّحيم) **لەقورئاندا (١١٤) جار هاتووەو دابەشی (١٩) دەكاتە (٦) ...**

**هەروەها** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **بۆ خۆیشی (١١٤) جار لەقورئاندا هاتووە. كە قورئان (١١٤) سورِەتە. بەلاَم خۆ سورِەتی** (التَّوْبَة)، (بِسْمِ الله) **ی لەسەرەتاوە نیە. كەواتە دەبێتە (١١٣) جارو ئەمەش دابەشی (١٩) نابێ. بەلاَم نەخێر ئەمە كەلامی خوایەو نابێ كەم و كورتی لەهیچ بوارێكەوە تێدا بێ. بەم بواری حیسابو بیركاریە وردەشەوە. بۆیە لەسورِەتی** (النَّمل) **دا، لەئایەتی (٣٠)دا، لەباسی نامەكەی حەزرەتی**

**(سولەیمان) دا دەفەرموێ :** (إِنَّهُ مِنْ سُلَيْمانَ، وَأَنَهُ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم)، **بەم شێوەیە** .(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **لەقورئاندا بوو بە (١١٤) جارو بەبێ ماوە دابەش دەبێ بەسەر (١٩)دا، کەژمارەی پیتەکانی** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **خۆیەتیو دەکاتە (٦) ..**

**پاکیو بێگەردی بۆ خوا، چ ئامارێکی ووردە، ئایا دەگونجێ ئەمە هەروا لەخۆیەوە بوبێتو بەمەبەست دانەڕێژرابێت، کەئەمڕۆ لەسەردەمی پێشکەوتنی زانستی دا. ئەم إعجازەی قورئان زیاتر ئاشکرا دەبێو دڵی عاشقانی قورئانی زیاتر پێ دەکرێتەوەو دەگەشێتەوە.**

**ئیمانداران: ئەو پیتانەی کەهەندێ لەسورەتەکانی قورئانی پێ دەست پێکراوە. کەبە(پیتە لەیەك پچڕاوەکان) ناو دەبرێن. هەندێ کەس ڕەنگە ڕەخنەی گرتبێ کەبۆچی ئەم قورئانە ئەم ووشانەی لەسەرەتای هەندێ سورەتدا داناوەو هیچ ماناش نابەخشێ، بەڵام مرۆڤی ئیماندار دڵنیایە. کەئەمە فەرمایشتی خوایەو دەستی مرۆڤی تێدا نیەو بەبێ هۆ ئاوا دانەنراون. یەکێ لەو حیکمەتانەی کەئێستا بۆ زانایانو توێژەرانی قورئان ڕوون بۆتەوە ئەوەیە. کەهەریەك لەو پیتانەی سەرەتای سورەتەکان، پەیوەندیەکی پتەویان بە (١٩) پیتەکەی** (بِسْمِ الله) **وە هەیەو کۆی ئەو پیتە لەو سورەتەدا بەبێ ماوە دابەش دەبێ بەسەر (١٩)دا. بۆ نمونە: پیتی (ق) کەسەرەتای سورەتی**(ق، والقُرْأنِ المَجيد) **ی پێ کراوەتەوەو سورەتەکەشی پێوە ناونراوە، پیتی (ق) لەو سورەتەدا (٥٧) جار هاتووە. ئەگەر دابەشی بکەین بەسەر (١٩) دا. یەکسانە بە (٣).**

**بەڕێزان: زۆر بەوردی سەرنج بدەن. لەقورئاندا هەمیشە کەباسی گەلی** (لوط) **پێغەمبەر دەکات. هەر دەفەرموێ** (قَوْمُ لُوط). **تەنیا لەسورەتی** (ق) **دا نەبێ لەجیاتی** (قَوْمُ لُوط) **دەفەرموێ:** (إخوانُ لُوط)!!

ئەزانن بۆچی؟! لەبەرئەوەی ئەگەر لەوێشدا بیفەرموایە (قَوْمُ لُوط). ئەوا ئەوکاتە ژمارەی (ق)کانی سورەتەکە دانەیەك زیادی دەکردو ئەبوو بە (٥٨)، لەجیاتی (٥٧). ئەو کاتەش دابەش نەدەبوو بەسەر (١٩) دا. لەسورەتی (ق)دا. جیاواز لەهەموو قورئان دەفەرموێ:﴿ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَانُ لُوطٍ ﴾ق: ١٣

هەروەها: ئەو سورەتانەی کەبەپیتێکی دیاری کراو دەست پێ دەکەن، لەو سورەتەدا. ئەو ووشانەی زۆر تێدایە کەئەو پیتەیان تێدایە، وەکو ئەوەی ئەگەر بەوردی سەرنج بدەی دەبینی لەسورەتی (ق)دا، پیتی (ق) بەرێژەیەکی بەرچاو لەو سورەتەدا هەیە. لەسورەتی (ن)دا. پیتی (ن) زۆر زۆرە لەو سورەتەداو بەهەمان شێوە لەسورەتی (ص) لەپیتەکانی تر زۆرتر بەکارهاتووە!!..

ئیماندارانی بەڕێز: سەرنج بدەن لەسورەتی (ص)دا، (١٥٢) جار پیتی (ص) هاتووە. کە (١٥٢÷١٩=٨) بەبێ ماوە دابەش دەبێ!!..

وەهەروەها لەسورەتی (ن)دا. پیتی (ن) (١٣٣) جار هاتووە: (١٣٣÷١٩=٧) ئەمیش بەبێ ماوە دابەش دەبێ. ئەمە ئەو سورەتانەی کەبەیەك پیت دەست پێ دەکەن. پاشان دەچینە سەر ئەو سورەتانەی کەبە (دوو) پیت دەستیان پێ کردووە. وەکو (طه). کەلە پیتی (ط) لەگەڵ (هاء) پێکهاتووە. بەهەردوکیان (٣٤٢) جار لەسورەتی (طه) دا دووبارە بوونەتەوە. (٣٤٢÷١٩=٨) بەبێ ماوە دابەش دەبێ بەسەر (١٩) دا!!..

یاخود لەسورەتی (یس) دا. کەبە دوو پیتی (ی) لەگەڵ (س) دەستی پێ کردووە. دەبینی ئەم دوو پیتە بەهەردوکیان (٢٨٥) جار لەسورەتی (یس) دا هاتوون، دەی تەماشا کە (٢٨٥÷١٩=١٥) بەبێ ماوە دابەش بوو!!.

دواتر بەڕێزان: سەرنجی ئەو سورەتانە بدەن کەبە (چوار) پیت دەست پێ دەکەن وەکو چوار پیتی (المر). کەلە چوار پیتی (ئەلف)،

(لام)، (میم)، (ڕاء) پێکهاتووه .. ئەم چوارپیتە لەو سورەتەدا کەبە (المر) دەستی پێکردووە. کەسورەتی (الرعد). بەهەر چوار پیتەکە (١٥٠١) جار لەسورەتی (الرعد) هاتوون. دەی (١٥٠١÷١٩=٧٩). بەبێ ماوە دابەش دەبێ بەسەر (١٩)دا !!! ئایا ئەمە ئەگەر کەلامی خوا نەبێ هەموو بیرکاری زان و کۆمپیوتەری جیهان هەیە. دەتوانێ شتێکی بیرکاری ئاوا وورد دروست بکات؟!

بەهەموو دڵنیاییەکەوە نەخێر. ئیتر چۆن پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار کەهیچ شارەزاییەکی لەبواری (بیرکاری)دا نەبووە. دەتوانێ ئاوا بەووردی قورئان دابڕێژێ؟! کەواتە: ئەم قورئانە کەلامی خوایەو دوورە لەدەستی مرڤو حەزرەتی محمد (ﷺ) تەنها ڕاگەیەنەرێتی.

ئیمانداران: یەکەم سورەتی قورئان کەهاتە خوارەوە، سورەتی (العَلق) بوو. جائەگەر تۆزێ وورد سەرنجی ئەم یەکەم سورەتەی قورئان بدەین دەبینین کە: چەند ووردەکارییەکی گرنگی تێدایە. وەکو:

١. ژمارەی ئایەکانی (١٩) ئایەتە.

٢. یەکەم بەشی کەیەکەمجار هاتۆتە خوارەوە، تەنها (١٩) ووشەیە، جگە لە پیتەکانی (جەڕو عەطف) کەبە ووشە حیساب ناکرێن.

٣. سورەتی - العَلق - نۆزدەهەمین سورەتیشە کەلەکۆتایی سورەتەکاندا.

بەڵێ، ئەمە هەمووی لەوپەڕی ووردەکاریدایەو کاری ڕێکەوت نیەو بەڵکو تەقدیرو تەدبیری خوای کاربەجێ یە ...

بەڵێ ئیمانداران: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) پێکهاتووە لە (١٩) پیت، هەرکەسێ بەردەوام (بِسْمِ الله)ی لەسەر دەم بێ، إنشاءالله لە (١٩) زەبانیەکەی جەهەنەم دەپارێزرێ. وەلەبەرئەوەی خوێندنی قورئان پاداشتەکەی بۆ هەر پیتێکی (١٠) چاکەیە. کەواتە هەرکەسێ جارێك بڵێ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) (١٩٠) سەدو نەوەت چاکەی بۆ دەنوسرێ:

**ئای چ بەرەکەتێکە تۆ ڕۆژانە بەسەدان چاکەت بەهۆی** (بِسْمِ الله) **کردنەوە دەستکەوێ، ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا نرخەکەی دەزانی. ئەو وەختەی مرۆڤ موحتاجە بەتەنها یەك چاکەو غەیری کردەوەکانی خۆی. کەس ئامادە نیە چاکەیەکی پێ ببەخشێ.**

**کەواتە: ئیمانداری بەڕێز، هەرکارێکت ئەنجامدا** (بِسْمِ الله) **بکە، چونکە بەرەکەت دەکەوێتە کارەکەتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (كُلُّ أَمْرٍ ذي بالٍ لايَبْدأُ فيهِ بِبِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم، أقْطَع) أَوْرَدَهُ السيُوطي في الجامِع الصَغير.

**واتە: هەرکارێك کەمرۆڤ دەیکات، لەچاکەو خێرو کاروباری دونیایی، ئەگەر بە** (بِسْمِ الله) **دەستی پێنەکات، ئەوە دوابڕاوە.** (أقْطَع)، **بەکلك بڕاو دەڵێن، واتە: کردەوەیەکی ناتەواوەو بەشێکی گەورەی لێ فەوتاوە. چونکە تۆ کاتێك کارێك دەکەی، ئەگەر** (بِسْمِ الله) **نەکەی. غرورو خۆبەزل زانینێك ڕوو لەدڵو دەرونت دەکات، وا هەست دەکەیت کەئەو کارەت بەئازایەتیو شانو شەوکەتی خۆت دەستت پێ کردووەو بەتوانای خۆت ئەجامی دەدەی، بەڵام کە وتت:** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم). **ئەوە تۆ لەسەرەتاوە لەناخی دڵتەوە ئەوە دەردەبڕی کەبەڕاستی سەرکەوتنی من لەم کارەداو بەئەنجام گەیاندنی پەیوەستە بەپشتیوانی خوای گەورە بۆم و هیچ هێزو شان و شکۆیەکی خۆمی تێدا نابینم، بەم شێوەیە تۆ لەخۆبە زلزانینو غرور ڕزگارت دەبێ، وپاشان (١٩٠) چاکەش بەووتنی ئەو** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم)**ە، دەخرێتە تای تەرازووی چاکەتەوە. بەڵام ئەوەی** (بِسْمِ الله) **کە ناکات. ئەو خێرو پاداشتە گەورەی لەدەست دەچێت. دەی ئەگەر دەتەوێ. پاداشتی دونیاو دواڕۆژ وەرگری. ئەوە هەرکارێکت کرد بە** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **دەست پێ بکە.**

**بەڕێزان: ئێمەی موسوڵمان چۆن یەکەم لاپەڕەی قورئانەکەمان.**

یەکەم ئایەتی بە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحیم) دەست پێدەکات پێویستە هەموو کاروبارێکی ژیانمان هەر بە(بِسْمِ الله) دەست پێ بکات. جا چ کاروباری دونیایی بێ، یان عیبادەت و خواپەرستی بێ.

بۆ نمونە: فەلاح، جوتیار، کاتێك کەدەنکە تۆوێك بەزەویەوە دەچێنێ، کەنەمامێك دەنێژێ کەگوێزێك، بادەمێکی ڕەق دەخاتە ژێر خاکەوەو دەڵێ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحیم) ئەبێ ئاگای لێ بێ ئەم (بِسْمِ الله)ی کردنە مانای ئەوەیە تۆ لەناخەوە دەڵێی: خوایە من بەناوی تۆوە ئەم تۆوە دەچێنم، تۆ ئەم زەویەت بۆ ڕام کردوم، ئەو هەموو توخم و پێکهاتەت تێدا هێناوەتە دی. کە گونجاوە بۆ ئەم فەلاحەتو کشتوکاڵو باخ و باخاتە. کەئەو بارانە لەئاسمانەوە دەبارێنێ، کەئەم دەنکە تۆوە کەهەر دەنکەی بەشێوەیەك کەوتوەو تۆ لەژێر ئەو کەرسەك‌و گڵەڕەقەدا، لەو تاریکی زەویەدا ڕاستی دەکەیتەوەو ئەگەر دەنکە گەنمەکە، جۆیەکە، نۆکەکە، سەربەرەو خواربێ، بە (١٨٠) پلە دەسوڕێ‌و ڕەگەکەی بۆ خوارەوەو چەکەرەکەی بۆ سەرەوە دەبێ! خۆ ئەگەر لەسەر لا- تەنیشت- کەوتبێ، ئەوا بەفەرمانی تۆ یا (الله) بە (٩٠) پلە هەڵدەسوڕێ‌و ڕاست دەبێتەوەو ڕەگ دەردەکاو چەکەرەکەی دێتە دەرەوەو سەوز دەبێ، ئایا بەڕێزان، غەیری چاودێری (الله) کێ ئاگای لەو دەنکە تۆوانەیە؟! ئایا ئەگەر ئەم (ڕەحم‌و بەزەییەی خوا کەلە- الرَّحْمن الرَّحیم)دایە. نەبوایە ئایا هیچ جوتیارو فەلاحێك دەیتوانی کیلۆیەك گەنم بچێنێ و یەك یەك دەنکە گەنمەکان لەتاقیگەدا پشکنینیان بۆ بکرێ و لای ڕەگ و چەکەرەیان دیاری بکرێ و بەڕاستی بخرێتە ناو زەویەوەو چەکەرەکەی بۆسەرەوە بێ، ئایا توخوا ئەگەر وابوایە، کەس هەبوو بتوانێ نانی خۆشی پەیدا بکات. نەك هی کەسانی تر؟! بەبێ گومان نەخێر، بەڵام بەڕەحم و بەزەیی خوا، فەلاحێك لەیەك ڕۆژدا چەند تەن تۆو دەچێنێ‌و هەر

بیریش لەوە ناکاتەوە چۆن دەنکە گەنمو جۆیەکان دەچنە ژێر زەویو چۆنو لەسەر چ بارێك دەکەون! پاشان هیچ کارێك لەفەلاحەتی ئاسانتر نییە. ئەو هەموو دانەوێڵە بەو زەویە ڕەقەوە دەکرێو دەکێڵدرێو بەجێ دەهێشترێ، نە ئاودانی دەوێ، نەچاودێری، خوای گەورە لەکاتی پێویستدا بارانی ڕەحمەتی بۆ دەنێرێ وەختێکیش لەکۆتایی بەهاردا پێویستی بەباران نەما، بارانی بۆ نابارێنێ! تەماشاکەو گەورەیی خوا ببینە لەشوێنە گەرمیانەکاندا بەهارێکی زوو باران دەوەستێتەوە، چونکە دانەوێڵەکە پێگەیشتوەو ئەگەر لێی ببارێ، لەناوی دەبات، بەڵام لەناوچە کوێستانەکان هەتا بەهار نزیکی کۆتایی دەبێتەوە، هەر دەبارێ، چونکە دانەوێلەی ئەوێ، هێشتا پێویستی بەباران هەیە. ئایا غەیری (الله) کەس هەیە ئەم ڕێژەو کاتی باران بارینەو کۆتایی پێ هاتنی دیاری بکات؟! نەخێر (لا إِلهَ إلاّ الله) .. جاکاتێ فەلاحو جوتیاری بەڕێز دەڵێ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) و تۆوەکە دەچێنێ و نەمامەکە دەڕوێنێ، ئەوە بەزمانی حاڵ دەڵێ: پەروەردگارا، وامن بەناوی پیرۆزی تۆوەو بەپشتیوانی تۆ ئەم دانەوێڵە دەچێنم. خوایە من وەکو بێ باوەڕەکان ناڵێم (بِسْمِ الله)ی ناوێ. ئەمە بەتەبیعەت بۆ خۆ دەڕوێ و ئەم چاندنو شین بونەو کامڵ بوونە بەهۆکارەکان و یاسای سروشتی کەون ڕودەدات!! پەنا دەگرین بەخوا. جا خوای گەورە بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەو فکرە بۆگەنە ناڕاستە. گەلێ جار ووشکەساڵی بەسەر مرۆڤەکاندا دێنێ، ساڵی واهەیە باران نابارێ، گژوگیا ناڕوێ، کانی و سەرچاوەکان ووشك دەبن، ئەمە خوای گەورە هەرگیز ڕقی لەبەندەکانی خۆی نیە. بەڵکو بۆیە ئەم بارانە دەگرێتەوە. تاوەکو ڕامان چڵەکێنێو بەئاگامان بێنێتەوە، کەدەرزی بێهۆشکەری ئەو مولحیدو خواناسانە، گێژو وڕومان نەکاتو قەناعەتمان پێ نەکات کەئەمە بەسروشتو

تەبیعەت دەبارێو دانەوێڵەو گیا شین دەبێ، دەی خۆ ئەو سروشتەو ئەو یاسایانەی کەون هەرماون، ئەی بۆ ناباری؟! بۆیە بەئاگابە خالیقو دروستکەرو هەڵسوڕێنەری یاساکانی کەون بناسەو ڕووی تێبکەو داوای ڕەحمەتی بکە، چونکە کەئەو خالیقە کە (الله) یە. ئەو یاسایانەی پەك خست. ئایا کێ هەیە بیانخاتەوە گەڕو بتوانێ تەنها دڵۆپێ باران ببارێنێ، کێ هەیە بتوانێ ئەو ئاوە سوێرەی دەریاو زەریاکان بکات بەهەڵمو سوێریەکەی بەجێ بمێنێو ئاوە شیرینەکەی بچێتە ئاسمانو پاشان یەکبگرێو ببێتە هەورو بباری! ئەی چەندمان بینیوە. کەجار هەبووە. بارانیش باریوەو گەنمو جۆکەش ڕواوە. کەچی کرم لێی داوەو ئەرزەکەی سورکردۆتەوە، وەکو ئەوەی تۆوی لێ نەچێنرابێ، ئەی نەمان بینی چۆن سن گەنمی کامڵی لەساڵی نەوەدەکان لەکوردستاندا نەهێشتو کەدەدورایەوە بەکەڵکی نان نەدەهات، یان هەر نەدەدورایەوەو بەجێ دەهێشترا؟! دەی ئەمە هەمووی پێمان دەڵێ هەموو شتێ لەم گەردونەدا بەئیرادەو ویستی خوای گەورە دەبێو هەر ئەو خوایەیە کەزەویو ئاسمانو ئەوەی لەناویاندایە بۆی ڕام کردوینو خزمەتمان دەکەن. هەرئەوەکە (يَمْنَعُ ويَمْنَحُ) لێت دەگرێتەوەو پێت دەبەخشێ.

کەواتە: زۆرجار هەرچی سەبەبو هۆکاری ئەو کارەیە بەڕێكو پێکی گرتوەتەبەر، کەچی هەر زەرەر دەکەیو هەرکارەکەت بۆنایەت پێش، ئەمە هەمووی بۆ ئەوەی کەوا نەزانی بەشارەزایی خۆت قازانجت کردووە! ئەوەتا هەموو شارەزایی خۆشت دەخەیتەکارو هەرزەرەریش دەکەی.. بەڵێ ئەوە(الله)یە هەموو شتەکانی بۆ مرۆڤ ژێربار کردووە. نەك سروشتو ڕێکەوت، بۆیە دەبێ لەهەموو کاروبارێکدا پەنا ببرێتە بەرناوی خوای گەورە، خۆئەگەر بەسروشتو ڕێکەوت بوایە، دەبوایە زەوی بەردەوام بەرهەمی بدایە. کەچی چەند ساڵ هەیە. هەر ئەو

**زەویەی جارانەو بەرهەمیش نادات!.. بەڵێ ئێمەی موسوڵمان ئەمە عەقیدەمانە:** (كُلُّ شَيء في هذا الكَوْنِ "بِسْمِ اللهِ". يَتمُ بِاسْم اللهِ، وبِإِذْنٍ مِنَ اللهِ، الكَوْنُ تَحْكُمُهُ الَاسْباب، نَعَمْ، ولكِنْ إرادَةُ اللهِ فَوْقَ كُلِّ الَاسْبابِ). **جاخوای گەورە لێی بەزیاد بێ. ئەوەندە کارئاسانی بۆ ئەم ئیمانداره کردووه. ئەوەی خوێندەوارەو ئەوەی نەخوێندەوارە. ئەوەی هەموو زمانی دونیا دەزانێ و ئەوەی بەزمانی خۆشی نازانێ باش بدوێ، ئەوەی ئەدیبەو شاعیرە، لەگەڵ ئەوەی قسەی سادەشی بۆنایە. هەمووی دەتوانێ ئەمەی کەباسمان کرد لەبیروباوەڕی ئیماندارانە. تەنها بەیەك دێڕ دەرببڕێ. کەئەویش ووتنی** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم)ە. **لەهەموو کارێکدا..**

**بەڵێ ئیمانداران: ئێمەی موسوڵمان دەبێ هەموو کارێکمان بەناوی خوا، بە** (بِسْمِ الله) **دەست پێ بکەین. یەکێ لەو کارانە، کاتی شۆفێریو لێخوڕینی ئوتومبیلە. یان کەشتیو بەلەمە لەناو دەریادا. یان وەختی هەڵسانو نیشتنەوەی فڕۆکەیە لەئاسماندا.. جا کاتێ سویچەکەت باداو سلفت لێ دا. بڵێ:** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم. سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وانا الى ربنا لمنقلبون).. **بەڵێ هەر شۆفێرێك بە** (بِسْمِ الله) **دەست بەلێخوڕین بکاتو لەماناکەی جوان تێ بگات، هەرگیز لەڕێگاوباندا نالەباری ناکاتو سەرکەش نابێ، چونکە دەزانێ ئەمە خەڵاتی خوایە بۆی. هی ئازایەتیو دەوڵەمەندی خۆی نیە. خوای گەورە پێی بەخشیوە. ئیتر نرخی دەزانێ و ئەگەر خزمەتی خەڵکیشی پێ نەکات. زەحمەتیان نادات . بەڵێ هەموو هۆکارێکی گواستنەوە. هەر لەووڵاخێکی سواری جارانەوە. تائوتۆمبێل و کەشتی و فڕۆکەی ئەم سەردەمە. خوای گەورە بۆ مرۆڤی ژێربار کردووە. خوای گەورە بەئاشکرا نیشانمان دەدات. کەئەگەر خوای گەورە بۆمان موسەخەر نەکاتو بەئازاییو زیرەکی خۆمان بوایە، دەبوایە حوشترێکی گەورە،**

فیلێکی زەبەلاح، منداڵێکی بچوك نەیتوانیایە ڕای بکێشێ، وەمارێك و مێشولەیەکی بچوك، بەو بچوکی خۆیانەوە نەیانتوانیایە، ئازاری مرۆڤ بدەن!.. ئۆتۆمبێلەکەش، کەشتیو فڕۆکەکەش هەربەهەمان شێوە، خوای گەورە موسەخەری کردووە. ئایا ئەو بەنزینەی کەئۆتۆمبێل ئیشی پێ دەکاتو ئەو بەنزینەی فڕۆکە کاری پێ دەکات. کە لەیەکتر جیاوازن، هەردوکیان خوای گەورە لەو ناخی زەویەدا بۆی دروست نەکردون!! ئەی ڕۆنو گریسو گازو هەموو پێداویستیەکان. خوای گەورە لەو زەویەدا بەو زۆریو زەبەندیەی کەبڕانی نیە. بۆی دروست نەکردون؟!!.

کەواتە: نەکەی کەچوار تایەکت لەژێردابوو. یان قاچت لەزەوی بڕاو چویتە ئاسمان، یان گەشتت دەکرد لەدەریادا. خوای پەروەردگارت لەیاد بکەی، کێ ئاوی والێکردووە. کەئەو کەشتیە گەورە بەو هەموو سەرنشینەوە لەسەر سەربگرێو غەرق نەبی، دەی سوپاسی خوا بکە، بەناوی خوا دەست پێ بکەو بێ فەرمانی خوای لەسەرمەکە ..

بەڵێ بەڕاستی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحیم) مامۆستایەکی گەلێ گەورەیەو هەرکارێکمان کردو (بِسْمِ الله) مان کرد. ئاوا ئامۆژگاریمان دەکاتو بەئاگامان دێنێتەوە.

جاکێ هەیە بڵێ پێویستم بەمامۆستاو ئامۆژگاری کارێکی ئاوا گەورە نی یە. ئەگەر گێل و گەمژە نەبێ!..

ئیمانداری بەڕێز: کاتێ کەخەریکی خوێندن و فێربونی زانست بوی، بەناوی خواوە دەست پێ بکە، چونکە یەکەم ئایەتی قورئانەکەمان کەفەرمان بەخوێندن و فێربونی زانست دەکات بەوە دەست پێ دەکات. کەبەناوی خواوە زانست بخوێنی. (إقرأ. باسِم رَبِّكَ الَّذي خَلَق). چونکە بە (بِسْمِ الله) دەستت پێ کرد، تەکەبور بەزانست و شەهادەکەتەوە لێ نادەی و دەزانی ئەو مێشك و زیرەکییە خوای گەورە پێ ی داوی، نەك

**هێزو توانای خۆت. هەموو ئەوانەی کەلە بواری زانستدا شارەزاییان زۆرەو خاوەنی شەهادەو بڕوانامەی گەورەن، بەلاّم (بِسْمِ الله) ناکەن، تەکەبور بەسەر خەڵکا لێ دەدەن و وەڵامی هەژار نادەنەوەو بەبێ پارە خزمەت بەکەس ناکەن.**

**ئێوەی بەڕێز سەرنج بدەن: ئەو تاقیگەیەی کەموادی کیمیایی تێدا دەگیرێتەوە، ئەگەر بە (بِسْمِ الله) دەستپێبکرێ مرۆڤی پێ قەلاّچۆ ناکرێ، ئەمڕۆ عیلمو تەکنەلۆجیا چونکە بە (بِسْمِ الله) دەست پێ ناکات گەورەترین مەترسی دروستکردووە بۆ سەر ژیانی مرۆڤایەتی. هەموو ئەوانەی کەجەنگی جیهانیان دروستکردو ئەمڕۆش بەهەزاران مرۆڤ بەچەکەکانیان دەکوژرێن. خۆخەڵکی نەخوێندەوار نین، بەڵکو هەتا بڵێی زانان . وەکو بواری خوێندەواریو زانست. لەگەورەترینو بەناوبانگترین زانکۆکانی جیهان دەرچوون. بەلاّم بەو زانستەیان مرۆڤایەتی قڕ دەکەن!!.. بەڵێ بەڕێزان: هەتا زانست بە (بِسْمِ الله) دەست پێکرا، چەند پڕ بەرەکەت بوو. چەند عالم و زاناکان نورانی بوون. چەند دڵسۆزی خەڵك بوون. چۆن وەکو مۆم دەتوانەوە بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی. هەموو ئامانجی زاناو عالمەکان. ڕەزامەندی خواو خزمەتی خەڵك و خاکەکەیان بوو. حوجرەکانی کوردستان باشترین شاهیدی ئەم ڕاستیەن کەچۆن مەلای مزگەوتەکان. بەبێ هیچ موچەیەکی حکومیو خەڵکی لەبەیانیەوە هەتا ئێوارە خەریکی بلاّوکردنەوەی زانستو زانیاری بوونو هەر حوجرەیەك بۆ خۆی پەیمانگاو زانکۆیەك بووە. وەبەدەیان زانای گەورەی پێ دەگەیاند!!.. بەلاّم کاتێ کەزانست (بِسْمِ الله) ی لێ دابڕا. کە (إِقْرَأْ) بەلاّم (باسْمِ رَبِّكَ)ی لەگەڵ نەبوو. لێی دابڕا. ئەوەتا دەبینین، گەلێك دکتۆر هەیە. بەو شەهادە بەرزەی کەهەیەتی. ئامادە نی یە نەخۆشێك بەبێ پارە ببینێ، مامۆستایەکی زانکۆ ئامادە نی یە.**

یەك مانگ بەبێ موچە وانە بڵێتەوە، هەموو ئامانجی بڕوانامەی باڵا وەرگرتن بووە پارە پەیدا کردن و موچە زیادبوون!! مەگەر ئەوانەی کەخواناس‌و دیندارن‌و بیری قیامەتیان هەیە.

بەڵێ ئیمانداران: ئێمەی میللەتی کورد، هەتا زانستمان بەناوی خواوە دەخوێندو دەست پێ دەکرد. بەو کەرستە کەمی و نەبوونی و هەژارییەوە. چەندین بەرهەمی دانسقەو نایابمان پێشکەش بەجیهان دەکرد. ئەوەتا گەلی کورد کە (چل) ملیۆن زیاترە. (٧) ملیۆنی لەعێراق و (١٨) ملیۆنی لەتورکیاو (١٢) ملیۆنی لەئێران و (٤) ملیۆنی لەسوریاو لوبنان و میصرو ئەوروپایە، ئەم گەلی کوردە. لەنێوان ساڵانی (١٣٨٠) تاوەکو (١٤٣٠) کۆچی. زیاتر لە (سێ) هەزار پەرتوکی نوسیوە، وە (٤٠) تەفسیری تەنیا بەزمانی کوردی نوسیوە!!.

ئێمەی میللەتی کورد لەسایەی ئیسلامداو لەسایەی ئەوەدا کەزانست بە (بِسْمِ الله)وە فێردەبوین، گەورە زانای وامان تێدا هەڵکەوتوە. کەهەموو میللەتان شانازیان پێوە کردوە. ئەوەتا زانایەکی بەناوبانگی وەکو (موفتی زەهاوی) کەکوردەو ماوەی (٣٨) ساڵ موفتی عێراق بووە، ئەم زانایە. ئەگەر لەووڵاتی ئێمەدا نەبوایەو کورد نەبوایە، ئەوا پەیکەری ئاڵتونیان بۆ دروست دەکرد. لەسجلی عوسمانی دا، کەژیانی موفتی زەهاوی تۆمار کراوە. بەم دەقە نوسراوە: (يفُوق كافَّه عُلماء عَصْرنا)، واتە: تاقانەی چەرخی دەوڵەتی عوسمانی!.. بەڵام کەخوێندنمان. کەنوسینمان بە بِسْمِ الله دەست پێ نەکرا. ئایا چیمان پێشکەش بەجیهان کرد. بەڵکو چیمان پێشکەش بەمیللەتی خۆمان کرد. جگە لەسەر یەکتر نوسین‌و ئاگری فیتنە خۆشکردن‌و تانەو تەشەردان لەبابو باپیرانمان؟!!

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: تۆی موسوڵمان پێویستە هەموو کارێکت هەربەناوی خواوە بێ، کاتێ کەشۆڕش‌و خەبات دەکەی و کاتێ حکومەت

پێکدێنیٚو دەیکەی بەکەشتی ڕزگاربوون، تاوەکو گەلو میللەتەکەت لەنەهامەتیو ناخۆشیو نەخۆشیو هەژاری و نەزانی ڕزگار بکەی و غەرق نەبیٚ لەداماویو گرانیدا، ئەوا وەکو حەزرەتی نوح بلّیٚ (بِسْمِ اللهِ مَجْراها ومَرساها).. بەناوی خواوە دەست پێبکە. بەدڵنیاییەوە. هەر سەرۆکێك. بەناوی خواوە دەست پیٚ بکات. بەڵام لەناخی دڵیەوە بێت. نەك وەکو زۆر سەرکردە کاتیٚ کورسی دەسەڵاتیان خەریکە لەژێر دەردیٚو دەکەونە گیانەڵاوە. بۆ چەواشەکاریو ڕاکێشانی هەستی موسوڵمانان بەلای خۆیاندا. (بِسْمِ الله) دەکەنو هەتا ئەو ڕۆژە دژی (بِسْمِ الله) و ئەوەی خوا پیٚی خۆشە، بوون، ئەوەنا، کەبۆ چەواشەکاریو نیفاق (بِسْمِ الله) دەکات، ئەگینا هەر سەرکردەیەك لەناخی دڵەوە بە (بِسْمِ الله) ووتار بداتو بەیان دەربکاتو قسە بۆ گەل بکات، خیانەت لەمیللەتەکەی ناکات، درۆیان لەگەڵ ناکات، چونکە یەقینی هەیە کە - الله - چاودێرە بەسەریەوە بەڵام زۆرێك، زۆرێکی زۆر لەوانەی کەلەجیاتی (بِسْمِ الله) دەیانگوت: (بِاسْمِ الشَّعبِ)، بەناوی گەلەوە، خیانەتیان لەگەل کردو درۆیان کردو بوونە خۆرەو سەرەتان بۆ گیانی گەل!!...

بەڵیٚ ئیمانداری بەڕێز: یەکێکی تر لەوکاتانەی کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی دیاری کردوین کە (بِسْمِ الله) ی تێدا بکەین. بریتیە لەکاتی چونەماڵەوە، چونکە خوای گەورە بەڕەحمی خۆی یارمەتی داوی کەئەو ماڵ و حاڵەت هەیەو پشوی تێدا دەدەی و تیٚ ی دا دادەپۆشریٚ ی. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إذا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وعِنْدَ طَعامِهِ، قالَ الشَّيْطانُ: لامَبيتَ لَكُمْ ولاعَشاءَ، وإذا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ، قالَ الشَّيْطانُ: أَدْرَكْتُمُ المَبيتَ، وإذا لَمْ يَذكُرِاللهَ عِنْدَ طَعامِهِ، قالَ: أَدْرَكْتُمُ المَبيتَ والعشاء) رَواهُ مُسْلِم: (٢٠١٨).

واتە: هەرکاتیٚ پیاو چووە ماڵی خۆیەوە- لەدەرەوەی ماڵی خۆی

گەڕایەوە- لەکاتی هاتنەژورەوە لەقاپی حەوشەو مەدخەلەکەوە. ووتی: (بِسْمِ الله)، ئەوا شەیطان بەشەیاطینەکان دەڵێ: نەجێگای مانەوەو ئیسراحەتتان لەمماڵەدا هەیە. نەخواردن. کەواتە: بڕۆن بۆ ماڵێکی تر. بەڵام ئەگەر پیاوێك کاتێك لەدەرەوەی ماڵەوە لەکارو کاسبیو فەرمانگەو شوێنی پیشەکەیەوە گەڕایەوە بەرەو ماڵ یەکسەر خۆی کرد بەماڵداو چووە ژورەوەو (بِسْمِ الله)ی نەکرد، شەیطان بەبەچکەکانی دەڵێ: شوێنی حەوانەوەتان دەست کەوت، وەکاتێ دەستی بەنان خواردن کردو ناوی خوای نەهێناو (بِسْمِ الله)ی نەکرد. شەیطان دەڵێ: ئەوە نان خواردنیشمان مسۆگەر کردو ئەم ماڵە جێ مەهێڵن. بەم شێوەیە ئەم خێزانە لەهیچیان کەم نی یە. کەچی بەردەوام دەنگە دەنگ و شەڕو هارایانە، چونکە لەسەر ئەم خانوەی خۆیان و ئەو سفرە ڕازاوەیان. یادی خوا ناکەن و سوپاسی خوا ناکەن. بۆیە ژیانیان لێ دەبێ بەژان و هەریەکەیان خواخوایەتی ماڵەکە جێ بێڵێ!.

ئیمانداری بەڕێز: هەرکات چویتە سەر سفرەی نان خواردن بڵێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إذا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللهِ، فإنْ نَسيَ أَنْ يَذكُر اللهَ في أَوَّلِهِ، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللهِ أَوَّلِهِ وآخِرِهِ). رَواهُ الترمذي (١٨٥٨) وقالَ/ حَسَنٌ صَحيح - صَحيح سَنَن أَبي داود لِلآَلْباني: بِرَقَم: (٣٧٦٦).

واتە: هەرکاتێ یەکێ لەئێوە نانی خوارد. با ناوی خوا بێنێو (بِسْمِ الله) بکات. خۆ ئەگەر لەبیری چوو لەسەرەتای دەست کردن بەنان خواردنەکەوە (بِسْمِ الله) بکات. ئەوە هەرکات بەبیری هاتەوە بابڵێ: بەناوی خوا لەسەرەتاو لەکۆتایی یەوە.

ئیمامی نەوەوی فەرمویەتی: بۆ (بِسْمِ الله) کردنی کاتی خواردن و خواردنەوە. جیاوازی نیە لەنێوان ئەو کەسەی لەشی پاکە. لەگەڵ

**ئەو کەسەی لەش گرانی لەسەرەو خۆی نەشۆردوە، یان ئەو ئافرەتەی لەخوێنی سوڕی مانگانەدایە. ئەمانە هەمووی بۆیان هەیە** (بِسْمِ الله) **بکەن لەکاتی خواردن و ئاو خواردنەوەدا.**

**بەڕێزان: لەڕووی زانستیەوە، ئەگەر خواردنێك** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **ی بەسەردا بخوێندرێت، ئەوا سوودی ئەو خۆراکە زیاتر دەبێت بۆ سەرهالەی مرۆڤ، ئەمەش بەچەندەها شێوە، زانایان ڕاستی ئەم بابەتەیان سەلماندوە، لەکتێبی** (ومَضاتٌ إِعْجازِيَّة مِنَ القُرآن والسُّنَة النَبَوِيَّة)**دا، لەنوسینی:** (خالِد فائِق العُبيدى) **باسی لەتاقیکردنەوەی زانایان کردوە، کەلەساڵی (٢٠٠٠)ی زایینی دا ئەنجامیانداوە، ئەویش بەم شێوەیە: زانایان هەستان بەهێنانی قاپێك (شەکلەمە) یەك دانە لەشەکلەمەکانیان دیاری کرد،** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم)**یان بەسەردا خوێند، پاشان چەند کەسێکیان هێناو هەرهەمویان لەبەردەم شاشەی وێنەگرتنی هالەدا داناو داوایان لێکردن دەست بەرن بۆ شەکلەمەکان و دەست بکەن بەخواردنیان، هەموویان شەکلەمەکانیان خوارد (هالە- ئەو خەرمانی ووزەیەی دەوری مرۆڤی داوەو بەچاو نابینرێ) هەمویان هالەیان گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەدەهات. بەڵام کاتێك یەکێکیان دەستی برد ئەو شەکلەمەی خوارد کە** (بِسْمِ الله)**ی لەسەر خوێندرابوو، سەیردەکەن دوای ئەوەی خواردنەکە چووە گەدەیەوە هالەی دەستیکرد بەگۆڕان و سەیر دەکەن، ئەو هالەیەی چوار دەوری گەدەی پڕشنگدار ترو بەهێزتر بووە، ئەمە لەکاتێکدا بوو کەکابرای شەکلەمەی دەخوارد نەیدەزانی** (بِسْمِ الله) **لێکراوەو بەسەریدا خوێندراوە. خۆ ئەگەر خۆی بەسەریدا بیخوێندایە بێگومان کاریگەری زیاتری دەبوو!.**

**هەزاران هەزار ڕەحمەت لەزانایانی خواناس کەبەبێ موختەبەرو تاقیگە ئەم ڕاستیەیان باسکردوە. ئەوەتا (لوقمانی حەکیم) بەیەکێ**

لەهاونشینانی دەڵێ: ئایا حەزدەکەی لەزانستی پزیشکیدا شتێکت پێ بڵێم کەئەگەر جێ بەجێی بکەی دکتۆرت نەوێ. وەلەزانستی شەرعدا شتێکت پێ بڵێم ئەوەندەت بەس بێ. وەلەبواری حیکمەتدا شتێکت پێ بڵێم. کەحەکیم و فەیلەسوفەکان نەتوانن فێرت بکەن؟! کابرا ووتی: بەڵێ .. لوقمانی حەکیم فەرمووی: ئەوەی بواری پزیشکیەکە ئەمەیە: هیچ شتێ مەخۆ. هەتاوەکو لەسەرەتایەوە (بِسْمِ الله) نەکەیت و لەکۆتایشیەوە (الحَمْدُ لله) نەکەیت!! .. وەلەبواری زانستی شەرعیەوە، ئەگەر لەلایەن کەسێکەوە پرسیارێکت ئاراستەکراو تۆ زانیاریت لەبارەیەوە هەبوو. ئەوە وەلامی بدەوەو تێ ی بگەیەنە، خۆ ئەگەر نەتدەزانی. یان دڵنیا نەبووی لەزانیاریەکەت. ڕاستەوخۆ بێ شەرم کردن بڵێ نازانم .. لەبارەی حەکیمی و دانایشەوە ئەمەت بەسە: بەردەوام بێدەنگ بە مەگەر پرسیارێکی پێویستت هەبێ و لەشتێ بپرسی!.

بەڵێ ئیماندران: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم، واتە: داواکردنی کۆمەك و هاوکاری لەخوای گەورە، پشت بەستن بەخوا، ئەو کاتە مرۆڤ هەست دەکات کەدڵو دەرونی دڵنیایی هەیە، چونکە یەقینی هەیە کە خالیق ئاگاداری دەکات. وە هەرکەسیش بەردەوام خوای لەبیربێ خوای گەورە هەموو کارئاسانیەکی بۆ دەکات. سەرنجی ئەم ڕووداوە سەرنج ڕاکێشە بدەن: یەکێ لەزانایان و گەورە پیاوانی ئیسلام کەناوی (ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمە) دەفەرموێ: جارێکیان بەقەدەری خوای گەوە ڕێم کەوتە شارێك. هیچ ناسیاوێکم لەو شارە نەبوو، کەس نەیدەناسیم، شەو مجێوری مزگەوتەکە جیا لەهەموو شەوێك دەرگاکەی داخست و نەیهێشت لەمزگەوتەکەدا بخەوم!! منیش ڕووم نەهات لەدەرگای هیچ ماڵێك بدەم و داوای مانەوەی ئەو شەوەی لێ بکەم. زۆریش ساردو

سەرما بوو. بۆیە لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان دەسوڕامەوە. تائەوەبوو بینیم کەوا کەسێك نانەواخانەی هەیەو خەریکی هەڵکردنی ئاگری تەنوری نانەواکەیەتی. چومە لای و سەلامم لێ کردو دانیشتم و ئەویش پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو. زۆر ڕێزی گرتم لەنزیك ئاگرەکەوە دانیشتم و خۆم گەرم کردەوە. دەستی کرد بەنان کردن و نانیشی دامێ و خواردم. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو. ئەم نانەوایە. هەرنانێکی پێوە دەدا دەیگوت: بِسْمِ الله!! تابەیانی نانی کردو هەر بِسْمِ الله لەسەر دەم بوو. لێم پرسی هۆی چیە لەگەڵ هەموو نان کردنێکدا (بِسْمِ الله) یەك دەکەی، ئایا هەر یەك جار بڵێی (بِسْمِ الله) بەس نیە؟! نانەواکە فەرموی: ناتوانم بەبێ (بِسْمِ الله) هەنگاوێ بنێم. وەئەوەندەم خوا خۆش دەوێ. حەزدەکەم بەردەوام بەناوی ئەوەوە دەست پێ بکەم.

ووتم: لەبەرامبەر خۆشویستنی (بِسْمِ الله) وە چ بەهرەو خەڵاتێکت لەلایەن خواوە پێ بەخشراوە؟! فەرموی: هەتا ئێستا هەرچیم لەخوا داواکردبێ بۆی هێناومەتە دی. تەنها یەك ئاواتم ماوەو پێی نەگەیشتووم! ووتم: چی یە؟! فەرموی: ئاواتە بەدی نەهاتووەکەم ئەوەیە: بیستومە زانایەك و خواناسێکی گەورە لەشاری مەککە هەیە. زۆر لەخوا ترس و خزمەتکاری ئیسلامە. لەبەرخاتری خوای گەورە لەناخی دڵمەوە خۆشم دەوێ و ئاواتم ئەوەیە بەخزمەتی بگەمو ئەو دەستانەی زیارەت بکەم کەخزمەتی ئیسلام و موسوڵمانانی پێ کردووە! ئیبراهیمی ئەدهەم دەفەرموێ: ووتم: ئەوەندە موشتاقی دیداری ئەوی ئەی بۆ ناچی بۆ مەککەو سەردانی بکەی؟! ووتی: من کابرایەکی نانەوام و بژێوی ژیانی خۆم و منداڵەکانم لەسەر ئەم نانەواخانەیەیەو ئەگەر ڕۆژێ کار نەکەم، منداڵەکانم موحتاجیان پێوە دیار دەبێ. چونکە هەرخۆم کاسبکاری ماڵم!.. وەپاشانیش من نانی ئەم شارۆچکەیە دەکەم ئەوەتا دەبینی

لەشەوەوە تا بەیانی نان دەکەم ئەمجا فریای نان کردنی ئەو خەڵکە هەمووی دەکەوم. خۆئەگەر چەند ڕۆژێ نانەواخانەکە داخەم خەڵکی پێیانەوە دیار دەبێ و ژیانیان لێ گران دەبێ. لەبەرئەوە نەمتوانیوە سەفەری مەککە بکەم و بەخزمەتی ئەو پیاوە باشە بگەم! بەڵام هەرلەخوای خۆم دەپاڕێمەوە کەئەو ئاواتەشم بێنێتە دی و بەخزمەتی ئەو زانا خواناسە بگەم (ئای لەئیمانداری ڕاستەقینە، ئاواتی لەدنیادا ئەوەیە. بەدیداری ئەو پیاوە چاکە شادبێ، کە تەنها لەبەرخوا خۆشی دەوێ، بەبێ هیچ بەرژەوەندیەکی دونیایی و ماددی).

نانەواکە فەرموی: بەڵام کەمن بۆم ناگونجێ ئیشەکە بەجێ بهێڵم، داوام لەخوای پەروەردگار کردوە کەکارێکی وابکات. ئەو (ئیبراهیمی ئەدهەمە) بەقاچی خۆی بێتە ئەم شارۆچکەی ئێمەو بێتە ناومانەوەو شەوێك لەماڵەوە لەخزمەتی دا بم!..

ئیبراهیمی ئەدهەم دەفەرموێ: خۆم بۆ نەگیراو دەستم کرد بەگریانو باوەشم پێدا کردو خۆم پێ ناساندو ووتم: زۆر دڵخۆشم لەبەر دوو هۆ:

١. ئومێدم هەیە بەڕەحمی خوا، کە (إِنْ شاءالله) منیش لەقاپی خوا بەبەندەی چاك قبوڵ کراوم، چونکە تۆ تەنها لەبەرخوا منت خۆش ویستوەو ئارەزووی بینینت کردوم لەخوا پاڕاویتەوە کەچاوت پێم بکەوێ. وەخوای گەورە ئاواتەکەی هێناویە دی.

٢. بەهۆی ئەم بینینەی تۆوە. زیاتر لەجاران بەرەکەتی (بِسْمِ الله) م بۆ ئاشکرا بوو. بەخوا من خۆشم نەمزانی بۆچی مەککەم بەجێ هێشت کەیەك نوێژ لە (مَسْجِدُ الحَرام)دا خێری بەئەندازەی (١٠٠) هەزار نوێژە کەلە ئەوێ نەکرێ. ئەو هەموو ئەجرو پاداشتەم بەجێ هێشتو ڕوم کردە ئێرە، کەمن هیچ ئیشو کارێکم لەم شارۆچکەیە نیە. کەس ناناسم. خزم و کەس و کارو ئاشنامی لێ نیە. پاشان مجێوری ئەو

مزگەوتە چۆن خۆشی نەیزانی بۆچی دەری کردەو دەرگای مزگەوتەکەی داخست. پاشان لەناو ئەو هەموو ماڵەو ماڵی ئەو هەموو عالم و زانایەی ئەم شارۆچکەیەدا دەژی، خۆشم نەمزانی کەچۆن بۆم لەدەرگای کەس نەدراو کەچاوم بەتۆ کەوت یەکسەر هاتم بۆ لات! ئەمە هەمووی خوای گەورە رێکی خست بۆ ئەوەی ئاواتەکەت بێتە دی و سوپاس بۆ خوای گەورە بەیەك گەیشتینو منیش گەلێ لەتۆ خۆشحاڵترم!..

بەرێزان: لەم بەسەرهاتەدا، وێرای پیرۆزی و بەرەکەتی (بِسْمِ الله) دەمەوێ ئاماژەش بەوە بکەم کە:

١. خەڵکی موسوڵمانی ئەو زەمانە چەند بەهیمەت بوون. ئەو نانەوایە. بەو هەژاریە. کەتەنها رۆژانە ژیاوە. داوای نەکردوە کەخوای گەورە بیکات بەدەوڵەمەندترین کەس، بەڵکو بەسەربەرزی زانیوە کەپیشەیەك دەکات لەخزمەتی خەڵکی دایەو پاداشتێکی لای خوای گەورە بۆ دەنوسرێ، وەئاواتی هەرە بەرزی بینینی کەسانی زاناو خواناس بووە، ئاوا رێزی زانایان و پیاوچاکان گیراوە..

٢. ئیماندارانی بەرێز: کاتێ ووشەی پیاوچاك بەکاردێنین وانەزانی ئیبراهیمی ئەدهەم پیاوێکی شرۆڵەی لەبرسا مردو بووە. گەراوە لەم شار بۆ ئەو شار تاوەکو یەکێ نانێکی بداتێ. نەخێر. بەڵکو ئیبراهیمی ئەدهەم. تابعی تابیعینە، واتە چاوی بەو کەسانە کەوتوە، کە ئەوانیش چاویان بەصەحابەی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتوە. لەساڵی (١٦٢)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە. ئەو زاتە گەلێ فەرمودەو سوننەتی سەروەرمان حەزرەتی محمد (ﷺ) بۆ باس کردوین، کەلە گەورە پیاوانی تابیعینی بیستوە وەکو: مالیکی کوری دینارو ئەعمەش و موقاتیل. وەهەروەها لەزانستی فەرمودەدا دەستێکی باڵای هەبووەو خۆی فێربووەو خەڵکیشی فێرکردوە. هاورێکانی وەکو: سوفیانی سەوریو شەقیقی بەڵخیو سەهلی

کوڕی هیشام فەرمودەیان لێوە نەقڵ کردوە. وەزانایانی فەرمودە، زۆرمتمانەیان پێ‌ی بوەو وەصفیان کردوە بەوەی کە ئیبراهیمی ئەدهەم: (صَدُوقٌ). کەئەم پلەیە دەست هەموو کەس نەکەوتووە. ئەم زاناو پیاوچاکە. گەلێ فەرمودەی زۆرجوانی فەرموە. لەوانە ئەمەیە کەدەفەرموێ:

- هەر پاشاو دەسەڵاتدارێك، دادگەری لەناوگەلەکەیدا بڵاونەکاتەوە، ئەوە ئەوو ئەو کەسەی کەڕێگری دەکاو خەڵکی ڕووت دەکاتەوە، جیاوازیان نیە.

- وەهەر زانایەك کەزانستی پێ بوو. بەڵام ترسی خوای لەدڵ دا نەبوو. خۆی لەبێ فەرمانی نەدەپاراست. ئەوە ئەو زانایەو گورگ هیچ جیاوازیان نی یە.

- وەهەرکەسێ خۆی زەلیل بکات بۆ غەیری خوا، ئەوە ئەو کەسەو سەگ یەکسانن!!

ئیبراهیمی ئەدهەم، ئەم زاناو پیاوچاکە بەڕێزە، لەژیانی دا، چوار کارو پیشەی کردووە:

١. دروێنە. بەیەك ڕۆژ ئەوەندەی گەنمو جۆ دوریوەتەوە بەداس، کەبە (١٠) سەپان بۆیان نەدوراوەتەوە.

٢. بێستانەوانی کردووەو چاودێریو پارێزگاری لەبێستانی کاڵەكو شوتی کردوە.

٣. ئاشەوانی کردووەو بەکۆڵ ئاردو ساوەری ماڵانی لەئاشەوە بردۆتەوە بۆ ماڵەکان!.

٤. ماوەیەك داری ووشکی لەچیاکان کۆکردۆتەوەو بەکۆڵ هێناویەتی بۆ ناو بازاڕو فرۆشتویەتیو بژێوی ژیانی خۆی پێ دابین کردوە!

بەڵێ ئەم زاناو خواناسە، ئاوا بەم چوار ڕێگەیە. بژێوی ژیانی

دابین کردوه. کەبەداخەوە ئێمە ئەمانە بەپیشەیەکی گەورەو نرخدار نازانینو پێمان سەیرە ئەولیاو پیاوچاکان ئەمانەیان کردبێ! بەڵام پیاوچاکانو زانایانی ئیسلام هەمویان بەدەستی خۆیان ژیاونو بە (بِسْمِ الله) دەستیان بەکارکردوەو موسوڵمانانیان فێری ئەم وانە گەورەیە کرد، کەبەردی بناغەی پێشکەوتنە کەدەڵێ: (إنَّ أُمَّةً تَحْتَقِرُ عُمّالَها، لاتَسْتَحِقُّ أَنْ تحْتَرَمَ، وإِنَّ شَعْباً يَعيشُ عَلى قِيَمٍ مِنَ الكِبْرِ والظُّهُورِ والتَّفاخُرِ لايَسْتَحِقُّ أَنْ يَعيشَ). واتە: ئەو ئوممەت و نەوەو نەتەوەیەی کەبەچاوی سوکەوە سەیری کارکەرانی بکات و ڕێز لەدەستی کرێکار نەگرێ. موستەحەق و شایەنی ئەوە نی یە، کەلەناو گەلاندا ڕێزو حورمەتی لێ بگیرێ. وەهەر گەلێك لەسەر خۆ بەزلزانین و خۆدەرخستن و کەش و فش کردنەوە، بژی، وەهەر بەکارهێنەر بێ و بەرهەمهێن نەبێ، ئەوە شایەنی ژیان نی یە!...

بەڵێ ئیبراهیمی ئەدهەم، ڕەمز بوو بۆ ئەو دەستە قڵشاوە ماندوو بەڕێزانەی کەکاردەکەن. بەڵام هەرگیز دزی ناکەن! وەئەو دەستانەی کەبەرهەم دێننو خۆیان دەژیەنن و بەرهەمیش پێشکەش بەخەڵکی تر دەکەن. نەك ماڵو سامانی خەڵکیش بەفیرۆ بدەن!. بەڵێ لەئیسلامدا گرنگ نی یە ناونیشانی کارەکەت چی یە. بەڵکو گرنگ ئەوەیە بێکار نەبیو کارەکەت دوو مەرجی تێدابێ لەڕووی شەرعیەوە حەڵاڵ بێو، زیانی بۆ خەڵکی نەبێ.

بەڵێ ئیمانداران: ئیبراهیمی ئەدهەم، لەو کاتانەدا کەدوژمنانی ئیسلام هێرشیان هێناوە بۆ سەر وولاتی موسوڵمانان، بەشداری جیهادی کردووە. بەشداری شەڕی ڕۆمەکانی کردووە. شاخ بەشاخ و بیابان بەبیابان غەزای کردووە، تاکو گەیشتۆتە ناو دەریاو ئاخر شوێنی ژیانی لەدورگەیەکی ناو دەریای ناوەڕاستدا بوو: بەیانیەکیان سکی زۆر ئازاری هەبوو. لەماوەیەکی کەمدا (٢٠) جار چووە سەر پێشاو.

**هەموو جارێکیش دەست نوێژی تازە دەکردەوە. چونکە ڕاهاتبوو لەسەر ئەوەی بەردەوام دەست نوێژی هەبێ. ئالەم کاتەدا کەزانی مەرگی نزیك بۆتەوە، حەزی نەکرد لەناو جێگای خەوتندا بمرێت. بەڵکو دەیویست هەروەکو لەمەیدانی ئیش و کەسابەتدا شێری مەیدان بوو. لەمردنیشدا شێرانە بمرێ. بۆیە تیرو کەوانەکەی دەرهێناو تیرێکی خستە کەوانەکەوەو هاویشتی بەرەو ڕووی دوژمنو پاشان کەوت و ڕۆحی دەرچووا بەڵێ ئەمانە زاناو پیاوچاکانن. کەواتە کەدەڵێین: وەلیو خواناس، هەرگیز کەسێکی چڵکنو بێ کارو دەست پان کەرەوەتان نەیەتە بەردیدو بەرچاو، کەتەنها هەر خەریکی نوێژو زیکربێو وازی لەدنیا هێنابێو بێ ئاگا بژی لەم دنیایەدا.**

**بەپشتیوانی خوای گەورەو میهرەبان باسی بەرەکەتی** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **هەڵدەگرین بۆ ووتاری داهاتوو** (إن‌شاءالله)**،خوای گەورە ڕەحممان پێ بکاو عاقیبەتی هەموو لایەکمان خێر بکات.**

اللّهُمَّ آمين.

سەرچاوەکان:


١. دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان، ئیکرام کەریم، ل١٢٩.

٢. ناوەڕۆکی ئیسلام، د. سەید بەکر بەرزنجی، **ل٨١، ل٧٤.**

٣. يَضْحَكُ رَبُّنا وَيَضحَكَ نَبيُّنا- محمد متولی الشَّعْراوی، **ص٣٠٩.**

٤. مِنْهاج الصّالِحِين في الآداب الأسْلاميّة، محمد عبدالعاطي بحيری، **ص٣١٦.**

٥. ووزە، دەروازەیەك بۆ ئاوێزان بوون- پەری حەمە جەزا، **ل٢٠.**

٦. وَعَلَّمْناهُ صَنْعَة، مُهَنَّد الحاج علي بك، **ص١١٩.**

# ووتاری یەکەم
# بۆ مانگی صەفەر
# بەرەکەتی

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم

## بەشی دووەم

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّـلامُ عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانـــداران: جوانترینو شـــیرینترینو کورتتریـــنو پڕمانا ترین شـــتێك کەلەســـەرەتای هەموو گوفتارو هەنگاوو هەڵوێستێکدا بوترێ.** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم)ە.

**دایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشـــە- بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەکرد. لەیەك ڕکاتدا (١٤) جار** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **ی دووبارە کردەوە. لەبەرئەوەی ئەوەندە بەلایەوە خۆش بوو. بەدووبارەکردنەوەی دڵو دەرونی زیاتر دەگەشایەوەو پشوی دەدا.**

**ئیماندارانـــی بەڕێز: لەم کاتانەدا** بِسْـمِ اللهِ **بکـــە، لەکاتی خواردن و خواردنـــەوەدا بڵێ:** (بِسْـمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم)**، بەم ووتنی** (بِسْـمِ الله)**یە. تەکەبوور نامێنێ، دەزانی ئەم سفرەو خوانە بەهێزی شان و بازوی تۆ ئامادە نەبووە. بەڵکو خەڵاتی خوایە. ئەوکاتە فیرعەونیەت و قارونیەت دروســـت نابێ. کەدەڵێ ی** (بِسْـمِ اللهِ) **ئەوەت دێتەوە ناخو مێشکەوە کە: خوایە، ئەم نان و خوانە هی تۆیەو فەزڵو بەخششـــی تۆیە. کەبەمنت بەخشـــیوە، دەی حەیفە کەتێرم خوارد هەوڵی کاری چاکەو عیبادەتی خـــوا نەدەم. کەدەڵێ ی** (بِسْـمِ الله) **یانی خوایە مـــن بەناوی تۆوە ئەم پاروە دەخەمە دەممەوە، چونکە ئەگەر تۆ یارمەتیم نەدەی، ئەم پاروە لەدەممەوە ناچێتە خوارەوە بۆ ناو گەدەم، تەنها گلاندە ڕژێنەکانی ناو دەمت کە (لیك) دروســـت دەکەن، ئەو کانی یە ووشك ببێ، کەبەڕاستی کانی یە! ئەگینا ئەو هەموو لیکە بەدریژایی ژیانت سەرچاوەکەی لەکام بەحرەوە هاتووە؟!!** **ئەمجا** (سُـبْحانَ الله) **هەتا پێویستت نەبێ ئەم لیکە نایەتـــە دەرەوەو کەهاتیشـــە دەرەوە. زیاد لەپێویســـت نایەت و وانابێ کەلیـــك بەدەمتا بێتـــە خوارەوەو دیمەنێکی ناشـــیرین بنوێنێ!.. ئەها جاربەجارێ خوای گەورە بەبیرت دێنێتەوە، کەکاتێ نەخۆش دەکەوی**

و ناو دەمت ووشــك دەبێ، چۆن هیچت بۆ ناخورێ، تەنانەت قسەشــت بۆ ناکرێ، چونکە لیك نارژێتە ناو دەمتەوە. کەچی ئەو هەموو ســاڵە، شــوکری ئەو (لیك)ی ناو دەمت نەکردوە!! بەڵێ ئەو لیکەی ناو دەمە کەکاتــێ خواردن دەخــۆی، خواردنەکە تەڕو نەرم و شــل دەکات. خۆ ئەگەر ئەو لیکە بەســەر ئەو خواردنەدا نەڕژایەو تەڕو نەرم و شــلی نەکردایەتەوە. بەژیانی خۆت پاروە نانێکی ووشــك، یان بسکیتێکت بۆ قوت نەدەچوو. ئەمە سەرەڕای بوونی ئەو هەموو ماددە هەزمکەرانەی کەلەنــاو لیکدا هەیەو هێشــتا پاروەکە لەناو دەمتایــە. کەبەهۆی ئەو لیکەوە بەشێك لەشــی بونەوەو هەرس بوونی بەسەردا دێتو ئەمەش یارمەتــی دانێکــی گەورەیە بۆ گەدە. کەبەهۆی ئــەو لیکی ناودەمەوە، هەندێ لەکرداری هەرســی لەکۆڵ بۆتەوە!. جاکاتێ تۆی ئیماندار دەڵێ ی: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) ئەوە دەڵێ ی: خوای پەروەردگارم یارمەتیم بــدەی و وامن بەپشــتیوانی تۆ ئەم پاروە نانەو ئــەم قومە ئاوە قوت دەدەم. خــوای پــەروەردگارم من یەقینم هەیــە، ئەگەر تۆ ڕەحمم پێ نەکەی (زمانە بچکۆلە)م، یەك هەڵەی بچکۆلە بکات. ئەم پاروە بچێتە بۆری هەناســەمەوە دەخنکێم، ئەها جــاری واهەیە یەك دەنکە برنج، یــەك پریشــکە ئاوێ نــەك پارویــەك و قومە ئاوێــك، دەچێتە بۆری هەناســەتەوە، ئای چەند بەناڕەحەت فــڕێ دەدرێتە دەروە!! چۆن ئاو بەچاوتا دێتە خوارەوە!

بەڵێ. وەختێ (بِسْــمِ الله) دەکەی لەکاتی نان خواردندا. لەناختەوە دەڵێی: خوایەگیان بەناوی تۆو بەپشتیوانی تۆ، ئەم پاروە نانە دەخۆم، چونکــە ئەگــەر تــۆ ڕەحمم پێ نەکــەی، ئەوا تەنها چەنــد خولەکێ (زمــان)م لەجوڵە بکەوێو ئەم دیواو دیــوو بەخواردنەکە نەکات. ئەوا ژیانم کۆتایی پێهاتوەو ئیتر بەبێ هاوکاری جوڵەی زمانم لەناو دەمدا

**لەکاتی خواردندا، پارویەك نانی بچوك نارِواتە خوارەوە بۆ ناو قورِگ. پاشـان رِۆیشـتنی ئەو خۆراکە بۆناو سـورِێنچكو گەدەو دوانزەگرێو رِیخۆڵەکان و پاشان فرِێ دانەوەی پاشەرِۆکە، ئەمە هەمووی بەرِەحمی خـوا لەگەڵت ئەنجام دەدرێ. هەربۆیە لەگەڵ** (بِسْـمِ اللـهِ) **دا، دەڵێ:** (الرَّحْمن الرَّحيم)، **لێرە پرسیارێك دروست دەبێ: باشە بۆچی لەناو (٩٩) ناوی جوانی** (أَسْـماءُ الحُسْنَى)**ی خوادا، تەنها دوو ناوی** (الرَّحْمن - الرَّحيم) **هاتووە. ئەی بۆ ناڵێ** (بِسْـمِ اللهِ العَزيز القَهّار). **یان** (بِسْمِ اللهِ الجَبّار). **ئایا هەر** (بِسْـمِ الله) **کەماناکەی تەواوە بـێ** (الرَّحْمن الرَّحيم). **ماناکەی نابێو جوان نادرەوشێتەوە؟!**

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

١. **بۆیــە** (الرَّحْمن الرَّحيم) **هاتــووە، چونکە وەکو ووتمان هەر لەپاروە نانەکەوە، کەهەموو کەس لەبیریەتیو ئەم هەموو هەڵپەی ژیانەی بۆ دەکــرێ، تاهــەر کارێکی ژیانت و هەنگاو هەڵهێنانــەوەت، بەبێ رِەحم و پشــتیوانی خوا ناکــرێ، هەروەها** (الرَّحْمن) **رِەحــمو بەزەیی خوایە بــۆ کافرو موســوڵمان لەدنیادا، بۆیــە ئەو کافرەی کەبرِوای بە** (بِسْـمِ اللــه) **کەش نــی‌یــە، وەکو ئیماندارەکە خوای گەورە ئەو خەڵاتانەی لێ وەرناگرێتەوە، کەواتە: ئەگەر** (الرَّحْمن) **لەگەڵ** (بِسْـمِ الله) **نەبوایە. ئەوا یــەك بێ بــاوەرِو مولحید پــاروە نانێکی بۆ قــووت نەدەچوو!.. بەڵام** (الرَّحيم) **رِەحمی خوایە. کەبەســۆزو میهرەبانە لەقیامەتدا، بەڵام تەنها لەگــەڵ ئیمانداران. ئەو خوایە بەرِەحمەی کەبەووتنی هەر** (بِسْـمِ الله) **یەك (١٩٠) چاکەی بۆ نوســیوی، وەهەرکارێك بە** (بِسْـمِ الله) **دەست پێ بکەی بەعیبادەت بۆت حیساب دەکرێ، ئایا ئەمە رِەحمەتی خوا نی‌یە کەتــۆ نان بخــۆیو ئاو بخۆیتەوە، خۆت تێرو تێرئــاو بکەی. تەنانەت جوت بوونی شەرعی ژنو مێرد بەیەکەوە. کەخۆیان چێژی لێ دەکەن،**

**کەچی بەبەرەکەتی** (بِسْمِ الله) **بەعیبادەتو خواپەرستی بۆت حیساب بکریو بنوسری؟!**

**٢. بۆیە دەڵێ ی** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم)**، لەبەرئەوەی ڕەنگە بیربکەیتەوەو بڵێ ی: باشە من چۆن بڵێم** (بِسْمِ الله) **لەکاتێکدا دوێنێ، سەعاتێ لەمەوبەر بێ ئەمری خوام کردووە. ئاخر هەست بەشەرمەزاریو خەجاڵەتی خۆم دەکەم؟! لەوەڵامدا دەڵێین: بۆیە خوای گەورە هەردوو صیفەتی پاکو بێگەردی** (الرَّحْمن)**و** (الرَّحيم)**ی خۆی خستۆتە پاڵ** (بِسْمِ الله) **کەوە. بۆئەوی تێت بگەیەنێو دڵنیات بکاتەوە کەڕەحمەتو میهرەبانیو سۆزی خوای گەورە، هەموو گوناهی بەندەکان دادەپۆشێ، ئەو خوایە کەئەوەندە بەبەزەیی یە. ئەو کافرو مولحیدەی تەواوی ژیانی بۆ دژایەتی خوا تەرخان کردوە. کەچی هەرچی دڵی دەخوازێو هەوڵی بۆ دەدا، خوای گەورە لەدنیادا پێی دەبەخشێ، بۆیە لەقیامەتا ڕەحمی پێ ناکات. چونکە خۆی ئینکاری خواو ڕەحمەتی خوای کردوە! جائەگەر خوایەك لەگەڵ بێ باوەڕدا ئاوابێ، ئیتر ئەبێ چەند بەبەزەیی بێ و چۆن لێخۆشبونێکی خۆی بڕێژێ بەسەر ئەو ئیماندارەدا کەدوای ئەوەی تووشی هەڵە بووە. دەستی بەرز دەکاتەوە بۆ لای خواو فرمێسك دەڕێژێو دەپاڕێتەوەو دەڵێ خوایە لێم خۆشبە! بەڵێ خوای گەورە** (يَغْفِرُ الذنُوبَ جَميعاً).

**کەواتە:** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **ئەم سیانە هەرسێکیان موشتەقن لە** (الرَّحيم)**. کەڕەحمیش جێگای کۆرپەی تازە دروست بووە لەسکی دایکی دا، ڕەحەم ئەو شوێنەیە کەمرۆڤ بەبێ ئەوەی هیچ جوڵەو هیچ جۆرە تێکۆشانو کارو کەسابەتێك بکات، ڕزقو ڕۆزی خۆی بۆ دەچێ! ڕەحەمی دایك. ئەو شوێنەیە کەهەرچی پێویستیەکی گەشەکردنی مناڵ هەیە، بەجوانترینو نایابترینو پاکترین شێوە ئامادەکراوە. ڕزق و ڕۆزیەك**

لەلایەن خواوە بەبێ ماندوو بوونو بەبێ بەرامبەر!! دەی بەخوا چۆن لەناو ڕەحمی دایك دا، منالْ تەنهاو تەنها بەڕەحمی خوا دەژیو گەورە دەبێو دەجولێ. لەسەر زەویشدا. کەبازوو هێزی هەیەو کاردەکاتو هەولْ دەدات. هەر بەڕەحمی خوا ڕزقی دەست دەکەوێو دەجولێو هیچی ئازایەتی خۆی نی یە. چونکە کام کاسبکارەی بەهێزی بالْو شانو بازوی خۆی دەلێ نان بەدەست دێنم. لەیەك چرکەدا. بەلێ تەنها لەیەك چرکەدا. ئەو لاشەیە دەگونجێ توشی شەلەل ببێو چاوەڕێ ی ئەوە بکات قومێ ئاو بکەنە دەمییەوەو ئەویشی بۆ قوت نەچێ!

خۆ ئەگەر ئەو کەسەی کەدەلێ من بەمێشکم کاردەکەمو بەعەقلْ کاسپی دەکەم و هەر بەمۆبایل و تەلەفۆن بازرگانی نێودەولەتی دەکەم. دەی زۆر نزیکە لەیەك چرکەدا مێشکت هەرچی زانیاریە تێ ی دا بسڕدرێتەوەو ڕێگای مالّی خۆت نەزانیەوە. هەروەکو ئەمە لەولاتی سوریا ڕووی داوەو (دکتۆر محمد راتب النابُلسی) لەیەکێ لەنووسراوەکانیدا باسی کردوە. کەبازرگانێکی گەورە، لەوکاتەدا کە لەنوسینگەکەی خەریکی حیسابو لێکدانەوەی سەرمایەکەی بوو، چی فرۆشتوەو چی بۆ هاتووەو چی ڕەوانەکردووە. ئالەو کاتەدا تەزویەك بەسەری دا دێو هیچی لەبیر نامێنێو کەس ناناسێتەوەو تەنانەت نازانێ خۆی ناوی چی یەو ژنەکەی کێ یەو منالەکانی کێن. وەهەروەها ڕێگەی مالّی خۆیانی نەدەزانی یەوە!..

بەلێ ئیمانداران: ووتمان هەرسێ ووشەی (الرَّحْمَة، الرَّحْمن، الرَّحيمْ) لەڕەحەمەوە وەرگیراون، منالّیش لەڕەحمی دایکی دا. تەنهاو تەنها بەڕەحمی خوا دەژیو هیچ ئازایەتی و هەولێکی خۆی تێدا نی‌یەو هەر ئاگاشی لێ نی‌یە. وە لەگەلْ ووشەی (الرَّحْمن الرَّحيم) یشدا، سەرنجت ڕادەکێشێ بۆلای سۆزو میهرەبانی دایك بۆ کۆرپەکەی، کەچۆن

بەمیهرەبانـــیو ئەوپەڕی خۆشەویســـتی یەوە باوەشـــی پێـــدا دەکاتو ئەگەر منداڵەکەی هەڵەیەکیشـــی بەرامبەر بکات لێ ی دەبورێو ئەگەر منداڵەکەی دوای سەرپێچی فەرمانەکەی بگەڕێتەوە بۆ باوەشی، لەئامێزی دەگرێتەوەو شـــادمان دەبـــێ بەگەڕاندنەوەی بۆلای. دەی بە (بِسْـمِ اللهِ الرَّحْمــن الرَّحيم) خـــوای گەورە بەئاگامان دێنێتـــەوە کەئەی عەبدەکەم من تۆم خۆشـــدەوێ. ڕزقت دەدەم، دەســـتت بەرز بکەوە بۆلام و تەوبە بکە، دەرگای تەوبە دائیمەن کراوەیە، کەواتە: بوونی هەردوو صیفەتی (الرَّحْمن) و (الرَّحيم) لەگەڵ (بِسْمِ الله) دا وەڵامە بۆ ئەو کەسەی کەدەڵێ: چۆن من داوای یارمەتی لەخوا بکەم و بەناوی ئەوەوە دەست پێ بکەم. لەکاتێکـــدا من ســـەرپێچی فەرمانەکانی دەکەم؟! توشـــی گوناهو تاوان بووم؟! بەو کەسە دەڵێین: وەرە بۆلای خوای گەورە بگەڕێوەو لەدەرگای (ڕەحمەتـــەوە) وەرە بۆلای پـــەروەردگارت. ئەوکات لێت خۆش دەبێتـو داوای یارمەتـــی لێ بکـــە، بەدەنگتەوە دێت.. وەتـــۆ هەرکاتێ کەوتیتە لیتاوی گوناهو سەرپێچی خواوە، پەنا بگرە بەڕەحمەتی خوا. لەعەدلی خوا، چونکە عەدلی خوای گەورە هیچ بچوك و گەورەیەك جێ ناهێڵێ کەنەینوسێ و تۆماری نەکات! لەبەرئەوە پەنا بگرە بەڕەحمەتی خواو بڵـــێ، خوایـــە بەڕەحمی خۆتم لەگـــەڵ بکەو لێم خۆشـــبەو یارمەتیم بدەو بە عەدلی خۆتم لەگەڵ نەکەی کەحیسابی ووردو درشتم لەگەڵ بکـــەی، چونکـــە ئەوکات تێـــدا دەچم!.. پاشـــان ئەگەر جوان ســـەرنج بدەیـــن دەبینین کە (الرَّحْمن) لەگـــەڵ (الرَّحيم) هەردوکیان لە (صیغەی موبالەغـــەن)، دەوترێ: (راحِمْ ورَحْمن ورَحيـــم). جا کاتێ دەڵێ ی: (راحِم) مانای وایە سیفەتی سۆزو بەزەیی تێدایە. بەڵام کەدەڵێ ی (رَحْمن) ئەوە موبالەغەیە لەصیفەتەکـــەداو مانای زۆر زۆر بەبەزەیی دەگەیەنێ. وە کەوتیشـــت (رَحِيم) ئەویش هەر صیغەی موبالەغەیەو بەمانای زۆر زۆر

بەسۆزو بەبەزەیی دێت. لەبەرئەوە خوای گەورە (سُبْحانَهُ وتَعالى) ڕەحمانی دونیاو ڕەحیمی قیامەتە. سۆزو بەزەییەکەشی لەسنور بەدەرەو مرۆڤ ناتوانێ پەی پێ بەرێ. بەڵێ کاتێ دەڵێی (الرَّحْمن) صیغەی موبالەغەیە. ئــەوە لەوەدا دەردەکەوێ کەئەوانەی ڕەحمو میهرەبانی خوا شــمولیان دەکاتو دەیانگرێتەوە لەدنیادا. هەموو دروســتکراوەکانی خوان. بەبێ تەماشــاکردنی بیروباوەڕو عەقیدەیان. بــەڵام خۆ لەقیامەتا. ڕەحیمی خــوا تەنها بــۆ ئیماندارانــە. چونکە لەقیامەتدا کافرو موشــریکەکان دورخراونەتەوە لەڕەحمی خوا. دەی کەواتە: ئەوانەی کەڕەحیمی خوای گەورە لەقیامەتا شمولیان دەکاتو دەیانگرێتەوە، بەژمارە زۆر کەمترن لەچاو ئەو کەســانەی کەلەدنیادا ڕەحمی خوا گرتونیەوە! دەی کەواتە: صیغــەی موبالەغەی (رَحیــم) لەکوێدایە؟! دەڵێین: صیغەی موبالەغەی (رَحیــم) لەوەدایــە کەهەرچەنــدە ئیمانــداران لەچــاو بێئیمــانو بێ باوەڕەکاندا وەکو مویەکی سپی وان، لەجەستەی گایەکی سووردا، بەڵام زۆری ڕەحمی خوا کەلە (رَحیم) دا دەردەکەوێ بەبەخشینی بێ سنوری خوایە، بۆ بەندەکانی لەقیامەتدا. کەدەیانخاتە بەهەشتەوە. وەمانەوەی هەتاهەتایشە لەو خۆشی بەهەشتەدا. کەواتە: خەڵاتەکانی خوای گەورەو زۆرترن لەخۆشیو خەڵاتەکانی خوا کەلەدنیادا بەبەندەکانی بەخشیوە.

بەڵێ، کەئاوت خواردەوە لەپێشدا بڵێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) لێرەدا پرســیارێك دەکرێ، ئەویش ئەوەیە: ئایا (بِسْــمِ اللهِ) کردن لەکاتی ئاو خواردنەوەدا، لەڕووی زانســتیەوە هیچ کاریگەریەکی هەیە لەسەر ئەو ئاوە؟! لەوەڵامدا دەڵێین: پرۆفیســۆری یابانی (مۆســارۆ ئۆماتۆ) پاش (دە) ســاڵ لێکۆڵینەوە ســەلماندی کە ئاویش هەستی هەیەو پەڕاوێکی نووسی بەناوی (نامەکان لەئاوەوە) کەوێنەی چەند کریستاڵێکی بەفری نیشــاندا، لەکاتێکدا کەمۆســیقایەکی خۆش بۆ ئاوێك بکرێت، پاشــان

بیبەستێت .. هەروەها کریستاڵی ئەو بەفرانەش کەئاوەکەیان مۆسیقای ڕەقو ناخۆش یان قسەی ناخۆش دەبیستن، دیارە کەوەك نەخۆش وانو کزو شێواون .. لەوێنەیەکدا بەڕوونی دیارە، کەوێنەی کریستاڵی ئاوی بەلوعەی شاری (تۆکیۆ) کەکلۆری تێکراوە پاش بەستنی شێواوەو ڕەنگی مردوی گرتووە!!.

کەواتە: ئەوەی کەپیاوچاك و زانایانی ئیسلام (تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا، نەك بۆ نان پەیداکردن) چەند ئایەتێکی قورئانیان لەسەر پەرداخێك ئاو دەخوێندو پاشان ئەو ئاوە دەدرا بەنەخۆشێك دەیخواردەوەو شیفای بۆ دەهات. ئەمە لەڕووی زانستیەوە سەلماوە، کەبەڵێ ئەو ئاوە هەست بەخوێندنی ئەو ئایەتانە دەکات، بەڵام ئەمڕۆ کەخەڵك خوێندەوارە، چاك وایە خۆی بەسەر ئاوەکەدا قورئانەکە بخوێنێو پاشان بیخواتەوە ..

ئیمانداران: یەکێکی تر لەوشێوینانەی کەپێویستە (بِسْمِ اللهِ)ی تێدا بکرێ، کاتی سەربڕینی ئاژەڵێك، یان پەلەوەرو باڵندەیەکە. خوای گەوە لە سورەتی (الأنعام) ئایەتی: (١١٨)دا، فەرموویەتی: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴾. لەم بارەیەوە. دکتۆر (سەعید موخلیص یەعقوبو دکتۆر نەبیل شەریفو دکتۆر فایز حەکیم) بەیەکەوە هەستان بەئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەك لەسەر ئەم بابەتەو دوو پارچە گۆشتیان هێنا، یەکەمیان لەکاتی سەربڕینی زیندەوەرەکەدا ناوی خوای لێ هێنرابوو. دووەمیان لەکاتی سەربڕینیدا، ناوی خوای لێ نەهێنرابوو. هەردووکیان بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر داناو لەپاشاندا سەیریانکرد، ئەوەی دووەمیان میکرۆب بەڕێژەیەکی یەکجار زۆر لەسەری گەشەی کردووە. بەڵام ئەوەی یەکەمیان کە (بِسْمِ اللهِ) لەسەر ووتراوە، وانیەو میکرۆب زۆر بەکەمی لەسەری دەبینرێ!..

کەواتــە: ئــەی قەصابو مریشــك فرۆشــەكان ئاگاداربــن. لەكاتی سەربڕیندا (بِسْمِ اللهِ) تان لەبیر نەچێت!.

شــوێنێكی ترو كاتێكی تر كەووتنی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحیم) تێی دا زۆر پیرۆزو پڕبەرەكەتە، ناو نەخۆشــخانەو لای پزیشكە بەڕێزەكانە، ئەوانەی لەدەوری نەخۆشــن هەر لەدەزری لێدەرەوە، تاوەكو پزیشــكی نەشتەرگەری، وەتاقیگەو ئەشیعەو ســۆنەر، تا دەرمانخانە، هەموویان (بِسْــمِ اللــهِ الرَّحْمــن الرَّحیم) بكــەن. كاتێ چارەســەری نەخۆش دەكەن. لێرەدا پرســیارێك دێتە پێشــەوە. ئەویش ئەوەیە: ئایا ووتنی (بِسْــمِ الله) لەڕووی زانستی یەوە، هیچ كاریگەری هەیە لەسەر دەرونو لاشەو چاك بونەوەی نەخۆشــەكەو وە ئایا كاریگەری هەیە لەســەر كاریگەر بوونی دەرمانەكە لەسەر نەخۆشەكە؟! لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، ئەوەتا لەكەناڵی ئاســمانی (سمارتس وەی) لەبەرنامەی (ووزەت بناسە) دكتۆر (مُحْسِــن الميالی) ئەندامی كۆمەڵەی چارەسەركردن بەووزە. لە(ڕووسیا) ووتی: زانایانی ڕووســیا بــەردەوام دەگەڕان بەدوای كاریگەری ووشــە لەســەر ووزە، ووشــەی زۆریان تاقی كردەوە، بەتایبەتی ئەو ووشانەی كــەزۆر بەكاردەهێنرێــنو مرۆڤەكان بەپیرۆزی دەزانن، ووشــەی زۆر زمانیان بەكارهێنا، هەتا گەیشتنە سەر ناوی خوا (الله)، سەیریان كرد لەرینەوەی شــەپۆلەكانی هێنانی ناوی خوا (الله) بۆ ماوەیەكی یەكجار زۆر بەبەهێــزی و كاریگەر دەمێنێتەوەو لەناو گەردوندا لەناو ناچێت، جیا لەهەموو ووشــەكانی تر ئەم شەپۆلانە وەكو هەڵدانی بەردێك بۆ ناو ئاو دەبینرێت. شەپۆلەكانی تادێت گەورەتر دەبێتو ماوەیەك لەناو ئاوەكــەدا دەمێنێتەوە. هەتا دەگاتە كەنــاری ئاوەكە. بەڵام ناوی (الله) هەتا هەتایە بەكاریگەرو شەپۆلی بەهێزەوە دەمێنێتەوە!..

**یەکێ لەو فەرمودانەی** (بِسْمِ الله) **تێدا هاتووە ئەمەیە:** (بِسْمِ اللهِ الَّذي لايَضُرُّ مَعَ إسْمِهِ شَيءٌ في الأرْضِ وَلافي السَّماءِ وَهُوَ السَّميعُ العَليم).

**هەرکەسێ ئەمە بەیەقینەوە بڵێ، توشی هیچ ناڕەحەتیەك نابێت إنشاءالله.**

**بەڵام ئیمانداران: پێویستە** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) **کەووترا لەناخی دڵەوە بێتە دەرەوە. نەك هەر قسەی سەرزمان بێت .. هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوکاتەدا کەلە** (طائِف) **بەشێوازێکی نەشیاو وەڵامیان دایەوەو بەدڵ شکاویەوە گەڕایەوە بۆ مەککە. لایدایە پەنا باخێکی ترێ، (عەداس) کەخەڵکی نەینەوا (موصڵ) بوو. هێشویەك ترێی بۆ بردن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریسەدا لەو ماندوو بوونو دڵتەنگی و مەراقەدا کەهەموو خەڵکی دونیا دەستیان بەڕویانەوە دەنانو دژایەتیان دەکردن. ئالەو کاتەدا دڵبەخەمیەدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو پەڕی متمانە بەخواو لەناخی دڵیەوە، بەهەموو خەلیەو شانەی لەشیەوە بەزمانی فەرموی:** (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم)، **ئەمجا ترێ یەکەی خوارد.** (عَدَّاس) **ووتنی ئەم** (بِسْمِ الله)**یە سەرنجی ڕاکێشاو کەوتە پرسیارو گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەری خواو سەرەنجام موسوڵمان بوو..**

**ئیمانداران: ئەو کەسانەی کەلەبەهێزی ئیمانەکەیانەوە، بەردەوام** (بِسْمِ الله) **یان لەسەر دەمە، کەسانی زۆر ڕۆشنبیرو تێگەیشتوون لەژیان و بڕوایان بەڕەئی بەرامبەر هەیەو لەگەڵ ئەوەدا کە** (بِسْمِ الله) **پیرۆزترین چەترەو سایەو سێبەرە کەسەدان لایەن دەتوانن لەژێریدا کۆببنەوەو هەموویان خاڵی هاوبەشیان** (بِسْمِ الله) **بەرامبەر بەنەیارو ناحەزانی** (بِسْمِ الله)، **توندو تیژی نانوێننو دەرگای گفتوگۆ داناخەن، هەروەکو لە (سیرە) دا هاتووەکە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەصوڵحی**

حودەیبیەدا، لەکاتی نوسـینی ڕێککەوتننامەکەدا، فەرموی: ئەی عەلی بنوسە (بِسْـمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم). حەزرەتی عەلی نووسی. بەڵام لایەنی بەرامبەر کە (سـەهلی کوڕی عەمر)بوو. ووتی: من ڕەحمان ناناسـم، دەبێ بنووسـی (بِسْمِكَ اللهُمَ). پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرموو، چۆن (بِسْـمِ الله) ڕەش دەکرێتەوە، جاچی لە (بِسْـمِ اللـهِ) جوانترە؟! نەخێر، بەڵکو فەرموی: ئەی عەلی (بِسْـمِ اللهِ)کە بکوژێنەوەو ئەوەی سـوهەیل دەیڵێ ئەوە بنووسـە!! بەڵێ ئەوە ڕێبازی ئەو کەسـانەیە کەبەردەوام هەمـوو کاروبارێکیـان بە (بِسْـمِ اللهِ) دەسـت پێدەکات. ئـاوا بڕوایان بەڕەئیو بۆچونـی بەرامبەر هەیەو هەرگیز ڕەئی خۆیان فەرز ناکەن و دەرگای گفتوگـۆ داناخـەن. کەواتە: موسـوڵمانی بەڕێـز: لەهەموو کارێکتـدا بە (بِسْـمِ اللهِ) دەسـت پـێ بکە. کاتێ دەسـت نوێژت گرت، سـەرەتا بڵێ بِسْمِ الله. کە خۆت شت، بڵێ بِسْمِ الله، کەقفڵی دوکانەکەت کردەوە، کەتەرازوەکەت دانا، کەچویتە سەرمێزی پیشەکەت. کەقەڵەمت هەڵگرت شتێ بنوسی، کەکتێبێکت کردەوە تا سەعی خوێندنەکەتی تێدا بکەی، کەهەر ئیشـێکت کرد، لەوەستایی. لەکرێکاری، لەچاك کردنەوە. لەهەموویاندا بڵێ: (بِسْـمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم). تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: لەکاتی سەرجێیی و جوت بونی ژنو مێرددا. با بِسْمِ اللـە بکەن. هەروەکو لەم فەرمودەیەدا هاتووە کەلە هەردوو صەحیحی بوخاری: (٥١٦٥) وە صەحیحی موسـلیم: (١٤٣٤) دا هاتووەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: (أَما لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ يَقُولُ حِينَ يَأْتِي أَهْلَهُ: بِاسْمِ اللهِ، أَللّهُمَّ جَنِّبْني الشَّيْطانَ، وَجَنِّبِ الَّيشْطانَ ما رَزَقْتَنا، ثُمَّ قُدِّرَ بَيْنَهُما في ذٰلِكَ، أَوْ قُضِيَ وَلَدٌ، لَمْ يَضُرَّه شَيْطان أَبَداً)..

واتـە: هەرکاتێ یەکێ لەئێوە چـووە لای خێزانی خۆی و جیماعی کرد، بابڵێ: بەناوی خوا. پەروەردگارم، بمپارێزە لەشەیطان. وە شەیطان

دورخـــەرەوە لەو کۆڕپەی کەلەم جیماعەدا پێمان دەبەخشـی. پاشـان ئەگـەر پەروەردگار بڕیاری دابێ کەلەو جیماعەدا منالْ دروسـت ببێ، هەرگیز شەیطان ناتوانێ زیان بەو منالە بگەیەنێ!.

هەروەها لەهەردوو صەحیحی بوخاری: (٣٢٨٠) وە صەحیحی مُسْلِم: (٢٠١٢)دا هاتـوە کە: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ئامۆژگاری صەحابەکان و هەموو ئوممەتەکەی کردو فەرمووی: (إذا اسْتَنْجَحَ اللَّيْلُ - أَوْكانَ جُنْحُ الَّيْلِ- فَكُفُّوا صِبيانَكُمْ، فَأَنَّ الشَّياطينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإذا ذَهَبَ ساعَةٌ مِنَ العِشاءِ فَحُلُّوهُمْ، وَأَغْلِقْ بابَكَ، وَاذْكُرِ اسْـمَ اللهِ، وَأَطْفِيءْ مِصْباحَكَ، وَاذْكُرِ اسْـمَ اللهِ، وَأَوْكِ سِـقاءَكَ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللهِ، وَخَمِّرْ إناءَكَ، واذْكُرِ اسْمَ اللهِ، وَلَوْ تَعْرُضْ عَلَيْهِ شَيْئاً)

واتە: کاتێ شـەو باڵی ڕاکیشـاو دنیا تاریك بوو. منالەکانتان بالای خۆتـان بنو بەتەنها بـەرەلای دەرەوەیان مەکـەن، چونکە لەو کاتەدا شەیاطینیەکان بلاودەبنەوە. جاکاتێ سەعاتێ لەشەو ڕۆشت. منالەکانتان ئازاد بکەنو ڕێگایان لێ مەگرن لەوەی کەبچنە دەرەوە. وەهەروەها کەشەو داهات، ئەی ئیماندار، دەرگاکەت دابخەو لەکاتی داخسـتنیدا (بِسْمِ اللهِ) بکە، وەچراکەتو گڵۆپەکەت بکوژێنەرەوەو لەکاتی کوژاندنەوەیدا (بِسْمِ اللهِ) بکە. وەدەمی کوپەی ئاوەکەت دابخەو (بِسْمِ اللهِ) بکە. وەمەنجەڵی چێشـتو خواردنەکەت بەسـەربەتاڵی بەجێ مەهێڵەو دایپۆشەو (بِسْمِ اللهِ) بکە.

بەڵێ موسوڵمان لەهەموو کارێکی ژیانی دا ناوی خوای لەسەر دەمەو (بِسْمِ اللهِ) دەکات، هەتا ئەوکاتەی کەدەمرێ، لەو کاتەشدا هاودینەکانیو ئیماندارەکانـی بـرای، بە (بِسْـمِ اللـهِ) بەخاکی دەسـپێرن. هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتـی: (إذا وَضَعْتُمْ مَوْتاكُمْ في القُبُورِ، فَقُولُوا: بِسْـمِ اللهِ، وَعَلى مِلَّةِ رَسُـولِ الله). رَواهُ أَحمد وَأَبُوداود، وَصَحَّحَهُ الأَلْباني في صَحيح الجامع: (٨٣٢).

بەڵێ هەرکەسێ بەردەوام (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) ی لەسەر دەم بێ، خوای گەورە دەیپارێزێ لەتووش بوون بەو گوناهانەی کەدەبنە غەزەبو تورەیی خوا لەسەر مرۆڤ. چونکە بەو (بِسْمِ الله) یە، مرۆڤی موسوڵمان بەردەوام دڵی پەیوەست دەبێ بەخواوە.

ئیمانداران: یەکێکی تر لەوشوێنانەی کە (بِسْمِ الله)ی تێدا دەنوسرێ (نامە) یە. کەزۆر جوانە، نامە نووسین بە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم) دەست پێ بکرێ. تەنانەت. ئەگەر نامە لەلایەن موسوڵمانەوە بۆ کافریش بنێردرێ دروستە (بِسْمِ الله)ی لێ بنوسرێ، هەروەکو لەقورئاندا، لەباسی نامەکەی حەزرەتی سولەیماندا، بۆ (بەڵقیس) کەئەو کات بەڵقیس کافریش بوو، کەچی نامەکەی حەزرەتی سولەیمان (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم)ی تێدا بووە. وەکو لەسورەتی (النَّمْل) دا باسی کردوە.

هەروەها لەهەردوو صەحیحی بوخاری: (٧)و صەحیحی موسلیم: (١٧٧٣)دا هاتووە. کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ نامەی نووسی بۆ (هیرقەل)، لەنامەکەدا نووسی: (بِسْمِ اللهِ الرَّحمن الرَّحيم ... مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِاللهِ ورَسُولِهِ، إلى هِرْقَلَ عَظيمِ الرُّومِ، سَلامٌ عَلى مَنِ اتَّبَعَ الهُدى... الخ). دەبینین هەرچەندە (هیرقەل) کافریش بووە، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) نامەکەی بە (بِسْمِ الله) دەست پێ کردووە.

بەڵام ئەگەر زانیت نامەکە لەلایەن ئەو کەسەوە فڕێ دەدرێو هەڵی ناگرێو بێ حورمەتی پێ دەکات. ئەوە نابێ (بِسْمِ الله)ی لێ بنوسی. وەئەگەر نامەیەکت بۆ هاتبوو (بِسْمِ الله)ی لێ نووسرابوو، وەتۆ ویستت فڕێی بدەی، ئەوا (بِسْمِ الله)کەی لێ بکەوەو لەشوێنێکی پاك، لەناو کتێبێك دایبنێ، یان لەشوێنێکی خاوێندا هەندێ گڵی بۆ هەڵکەنەو لەوێدا بیسوتێنەو پاشان گڵەکەی بەسەردا بکەوە.

ئیماندارانی بەڕێز: لەکۆتایی ئەم بابەتەدا، دەمەوێ ئاماژە بەدوو

خاڵی گرنگ بدەم:

١. کاتێ دەڵێین (بِسْمِ الله) لەسەرەتاو دەست پێکردنی هەموو کارێکدا دەکەین ئەوە نابێ وابزانین کەتەنها هەر بەوەندەی (بِسْمِ الله) مان کرد، ئیتر خوای گەورە هەموو شتێکمان بۆ جێ بەجێ دەکات و هەوڵیشمان نەدابێ و هۆکاری ئەو کارەشمان نەگرتبێتەبەر، هەر سەرکەوتوو دەبین. نەخێر. نابــێ وا تێبگەین، بۆ نموونە: خوێندکارێك لەتاقیکردنەوەدا، بڵێ چونکە (بِسْمِ الله)م کردووە، دەبێ هەموو وەڵامەکانم ڕاست بن! بەڵام دەبێ ئەو قوتابیەی وەڵامی پرســیارەکانی تاقیکردنەوە بداتەوە. کاتێ ڕاستی کردەوە لەگەڵ (بِسْمِ الله)کەدا، کەهەوڵو کۆششت کردبێ، ئەمجا بڵێ: (بِسْمِ الله)و داوا لەخوای پەروەردگار بکەی کەیارمەتی دەرت بێ، ئەویش بەوەی کەئەوەی هەوڵو کۆششت کردوەو لەبەرت کردوە بیرت نەچێتــەوەو جوانترین دەربڕینت بۆ بێتە ســەر نوکی پێنوســەکەت. لەم بارەیەوە سەیری قورئان بکەن، دەفەرموێ: (إِقْرَأْ) پاشان (بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَق). بەڵێ ئەبێ بخوێنیو بچیتە قوتابخانەو شــەونخونی بکەیو ئەمجا پشــت بەخوا ببەستیو (بِسْمِ الله) بکەی، تەماشاکەن نافەرموێ: (بِاسْــمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَق إِقْرَأْ) بەڵکــو (إِقْرَأْ) بکەو ئەمجا ناوی خوای لێبێنە .. ئەبێ زانستی پزیشکیت بەتەواوی خوێندبێو پسپۆڕی ئەو بوارەبی، ئەمجا (بِسْــمِ الله) بکەیو نەشــتەرگەری بکەی، نــەك بەبێ خوێندنو پســپۆڕی پزیشــکی خۆت لەخەڵکی بکەی بەدکتــۆڕو دەرزیو دەرمان بدەی بەخەڵك ئەمە چیە ئیماندارێکی نوێژ پاکیو (بِسْمِ الله) دەکەی. نەخێر. ئەمە تۆ ستەم لە (بِسْمِ الله) دەکەیو دەبێ سزا بدرێ ی!.

دووبارە ســەرنجی قورئان بدەنەوە: لەباســی حەزرەتــی (نوح) دا. دەبینین حەزرەتی نوح. ماوەیەکی یەکجار زۆر خەریکی دروست کردنی کەشــتی بوو. داری دەبڕی، دەیکرد بەتەختە. لەسەر جوانترین شێوەی

ئەندازەیی کەبەرگەی شەپۆلە سامناکەکان بگرێ. کەکەشتیەکە پێکهاتبێ لەچەندان بەش. بەشــی ئاژەڵی دڕندە بەجیا، شــیردەر بەجیا، شوێنی حەوانەوەو ئیسراحەتی ژن و پیاو بەجیا. ئەمانەی هەموو بەشێوەیەکی وارێکوپێك و جوان و بەنەخشەسازی بەهێز بنیات نا، بەشێوەیەکی وا ئێســتا ئەو زانایانەی کەپارچەی پاشماوەی کەشتیەکەیان دۆزیوەتەوە، سەریان سوڕماوە لەو هەموو ووردەکاری و شێوە ئەندازەیی و ئەو بەردە گەورانەی کەحەزرەتی نوح کونی کردون و لەنگەری کەشــتیەکەی پێ ڕاگرتوون. جاتەماشــاکەن. حەزرەتی نوح هەموو ئەمانەی کرد. ئەمجا کەتۆفان هەســتاو زەوی ئاوی هەڵدەقوڵاندو ئاســمان ئــاوی دەباراند. کەشتیەکەی خســتەکارو فەرموی: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْرٖىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ﴾ هود: ٤١، بەڵێ هەموو هەوڵو تێکۆشــانی خۆی خستەکار، ئەمجا ناوی خوای لێهێنــاو داوای یارمەتــی لەخوا کرد کە ســەلامەتیان بکات. دەی تۆی موســوڵمان نابێ ســتەم لە (بِسْـمِ الله) بکەیو ئیســلام ناشرین بکەی ئەویــش بەوەی کە: ئوتومبێلەکەت مەرجەکانی توندوتۆڵی تێدا نـیە، ئیتر نابێ دەســت بکەی بەلێخوڕینیو بچیتە ســەر شــەقامی گشتیو بڵێی (بِسْـمِ الله) خوایە بەناوی تۆ، نەخێر، دەبێ وەکو حەزرەتی نوح، هەرچی پێویســتـیە بۆ ســەلامەتیو ڕزگاربــوون بیگریتەبەر، ئەمجا پشت بەخوا ببەستیو داوای لێ بکەی سەلامەتت بکاو لەبەلا بەدوورت بکاو توشی نەزانو ناشیەکت نەکات ..

نــەك بەداخــەوە. وەکــو ئــەم ڕووداوەی کەبەچاوی خــۆم بینیم. برادەرێکی چاککردنی تەلەفزیۆنو سەتەلایت، کەوەرشەی چاککردنەوەی ئــەو ئامێرە کارەباییانەی هەبوو. بۆی گێڕامەوەو نیشــانی دام. کەئەم تەلەفیزیۆنە هی کەســێکەو ســوتاوەو هێناویەتی بۆی چاك بکەمەوە. ووتــی: منیش کەســەیرم کرد لەئەنجامی زیادبوونــی توندی کارەبادا

بەرگەی نەگرتبوو، ســووتابوو. بەخاوەنــی تەلەفیزیۆنەکەم ووت: ئایا (حافیزە) ی لەســەر بوو. (ئەو ئامێرەی کۆنترۆڵی بەرزونزمی کارەبا دەکات). ووتــی: بەڵــێ پێوەی بوو. ووتــم: حافیزەکە عێراقی بوو یان ئێرانــی؟! ووتی: نازانم، بەڵام حافیزەمان پێوەکردبوو! کابرای وەســتا دەڵێ ووتم: ســەیرە ئەو حافیزەیە کاری نەکردوەو بەرگری لەسوتانی تەلەفیزیۆنەکە نەکردوە. دیارە حافیزەکەش ســوتاوە!، کابرای خاوەن تەلەفیزیۆن ووتی: نەخێر وەستا گیان، حافیزەکە هیچی لێ نەهاتووە، ئەوەتا لەگیرفانمایە!! ووتم: ئادەی نیشانم بدە! کە لەگیرفانی دەریهێنا، (کوژەکەیەکی شــینەو چاوێکی تێدایە. ئەوەی کەبەملی منالّدا دەکرێ بۆ چاوەزار!!). وەســتاکە لێی وەرگرتبوو، نیشــانی منی دا! جا تــوخوا میللەتی ئاوا کەپێش ناکەوێ. تاوانی ئیسلامە؟! ئایا (بِسْمِ الله) ئاوامان فێردەکات؟! حاشا ..

٢. خاڵــی دووەم کەدەمەوێ ئاماژەی پێ بدەم ئەوەیە: ئێمەی ئەهلی مزگــەوتو هەڵگرانــی پەیامی ئیســلام، دەبــێ زۆر بەئاگابین لەوەی کەکاتێ (بِسْــمِ الله الرَّحْمن الرَّحيم) دەکەیــن لەهەرکارێکماندا، بەتایبەت کەلەناو خەڵکین. بۆ نمونە: دوکاندارێك کاتێ شــتێ دەفرۆشــێ و بۆ کڕیاری دەکێشێ. زۆر پیرۆزو پڕ بەرەکەتە (بِسْمِ الله) بکات. وەکڕیاریش دڵو دەرونی پێی دەگەشــێتەوەو تام و چێژی زیاتر لەو شــتە دەکات کەکڕیویەتــی، چونکــە دەڵێ لەکەســێکی موســوڵمانم کــڕی، کەناوی خوای لەســەر دەم بوو! بەڵام ئەوە زۆر گرنگە، کەکاتێ فرۆشیار (بِسْمِ الله)ی کــرد. دەبێ ئاگاداری ئەوە بێت کارێکی وانەکات کەکڕیار دوایی هەســتی پێ بکات، کەدەســتی بڕدراوە، یان غەشــی لێ کــراوە. بەڵکو دەبێ ئەو (بِسْــمِ الله)یە، فێری ئەوەت بکات کەسەرراســترین فرۆشیار بیت، چونکە ئەگەر (بِسْــمِ الله)ت کردو پاشــان غەشــت لەکڕیار کرد،

ئەویــش پێی دەزانێو بەداخەوە ئەگــەر زۆر ئیمان دامەزراو نەبێ و باش لەئیسلام حاڵی نەبوبێ، کە لەکەسەکانەوە ئیسلام نەناسێ. بەڵکو ئیســلام لەخۆیەوە بناسێ، ئەوە بەهۆی ئەو غەشەوە کەلەژێر پیرۆزی (بِسْـمِ الله) دا کراوە. ئیســلامی لەلا ناشــرین دەبێــت!. ئەوکاتە غەش کردنەکە دووجار تاوانی دەبێت. تاوانی غەش لەکڕین و فرۆشــتنەکە، تاوانی غەش کردن لەژێر ناوی (بِسْـمِ الله)و پیاوچاکی و دەم بەزیکری دا. کەستەمێکی گەورەی لەئیسلام کردووە!.

ئیمانداران: بەڕاســتی جێگای دڵخۆشیە کەکەسانێك هەن، بەکردەوە نیشــانی دەدەن کەچەندە ئیمانیــان بەهێزە بەچاودێری خوای گەورە. کەکاتێ (بِسْمِ الله) دەکەن یەقینیان هەیە کەخوای گەورە نەك هەرچاوی لێیانە، بەڵکو بەخەتەرەی ناو دڵیشیان ئاگادارە.

سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن:

کــە ڕوداوێکــەو لەدەڤــەری ڕاپەڕیــن (ڕانیــە) ڕووی داوەو ئەمە ناوەڕۆکەکەیەتی: کابرایەکی جامباز، فرۆشــیارو کڕیاری مەڕو ماڵات، ڕۆژێکیان گامێشــێکی زۆرچاك لەمەیدانی ڕانیە دەکڕێ و تائێوارە بۆی نافرۆشــرێتەوە، بۆیە ئێوارە دەیخاتە ئوتومبیلە توێتاکەیەوەو دەیبات لەگوندێکی نزیك ڕانیە دای دەنێت لەماڵی برادەرێکی دڵســۆزیو دەڵێ: بالێــرە بێ لــەلای مانگاکانی ئێــوە، هەتا یــەك دووڕۆژی تر دێمەوە بۆیی‌و دەیبەمەوە بۆ مەیدانی ئاژەڵ فرۆشــتنی ڕانیە. خانەخوێ دەڵێ نرخی چەندە؟! دەڵێ: (ئەوەندە ملیۆنە). إنشــاءألله شــتێ خێر بکات دەیفرۆشــم. بەڵێ گامێــش بەجێ دێڵێ و دەڕوات. شــەو خانەخوێ و خێزانەکەی باسی ئەوە دەکەن کەبۆچی ئەم گامێشە بۆخۆیان نەکڕن. پیاوەکە دەڵێ: هەرزۆر باشــە، پارەمان هەیەو جێگاو ئالیکی باشــمان هەیــەو لەجیاتی بچین لەمەیــدان بیکڕین. ئەمە هاتۆتە ماڵی خۆمان

و (ســی) هــەزار دیناریك خێریشــی بۆ دادەنێین. بــەم جۆرە بڕیاری خۆیان دەدەن و كابرای خاوەن ماڵ هەرئەو شــەوە پارەكە دەژمێریو قازانجەكەشــی دەخاتە ســەرو حــازری دەكاتو بەژنەكەی دەڵێ: ئەوە پارەكەیــەو بالاتبێ، نەوەكا كاتێ فلانەكــەس دێ. من لەماڵ نەبم، تۆ پارەكەی بدەیەو پێ ی بڵێ. كەخۆمان هەڵمان گرتۆتەوە! بەو نیەتەوە دەخــەون كەئەم گامێشــە هی خۆیانە، بەڵام (سُــبْحانَ اللــه) كەبەیانی هەڵدەســتن گامێش خەریكی ئەوەیە مــردار ببێتەوەو كەوتۆتە لرخە لــرخ و لەقەفرتــێ و بەحاڵ ڕۆحــی تیاماوە! بەپەلە ســەری دەبڕنو ناوی خێری لێ دێنن و دابەشی دەكەن بەسەر دانیشتوانی گوندەكەدا! بــۆ ڕۆژی دواتــر خــاوەن گامێش دێتــەوەو دەڵێ پەلەمــەو دەمەوێ گامێشەكەم باركەم. ئەوانیش دەڵێن: جارێ وەرە دانیشەو نانی نیوەڕۆ ئامادەیەو لەگۆشتی حەیوانەكەی خۆت بخۆ. ئەویش وادەزانی بەگاڵتەو ســوعبەتیانەو دەڵێ: دەی دەردو بەڵای بردبێ. پاشان كەدێتە ژوورەوە بۆی دەردەكەوێ كەبەڕاستیانەو گامێشەكە بەحاڵ بەچەقۆ ڕاگەیشتوەو كردویانــە بەخێر. ئەویش زۆر مەردانە دەڵێ: هەر گوێشــی مەدەنێ، خوای كردوە بەدەست ڕاگەیشتوەو موسوڵمانان لێیان خواردووە. بەخوا وادەزانــم هەموو پارەكەیــم لەگیرفاندایەو تەنها ئێــوە گەردنم ئازاد بكــەن كەبومە هــۆی عەزیەت دانتــان!! بەڵێ نان دەخــواو دەیەوێت بڕوات. خاوەن ماڵ دەستی دەگرێ و دەڵێ: مەڕۆ بابچینە ئەو ژوورەوە، لەوێ (تەواوی پارەكەی) دەخاتە بەردەســت كەشــەو بــە (٣٠) هەزار خێرەكەشــەوە ئامادەی كردبوو. دەڵێ: ئەمە پارەی گامێشەكەیەو (٣٠) هەزاریشم خێر بۆداناوی ! كابرای خاوەن گامێش دەڵێ: باشە ئەوە تۆ دەڵێی چی؟! ئەی گامێش ســەرنەبڕدراو نەخــورا؟! خاوەن ماڵ دەڵێ: بەڵێ ڕاســتە. بەڵام من ئەو شــەوەی كەتۆ گامێشــەكەت هێنا، لەگەڵ

خێزانەکەمـــدا بڕیارماندا کەبیکڕین بۆ خۆمان و هەرئەو شـــەوە. ئەم پارەیەم جیاکردەوە بەتەواوی مانا ئەو گامێشەمان کرد بەهی خۆمان، چونکە دەمانزانی تۆ هەر دەیفرۆشـــی! لەبـــەر ئەوە لەژێر موڵکایەتی مندا مردوەو هیچ پەیوەندی بەتۆوە نەماوە!!! بەم شـــێوەیە هەردوولا زۆر هـــەوڵ دەدەن کەقەناعەت بەیەك بکەن. کەهی ئەم بوەو هی ئەو نەبووە. بەڵام خاوەن گامێش هەر ســـوور دەبێ لەســـەری و دەڵێ: دەی باشـــە مادام هەرقبوڵی ناکـــەی نیوەی پارەکە تۆبیدەو نیوەشـــی هیی منە، خانەخوێ دەڵێ: نەخێر هەمووی هیی منەو دەبێ (سی) هەزاری قازانجەکەش هەڵبگری!! ســـەرەنجام خـــاوەن ماڵ تەنها (٣٠) هەزارەکە هەڵدەگرێتەوەو تەواوی پارەکە دەداتە خاوەن گامێشـــەکەو گەردنیشی پڕ بەدڵ ئازاد دەکات! بەڕاستی ئەمە موسڵمانی ڕاستەقینەیە.

خوای پەروەردگار ڕەحممان پێ بکات و لەگوناه و هەڵەکانمان ببورێ.

(رَبَّنا آتينا فِي الدُّنيا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَة حَسَنَةً وَقنا عَذابَ النّار) أللّهُمَّ آمين ...

سەرچاوەکان:

١. يَضحَكُ رَبُّنا وَيَضْحَكُ رَسُولُنا، محمد متولي الشَّعراوي، ص٣١٥ ، ص٣١٣.

٢. بەرەو ئیسلام، ئارامی، ئەندازیار عُثمان.

٣. دەروازەیەك بۆ ئاوێزان بوون، پەری حمە جەزا، ل٢١.

٤. شَرح الأُصُول الثَّلاثَة، محمد حَسّان، ص١٥، ص١٧، ص١٨.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانداران: ئێمە ئەمڕۆ لەڕۆژگارێکدا دەژین، کەئەم ماددیگەراییە وای کردووە (بێ ئاگایی) ڕووی کردۆتە زۆربەی خەڵکی، بێ ئاگایی و گوێ نەدان بەباسی خواو قیامەت و قەبرو تەنها بینین و بیرکردنەوە لەم دونیایەو ژیانی ئەم دونیایە. وەکو ئەوەی کەهەرگیز جێی نەهێڵین! کوا کام کۆڕو دانیشتنمان ئەوەندەی باسی دونیاو دەوڵەمەندبوونی تێدا دەکرێ، باسی خوای گەورەو قیامەتی تێدا دەکرێ؟! ئەوانەی ئەمڕۆ لەنەخۆشی غەفلەت پارێزراون بەڕەحمی خوا، هێندە کەمن وەکو موی سپی وان لەگایەکی ڕەشدا! ئەوانە غەریب بوون،** (فَطُوبَى لِلْغُرَباء)، **تەنانەت هەیە پێیان دەڵێ: ئەوەندە دینداری بەقورسی مەگرە، وریابە بەدینداری شێت دەبی!! بەڵام ئەو هەموو عەرەق خۆرو سەرخۆش‌و بێ هۆشە دەبینێ. ناڵێ وازبێنن و ئێوە بەدەستی خۆتان خۆتان شێت کردووە!.**

**بەڵێ ئیمانداران: غەفلــەت کەڕووی کردە دڵ‌و دەروون، وا لەمرۆڤ دەکات کەتەرکی واجبات بکات. وەتەرکی نەهی کردن لەخراپەو مونکەر بــکات، وەواز لەنوێژی جەماعــەت و مزگەوت بهێنێ، وەلەزەت و چێژ لەخواپەرستی نەبینێ. وەساردو ســڕبێ لەبەجێهێنانی عیبادەتەکاندا. وەخۆی مەشغوڵ بکات بەکارە موباحەکانەوە. کەهەرچەندە حەرام نین، بەڵام خزمەتیش بەدین و ژینی ڕاستەقینەی مرۆڤ ناکەن. ئیتر مرۆڤی غافــڵ وای لێ دێ خواردن و خواردنــەوەی زۆر دەبێ و کاروکردەوەی کەم دەبێ. لەجل و بەرگی لاشــەدا پۆشتە دەبێ، بەڵام لەجل و بەرگی تەقواو ئیماندا شــڕۆڵە دەبێ، خەوتنی زۆر دەبێ‌و بەخۆدا چوونەوەی کەم دەبێ، حەز بە گەشت و سەیرانی لاشە دەکات. بەڵام گەشتی ڕۆح و دڵ‌و دەروونی واز لێ دێنێ. مرۆڤی غافڵ وای لێ دێ. بەردەوام هەوڵی**

ڕازی بوونی خەڵکی دەدات و خوای خەڵکی لەخۆی توڕە دەکات.

ئەهلی غەفڵەت بەدڵ لەشتەکان ناگەن. بەچاویان نابینن، چونکە بینینی چاوی سەر لەگەڵ (البَصیرَه) ڕوناکی دڵ. جیاوازی زۆرە. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ۚ أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴾ الأعراف: ٩٧١.

واتە: سـوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆر لەپەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردوە. ئەوانە دەزگای دڵیان هەیەو کەچی حەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی هەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئائەوانە وەکو ئاژەڵ وان لەشوێن کەوتنی ئارەزوودا. بەڵکو ئەوانە وێڵ تریشن، ئائەوانە هەر غافڵو بێ ئاگان لەحەق. بەڵێ مرۆڤی غافڵ لەئاژەڵ وێڵترە، چونکە ئاژەڵ ئەو عەقڵەی مرۆڤی نی یە. پێغەمبەرانی بۆ نەهاتووە، قورئانی لەبەردەسـتدا نیـیە. بەڵام مرۆڤ هەموو ئەمانەی هەیە، کەچی غافڵەو بێئاگایانە لەژیاندایە..

بەڵێ بەڕێزان: مرۆڤی غافڵ لەقیامەتا بەئاگا دێتەوە، خوای گەورە لەقورئاندا فەرمویەتی: ﴿ وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴾ ق:١٢-٢٢.واتە ڕۆژی قیامەت دێت و هەموو کەسێك دووکەسی لەگەڵدایە، یەکێکیان دەیگەیەنێتو ئەوەی تریشیان شایەتە بەسەریەوە. بەیەکە یەکەی بێ باوەڕان دەوترێت: سوێند بەخوا بەڕاستی تۆ لەم بەسەرهاتانە نائاگابویتو گوێی خۆتت لێ خەواندبوو، ئێستا ئێمە پەردەمان لەسەر چاوەکانت لاداوەو هەموو شتێك وەکو خۆی دەبینیت و ئەمڕۆ چاوەکانت تیژە.

هـەروەهـا خـوای پـەروەردگـار خـۆی فـەرمـانـی بەپێغەمبەرە خۆشەویستەکەی کردووە، کەدوور بێ لەغافڵەکان. دەفەرموێ: ﴿ وَلَا

تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴾ الأعراف: ٢٠٥.

**واتە: لەبیٚ ئاگایان مەبە. ئەوانەی کەدڵیان لەخوا غافڵە.**

**ئیمانداران: سەرچاوەی غەفڵەت و بیٚ ئاگایی، نەشارەزایی یە لەدین، خوای گەورە فەرمویەتی:** (يَعْلَمُوْنَ ظاهِراً مِنَ الحَيوةِ الدُّنيا، وَهُمْ عَنِ الآخِرَةِ هُمْ غافِلُون) ..

**بەڵــیٚ زۆر کەس هەیە، بۆ کاروبــاری دونیایی زۆر زیرەکەو ووردە. دەزانیٚ چەند جۆر دراو هەیە. دۆلاریٚك چەند سەنتە. سیاسەتی دەولی چۆنە، کیٚ چی دەکاتو خەریکی چی یە. کەچی لەولاوە نازانیٚ ئەرکانی ئیمان چییە، نازانیٚ قیامەت چۆن دادیٚو چی فریات دەکەویٚ. بەڕاستی لەقیامەت غافڵە.**

**جابەڕیٚزان: ئــەو هۆیانەی کەوا دەکەن مرۆڤ بیٚ ئاگا بژی لەخواو قەبرو قیامەتی خۆی. بەکورتی ئەمانەن:**

١. الإنْشِغال بالدُّنيا وَالرُّكُونُ إِلَيْها، والحُبُّ مِنْ أَجْلِها وَالبُغْضُ مِنْ أَجْلِها: **مەشغوڵ بوونو خەریك بوونی زیاد لەپیٚویست بەدونیاو مەیل بۆلاکردن بەلای دونیاداو دورکەوتنەوە لەقیامەتو خۆشەویستی لەپیٚناوی دونیاداو ڕق لیٚبوون لەپیٚناوی دونـیادا. هـەروەکـو ئەمڕۆ دەبینین، زۆری خۆشەویستی نیٚوان خەڵکی هەر لەبەر بەرژەوەندی دونیایییە. بۆیە فلاٚن کەسی خۆش دەویٚ چونکە ئیشی پیٚ یەتی. چونکە بەرژەوەندی لەگەڵیا دەگونجیٚ. وەکەڕقیشی لیٚیەتی هەر لەبەر دنیا ڕقی لیٚیەتی. کـەبـەرژەوەنـدی لەگەڵیا ناگونجیٚ، کـوا دەگـمـەن نـەبیٚ کیٚ هەیە لەبەرخوا. تەنها لەبەر خوا فلاٚن کەسی خۆش بویٚت. یان تەنهاو تەنها لەبەرخوا ڕقی لەفلاٚن کەس بیٚت! باشە هەرچی کیٚشەی ئەمڕۆ هەیە، هەرلەسەر ماڵی دونیا نی یە؟! ئەوەی کەخۆشەویستی نیٚوان ژنو میٚرد. باوكو دایكو برا لەیەك دەکات. هەرتەماحو ماڵی دنیا نی یە؟**

ئەوەتا گفتوگۆی ژنو پیاوی ئەم سەردەمە بەیەکەوە هەر ئەمەیە: ئەرێ کەی ئەوە بکڕین. ئەوە مۆدی نەماوە!، ماڵی فلان کەس ئەوەیان کڕیوە، ئەرێ چی بخۆین؟! کوا ژنو مێرد جارێك دانیشنو باسی ئەوە بکەن چۆن سوننەتێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەماڵەکەیاندا زیندوو بکەنەوە! ئەوەی ئەمڕۆ متمانەی لەنێوان خەڵکی دا نەهێشت هەر ئەم باوەش کردنە توندەیە بەدونیادا. کەزۆرکەس هەزار برادەرو دۆست و ئاشنای خۆی دەگۆڕێتەوە بەدۆلارێك!! چەند برادەری گیانی بەگیانی (بەڵام دوور لەدین) برادەرەکەی خۆی کوشت بۆ پارەو ماڵی دونیا. بۆ ئوتومبێلەکەی! هەروەکو ئەوەی کەلەپارێزگای سلێمانی بینیمان دوو خوێندکاری زانکۆ، یەکێکیان دەوڵەمەندو خاوەن ئوتومبێلی مۆدێل بەرز، یەکیان نیمچە هەژارو بێ ئوتومبێل، دوای سێ ساڵ لەبرادەرایەتی، کەهەموو جارێ بەیەکەوە لەسلێمانیەوە چون بۆ زانکۆی صەلاحەدین، چونکە هەردوکیان قوتابی زانکۆو هەمان کۆلێژو بەش بوون بەیەکەوە. کەچی ئەوەبوو لەبەر تەماحی سەیارەو پارەکەی. یەکێکیان بەفێڵو پیلان ئەوی تریان کەدەوڵەمەندەکە بوو. بردیە دەرەوەی شارو لەوێ کوشتیو لاشەکەی فڕێ داو ئوتومبێلەکەی هێنایەوەو پاشان گیراو دانی نـا بەخیانەتو تاوانەکەیدا!!

بەڵێ ئەمە هەمووی لەسەر دونیاو ماڵی دونیا. چارەسەری ئەمەش بەوە دەبێ کەئەو ڕاستی یە بزانین کە: دونیا شوێنی پێدا ڕۆیشتنە، نەك مانەوە. (الدُّنيا مَمَرٌ وليْسَتْ مَقَرّاً). جا پێویستە ڕێگاوبانمان جوانو پاكو ڕازاوە بن، ڕووناك بن، دارو درەختو گوڵو گوڵزاریان لەملاولاوە بێ، بەڵام ئایا کەس هەیە. ئەو جادەو ڕێگاوبانە بەماڵی ڕاستەقینەی خۆی بزانێ و بڵێ من لەم سەرشەقامە دەخەوم؟! دەی دونیاش هەروایە، ڕۆژانە لە لەدایك بوونتەوە پێیدا تێ دەپەڕی تا لەو سەرەوە دەچیتە

**تونێلی قەبرەوەو بەرەو قیامەت دەڕۆی!**

بەڵێ ئیمانداران: ئیسلام نافەرموێ تۆی مرۆڤ تەرکی دونیا بکە، بەڵام دونیا وەکو ڕێگاو بانەکە تەماشا بکە. جوانی بکە، خاوێنی بکە، (إماطَةُ الآذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَة) بکە. بەڵام چاوت لەو سەری ڕێگاکەبێ بانەکەوێتە ناو چاڵ و چۆڵ ، بەڵام کەی چاوت لەوسەری ڕێگاکە دەبێ؟! کاتێ کەبەشەقامێکی ڕاست و ڕێکدا بڕۆی. کەهیچ گرێو گۆڵو پێچ و پەنایەکی تێدا نەبێ. کەئەو ڕێگایەش (صِراط المُسْتَقيم) کەلە ئەندازەدا. بەو هێڵە دەوترێ کەهیچ لاری و خواریەکی تێدا نیە ئەو (صِراطَ المُسْتَقيم)ەی ناو نوێژەکەمانە کەداوا لەخوا دەکەین و دەڵێین: (إهدِنا الصِّراطَ المُسْتَقيم). بەڵام بەداخەوە دەردی غەفڵەت وای لێ کردوین کەلەنوێژەکەشماندا نازانین دەڵێین چی!.. کەڕۆژی (١٧) جار تەنها لەنوێژە فەرزەکاندا دەڵێین: (إهدِنا الصِّراطَ المُسْتَقيم)، کەچی لەدەرەوەی مزگەوتەکەو ئەولای بەرماڵی نوێژەکەوە بەشوێن غەیری (صِّراطَ المُسْتَقيم) دەکەوین.. بەڵێ بەڕێزان: دونیا نەویستی لەئیسلامدا نی یە. بەڵکو ئەوە هەیە کەنابێ موسوڵمان دونیا پەرست بێ، دونیا هەموو هیواو ئاواتێکی بێ، نابێ بەیەکەوە نانی سەروەتو سامان و خۆش گوزەرانی ژیان توشی بێئاگایی (غەفڵەتت) بکات و قیامەتت بیر بباتەوە. یادو زیکری خوای خالیقی خۆتت بیربباتەوە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾ الحشر: ١٩.

واتە: نەکەن وەکو ئەو کەسانەبن کەخوایان فەرامۆش کرد ، شوێنی بەرنامەکەی نەکەوتن. خوایش ئەوانی لەبیرخۆیان بردەوە. ئەوانە لەسنور دەرچوو تاوانبارەکانن... بەڵێ، هەرکات دونیاو کۆکردنەوەی دونیا توشی غەفڵەتی کردی، ئەوا دڵنیابە بەردەوام خۆت بەهەژار

دەزانـــی، چونکـــە لەبیرت چۆتـــەوە ئەم ماڵو ســـامانە هـــی خوایەو بەدەســـت خۆیەتی بیـــدا بەکێ لەبەر حیکمەتێـــکو لەکێی بگرێتەوە لەبەرحیکمەتێك ...

بەداخەوە زۆربەی خەڵکی دەوڵەمەندی ئەمڕۆ وەکو ئەم بەسەرهاتەی لێ هاتووە کە: ڕۆژێك پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند بەهاوڕێیەتی کوڕەکەی گەشـــتێك بۆ شارێکی هەژارنشـــین ئەنجام دەدات. تاکوڕەکەی بەچاوی خۆی حاڵ و گوزەرانی هەژاران ببینێت و بزانێت بەچ شێوەیەك ژیانی ڕۆژانەیان بەسەر دەبەن و چۆن دەژین!، بۆ ئەم مەبەستە چەند ڕۆژێك لەماڵی خێزانێکی هەژاردا بەســـەر دەبەن. پاش کۆتایی گەشتەکەیان و گەڕانەوەیان باوکەکە لەکوڕەکەی پرسی: کوڕی خۆم گەشتەکەت بەلاوە چۆن بوو؟ ئەویش دەڵێت: بابەگیان گەشتێکی زۆر نایاب بوو!!. باوکەکە ووتـــی: ئایا بینیت هەژاران بەچ شـــێوازێك دەژین؟! کوڕەکە لەوەڵامدا ووتی: بەڵێ بابەگیان .. باوکەکە ووتی: کەواتە پێم بڵێ لەم گەشـــتەدا چی فێربوویت؟! کوڕەکەی ووتی: بینیم ئێمە سەگێکمان هەیەو ئەوان چوار ســـەگ!! لەناوەڕاســـتی باخچەکەماندا حەوزێکـــی بچوکی ئاومان هەیـــە، بەڵام ئـــەوان جۆگەیەکیان هەیە کۆتایی نایـــەت!! ئێمە چەند گڵۆپێکمان بۆ ڕووناك کردنەوەی باخچەکەمان هەیە، ئەوانیش هەزاران ئەستێرەی پرشنگدار ئاسمانی باخچەکەیان ڕووناك دەکاتەوە. بابەگیان ماڵـــی ئێمە بەردەمەکەی باخچەیەکەو کۆتایـــی پێ دێت. بەڵام ئەوان ئاســـۆیەکی فراوانیان هەیـــەو کێڵگەکانیش تێ دەپەڕێنێ!! ئێمە چەند خزمەتکارێکمـــان هەیە. خزمەتمان دەکـــەن. ئەوانیش هەرئەندامێکی خێزانەکەیـــان لەنێـــوان خۆیانداخزمەتـــی یەکتری دەکـــەن. ئێمە بۆ دەسکەوتنی پێویستی و خواردنەکانمان ناچار دەبین بیانکڕین، ئەوانیش ئەوەی کەخۆیان دەیچێنن دەیخۆن و نایکڕن.

ئێمــە چەند دیوارێکی بەرزمان هەیە تا بمانپارێزێت، ئەوان چەند هاوڕێیەکی دڵسـۆزیان هەیــە پارێزگاریان لێ دەکــەن. باوکی کوڕەکە گوێــی بۆ کوڕەکەی گرتبــوو، بێدەنگ بوو، لەوکاتــەدا کوڕەکە ووتی: بابەگیان زۆر سوپاست دەکەم، لەبەرئەوەی بەم گەشت و سەفەرە تێت گەیاندم، کەئێمە چەند هەژارین!!..

بەڵێ ئەمە حاڵی ئەو کەســەیە کەلەشار دەژی، خۆئەوەش کەلەلادێ دەژی، ئاوا بەپێچەوانەوە عەشقی ژیانی ناوشارەو بەردەوام بەژیانی ناو لادێو خــواردنو خانوی گوند ناڕازی یــە. هەرئەڵێ خوا بیبڕێ کەی ئەمە ژیانە، ئیتر غەفڵەت یەخەی دەگرێ و لەجیاتی شوکرانە بژێری توشی کوفرو ناشوکری دەبێ!

بەڵێ چارەســەری دونیا پەرستی قەناعەتە، وەرە بیربکەوە: ئەگەر هەمــوو موڵکی دونیا هی تۆ بێت، خۆ ئەوپەڕی ژەمێك زیاتر دەخۆی. خەڵکی ســێ ژەم دەخوات. ئەوپەڕی تۆ چوار ژەمت خوارد. خۆئەگەر هەرچی خواردنی خۆشە هەتبێت، تەنها یەك ساڵ لاشەت بەرگەی ئەوە دەگرێ چیت حەز لێ یە بیخۆی، پاشان نەخۆشی ژیانت لێ تاڵ دەکات. چونکــە ئەگەر هەرچی دڵت بیخوازێ هەتبــێو هەموو ڕۆژێ بیخۆی. تووشــی شــەکرەو فشــاری خوێن و دەیان نەخۆشــی دەبیت، کەواتە: زۆرجــار کەخوای گەورە هەموو شــتێکت بەدڵی خــۆت ناداتێو چەند ژەم خواردنــی ســادە دەخۆی و ئەمجا ژەمێــك خواردنی چەورو باش دەخۆی ئەوە خوای گەورە ڕەحمی لەگەڵ کردوی. بۆئەوەی جەســتەت بەســاغی بمێنێتــەوە، ئەی نابینی ئەوانەی هــەژارن و خواردنی باش لەمانگێکا. جارێك ناخۆن، جەستەیان چەند ساغەو چۆن دکتۆر نابینن، بەپێچەوانــەی بەرپــرسو دەوڵەمەندەکان، کەهەموو ڕۆژێ ســفرەیان ڕازاوەیە چۆن جۆرەها نەخۆشــی لەلاشەیاندایەو نانێك ناخۆن حەبی

لەپێش و دواوە نەخۆن چایەك ناخۆنەوە ئەگەر تۆزێ شەكری تیابێ!
بەڵێ بەڕێزان: ئەگەر لەژیاندا چەند ئیسـراحەت بیو جێگات نەرم و گەرم بێ. بەخوا مەگەر دوو سـەعات زیاتر بتوانی لەوەی ئێسـتات زیاتـر بخەوی. ئاخـری وەرس دەبی. خـۆ ئەوەی كەكرێكارەو شـەو بێدارەو مانـدووە، بەدڵنیاییەوە كەحەزی لەخەوو پشـوە هی ئەوەیە كەدەرفەتـی نی یە، ئەگـەر ئەویش دەرفەتی خەوو ئیسـراحەتی بۆ برەخسێ بەئارەزوی خۆی ، ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەو تامو چێژەی ئێستا لەخەوتن ناكات!. خۆ ئەگەر هەموو خانووەكانی سـەر زەوی هی تۆبن هەر دەتوانی لەیەكیاندا بژی لەكۆتایشدا كەمردی و دونیات بەجێهێشت، تەنهـا هەردوو مەتـر زەویت پێ دەبڕێ و وەكـو هەموو خەڵكی هەر لەیەك قەبردا دەبی، ئەگەر خوای گەورە بەنسـیبت بكات. چونكە كەم نین ئەوانەی كەمردن، نەخرانە گۆڕەوەو لاشەیان نادیارە!..
ڕەحمەتی خوا لەو شاعیرە بێ كەفەرمویەتی:
كەسێ مەردە كەعەوداڵی ڕازی كردنی خودا بێ
لەترسی قەهری بێ وێنەی، دڵی لەدونیا بەردابـــــێ
بۆ خزمەتی خەڵكی ڕەجاڵ، سەراپای عومری دانابـــێ
نەڵێ مەردم كەدنیا پشتی لەو، ئەو ڕوو لەدنیابــــــێ
كەپوری زاڵە، بۆچی پیرەزاڵی پێ ڕەزا نابـــــــێ؟!
فەرموو تەئریخی گشت بەشەر، سەراپای بیكە تەماشــا
بەقای بۆكەس نەبوە هەرگیز، نەبۆ هەژار نەبۆ پاشـــا
ئەگەر فەرزەن هەموو دونیات پێ ببەخشن لەشاباشــا
لە(دەروێش)و لە (شـا) ئەم فاحیشە ئاخر دەكا حاشـــا
گەر ئەهلی غیرەتی بەر لەو لەخۆیو ئەهلی حاشا بـــێ

ئیمانــداران: یەکێکی تر لەهۆکارەکانی غەفڵەت و بێ ئاگایی بریتی یــە لە گەنجیەتیو تەمەنی لاویەتــیو ئەوەی کەلە گەنجیەتیدا هەیە. لەچوستو چالاکیو لاشــەی پتەوو بەهێزو گەشەو نەش و نماکردنی. لەجوانــی و چێژوەرگرتــن لەژیان. کەگەنــج و لاو ئەوەندە بەهێزەو لەش ســاغەو بەهیواو ئاواتەوە دەژی، ئەگەر ئیمان و خواناسی لەگەڵ نەبێ زۆرجار، بەڵکو هەمووکات تووشــی غەفڵەتو بێ ئاگایی دەبێت. چارەســەری ئەمەش بــەوە دەکرێت کەگەنج بزانــێ قۆناغی لاویەتی لەنێــوان دوو بێهێزی دایە، قۆناغی منالی، لەگەڵ قۆناغی پیری. بەڵام بــڕوا بکەن قۆناغی گەنجیەتی لەمنالــی و پیری زۆر زوتر تێدەپەڕێ و تــەواو دەبێ، قۆناغی لاویەتی ڕێــك وەك بەهار وایە. وەرزی بەهار هەرئەوەنــدە دەزانــی کەوتیــان بەهارە هەتا خۆت ئامــادە دەکەی بۆ سەیران و گەشتێك دەڵێن بەهار تەواو بوو. گوڵاڵە سوورە نەماو تەواو بــوو ئەو گژو گیا ســەوزە جوانــە دڵڕفێنە زەرد بــوو!! گەنجیەتیش هەروەکو وەرزی بەهار ئاوا زوو بەسەر دەچێو وەختێ بەخۆت دەزانی کەپیری بەخۆییو بێهێزیو چاوکزیو لەرزۆکی و پشــت چەماوەیی و کەنەفتییەوە وا لەپێشوازیدایە.

بەڵــێ زۆر گەنج هەیە غافڵــە، بێ ئاگایە لەدینداری و خواناســی، بێئاگایە لەقیامەتی خۆی وەباوەشی بەدونیادا کردووە. کەوەکو ئەوەی کەهەرگیز جێی نەهێڵێ، چونکە وادەزانێ چونکە گەنجە هێشتا زۆری مــاوە لەدونیادا و جــارێ بەجێ ی ناهێڵێ، بــەڵام ئەوەتا بەبەرچاوی خۆمانەوە، ڕۆژانە ئەو هەموو گەنجو لاوە دەمرێ، بڕۆ سەرگۆڕستانەکان و تەماشــای بەرواری لەدایك بوونو مردنی ســەر کێلە قەبرەکان بکە، بزانە زۆربەی بەگەنجی نەمردون!

هــەر لەم حەفتەیــەدا (کاتی خوێندنەوەی ئەم ووتــارە) گەنجێکی

خوێنــدکاری زانکۆی ســلێمانی کەخوێنــدکاری قۆناغی (شەشــەمی) کۆلێجــی پزیشــکی بوو. خەڵکی قەڵادزێ بوو. لەکاتــی گەڕانەوەیدا بۆماڵەوە، لەنزیــك قەڵادزێ لەپێکدادانی ئوتۆمبێلدا گیانی لەدەســتدا!! ئەو هەموو خوێندنە ئەو هەموو شــەونخونیو تێکۆشانە تا لەکۆلێجی پزیشــکی وەرگیراوە چەند دڵی خۆش بووە. کەهەر شــەش ســاڵەکەی زانکۆی بڕیوەو ئەمساڵ دەبێتە پزیشك و پاشان دەیان و سەدان پڕۆژەو بەرنامەی ژیان و داهاتوو.

ڕەنگــە تاکە شــتێك کەلەبیــرو بەرانامەیدا نەبووبــێ، ئەو مردنە کتوپــڕە بووبێ کەپێچایــەوەو ژیانو ژینگەی کۆتایــی پێ هێنا!! هەر لەو ماوەیەشــدا لــە (چەمچەماڵ) دووبرا کەیەکێیــان قوتابی قۆناغی چوارەمی زانکۆ بوو. بەدەعمی ئۆتۆمبێل مردن!..

یــان ئەو هەموو گەنجەی لەهەڕەتی لاویەتی دا. توشــی نەخۆشــی ســەخت دەبنو ئەولاشە بەهێزو جوانە، چۆن بەچەند هەفتەو مانگێ دەپوکێتەوەو مردن کۆتایی پێ دێنێ. ئەمانە هەموو بەئاگاهێنەرەوەنو پێمــان دەڵێن: ئەی گەنــج لەغەفڵەت و بێ ئاگایــی دا مەژی. چونکە گەنجیەتی زوو تێدەپەڕێ و دوایی پەشــیمان دەبی، لەپیرەکان بپرسن کەچەنــد پەشــیمانن بۆ ئــەو تەمەنەی کاتــی خــۆی لەگەنجیەتیدا بەغەفڵەتو بێ ئاگایی لەخواو لەدینو مزگەوت بەسەریانبرد!!.

بەڕێــزان: یەکێکی تــر لەوهۆکارانــەی کەمرۆڤ بــەرەو غەفڵەت دەبەن بریتی یە لەتەندروســتی باشو لەشساغیو دوور بوون لەئازارو ناڕەحەتی. کەبەڕاستی ئەگەر مرۆڤ بەردەوام لاشەی ساغو تەندروست بــوو، هەمــوو هیواو ئاواتی دەبــێ بەگەڕان و خــواردنو خواردنەوەو بیرکردنەوەو هیوا درێژی و بەتەماعی. هەربۆیە کاتێ مرۆڤ نەخۆش دەکەوێ. ئەمجا بەئاگادێتەوەو لەخەوی غەفڵەت بەخەبەر دێ!..

وەیەکێکــی تریش لەهۆکارەکانی بێ ئاگایی و غەفلەت بریتی یە لە (دەســت بەتاڵی و بێکاری) کەمرۆڤ زۆرجار بۆی دەرەخسێ کەژیان و گوزەرانی مســۆگەرو باشەو زۆرهەوڵو کاسبی کردنی ناوێ، کەلەڕاستی دا، دەســت بەتاڵی بۆخۆی خەڵاتی خوایەو وەکو وێستگەی سوتەمەنی وەهایەو مرۆڤ خۆی تێدا بەهێز دەکاتەوەو گوڕوتین و وزەیەکی زیاتر کۆدەکاتــەوەو بۆکاری داهاتوی بەبەهێزیەوە دەچێتەوە مەیدان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴾ الشرح: ٧.

واتــە: جاکاتێ لەکارێکی خێر دەبیتەوە، خۆت ماندو بکە بەکارێکی خێری ترەوە. بەڵێ، کاتی دەست بەتاڵی ئەگەر لەخێردا بەکارنەهێنرێت، دەبێ بەخراپەو شەڕ پڕبکرێتەوە. چەندین ئافرەت دەست بەتاڵی وایان لێدەکات لەخواو لەعیبادەتەکانو لەقسەی خێرو ئاگاداربوون لەمێردوماڵو منداڵ بێ ئاگابێو وەکو ووتمان هەرکەسیش خەریکی خێرنەبێت دەکەوێتە شەڕەوەو سەرەنجام ئەو کەسانە لەژنو پیاو توشی کارەساتی خراپ دەبن.

یەکێکی تر لەو شــتانەی کەمرۆڤ توشی غەفلەتو بێئاگایی دەکات، بریتی‌یــە لە (هاوڕێی خراپ) کە هاوڕێ ی خراپ وەکو خۆی بێئاگایە تۆش توشی غەفلەتو بێئاگای دەکات. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴾ الكهف: ٢٨.

واتە: بەگوێی ئەوجۆرە کەسانە مەکە کەدڵیمان غافڵ کردووە لەیادی خۆمان (بەهۆی دونیا پەرستییەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووەو هەرچی کاروباری هەیە بێ سەرو بنەو لەسنور دەرچووە ... بەڵێ ئەمرۆ هاوڕێی خراپ کەتوشی غەفلەتو بێ ئاگایت دەکات هەر ئەو هاوڕێیە نیە کە لەبازاڕو سەرشەقامەکان دەیناسی، هاوڕێی خراپی جاران باشتر بوو. چەند سەعاتێ لەمرۆڤ دوور دەکەوتەوە. بەڵام

هاوڕێ ی خراپی ئەمڕۆ ئەگەر چی هەموو دەرگاكانیش داخەی (وغَلَّقَتِ الْأَبْوَاب) بكەی. لەماڵیش نەچیتە دەرەوە، ئەو لەژوورەوە لەگەڵتایە، شەوو ڕۆژی بۆ نی‌یە، پشوو نادات، ئەویش بوارەكانی گەیاندنو ڕاگەیاندنە. تەلەفیزیۆنو سەتەلایتو كۆمپیوتەرو ئینتەرنێتە. جایان دەبێ بەهاوڕێو هاودەمێكی باش بۆت، یان هاوڕێیەكی هەمیشەیی خراپو لەناوبەر كەوات لێ دەكات بێ ئاگابی لەیادی خواو بەردەوام لە بێ ئاگایی دا بژی..

چەند كەسمان هەیە بێ ئاگایە لەزیكری خوا، لەنوێژی جەماعەتی خەوتنانو بەیانیان. چونكە تا نیوەشەو بەدیار تەلەفیزیۆنەوە ناخەوێ. ئەمجا بێ ئاگا دەبێ و بۆ بەیانی غافڵو خەواڵوە لەئیشی فەرمانگەكەی. لەكاو كاسپیەكەی، ئەگەر خوێندكارە غافڵە لەسەعی و وانەكانی، ئافرەتی واهەیە بەچەند كاتژمێر بەدیار زنجیرە تەمسیلیٍ دۆبلاژكراوی لەدەرەوە هێنراوی بێ ناوەڕۆك دادەنیشێو بێ ئاگا لەماڵ، لەمناڵ، لەمیوان، لەهاوسەری ژیانی!! چەند باوك بەهۆی تەلەفیزیۆنەوە. كەهەر لەئێوارەوە كەهاتەماڵەوە، كۆنترۆڵەكەی بەدەستەوەیە، بێ ئاگایە لەمناڵەكانی، لەخێزانی، لەهەموو كەس، ئەوەی كەلەزۆربەی كەناڵەكانەوە وەری دەگری، زۆربەی هەرە زۆری سەرەنجامەكەی بریتی یە لەغەفڵەتو بێ ئاگایی لەخواو لەدینو لەقورئانو لەقیامەت. بۆ دونیاش دروست بوونی نەوەیەكی بێ هیمەتو بێ ئامانجو بێ سودو بێ بەرنامە!! بەداخەوە ئەم ئامێرانەی تەكنەلۆژیای سەردەم هەر لە (مۆبایل، سەتەلایت، CD، DVD)، میمۆری، كۆمپیوتەر، ئەنتەرنێت) لەم وولاتەی ئێمەدا، ڕەنگە زۆر ڕاست بێ ئەگەر بڵێین (٨٠٪) ی زیاتری بۆ خۆ بێ ئاگا كردنو خۆ خافڵاندن و تەماشاكردنی شتی ڕوخێنەرو ئابڕوبەر بەكاردێت، بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ دوادەكەوین، ئەو

هەموو پارەو ســەرمایەی بەفیڕۆی دەدەین. ســەرمایەی ژیانمانی پێ لەناو دەبەیــن، کەکاتمانە! کەکاتیش ژیانمانــە!.. خۆ وولاتانی تریش هەر بەم تەکنەلۆجیایە پێش کەوتون. بەلام ئەم وەسائیلانە بەدەستی گەنجانێکەوەیە کە: مۆبایلەکەی پڕی نیە لە گۆرانیو ڕەســمی خراپو لەسەر جادەش گۆرانی پێ لێ دەدات! ئەنتەرنێتو کۆمپیوتەر بەدەست کەسانێکەوەیە کەلەبەرامبەریاندا بەخەبەرنو پێش خۆرهەلاتن دەچنە ســەر کارەکانیان، نەك وەکو لای ئێمە کەنیوەڕۆ خەودەکەنو کاتژمێر (١١)ی پێــش نیوەڕۆ بەدەم باوێشــکەوە، بەیانی بــاش دەکەن!! وولاتی پێشکەوتو هاولاتیەکانی شەونخونی دەکەن بەسەر لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگی کتێبو بیرکردنەوەو پلان دانان و بەرنامەڕێژیدا، نەك بەشــەونخونی کردن بەدیار فیلمی ئەجنەبیو دۆبلاژکراو نێرگەلەکێشانو مەینۆشیو خۆ بەنج کردنو گاڵتە و ڕابواردنەوە!! بەلام تکایە ئەم قسانە ئەوەتان نەباتە بیرو مێشکەوە، کەهەرچی وولاتی موسڵمان و ڕۆژهەلاتی هەیە دەبــێ هەر دواکەوتوبــێو ئەوی ئەوروپی و ئەمریکــی یە، دەبێ هەر پێشــکەوتوو بێ! نەخێر، بەڵکو پێشــکەوتن پەیوەنــدی بەئاگابوونو بەهەوڵو هیممەتەوە هەیە.

من ســێ نمونەتان بۆ باس دەکەم، نمونەکان باسی سێ وولاتن، ئەم سێ وولاتە دوانیان موسڵمانن، یەکیان دژ بە ئیسلامە:

١. دەوڵەتی یەکەم، دەوڵەتی (ئیمارات)ە، کەدەوڵەتێکە لەسەر سستەمی پاشایەتی دەڕوا، وولاتێکی عەرەبی یە، چل ساڵ لەمەوبەر خەریکی حوشتر لەوەڕاندن بوون، بەپێی پێشبینیەکان بێت ساڵی (٢٠١٦) بەرهەمی نەوتی تەواو کز دەبێتو بەرەو کۆتایی دەڕوات. بەلام هەر لەزووەوە، سەرچاوەی نوێو ئەلتەرناتیفی بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نەوت دیاری کردوەو گەشتوگوزارو بازرگانیان بەگەورەترین سەرچاوە

داناوه كه دوو سەرچاوەی هەمیشە زیندوون. ئەوەبوو، كاتێ (محمد بن ڕاشد ئال مكتوم) میری میرنشینی دووبەی، بەم ووتەیە: (نَبْني القِمَمِ العالِية بِالْهِمَمِ العالِية) بەهیمەتە بەرزەكان، لوتكە بەرزەكان بونیات دەنێین، گەورەترین‌و بەرزترین بورجی لەجیهاندا (لەدوبەی) كردەوە. كەبەرزیەكەی (٨٢٨) مەترەو، (٢٠٦) نهۆمەو، جێگەی (١٢٠٠٠) كەسی تێدا دەبێتەوە، ژمارەی ئاپارتمانەكان: (١٠٤٤).

پـــارەی تێچوو (١،٥) یـــەك ملیارو نیوە!! ئەو دوریـــەی كەدەتوانرێ بورجەكـــەی لێوە ببینـــرێ (٩٥) كیلۆمەترە!!.. جیـــاوازی پلەی گەرمی بەرزترین تابق لەگەڵ نزمترین (١٠) پلەی ســـیلیزی یە .. ئەو تابقەی بەرزتریـــن مزگەوتی جیهانی لێ یـــە (١٥٨) ەمین تابقە!.. ژمارەی ئەو كرێكارانەی كاریان تێدا كردوە (١٢٠٠٠) كرێكارە! نرخی مانەوەی یەك شەو لەتابقی هەشتا (٨٠) بەرەو سەر (٣) ملیۆن دۆلارە!!.. بەم شێوەیە گەلی خۆی بەخێودەكات و سەرنجی هەموو دونیا بۆلای خۆی ڕادەكێشێ.

٢. وولاتی دووەم: مالیزیایە: وولاتێكی ئیسلامی یە. چەندین دین و نەتەوەی تێدایە، خاوەن ســـەرچاوەی سروشتی دیاری كراوە. پێك دێت لە (ڕۆن ، دار) .. مالیزیا تاساڵەكانی (١٩٦٠)، وولاتێكی كشتوكاڵی بووە، نەخوێندەواری و هەژاری ســـیمایەكی دیاری ئـــەو وولاتە بوون. بەڵام مالیزیا دەســـتی كرد بەبنیاتنانی ئابوریەكی پیشەســـازی، دەرگای والاّ كـــرد بەرووی بەرهەمهێنە بیانیەكاندا. ئێســـتا دووەم دەوڵەتە لەپاش وولاتە یەكگرتوەكان لەنەخشەسازی‌و بەرهەمی پارچەی ئەلكترۆنی دا .. لەم بوارەدا پێش هەریەك لە (چین، ڕوسیا، هیند، نەمسا) وەیە!..

(٥٠٪)ی هاوولاتیانـــی مالیزیـــا، ئەنتەرنێـــت بەكاردەهێنن، ئەمەش بەرزترین ڕێژەیە لەجیهاندا!!..

٣. وولاتـــی ســـێیەم. كەدژ بەئیســـلام‌و موســـوڵمانانە، (ئیســـڕائیلە)

کەولاتێکی تازە دروست کراوە. ڕاستەو بێ گومانە کەئەمریکا ڕاستەوخۆ کۆمەك و یارمەتی دەدات. بەلام: زۆر وولات دوژمنیەتی، هەژارە لەنەوتدا، دانیشتوانی کەمە، بەلام توانیویەتی لەو ماوەکەمەدا ئابوریەکی بەهێز بنیات بنێ. هەلی فێربوون لەهەموو ئاستو تەمەنێکدا دەستەبەر بکات!..

ئیماندارانی بەڕێز: یەکێکی تر لەهۆکارەکانی غەفلەت، پلەو پایەو دەسەلاتە. کەوا دەزانێ لەدەستی ناچێو تاسەر بۆی دەمێنێتەوە. بەلام پێویستە هەموو خاوەن کورسیەك ئەم حەقیقەتە باش بزانێ کە (لَوْ دامَ لِغَيْرِكَ ماوصَلَ إِلَيْكَ)..

شاعیر فەرمویەتی:

هەرچەندە ئەو ڕۆژە، لەلوتکەی کیبریادا بێ مەنزڵو جێت
سبەی ئەجەل یەخەت دەگرێ، دەڕۆی، یەکێ تر دێتە جێت
حەیفو مەخابنە بۆ (نەوس) باخی فیردەوست لەدەست چێت
سبەی خاکت بەسەر وەك من دەبێ (تَحْتَ الثَّرى) بێ جێت
بلا ئەمڕۆ کەخەوتی، مەسنەدت تەختی ثوڕەییا بێ!

مەحوی فەرمویەتی:

لەعیشوەی پڕ فەنی دونیا، مەبە ئەیمەن کەوەك نۆشی
بەتەفرەی مەی، بەسەد دانا، قەڕابەی زەهری نۆشیوە
وەکو دێوو ئیشی عەکسە، میهری قەهرە، شەربەتی زەهرە
فریبە، گەنمی هەرجۆ، شیری هەر دۆ. ڕۆنی هەرپیوە

لەکۆتایی دا دەفەرموێ:

ئەگەر تاجت لەسەرکا. سەرتی پێوە قوت ئەدا
ئاخر موبارەك کەی دەبێ ئەو خەلعەتەی خەلعی لەدوابێ!

بەڵـێ ئیمانـداران: کاربەدەسـتان ئەگـەر ژیربن. بەپۆسـتو پلەو پایەیـان غافـڵ نابـن و لەخـوای گـەورەو لەخزمـەت کردنی گەل‌و میللەتـی خۆیان. چونکە هەر سـەرکردەیەك غافڵو بـێ ئاگایانە ژیا، ئەوە جگە لەمەحکەمەی کوبڕای خوای گەورە لەقیامەتا سزای دۆزەخ بۆی. لەدنیاشـدا یاسای (سزای تاوانبارانی جەنگ) هەیە. کەتاوانەکانی جەنگیش ئەمانەن:

١. پیلان دانەر بۆ جەنگێکی دوژمنکاریانە.

٢. بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراو.

٣. دیل و بارمتە کوشتن.

ئەوەتا لەبەردەم دادگای باڵا لە (نۆرمبرج)ی ئەڵمانیا، (٣٦) سەرکردەی حکومەتی ئەڵمانی و حیزبی نازی درانە دادگا. (٥) یان بێ ئامادەبونیان دادگایی کران. (١١) کەسیان فەرمانی لەسێدارەدانیان دەرچووو. لەبەردەم دادگاکانـی (بەریتانیـاو ئەمریکاو یۆنان‌و چیـكو پۆڵەنداو نەرویج‌و فەڕەنسا). تاوەکو ٤ی دیسەمبەری ١٩٤٦ی زاینی (٢٤٣٦٥) کەس بەتاوانی جەنگ درانە دادگا. (١٤٣٢) کەسیان حوکمی سێدارەو (١٢٤١٣) کەسیشیان حوکمی سجن دران.. لەیابان‌و خۆرهەڵاتی دوور: (١٤٠٨) کەس تاوانباری جەنـگ بوون و (٤٥٧) کەسـیان لەسـێدارە دران و (٧٣٥) کەسیشـیان بەندکران... لەم چەند ساڵەشـدا (میلۆسۆڤیچ) سەرۆکی یۆگۆسلافیای پێشوو، ئەو پیاوەی کەلەماوەی حوکمڕانیەکەیدا، بەهۆی هەڵگیرسانی (٤) شـەڕەوە (٣٠٠،٠٠٠) سێ سـەدهەزار کەسی کوشت‌و سەدان هەزاری بریندار کردو دوو ملیۆن‌و نیو کەسـی ئاوارە کرد، ئەو پیاوە (صرب)ە توند ڕەوەی لەسەرەتای نەوەتەکاندا تەحەدای کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی دەکرد. بەڵام ڕۆژی ڕەشی هات و لەسجنی دادگای (لاهای)ی نێودەوڵەتی دوای چوار ساڵ زیندان، بەسەر شۆڕی مرد.

**هەمووشـــمان چارەنوسی ڕەشـــی (صەدامو عەلی کیمیاویو سەرانی بەعســی عەفلەقی سۆسیالیســتمان) بینی کەچەنــد بەزەلیلی خرانە قەفەسی دادگاوەو سەرەنجام بەسزای دونیایی خۆیان گەیشتنو حەق وایە ببن بەوانەو پەند بۆ هەموو سەرکردەکان. ئەو سەرکردانەی کەغافڵو ســەرکەشو خوانەناس و دڵڕەقن. چونکە ســـەرەنجامی ئەوانیش هەر ئاوا دەبێ، ئەوە (حوســـنیناموبارەکیش)و دارو دەستەکەشی سەرمیان هات و قەزافیش ئاوا کۆتایی هات و ئەوانی هاوشێوەی ئەوانبن هەمان چارەنوســـی ئەوانیان دەبێت، هەروەکـــو (زین العابدین بن عەلی) لێی بەسەرهات! بەڵام ئایا سەرکردەو لێپرسراوەکان پەندیان لێوەردەگرن؟!.**

**خوای گەورە بەڕەحمی خۆی لەخەوی غەفڵەت بمانپارێزێ و لەسەر شاڕێگە ڕاستەکەی ئیسلام بەردەوامو دامەزراو بین.**

أللّهُمَّ آمين.


سەرچاوەکان:

١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.

٢. گۆڤاری (بڕیار)، ژمارە: ٢٠ کانونی دووەمی (٢٠١٠)، ل٤٣ ، ل٤٨ ، ل٢٥.

٣. شنەی سۆز- جَلال الدِّين نَجْمَ الدِّين - شعر ، ل٤٢.

٤. ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە: ٧٧٢، ل٥ ٢٠١٠/١/٧.

٥. ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە: ٥٨٠، ل٤.

# ووتاری سێیەم

## بۆ مانگی صەفەر

## بۆ ڕزگاربون لەغەفڵەت

## بەردەوام

## إنْشاءَ الله بڵێ

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِينَ:

**ئیمانداران: ئەمڕۆ بەهۆی مەشغوڵ بونی زۆرەوە، بەهۆی هۆکارەکانی کارئاسان کردن، وەزۆری بەرنامەکان کەوادەکات مرۆڤ ناچاربێت لەڕۆژێکدا، چەند کارێك ئەنجام بدات، چەند کەس ببینێ. چەند مەوعید بۆ ڕۆژانی داهاتوی دابنێ، لەکاتێکا لەسەردەمانی پێشوودا، لەماوەی یەك مانگدا بەئەندازەی یەك ڕۆژی ئەمڕۆ مەوعیدی دانەدەنا. جالەئەنجامی ئەم زۆر بڕیاردان وهەڵسوڕانەدا. زۆرجار مرۆڤ توشی بێ ئاگایی دەبێ وبڕیارەکان بەقەطعی دەدات ویەکسەر دەڵێ: دڵنیابە دێم، حەتمەن ئەوکارە دەکەم. دڵنیابە دەتبینم: بەڵام بێ ئاگا لەوەی کەنابێ بەبێ** (إِنْشـاءالله) **بڕیار بدەین. دەی بالەم ووتارەدا بچینە خزمەت قورئان وبزانین چۆن باسی** (إِنْشـاءالله)**مان بۆدەکات..**

**(نضری کوڕی حاریث) پیاوێکی زۆرزانی قورەیشیەکان بوو، ئەم کابرا پیسە زۆر ئەزیەتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەدا، بەهەموو جۆرێك دژایەتی دەکرد، لەڕۆژگارێکدا چوو بۆ وولاتی (حیرە)و فێری چیرۆکی (ڕۆستەمو ئەسفندیار) بوو. گەلێ سەرگوزشتەو چیرۆکی لەبەرکردبوون. جا کەپێغەمبەر (ﷺ) لەکۆڕو مەجلیسەکانی دا بانگی خەڵکی دەکرد بۆ ئیسلامەتی وبەسەرهاتی گەلە پێشینەکانی دەگێڕایەوە، (نەضر) یش دەهاتو دەستی دەکرد بەحیکایەت گێڕانەوەو بەسەرهاتی سەرنج ڕاکێشی دەربارەی پاشاکانی فارس دەگوت. ئەمجا دەیگوت: ئەی هۆزی قورەیش، من زۆر لە (محمد) باشتر دەزانم سەرگوزشتە بگێڕمەوە!!، هەروەکو لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆشدا بەشێوازێکی مۆدێرن، دەیان کەناڵی ئاسمانی دادەنرێ، بۆئەوەی خەڵکی لەخواو لەپەیامی خوا غافڵ بن وگوێ لەقورئان وفەرمودەی سەروەرمان نەگرن و بەفیلم و گۆرانی وڕەقس و سەماو شتی سیحراوی سەرنج ڕاکێش خەڵکی توشی غەفڵەت وبێئاگایی**

لەخواو لەپێغەمبەرو لەئیســلام بکــەن. ئەوەبوو جارێك لەجاران، ئەم (نەضــری کوڕی حاریســە)، لەگەڵ عوتبەی کــوڕی ئەبوموعیط چوو بــۆ مەدینە (یەثریــب)ی ئەوکاتە. دەربــارەی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ مالمەکانی جولەکەی مەدینە قسەی کرد. ووتیان: کەچوونەوە دەربارەی سێ شت پرسیار لە (محمد) بکەن:

١. یارانی ئەشکەوت (أَصحابُ الكَهْف) کێن‌و چۆنە بەسەرهاتەکەیان.

٢. دەرباره ئەو پیاوەی کەخۆرهەڵات و خۆرئاوای پشکنی‌و خستیە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. ئەو کەســە کێ یەو چی کردوەو باس‌و بەسەرهاتی چۆنە..

٣. دەربارەی گیان (ڕوح)لێ ی بپرسن چی یەو چۆنە؟ جا ئەگەر وەڵامی دانەوە، ئەوە دڵنیابن کە پێغەمبەرە، ئەینا جادوو بازو درۆزنە.. بەڵێ کاتێ هاتنەوە بۆ مەککە. ئەم دوانە لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی قورەیش دا چونە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئەم سێ پرسیارەیان لێ کردو کردیان بەمەرجی ئیمان هێنانیان، پێغەمیەری خوا (ﷺ) لەخۆشی ئەوەی کەقورەیش ڕێگای گفتوگۆو حیوارو پرسیارو وەڵامیان قبوڵە. وەواز لەشەڕخوازی‌و داپڵۆسین‌و ئینکاری کردنی حەقیقەت و ڕاستی دێنن، کەئیسلام هەمیشە دینی ئاشتی‌و سەلامەتی و گفتوگۆو وەڵامدانەوەی پرسیارەکانە .. لەخۆشی ئەم گۆڕانکاریەی کەبەسەر بیروبۆچونی قورەیش دا هاتووە. یەکسەر فەرمووی: بەیانی وەڵامی پرسیارەکانتان دەدەمەوە. هیچ ئەگەری دانەنا. نەیفەرمووی ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ (إِنْشاءالله) ..

قورەیشەکان ڕۆشتن‌و چاوەڕێی بەیانی بوون. پێغەمبەری خواش (ﷺ) چاوەڕێ ی وەحیە لەلایەن خواوەو وەرگرتنی وەڵامی پرسیارەکانە. بەڵام (پانزە) ڕۆژ تێپەڕی و وەحی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نەهات !!

قورەیشیەکان کەوتنە مقۆمقۆ. ووتیان: خۆ محمد وادەی بەیانی پێداین بۆ وەڵامی پرسیارەکان. کەچی خۆئەوە پانزە ڕۆژ تێپەڕی و هیچ وەڵامی نەبوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بەمە دڵتەنگ بوو!! موسوڵمانانی بەڕێز: بیهێننە بەرچاوتان، ئەبێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند مەراقی خواردبێ!، چەند خەم و پەژارەی بوبێ!، ئەو پێغەمبەرەی (ﷺ) هەرگیز وەعدە خیلاف دەرنەچووە، ئێستا وا لەم مەسەلە چارەنووس سازەدا، وەڵامی نیە!. ئایا دەبێ خوا لێی تورە بێ؟! ئەی بۆچی جوبریل نایەت بۆلای؟! خۆئەگەر وەڵامەکانی لەکاتی خۆی دا. پێی بوتنایە ئەو کافرانە بەڵێنی ئەومیان دابوو کەئیمان بهێنن!! بەم هەموو چاوەڕێ کردنو خەفەت خواردنەوە، پانزە ڕۆژی بەڕێ کرد!، ئەمجا جوبریلی ئەمین هاتو لەلایەن خواوە سورەتی (الكَهْف)ی بەنیگا بۆ هێنا. کەوەڵامی پرسیارەکانی دایەوەو باسی (أَصْحابُ الكَهْف)و ذیلقەرنەینی کردو لەبارەی ڕوحیشەوە فەرموی: (قُلِ الرُّوُحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي)..

جا بەڕێزان: سەرنجی قورئان بدەن. جارێ وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە، ئەمجا دێتە سەرباسی ئەوەی کەهۆی چی یە ئەو ماوەی (١٥) شەوە، قورئان نەهاتۆتە خوارەوەو توشی ئەو دڵناڕەحەتیە بووە. (ئەمەش خۆشەویستی خوا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەردەخات) کەڕاستەوخۆ پێی نافەرموێ: ئەی محمدی خۆشەویستم. دەبوایە وات نەوتایە. یەکسەر نەت وتایە: بەیانی وەڵامتان دەدەمەوە. بەڵکو بۆ دڵ ڕاگرتنی پێغەمبەر (ﷺ) باسی یارانی ئەشکەوتەکە (أَصْحابُ الكَهْف) دەکات، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىۡءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ۝ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ الكهف: ٢٣ - ٢٤. واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەرکارێك بتەوێ لەداهاتوودا ئەنجامی بدەی، بەڕاشکاوی مەڵێ سبەینێ من ئەوە دەکەم. مەگەر بڵێی (إِنْشاءالله)، جا بۆ هەموو کارێك کەدەتەوێ

لەداهاتوودا ئەنجامی بدەی ڕستەی: (ئەگەر خوا بیەوێ و مەیلی لەسەر بێ و ویسـتی وابێ)ی لەگەڵدا بڵێی. هیچ وەعدێك مەدە بەبێ ووتنی (إِنْشـاءالله) لەگەڵی. چونکە هیچ شـتێك لەبوونەوەردا بەبێ ویسـتی خـودا نایەتەدی. وەهەموو کارو کردەوەو ڕوداوێکی لەمەودوا شـتێکی پەنامەکیو غەیبی یە لەئێمە، کەوا بێ پێویستە لەخۆوەو بەبێ عیلمو زانین دەم لەو شتانە نەکوتین.

ئیمانداران: بێگومان هەرشتێ خـوای گـەورە فەرمان بەکردنی یان بەووتنی بکات. ئەوپەڕی لەجێی خۆیدایەتیو هیچ پێویست بەلێکۆڵینەوە ناکات، بەڵام هەر بۆ دڵڕۆشنی زیاتری خۆمان و (عَيْنَ اليقين) ی خۆمان، بەکورتی چەند خاڵێك لەبەرەکەتی (إِنْشاءالله) باس دەکەین:

١. ووتنی (إِنْشاءَالله) بەجێ هێنانی فەرمانی خوایە، ئەدەبێکی جوان بوو کەخوای گەورە فێری پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی کرد، بەپێی بنەمای: (هەموو شتێکی گەورە دەبێ ڕەنج و ماندوو بوونی گەورەی لەپێناودا بدرێ)، بۆ دەستکەوتنی ئەم (إِنْشأالله) یە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) (پانزە) ڕۆژ چاوەڕوانـی وەحی بـوو. ئای چاوەڕوانـی چەند ناخۆشە!. پانزە ڕۆژو شەو خەم و مەراق خواردنو گاڵتە پێکردنی کافرە دڵ ڕەقەکانی چەشتوە!. کەواتە: (إِنْشاءالله) زۆر گەورەیەو دەبێ هەموو ئیماندارێك بەردەوام لەبیری بێت و لەسەر زوبانی بێتو بەدڵ لەماناکەی حاڵی ببێت..

٢. ووتنی (إِنْشـاءالله) پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ پەروەردگاریدا بەتین دەکات. مـرۆڤ والێدەکات هەسـت بەتەنهایی و بێ پشـتیوانی نەکات. مرۆڤ هەرکە وتی (إِنْشاءالله) هەست دەکات هێزێکی کاریگەری لەپشتە جا کەلەکارەکەیدا سەرکەوت لەخۆی بایی نابێ. چونکە دەزانێ بەمەیلو

وویستی خوا، ئەم سەرکەوتنەی بەدەست هێناوە..

بەتێشــکان و ژێــر کەوتنیــش هیــوا بــڕاو نابێ. چونکــە بڕیاری یەکلاکــەرەوەی نــەداوەو دەزانێ خــوا مەیلی لێ بــووە، کەئەم کارەی ســەرنەکەوێ و حەتمەن خێری تێدایە، هەرچەندە ئێستا جارێ تێ ی ناگات. ئیتر ئەمە دڵتەنگی لەسەر لادەبات .. ئەی ئەگەر لەبیرت چوو (إِنْشــاءالله) بڵێ ی؟! خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾ الكهف: ٢٣ – ٢٤.

هەرکاتــێ بڕیارێکت داو نیازی کردنی کارێکت هەبوو. لەبیرت چوو (إِنْشــاءالله)بڵێ‌ی، دوایی بیرت کەوتەوە خێرا بیڵێ و فریای قســەکەی پێشوتی بخە، ئەو خێرو فەڕو بەرەکەتە لەدەست خۆت مەدە. هەرچەندە ماوەی زۆریشــی بەسەردا تێپەڕی بێ. کە بەبیرت هاتەوە (إِنْشاءالله)ت نەکردوە، یەکسەر بڵێ: (إِنْشاءالله)..

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: تاســاڵێکیش بێــت هەر قەیناکات. واتە: ئەگەر کەسێك بڕیارێکی داو پاش ساڵێك بیری کەوتەوە کە (إِنْشاءالله)ی بــۆ ئــەو کارو بڕیــارە نەگوتوە با ئێســتا کەدوای ئەو ســاڵە بەبیری کەوتۆتەوە بیڵێ.!

بەڕێزان: پێویستە ئەوەش ڕوون بکەینەوە کەوتنی: (إِنْشاءالله) ئەوە ناگەیەنێ کە ئادەمیزاد پاڵی لێ بداتەوە. بیر لەداهاتوو نەکاتەوە. پلان بــۆ دهاتوو دانەنێ. نەخێر، بائادەمیزاد بیر بکاتەوە. پلان دانێ، بەڵام با وا هەست بکات، کەبیر کردنەوەو پلان دانانی بۆ کارەکانی بەویستو ئیرادەی خوای گەورەیەو هەســت بکات کە قودرەت و دەسەڵاتی خوای گــەورە لەزوور دەســەڵاتی ئەوەوەیە. نیازی کردنــی هەرکارێکی کرد، بەدوری نەزانی کەخودا ویستێکی تری هەبێ. جائەگەر خوا یارمەتی داو نیازەکەی بۆ هێنایەدی ئەوە باشە، خۆ ئەگەر ویستی خوا بەپێچەوانەی

نیازی ئەوەوە بوو، ئاواتەکەی نەهاتەدی، باپێ ی دڵتەنگ نەبێ. چونکە هەموو شتێك بەدەست خوایە، وویستی ئەو چۆنە هەر ئەوە دێتەدیو هەرئەوەش خێری تێدایە بۆ بەندە...

ئیماندارانــی بەڕێــز: خــوای گــەورە چەندین نمونــەی واقیعی ۆ بەرچاومــان نیشــان دەدەات کەبەبــێ (إنْشــاءالله) هیــچ کارێ ناکرێ. لەصەحیحەیــن دا. واتە: صەحیحی بوخاری و موســلیم. فەرمودەیەك هاتووە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەفەرمویەتی: سولەیمانی کوڕی داود – ســەلامی خوایان لەسەر بێ، فەرموی: ئەمشەو دەچمە لای (حەفتا) لەخێزانەکانم، لەڕیوایەتێکدا (١٠٠) لەخێزانەکانم، هەریەکەیان کوڕێکی ببــێ و گــەورە ببێ و پێ بگاو لەپێناو ئاینی خــوادا جیهاد بکات. پێ ی گوترا بڵێ:(إنْشــاءالله)، نەیگوت. ئەو شــەوە چووە لای خێزانەکانیو ئافرەتێکیــان نەبێ، هیچیان ســکی نەبوو. ئەو ژنەشــی منالێکی نیوە چلــی بوو. ئەمجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (فَو الَّــذي نَفْسي بِيَدِهِ لَوْ قالَ: إنْشــاألله، لَمْ يَحْنَث، وكانَ دَركاً لِحاجَتِهِ) لەڕیوایەتێکی تردا (ولَقاتَلُوا في سَــبيلِ اللهِ أَجْمَعُونَ). واتە: دەی ســوێند بەوزاتەی کەنەفسی منی بەدەستە کە (الله) یە، ئەگەر حەزرەتی سولەیمان بیفەرموایە: (إنْشاءالله) ئاواتەکەی دەهاتــە جێ و ئەو کوڕانەی لەدایك دەبــوونو لەپێناوی دینی خوادا، لەگــەڵ دوژمنانی ڕێبازی خــوادا دەجەنگان بەیەکــەوە.. بەڵێ خوای گەورە لەپێغەمبەرانیشی قبوڵ ناکات کە (إنْشاءالله) نەڵێن.

بەڕێــزان: نمونەیەکــی واقیعــی. کەلە کوردســـتانی خۆماندا ڕووی داوە ئەوەیەکــە: کوڕێــك ژن مــارە دەبڕێت و جلــی بوکێنی و ئاڵتون دەکــڕدرێ و ماڵــی زاوا کۆمەڵێ خەڵك و هەندێ ئۆتۆمبێل دەنێرن بۆ هێنانی بوك لەگوندێکی ترەوە. ئەو زەمانە عادەت وابوە، زاوا لەماڵەوە چــاوەڕێ ی بوکی کــردوە. لەمیانی گفتوگــۆی زاوا لەگەڵ هاوڕێیەکی

دا، زاوا دەڵــێ: بەیانــی بوك لێرە حازر دەبێو دەبینین چ شــایی یەك و حەفلەو ئاهەنگێك ســاز دەكرێت. كەدەبێ نەوە بۆ نەوە بیگێڕنەوە، كەســێك لەوێ دەبێ، دەڵێ: كاكی زاوا بڵێ: (إنْشــاءالله) بەویستی خواو بەپشــتیوانیو تەوفیقی خوا شــایی یەكی خۆش دەبێــت .. زاوا دەڵێ: (إنْشاءالله) ی ناوێ. هەموو شت حازر كراوەو هەردەبێ بوك بێ و شایی بكرێ!! بەڵێ ئەوانەی لەوێ دەبن لەم قســەیە نیگەران دەبن و زاواش لەسەر كەللە شەقی خۆی سور دەبێ!.. بەڵێ بۆ بەیانی بوك دەگاتە جێ و زاوا لــەوەدا دەبێ كەخۆی گۆڕیوەو دەیەوێ بڕواتە دەرێ و دەســتی بوك بگرێ، ئالەو كاتەدا برایەكی زاوا كەمناڵكارێك دەبێ دەست دەداتە تفەنگێكی كلاشــنكۆف و دەیەوێ تەقەی خۆشــی بەســەر خەڵكەكەدا بكات، بەڵام بێئاگایانە ڕووو دەكاتە سنگی براكەی (كاكی زاوا) پەنجەی لێ دەكێشــێ و زاوا وەكو بێژنگ بەفیشــەك دادەبێژێ!!! دەست بەجێ زاوا گیان لەدەســت دەدات!، شــایی دەبێت بەشــین و بوك دەگەڕێتەوە بــۆ ماڵی باوكی و خەڵكەكە هەرئەوەندە دەڵێن: ئائەمە بوو بەرهەمی (إنْشاءالله)ی ناوێ..!

بەڵــێ بەڕێزان: ووتنی (إنْشــاءالله) ئەدەبو شــەرم كردنە لەخوای گــەورە، كەبەندایەتی خۆت دووبارە دەكەیتەوەو دەڵێ ی: خوای گەورە من چیم تابڕیار بدەم فلان كارە بكەم ئەگەر وویستی تۆی لەسەر نەبێ. كەواتە ئەوەی (إنْشاءالله)بەعەمدی و ئەنقەست ناڵێ و بەلایەوە گرنگ نی‌یە. ئەوە بێ ئەدەبی كردووە بەرامبەر بەخوای گەورە. وەبەندەی بێ ئەدەبیش بەرامبەر بەخوای گەورە، پێویستە ئاگادار كردنەوەی بكرێ!

ئیمانــداری بەڕێز: هەرگیز لەخوا غافــڵ مەبەو بۆ هەموو كارێكت (إنْشــاءالله)بكە، چونكە هەموو دەقیقەیەك تۆی مرۆڤ موعەڕەزی بۆ لەناوچوون، ئەوەتا هەر لەم ماوەی پێشودا لە (٢٠١٠/١/١٢)دا، بومەلەرزە

(زەمیـــن لەزرەیـــەك) لە (هایتـــی) دا. كەپـــاش بومەلەرزەكە (بان كی مۆن) ئەمینداری گشتی نەتەوە یەكگرتوەكان، ڕایگەیاند، كە سێ یەكی دانیشـــتوانی، واتـــە (٣) ملیۆن كەس زیانی قورســـیان پێ گەیشـــتووە. (هیـــلاری كلنتۆن) وەزیـــری دەرەوەی ئەمریكاش پێشـــبینی كرد ئەم زەمین لەرزەیەی هایتی ســـەختتر بێت لەوەی (تسونامی) كەدووملیۆن و سێ سەد هەزار قوربانی لێ كەوتەوە!! (٩٠٪)ی پایتەختەكەی وێران كرد. كۆشكی سەرۆكایەتیش یەكێك بوو لەباڵەخانە داڕماوەكانی شاری (پۆرتـرپرێنـــس)ی پایتەخـــت!.. ئەم بومەلەرزەیـــە بەبڕی (٧،٣) پلەی (ڕێختـــەر) بوو، ڕوداوێكی ســـەرنج ڕاكێش كەلەو بومەلەرزەیەدا بینرا ئەوەبـــوو: دوای (١٠) ڕۆژی تەواو لەزەمین لەرزەكەی (هایتی)، لەڕۆژی (١١)هەمیـــن دا. تیمەكانـــی فریاكەوتـــن توانیان گەنجێـــك لەژێر بینا ڕوخاوەكانـــدا دەربهێننەوە كەڕووتـو قووت بوو. هیچی لەبەردا نەبوو. بەڵام هیچ ئازاری پێ نەگەیشـــتبوو. كەدەریان هێنایەوەو هەندێ ئاوی موغەزییـــان تێ كردو چارەســـەریان كـــرد، زۆر بەچاكی هاتەوە هۆش خۆیی و دەســـتی كرد بەخواردن و خواردنەوە.(ســـبحان الله)، (١٠)ڕۆژ بوو لەژێر ئەو چیمەنتۆ و بلۆكەدا بوو ، بەبێ خواردن و خواردنەوە. كەچـــی نەمردو وەزعی زۆر باش بوو. كاتێ لێیان پرســـی: بۆچی ئاوا ڕووتی و هیچت لەبەردا نی یە؟! ووتی لەو كاتەدا من لەحەمامدا خۆم دەشـــت، لەقاتی دووەمی بیناكە بووم، هەستم كرد بیناكە دەلەرزێ وام زانی شۆرتی كارەبا چۆتە سەر ئەرزی حەمامەكەو بەم بەرو ئەوبەرمدا دەدات، بـــەڵام هەرئەوەنـــدەم زانی قاتی ژێـــرەوەی بیناكە لێك ترازاو، ئیتـــر حەمامەكە لەت بوو! ئیتر نەمزانیوە چیم لێ بەســـەر هاتووە. هەتـــا ڕزگاریان كردم!! كەواتە: هەرگیز لەخوا غافڵ مەبە، ئەوەتا ئەو كەســـە لەحەمامدا فریا نەكەوت پارچە قوماشێك لەخۆیەوە بپێچێ و

زەوی لەژێریدا لەرزی و ئاوای لێ بەسەر هات! ئای پێشینانمان چەند جوانیان فەرمووە: (ئەوەی لەخوا غافڵە کافرە)

ئیمانداران: سەرنجی ئەم ڕووداوە گەورەو مێژوویی یە بدەن، ئەو بەسەرهاتەکە کەکەس نی یە نەیبیستبێ. ئەو بەسەرهاتەی چەندین کتێب و چیرۆکی لەسەر نوسراوە. وەچەندین فیلمی لەسەر بەرهەم هێنراوە، ئەویش بەسەرهاتی کەشتی بەناوبانگی (تیتانیك)ە. ئەوەبوو کاتێ ساڵی (١٩١٢) ئەم کەشتیە سەرسوڕهێنەرە، لەڕووی دارِشتن و پتەوی‌و کەرەستەی پێشکەوتوو بەهێزی تێ ی دا. ئەوانەی سەرپەرشتی کەشتیەکەیان دەکرد. ئەوەندە دڵنیا بوون لەبەهێزی و پتەوی کەشتیەکە. کەهیچ شەپۆلێکی بەهێزی دەریاو هیچ بارودۆخێکی سامناکی ناو دەریاو زەریاکان، ناتوانێ کاریگەری لەسەر ئەم کەشتی یە دابنێ (پەنا بەخوا) بەلەخۆبایی بونێکی لەڕادەبەدەرەوە لەسەر تەنیشتی کەشتیەکەیان نوسی: (تەنانەت خوا بۆ خۆشی ناتوانێ ئەم کەشتی‌یە غەرق‌و نقومی ناو ئاو بکات!) (نَعُوذ باللــهِ). ئەمەش دەقی ئەو کوفرو بێ ئەدەبیە گەورەیە کەبە (ئینگلیزی) لەتەنیشتی کەشتیەکەیان نووسی بوو:

.THE SHIP THAT EVEN GOD WON'T SINK

(نقوم بوون) (ناتوانێ) (خودا) (تەنانەت) (ئەمە) (کەشتی)

بەڵێ بەپیتی گەورە تەحەدای (رَبُّ العالمین) یان دەکرد! چونکە دەیانگوت: ئەم کەشتیە. وەکو کەشتیەکانی تر هەڕەمەکی دروست نەکراوە. ئەمە لەسەر نەخشەیەکی زۆر تۆکمەو پتەو دروست کراوەو، چی ئەندازیارو شارەزای بواری دەریا هەیە تەماشای کردوەو حیسابی هەموو جۆرە پێشهاتێکی ناو دەریاو زەریاکانی بۆ کراوە. ئەم کەشتیە بەزانست بەڕێوە دەچێت. لەبەرئەوەی ناوی دەنێین: کەشتی نوقم نەبوو لەئاودا! ئەوەبوو کەشتی (تیتانیك) دەستی کرد بەگەشتەکەی‌و

## تەنانەت خوداش ئەم کەشتییەی پێ نوقـ

بەدەیان گەورە بازرگانی لەســەر بوو. لەگەڵ ســەدان کەس، کەخۆیان بەبەختەوەرترین کەس دەزانی ، چونکە شــەرەفی یەکەم گەشتی ئەو کەشتی‌یە سەرسوڕهێنەریان پێ بڕابوو. بەڵام کاتێ شەویان بەسەرهات و کەشتی لەڕۆیشتنی خۆی بەردەوام بوو، چونکە دڵنیابوو لەو ئامێرە ئاگادارکەرەوانەی کە بەحیســاب لەهەموو شتێك کەڕووبەڕوی دەبێتەوە ئاگاداریان دەکاتەوە ، بەڵام وەختێ بەخۆیان زانی، کەشــتی‌یەکە خۆی کێشــا بەشــاخێکی ســەهۆڵین داو کەشــتی یەکە لەنگەری تێك چوو. بەشی پێشــەوەی هەڵوەشاو ئاو هاتە ناوەوەو ســەرنجام کەشتی یەکە بەهەموو سەرنشینەکانی یەوە نقوم بوو تیاچوون. سەرەنجامیان وەکو ســەرنجامی هەموو ئەوانە وابوو کە تەحەدای دەســەڵاتی بێ ســنوری خوای پەروەردگار دەکەن...

ئیمانــداران: ئێمــەی موســوڵمان دەبێ ئــاگاداری خۆمــان بین، کە لەنرخــی (إِنْشــاءالله) کــەم نەکەینــەوە. ئەویش بەوەی کــە: بڵێین: (إِنْشــاءالله). بەڵکو دەبێو پێویســتە بەرنامەی تەواو، ئیشی ڕێکوپێك. تەوای هەوڵدان، دڵنیابوونو عەزمو جەزم بوون لەدڵماندا هەبێ. ئەمجا بڵێین: (إِنْشاءالله)....

بەڕێزان: بەوردی ســەرنجی قورئان بــدەن: ئەو ئایەتەی کەفەرمان بــە پیغەمبەر (ﷺ) دەکات کەبەبێ ووتنی (إِنْشــاءالله) هیچ بڕیارێك و بەڵێنێــك بۆ داهاتوو نەدات. ئائەمە لەســوڕەتی (الکَهْف) دایە. دەی مەعلومە سوڕەتی (الکَهْف)، باسی سێ مەسەلەی زۆر گرنگی تێدایە..

١. گەشــت و گەڕان بەدوای فێربوونو زانســتدا، (ســەفرەی عیلمی) ڕاستەقینەی نێوان حەزرەتی موساو خدر. کەچەند گەڕانو شەونخونی‌و ناو دەریــاو غەریبی‌و برســیەتی‌و کارکردنی تێدایــە. کەپێمان دەڵێ: زانست هەروا بەئاسانی بەدەست نایەت، حەزرەتی موسا تەواوی هەوڵی

خۆی داوه، ئەمجا دەفەرموێ: (قال ستجدني إن شآءالله صابرا ولا أعصى لك أمرا) الكهف: ٦٩.

واته: دەمبینیت ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت خۆڕاگر دەبم و لەهیچ فەرمانێکت دەرناچم..

کەواتە: خوێندکار نابێ بڵێ: (إنْشاءالله) سەعی دەکەم، کەچی هەنگاو نەنێ بۆ هەڵگرتنی کتێب و خۆدورگرتن لەهاوڕێ ی خراپ و تەلەفیزیۆن و هەموو ئەو شتانەی کات بەفیڕۆ دەدەن. نەخێر، تەواوی هەوڵی خۆت وەکو حەزرەتی موسا بخەرەکار، ئەمجا بڵێ (إنْشاءالله) لەتاقیکردنەوەدا سەرکەوتوو دەبم..

٢. سوڕەتی (الكهف) باسی یارانی ئەشکەوتەکە دەکات. کەباس لەباسی شۆڕشو ڕاپەڕینە دژی ستەم و دیکتاتۆریەت، کەئەو کۆمەڵە گەنجە هەربەوەندەی بڵێن:(إنْشاءالله) خوا لەدەستی ئەو زاڵمە ڕزگارمان دەکات، دانەنیشتن. بەڵکو هەوڵیاندا فیداکاریان کرد. ڕێگای شاخ و ئەشکەوتیان گرتە بەرو لەسەر دۆشەکی نەرمەوە چونە سەربەردی ڕەق. ئەمجا لەخوا پاڕانەوەو ووتیان: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ الكهف: ١٠.

واته: پەروەردگارا لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەت و میهرەبانی تایبەتیمان پێ ببەخشەو لەسۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکەو ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا ..

٣. سوڕەتی (الكهف) کەوانەی (إنْشاءالله) مان فێردەکات. باسی (ذُو القَرْنَيْن) دەکات. باسی دروست کردنی سەددی بەهێزو قورقوشمی پۆلاین دەکات. کەلەو زەمەنەوە یەئجوج و مەئجوج خەریکی کون کردنی، کەچی تانزیکی قیامەت و دونیا وێران بوون. ئەو سەدەیان بۆ کون ناکرێ ، جا سەرنج بدەن کاتێ (ذو القرنين) ئەو سەددەی دروست کرد.

فەرمـــوی: ﴿ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴾
الكهف: ٩٨

واتــه: دروســتكردنی ئــهم بهربهســته ڕهحمهتێــك بــوو لهلایهن پهروهردگارمهوه. ئینجا كاتێك پهروهردگارم بڕیاری تێكدانی بدات، وردو خاشی دهكات. بێگومان بهڵێنی پهروهردگارم حهقیقهتو ڕاستهقینهیه .. بهڵـــێ، ئهمه زیكری كاربهدهســـته. نهك بڵێ بهســهرچاو، نهك بڵێ (إنْشاءالله)و هاوڵاتی بهڕێ بكاو زوڵم له (إنْشاءالله) بكات. بهڵكو پێویسته لهسهر كاربهدهســـتو فهرمانڕهوا، بهكردهوه خزمهت بهمیللهت بكاتو پاشان منهت بهسهر میللهتدا نهكات. بهڵكو وهكو (ذُو القَرْنَيْن) بڵێ: (هذا رَحْمَةٌ مِنْ رَبِّي) بهم شــێوهیه حكومهتو میللهت دهچنه یهك سهنگهرهوه، كهئهویش ئهوهیه: ههموو چاكهو خێرهكان لهســایهی فهزڵو كهڕهمی خواوهیه، وهدهبێ خوای گهوره ئهو دهســكهوتانه بپارێزێ لهفهوتان و لهناوچوون.

ئیمانداران: ههڵهیهكی تر ئهوهیه كهجاری واههیه بهكهسێك دهڵێی: نوێــژ بكه، ڕوبكهره خوا. یان بهئافرهتیك دهڵێی: حیجاب بكه. كهچی بهبــێ ئهوهی نیــازی نوێژكردن یــان حیجاب كردنی بهمێشــكدا بێ. ههربـــهدهم دهڵێ (إنْشــاءالله).. نهخێر دهبێ نیهتی ناو دڵت پاك بكهی. ئهمجا ههنگاو بنێی پاشان بڵێی: (إنْشاءالله) ئهو كاره دهكهم. ههروهكو حهزرهتی ئیســماعیل، لهبهردهم فهرمانی خــوادا مل كهچ بیو ئهمجا بڵێی: ﴿ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ الصافات:١٠٠.

كهواتــه: بابهردهوام یادی خوای گهوره بكهینو لهخوا غافڵ نهبین، وه (إنْشــاءالله) ویردی سهر زمانمان بێو دڵمان پێی ئاگاداربێو خوای گهوره بهڕهحمی خۆی پشــتو پهنــاو یارمهتی دهری ههموو لایهكمان بێ.

اللّهُمَ آمين.

سەرچاوەكان

١. تەفسیری ئاسان- بورهان محمد أمين.
٢. تەفسیری ڕەوان. مەلا محمودی گەڵاڵەیی. ب٨ ل١٩٧، ب٨ جزمی (١٥)، ل٢٢٣.
٣. ئەسرینەكانی سەدەی بیستەم. ئاوات أبوبكر أحمد.
٤. تَعليم الحَياة، مَعَ قِصَص سورة الكَهْف، يزن أَحمد عَبْدَه، ص١٩.
٥. الكَوارِث الطَبيعيَة، عفت وَصال حَمْزَة، ص١٤.

# ووتاری چوارەم
# بۆ مانگی صەفەر
# سوپاس کردنی خوا

الحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ العالَمِين

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّــدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِنَ:

**سوپاســت دەكەین خوایە، ئیمانمان هەیە بــەوەی كە بێ هاوبەش‌و شــەریكی، بەدیهێنــەری هەموو بونــەوەرو دیارو نادیــاری.. هەرچی عیبادەتــە هەربــۆ تۆیــە خوایە. نوێــژ، ڕۆژوو نیەت، دنیــا، هەنگاو، هەڵوێســت ، بۆیە موسوڵمان هەموو كارێكی هەموو گوفتارێكی بەناوی خواوە دەســت پێ دەكات.** (كُلُّ أَمْرٍ ذي بالٍ لَمْ يَبْدَأْ بِبِسْــمِ اللهِ الرَّحْمن الرَّحيم فَهو أَقْطَعْ). **ئیمانمان پێتە** (يا الله) **كەهیــچ شتێ بەبێ ویستی تۆ ناكرێ، جا دەڵێین:** (إنشــاءالله).. **ئێمەی ئەهلی ئیمان بڕوامان بەوەیە هەرچی هەمانە هی خودایەو دەڵێین:** الحَمْدُلِلّهِ. **ســوپاس‌و ستایش هەر تایبەت بەتۆیە خوای پەروەردگار. ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: هەموو هەناســە هەڵمژینێ، دووجار سوپاسی خوای دەوێ، جارێك كەبەئاسانی هەناسەكە هەڵدەمژی و جارێكیش كەبەئاسانی هەناسە دەدەیتەوە. ئێمەی مرۆڤ لەهەر هەناســە هەڵمژینێكدا (٥٠٠) مللتر ئۆكســجین دەمژین( ٥/١ و ١٠٠)ی مللتــر دەمێنێتەوە. باقیەكەی یەكســانە بــە (Co2) و لەگەڵ هەناســە دانــەوەدا دەیدەینەوە .. ئایا بیرت لــێ كردۆتەوە لەڕۆژێكدا چەند هەناسە وەردەگریت؟!**

**لەیەك دەقیقەدا مرۆڤ (٢٠) جار هەناســە دەدات. لەیەك ســەعاتدا (٢٠×٦٠=١٢٠٠) جــار. لەیەك شــەوو ڕۆژدا (٢٤×١٢٠٠=٢٨٨٠٠) جار! ئایا دەكاتــە چەند لیتــر لەئۆكســجین؟! (٢٨٨٠٠×١٠٠مللتر) یەكســانە بە (١٢,٨٨٠,٠٠٠) لتر ئۆكسجین!!**

**ئەگەر وادابنێی یەك لیتر ئۆكســجین تەنهــا بەیەك دیناری چاپە. (كەلەهیــچ شــوێنێكی ئەم ســەرزەویەدا بەو نرخە دەســتت ناكەوێ. ئەوە بەو حاڵەش بایی"دوانزە ملیۆن و هەشــت ســەدو هەشتا هەزار" دینــاری چاپی نوێی عێراقی بەكاردێنی!!) دەی ئەم هەموو هەوا پاكە**

هەڵدەمژی بەو ئاسانیەو بەو ئاسانیەش دەیدەیتەوە. بەبێ ئەوەی هەر هەستیشی پێ بکەی. یان یەك دینار خەرج بکەی. کەواتە ئەی حەیف نیە بەردەوام سوپاسی خوا نەکەی‌و لەناخی دڵەوە بڵێی بەڕاستی ئیمامی غەزالی جوانی پێکاوە کەفەرمویەتی هەموو هەناسە وەرگرتن‌و هەناسە دانەوەیەك دووجار سوپاسی خوای دەوێ. دەی هەزاران هەزار جار سوپاس بۆ تۆ خوایە.

ئیمانداری بەڕێز: شوکرانە بژێری خوای گەورەو سوپاس کردنی تەنها هەرئەوە نی یە کەبەزمان بڵێ ی (الحَمْدُلِلّـهِ)، بەڵکو زۆرجار بەکردەوە دەبێ نیشانی بدەی کەسوپاسی خوا دەکەی. وەکو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بکەین (ﷺ).

ئەوەتا کاتێ کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرموی: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ﴾ البقرة: ٢٤٥.

واتە: کێ یە ئەوکەسە کەقەرز دەدات بەخوای پەروەردگار بەقەرزێکی چاك (بەخشراوەکە لەماڵی حەلاڵ‌و بێ منەت و نازدار بێت). خوای بەو هۆیەوە بۆی چەند بەرامبەر دەکات و پاداشتی بێ سنوری پێ دەبەخشێت.... کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە صەحابەیەکی بەڕێز کەناوی (أبو دَحْداح) بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا عەرزی کرد: ئای لەڕەحمی خوا، خوای گەورە لەبەرخاتری بەندەکانی قەرز دەکات؟! (أُمْدُدْ يدَكَ يارَسُول اللهِ) ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی پیرۆزت درێژ بکەو بادەست بخەمە ناو دەستت. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: مەبەستت لەوە چی‌یە؟! أبو دَحْداح فەرموی: (لي بُسْتانٌ لايَمْتَلِكُ أَحَدٌ مِثْلَهُ، هو قَرْضٌ لِلّهِ تَعالى). من بێستان‌و باخێکی ئەوەندە جوان‌و دڵگیرو پڕ بەرهەمم هەیە. کەهیچ کەس باخ و بێستانی ئاوای نیە. ئەوا بەقەرز دام بەخوای گەورە! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (ولَكَ بِهِ سَبْعُ مِئَةِ

ضِعْـفٍ ياأَبا دَحْداح). ئەوا بۆ تۆ هەیە بەرامبەر ئەو باخە کەبەخشـیت بەخـوا. حەوت سـەد قاتی ئـەوە لای خوا ئەی ئەبا دەحـداح!! ئەبو دەحداح لەخۆشـیاندا هاواری کرد (اللهُ أکبر ، اللهُ أکبر)، بەخێرایی بەرەو ماڵەوە بەڕێ کەوت و ڕووی کردە ئەو باخ و بێستانە دڵگیرەی‌و سەیری کـرد ژن و مناڵەکەی لەوێدان، هەر لەدورەوە بانگی خێزانەکەی کردو ووتی: هاوسـەری بەڕێزو خۆشەویستم ئەم باخە خۆش‌و پڕ بەرهەمە. کەزۆر دڵمان پێوەی بوو، بەخشیم لەپێناوی خواداو بەقەرز دام بەخوا. وەپێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموی: خوای گەورە حەوت سـەد قاتی ئەوە پاداشتتان ئەداتەوە، ژنەکەی بەبێ دودڵی‌و بیرکردنەوە، فەرموی: بەخـوا چاکت کرد. دەی دەسـتت خۆش بێ. ئەوە ماڵی ڕاسـتەقینەی ئێمەیە. ئەوە لەفەوتـان لەناوچوون بەدوورە. خوا لێمان قبوڵ بکات.. بەڵـێ لەوکاتەدا مناڵە بچکۆلەکەیان دەنکێ خورمای خسـتە دەمیەوە کەهی دارخورماکانی ئەو باخە بوو. ئەبو دەحداح پەنجەی کرد بەدەمی منداڵەکەداو ووتی: (کخ ، کخ ، البُسْتانُ لِلّهِ). بیتفەوە، بیتفەوە، ئەم باخ و بێستانە هی خوایە. ماڵی ئێمە نەماوە، نابێ لێی بخۆین!.

بەڵـێ بەڕێزان: ئەمە سـوپاس کردنـی خوایە. بـەڵام بەکردەوەو بەکردار. هەرچی سـوپاس و ستایشە هەرلایەقە بەخوای پەروەردگار، خوای گەورە فەرمویەتی: (قُلِ اللّهُمَّ مالِكَ المُلْكِ ، تُوتي المُلْكَ مَنْ تَشـاء وتنزع الملك عن تشاء وتُعِزُّ مَنْ تَشاء وتُذِلُّ مَنْ تَشاءُ، بِيَدِكَ الخَيْرُ إنَّكَ عَلي كُلِّ شَيء قَدير)..

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز. بەردەوام سوپاسـی خوای پەروەردگار بکەو بڵێ: (الحَمْدُلِلّهِ) سوپاسـی خوا بکە کەبەموسـوڵمان وەری گرتوی. ئەم مرۆڤە لاوازە، خوا دەرگای بۆ خسـتۆتە سەرپشـت و دەفەرموێ: وەرە قسـەم لەگەڵ بکـە. دەرگات لـێ داناخەم. وەڵامت دەدەمـەوە. ئەگەر گوناهباریـش بیت، گوناهی واهەیە خۆت شـەرمی لێ دەکەی ئەوەندە

**قێزەونە، کەچی خوا هەر دەرگات لەســەر داناخات، بانگت دەکات، زۆر بەســۆزو میهرەبانیــەوە بانگت دەکات و دەفەرموێ:** (قُـلْ ياعِبادِيَ الَّذينَ أَسْرَفوا عَلي أَنْفُسِهِمْ لاتَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ، إِنَّ اللهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَميعاً).

**خوای گەورە بانگت دەکاو دەفەرموێ: وەرە بۆ لام. ئەوەتا تۆ چەندە گوناهباریــش بــی، من هەر ڕزقت ئەدەم. لاپەڕە ڕەشــەکانی ژیانت بۆ سپی دەکەمەوە. پەردە پۆشــت دەکەم و ناهێڵم خەڵکی بەگوناهەکەت بزانن. لەقیامەتیشا فەزعت ناکەم!! جابا بیر بکەینەوە. کەسێ کەهەر مرۆڤێکی وەکو خۆتە، هیچی تۆی بەدەست نی یە، نەژیانت، نەمردنت، نــەڕزق و ڕۆزیت، کەچــی کاتێ هەڵەیەکی بەرامبــەر دەکەی و داوای لێبوردنــی لێ دەکــەی، دەڵێ: والێت خۆشــبوم و عەفوبە، بزانە چۆن سوپاســی دەکەی. چۆن لەهەموو کۆڕو مەجلیســێکدا بەشان و شکۆیدا هەڵ ئەدەی، باسی چاکەو لێبوردەیی دەکەی. ئەی ئەبێ چۆن سوپاسی ئەو پەروەردگارە نەکەی. کەخالیقتە، کەڕازیقتە، دروستی کردوی، ژیان و مردنــت، بوون و نەبوونت، عیزەت و زەلیلیت، ماڵو ســامانت، هەر هەموو شــتێکت بەدەســتی ئەوە. کەچی ڕۆژانە بــێ فەرمانی دەکەی، لاپەڕەی ڕەشــی تاوان پڕدەکەیتەوە. کەچی کاتێ کەداوای لێخۆشبوونی لێ دەکەی لێت ئەبورێ، بەرەو ڕوت دێ، ئەو زیاتر بەلاتەوە دێ. خۆی ئەفەرموێ:** (مَنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ باعاً، تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِراعاً) **هەرکەسێ باڵێ لێم نزیك ببێتــەوە. من گەزێ، دوو ئەوەنــدە لێی نزیك دەبمەوە.** (وَمَنْ أَتاني يَمْشي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً). **هەرکەسێ بەڕۆشتنی ئاسایی بەرەو ڕوم بێ. من بە گورگە لۆقەو نیمچە ڕاکردن بەرەو ڕووی دەڕۆم!!..**

**دەی هەزاران هەزار ســوپاس بۆ تۆ خوای پەروەردگار.** (الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين)..

**ئیمانداران: ئای خوای پەروەردگار چەندە بەندەی پاك و دڵســۆزی**

خۆی خـۆش دەوێت. بۆ نمونــە: ئافرەتێکی وەکـو خاتوو خەدیجەی دایکی ئیمانداران. گەورەترین خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە بەرێــزە لای خوا. دەگاتە پلەیــەك کەڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەخاتوو خەدیجە دەفەرموێ: ئیستا جوبریل - عليه السَّلام - لەلام بووو، پێی ووتم: (يامُحَمَّد، إِقْرَئِي خَدِيجَةَ مِنَ اللهِ السَّلام. وقُلْ لَها: إِنَّ اللهَ يُبَشِّرُكِ بِقَصْرٍ مِنْ قَصَبٍ "لُؤلُؤٍ" فِي الجَنَّةِ). ئەی محمد (ﷺ)، ســەلامی خوای پەروەردگار بەخەدیجە بگەیەنەو پێی بڵێ: بەڕاستی خوای گەورە موژدەی دەداتێ بەوەی کەکۆشکێکی لە (لوئلوء) لەبەهەشتا بۆ ئامادەکردوە!!.

دەی خوشــکی بەڕێز. وەرە ڕێبازی خاتوو خەدیجە بگرە، بائاوا لای خوای پەروەردگار بەڕێزبی. یان کاتێ کەسوڕەتی (البَيِّنَة) هاتە خوارەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی (ئوبەی کوڕی کەعبی) کرد — کەپێشتر یەهودی بوو. موسوڵمان ببوو، فەرموی: (ياأُبَي إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ اَقْرَأُ عَلَيْكَ سُورَةَ البَيِّنَة). ئەی ئوبەی بەڕاستی خوای گەورە فەرمانی پێکردوم، کەسوڕەتی (البَيِّنَة) بەسەردا بخوێنم! ئوبەی لەخۆشی ئەم موژدە گەورەیە فەرموی: (أَسَمّانِي رَبِّي يارَسُولَ اللهِ؟!!)، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یانی خوای گەورە بۆخۆی ناوی منی هێنــا، فەرموی ئوبەی؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (نَعَــمْ، فَبَكَي أُبَي بن كَعْب) .. فەرموی: بەڵێ. خوای گەورە (سُــبْحانَهُ وَتَعالى) بۆخۆی ناوی تۆی هێنا!. ئوبەی لەخۆشیاندا دەستی کرد بەگریان!..

دەی ئیمانــداری بەڕێــز، تۆش ئــاوا نێوانی خۆت و پــەروەردگارت ئاوەدان بکە، ئاوا خوای گەورە ناوت دێنێ! ئەی لەفەرمودەدا نەهاتووە کە: کاتێ خوای گەورە بەندەیەکی خۆش ویست. بانگی جوبریل دەکات و دەفەرموێ: ئەی جوبریل من فلان کەسم خۆش دەوێ، تۆش خۆشت بوێ، ئیتر جوبریلیش خۆشــی دەوێو پاشــان هەموو فریشتەکان ئەو بەندە صاڵحە، چاکەکارە دەناسن و خۆشیان دەوێو دواتر خۆشەویستی

دەچێتــە ناو دڵــی هەموو خەڵکی ســەرزەوی یەوەو هەمــوو خەڵکی خۆشیان دەوێت! دەی توخوا ئائەمە. ئەم ڕێزو قەدرە کەخوا لەبەندەی خۆی دەنێت پێویســتی بەســوپاس کردن نی یە؟! بەڵێ دەبێ لەناخی دڵەوە بڵێی: (الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين).

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: بەردەوام بڵێ (الحَمْدُلِلّهِ)، ئەو کاتەی کەلەنوێژ دەبیتەوە، چونکە تۆ لەنوێژدا سوژدەت بۆ خالیقی خۆت بردەوەو بەو ســوژدەیەت یەقینت بــۆ پەیدا بووە. کەهیچ شــتێ لەتۆ گەورەتر نی یــە، ئەو خوایە نەبێ کەســوژدەی بۆ دەبــەی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (أُمِرْتُ أَنْ أسـجد عَلى سَـبْعَةِ أَعْظُـمٍ، عَلى الجَبْهَةِ أَنْفِـهِ، والكَفَّيْنِ، والرُّكْبَتَيْنِ، وأَطْرافِ القَدَمَيْنِ).

واتە: فەرمانم پێدراوە کەلەســەر حەوت ئێســقان ســوژدە ببەم بۆ پەروەردگارم، لەسەر لوت، هەردوو لەپی دەست، هەردوو ئەژنۆ، هەردوو سەرەپەنجەکانی قاچ...

بەڕاســتی ئێمەی موسوڵمان لەگەڵ دیمەنی سوژدە ڕاهاتووین، ئەینا ج دیمەنێکی عەجیبە، تەماشاکە بەرزترین شوێنی لاشەت لەگەڵ نوکی سەری پەنجەی قاچت یەکسان دەبێ! کەبەم سوژدە بردنە بەو شێوەیە، بەکردەوە دەڵێی: خوایە وامن لەتەوقی ســەرم تاوەکو سەری پەنجەی قاچم مل کەچی تۆم .. جالەو کاتەدا کەسەرت لەسوژدەدایە، لەهەموو کاتێ زیاتــر لەخوا نزیك دەبی. پێغەمبەری خــوا (ﷺ) فەرمویەتی: (أَقْرَبُ مايَكوُنُ العَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وهُو ساجِدٌ). نزیکترین ساتێك کەبەندە لەخوای پەروەردگاری خۆیەوە لەهەموو سات و کاتێ نزیکترە. ئەوکاتەیە کەئەو بەندەیە لەســوژدەدایە.. دەی کەواتە بڵێ: خوایە گیان سوپاست دەکەم. کەئــاوا دەرفەتم دەدەی ســوژدەت بۆ ببەم و لێــت نزیك ببمەوە، خۆ تەشــبیە نەبێ (ولِلّــهِ المَثَلُ الأعْلى) بۆ کاروبــاری دونیایی چاوپێکەوتنی

بەرپرسێك. كۆڵێ مەمنونیو سوپاسی دەوێ، ئەی تۆ كەلە (رَبُّ العالَمين) نزیــك ببیەوە، بەهۆی ســوژدە بردنەوە. ئەبێ چەند حەمدو ســەنای پــەروەردگارت بكەی، دەی لەدوای ســەلامی نوێژەكــەت، لەزیكرەكاندا (٣٣) جار دەڵێی (الحَمْدُلِلّهِ). چونكە بەڕاستی ئەوەی كەنوێژەكەت كردو سوژدەو ڕكوعت بۆ خوای خۆت برد. ئەوە سوپاسی خوای دەوێ.

بەڕێزان: توخوا حەیف نی یە دڵت نەكەیتە شوێنی خۆشەویستی خوا؟!

چونكە دڵ كەپڕنەبوو لەخۆشەویستی خوا، ئەبێ بەهێلانەی شەیطان.. لەفەرمــودەدا هاتووە هەردڵی خاڵی بێ لەقورئان، (كَالْبَيْتِ الخَرِب). وەكو كەلاوە وایە. شــەیاطینو جنۆكەش بەردەوام هەر حەزیان لەكەلاوەیە، حەزیان بەشــوێنی ئاوەدان و پوخت نیە. (ئیبن قەیم) دەفەرموێ: دڵ ناڕەحەتیو خەمو دوودڵیو خەمۆكی و داواكاری زۆری هەیە. هیچ شتێ دادی نادات، تەنها خواناســی نەبێ. خوا گەورە لەفەرمودەی قودسی دا فەرمویەتی: (يــا ابْنَ ادَم، تَفَرَّغْ لِعِبادَتِي، أَمْلاء صَدْرَكَ غِنَى، وأَسُــدْ فَقْرَكَ). ئەی نەوەی ئادەم، خۆت یەكلایی بكەوە بۆ عیبادەتو بەندایەتی من. منیش ســینەت پڕدەكەم لەدەوڵەمەندی. دڵت دەوڵەمەند دەكەم، وەهەژاریت لەســەر لادەبەم، ئەوكات هەست دەكەی سینەت گوشادەو دڵت فراوانە. جارێكیــان كابرایەك هاتە لای بیشــری كوڕی حاریــسو ووتی: دوعام بــۆ بكە، ئەم پیاوچاكە فەرموی: كاكەگیان خۆت لەوكاتەدا دوعا بكەو لەخوا بپاڕێرەوە كەماڵو منداڵت ووتیان: ئاردو نانمان نەماوەو پارەشت پێ نی‌یە!! ئالەو كاتە ســەختەدا، كەماڵو منداڵت برسیانەو داوای نانت لــێ دەكــەنو تۆش هیچت نــی یەو دڵت پڕ بووەو فرمێســك لەچاوت قەتیس بووە. ئالەو كاتەدا دوعا بكەو لەخوا بپاڕێوە، (إِنْشاءالله) دوعات قبوڵ دەبێ. چونكە تۆ لەوكاتەدا تەنها پشت بەخوا دەبەستیو غەیری خوا تەمات بەكەسی تر نیە كەبێ بەهاناو هاوارتەوە.

کەواتە: ئێمـــە کە زۆرجار دوعامان گیرا نابێ، هی ئەوەیە کەدڵمان غەیری خوای تێدایە .. دڵمان پەیوەستە بەغەیری خوای پەروەردگارەوە.. ئەینا دوعای ئیماندار گیرایە.

ئیمانداران: گەورەترین شت کەدەبێ (الحَمْدُلِلّٰهِ) بۆ بکەین، ئەم ئیمان و ئیســلامەتیەیە. ئـــەم قورئان و مزگەوت و شـــەرعە پاکە جوانەیە. کەکامـــەی زۆر نەیاریەتی. کاتێ جوان تێی گەیشـــت مل کەچی دەبێ.. ئەوەتــا لەم هەفتەیەدا (دانێڵ ســـتریـج)ی سیاســـەتمەداری سویســـری خاوەنی یاســـای قەدەغەکردنی منارەی مزگەوتەکان لە(سویســـرا)، بەم دوایی یە موســـوڵمان بوو. وەدەســـتی لەکارکردن لەحیزبەکەی (پارتی گەلی سویســـرا) کێشـــاوەتەوەو موســـوڵمان بوونی خـــۆی ڕاگەیاندوە. ئەوەبـــوو کاتێ (دانێل) یاســـای قەدەغەکردنی منـــارەی مزگەوتەکانی دارِشـــت، ڕووبـــەڕووی ڕەخنـــەی توندی موســـوڵمانانی جیهـــان بۆوە، تەنانەت سەرئێشـــەی زۆریشی توشـــی حکومەتی سویسرا کرد. ئەمەش وایلێکرد بۆ زیاتر ڕەخنەگرتن لەئیســـلامو پشـــتگیری پێشـــنیارەکەی، لێکۆڵینەوەو دیراســـە دەربارەی ئیسلام بکات. لەئەنجامی دیراسەیەکی قوڵ بۆی دەرکەوت، ئیسلام ئاینی تەساموح و لێبوردەییە. وەلەدواییدا ووتی: ئیســـلام وەڵامـــی هەموو ئەو پرســـیارانەی دامـــەوە کەدەمێکە لەقەفەســـەی سنگمدا پەنگی خواردبۆوەو لای هیـچ ئاینو بەرنامەیەکی تر وەڵامەکەیم دەســـت نەدەکەوت. بەڵام ئیسلام کەبۆ دژایەتی کردنی بەمەبەســـتی ڕەخنەی زۆر توند لێگرتنی کەوتمە دیراسەو لێکۆڵینەوە لەســـەری، ســـەرەنجام تینویەتی دڵی شـــکاندم. بەڵێ، ویســـتی منارەی مزگەوت قەدەغە بکات، بەڵام دڵی بەباڵای منارەکاندا وەك هێلانەیەکی عاشقانە هەڵواسرا..

کەواتە: ئەو وانەی کەلەم ووتارەدا فێری بووین ئەوەیەکە: (الحَمْدُلِلّٰهِ)

**بکەین بەویردی سەر زوبانمان، پڕ بەدڵ بڵێین** (الحَمْدُلِلّهِ) **کەتۆ بەتاکو تەنها دەناسمو هاوبەشت بۆ بڕیار نادەم** (یا الله).. **ئەو هەموو خەڵکە بت ئەپەرستێ، خواردن دەخاتە بەردەمی، کاتێ دەڕوات بۆ سەرکارو ئێوارە کەگەڕایەوە لەخواردنی بەردەمی ئەو بتە دەخوات بۆ پیرۆزی!!! ئەمە لەوڵاتێکی وەکو (مالیزیا) لەو وڵاتە پێشکەوتوە، ئەلکترۆنیە!!**

**دەبێ لەناخی دڵەوە بڵێین:** الحَمْدُلِلّهِ، **لەسەر ئەوەی حەزرەتی محمد (ﷺ) پێشەوامە** (الحَمْدُلِلّهِ) **لەسەرئەوەی دەزانم بۆچی هاتومەتە سەر دونیاو دەزانم کەمردم چی دەبێ و چیم لێ دێ. سوپاس بۆ خوا خاوەنی قورئانێکین لەپێش لەدایك بونمانەوە باسی دەکات، تاچونە ناوبەهەشتت، خوای گەورە بمانکات بەئەهلی بەهەشت. کەئەویش بەپابەند بوونە بە** (صِراطَ المُسْتَقيم)**ەوە. ئەمڕۆ خەڵکی دوور لەدین گەورەترین موشکیلەی ئەوەیە نازانێ ژیان یانی چی، نازانێ بۆچی هاتۆتە سەر ئەم شانۆی ژیانەو پاشان کەمرد چی لێ بەسەر دێو سەرەنجام و چارەنوسی بەرەو کوێ دەڕوات!! خوای گەورە بەڕەحمی خۆی لەسەر شەقامە ڕێگەی ئیسلام دامەزراومان بکات.**

رَبَّنا لاتُزِغ قُلوُبَنا بَعْدَ إِذ هَدَيْتَنا، وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الوَّهاب).. اللّهُمَّ آمين...

# ووتاری یەکەم
# بۆ مانگی ربیع الأول
# سوپاس‌و ستایشی
# خوای گەورە
# (بەشی دووەم)

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، وَالصَّلاة والسَّـلامُ عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئيمانـداران: لەووتاری ڕابردودا باسـی** (الحَمْدُلِلّه) **مان کردو هەندێ لەوجێگایانـەی کەپێویسـتە لەسـەر موسـڵمان بـەردەوام** (الحَمْدُلِلّهِ) **لەسـەردەم بێ شی کردەوە، بەپشـتیوانی خوای گەورە لەم ووتارەشدا هەرباسـی گەورەیی وگرنگـی** (الحَمْدُلِلّه) **دەکەین لەژیانی موسـڵماندا، بەڕێزان: هەرووشـەی** (الحَمْدُلِلّه) **بۆخۆی سوپاسی خوای دەوێ!. ڕەنگە یەکێ بڵێ باشە چۆن** (الحَمْدُلِلّه) **بۆخۆی** (الحَمْدُلِلّه) **دەوێ؟!**

**لەوەڵامدا دەڵێین: لەبەرئەوەی خوای گەورە بەم دوو ووشـە جوانو ئاسـانو لەسـەر زمان شـیرینە، کەهەموو کەس دەتوانێ بیڵێو هیچ قورسـیو گرانیەکی تێدانی‌یە، خوای گەورە فێری کردوین کەبەم دوو وشـەیە، حەمدو سەناو سوپاسـی بکەین. خۆئەگەر خوای پەروەردگار بۆی دیاری نەکردینایە کەبەچ شـێوەیەکو بەچ ووشـەیەك سوپاسـی بکەین وبۆی کـورت هەڵنەهێنایناپە لەودوو ووشـەدا** (الحَمْدُلِلّه) **ئەوە بەڕاسـتی لەسـەر مرۆڤ زۆر قورسو گران دەبوو، کەدەستەواژەیەکی گونجاو پەیدابکات. کەشایانی ئەوەبێ سوپاسی خوای پەروەردگاری پێ بـکات.. وەئەم** (الحَمْدُلِلّه) **یە، خوای گەورە بەیەکسـانی، بەبێ جیاوازی فێری هەموو بەندەکانی کردووە. خۆئەگەر سوپاس کردنی خوای گەورە، ئاوا لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بەو دوو ووشـە جوانە پڕبەرەکەتە، دیـاری نەکرایـە، ئـەوا خەڵکی جیاواز دەبون لەسـوپاسو ستایشـی پەروەردگاریانـدا، بەپـێی ئاسـتی توانایان لەسـەر دەربڕین، چونکە ئەوکات کەسـێکی ئەدیبو شـاعیرو زمان ڕەوان، زۆرجوانتر دەیتوانی سوپاسی خۆی بۆخوای** (رَبُّ العالَمين) **دەربڕێ لەکەسێکی نەخوێندەواری وا کەئەو شارەزاییو لێهاتویەی لەزمانو ئەدەب ودەربڕیندا نی یە. بەڵام بەم** (الحَمْدُلِلّه) **مامۆستایەکی زانکۆ، لەگەڵ کەسێکدا کەپیتەکان ناناسێ،**

وەكویەك بەیەكسانی حەمدو سوپاسی خوای گەورە دەكەن.. یاخود: تۆ ئەگەر بتەوێ سوپاسی كەسێك بكەی كەچاكەیەكی بەرامبەر كردوی، دێ ی ماوەیەك بیردەكەیتەوەو كاغەزو قەڵەم دێنیە مەیدانو ووشەی جوان دەهۆنیتەوەو ئەم ووشە لادەبەی وئەوەت پێ جوانترە ئەیخەیتە شوێنی. ئەم دیوانە شعرو ئەو پەخشانە شعرە تەماشادەكەی بۆئەوەی چەند ووشەو ڕستەیەكی كورت وپوخت بەدەست بێنی وسوپاس وپێزانینی خۆتی پێ دەرببڕی بۆئەو كەسە چاكەكارە، كەیارمەتی داوی وچاكەی لەگەڵ كردوی!. پاشانیش لەدەرونی خۆتا هەست بەقەلەقی دەكەی ودەڵێ ی تۆ بلێ ی بەدڵی بوبێ وتوانیبێتم سەرنجی ڕابكێشم!... دەی ئەمە ئەگەر بۆمرۆڤێك ئاوامان كردوە، ئەی باشە بۆخوای (رَبُّ العالمین)، دەبوایە چۆن بمانتوانیایە سوپاس گوزاری وحەمدو سەنای خۆمان بەرامبەر زاتی خوا (سُبْحانَهُو تَعالی) دەرببڕیایە!..

بەڵام خوای گەورە بەلوتفی خۆی. بەڕەحمانیەتو ڕەحیمی خۆی. (الحَمْدُلِلّه) فێركردوینو بەو دوو وشە جوانە، حەمدو سوپاسی خوا دەكەین كەشایانی پەروەردگارمان بێ. دەی كەواتە: هەرئەم (الحَمْدُلِلّه)یە بۆخۆی (الحَمْدُلِلّه) دەوێ!...

بەڕێزان: خوای گەورە (سُبْحانَهُو تَعالی)، پێش ئەوەی دروستمان بكات، هەموو ئەوشتانەی كەواجبە لەسەرمان سوپاسی خوای لەسەربكەین، بۆی بەدیهێناوین. ئاسمانەكانو زەوی بۆبەدی هێناوین. ئاوو هەوای بۆ دروست كردوین، ڕزقو ڕۆزیو هەموو پێداویستیەكانی ژیانی مرۆڤی، هەرلە ئادەمەوە تاسدوا مرۆڤی ئەم سەرزەوی یە لەسەر زەویو ناو زەویدا دروست كردوە!، ئەوەتا بەو هەموو ملیارەها مرۆڤە هاتۆتە سەرزەویو دێتە سەرزەویو هەر هەمووی كانی وئاوو مەعدەن ونەوتی لێ دەردێنێ و هەرلێ ی نابڕێ. بەڵكو هەرزیاد دەكات، نەوە لەدوای

نــەوە لەم ســەرزەوی یە کشــتوکاڵ دەکات، کەچی ئــەم زەوی یە، بێ کەڵــك نابێو هەردەڵێ ی یەکەم جاریەتی شــتی تیاچێندراوەو یەکەم بەرهەمیەتی پێشکەشــی دەکات.. بەڵکو ئێســتا کەئێمە وەکو ئوممەتی حەزرەتی محمد (ﷺ) دوا ئومەتین لەســەر زەوی، جار بۆجارو نەوە بۆنــەوە ژیانی لەڕوی ماددیو دەســتکەوتەکانی ســەرزەوی وناوناخی زەوی یــەوە زیاتــر دەکات. ئایا ئەمە حەمدو سوپاســی خوای ناوێ؟! بەڵــێ خوای گەورە ئەمانەی هەموو پێشــکەش بەئــادەمو حەوا کرد، پاشــان بۆنەوەکانیــان هەتا قیامــەت، پێش ئەوەی کەئادەم دروســت بکات.. پاشــان کەمرۆڤ چووە ڕەحمی دایکی یەوە، دەبینی باشــترینو ئارامتریــن جێــگای بۆدیاری کراوە (فِي قَرَارٍ مَكِينٍ) لەناو شــلەیەکدا ئەم کۆرپەلەیە مەلەدەکات بۆئەوەی هیچ کاریگەری دەنگیو پێداکێشانێکی دەرەوە، کاریگەری لەســەر ئەم کۆرپە ناسکە دروست نەکات، ئایا ئەمە (الحَمْدُلِلّــە) ناوێت؟! بەڵێ دەبێ لەناخــی دڵمانەوە بڵێین: (الحَمْدُلِلّه رَبِّ العالمیــنَ)... وەکاتێکیش مرۆڤ هاتە ســەرزەوی خوای پەروەردگار لەناو ســنگی دایکی دا، دوو ســەرچاوەی شــیری بۆدابین کردوە، کەبەڕاستی گەورەییو دەســەڵاتی خوای تێدا دەدرەوشــێتەوە. هەرکات مناڵ برسی بوو، دێتەدەرەوە، کەمناڵەکە تێری خواردو دەمی لێ کردەوە، یەکســەر دەوەســتێتەوەو شــیرەکە نایەتەدەرەوە! هەروەها ئەم شــیرە بەپێی وەرزەکانو ساردیو گەرمی دەگۆڕێو لەهاویندا فێنكو سارد لەزستاندا گــەرم، بۆئەوەی گەرمی لاشــەی مناڵەکە ڕابگرێــت!، تەنانەت زانایان بۆیان دەرکەوت، ئەوشــیرەی کەلەبەیانیانــدا لەمەمکی دایك دا هەیە، جیاوازە لەوشیرەی کەلەشەوانو کاتی خەوتندا لەهەمان مەمکدا هەیە!! چونکە ئەوشــیرەی کەلەبەیانیاندا دێتە مەمکی ئافرەتی شــیردەرەوە، ماددەی چالاکی بەخشــی، بەئاگاهێنەرەوەی تێدایە. بۆئەوەی مناڵەکە

چوستو چالاکی زۆربێ، بەڵام لەشەودا. کەوەختی خەوتنی منداڵەکەیە شـیری دایکەکە مـاددەی خەولێخەری تێدا دروسـت دەبێت، بۆئەوەی ئـەو کۆرپەیە بەئاسـودەیی بخەوێت!... ئایا ئەمـە (الحَمْدُلِلّه)ی ناوێ. ئێسـتا کەبۆت باس دەکرێ یادی ئەوکاتەی خۆت بکەیەوەو سوپاسـی پەروەردگارت بکەیو بڵێی (الحَمْدُلِلّه)...

کاتێکیش کەئەو منداڵە لەشیر بڕایەوە، خوای گەورە سۆزو بەزەییەکی وادەخاتـە دڵی دایك وباوکیەوە کەپـاروی دەمی خۆیان دەخەنە دەمی منداڵەکـەوەو ئەمجا وائەزانـن خۆیان خواردویانە. بـاوك ئەو هەموو سـەرماو گەرمایە قبـوڵ دەکات لەپێناو تێرکردنی منداڵە سـاواکەیدا، خۆی جل وبەرگی کۆن دەپۆشـێ. تاوەکو منداڵەکانی پۆشـتەبن، خۆی قسـەی ناخۆشـی ناو خەڵك قبوڵ دەکات. لەپێناوی ئەوەدا منداڵەکانی قسـەی ناخۆشیان پێ نەوترێ، خۆئەوە دەورو ڕۆڵی دایك باس ناکرێ، کەچی دەچێژێ لەپێناو ئارامی وحەوانەوەو خۆشـبەختی منداڵەکەیدا. ئەمە هەموی پێش ئەوەی مرۆڤ بتوانێ بەزمانی بڵێ (الحَمْدُلِلّه) کەخوا ئەمانـەی هەموو پێشـکەش دەکات، دەی توخوا بێ وەفاییو سـپڵەیی نیە کەمرۆڤ خۆی ناسی وپێگەیشت ئەمجا سوپاسی ئەو پەروەردگارە بەڕەحمو بەسۆزەی نەکات؟!

پاشـان کەمرۆڤ گەیشـتە ئاسـتی بلوغو تەکلیف، شەرعورێسایەکی بۆدانـاوە، کەهەموو ووردو درشـتێکی ژیانی تێدایـە بۆی، هەرلەوەوە کەپێ ی دەڵێ چۆن خوای خۆی دەناسێ وچۆن سوپاسی دەکات، بەچی خۆشـبەخت دەبـێ وبەچی بەدبەخت دەبێ. شـەرعێکە ئەرك ومافت بۆدیـاری دەکات. بەبەرچاو ڕونی یەوە هەنگاو هەڵدەگری. شـەرعێکە لەچونە سـەرئاوەوە بۆت بـاس دەکات، تاوەکو سیاسـەتی دەولی. ئایا غەیری ئیسـلام پەیـڕەوو پرۆگرامێکی ئاوای هەیە، کەباسـی گەورەو

گچکـەی ژیانـت بۆبکات؟! چۆن نـان دەخۆی، چۆن ئـاو دەخۆیتەوە، چۆن قسـەدەکەی، چی دەڵێ ی وچـی قەدەغەیە بیڵێ ی. چۆن ژیانی هاوسـەری پێـك دێنی، چۆن دەژی، چۆن دەمـری. چۆن دوای مردنت کفن ودفن دەکرێ ی (بەخوا کافرەکان بەتایبەتی لەوڵاتی موسـڵمانان دا، ئیسـلام نەبوایـە، نەیاندەزانی مردوەکەیـان چی لێ بکەن وچۆنی بشارنەوە!)، پاشان کەمرۆڤەکە مرد، باسی ئەوەدەکات چۆن میراتەکەی دابەش دەکرێ، چۆن میرات بەرفلان دەکەوێو بەرفلان ناکەوێ!..

مامۆسـتایەکی پسـپۆڕ لەبواری یاسـادا: کەلەزانکۆیەکی ئەمریکی کاردەکات، دەڵێ: لەدانوسـانێکدا لەبارەی یاسـاوە، مامۆستایەکی یاسای جولەکەمان لەگەڵدا بوو، کەوتە تانەو تەشەردان لەئیسلام وموسڵمانان. منیش بۆئەوەی دەمکوتی بکەم، لێم پرسی: ئایا دەزانی قەبارەی یاساکانی میرات لەدەستوری ئەمریکی دا چەندە؟! ووتی بەڵێ: زیاترە لە (هەشت) موجەلـەد. منیش پێم ووت: ئەگەر یاسـایەکی میراتت بۆبهێنم کەلە (دە) دێڕ زیاترنەبێت، ئەوسـا بڕوادەکەی کەئیسـلام ئاینێکی ڕاستەو حەقـە؟! ووتـی: هەرگیز شـتی وانابێت.. منیـش ئایەتەکانی میراتم لەقورئان بۆدەرهێناو دامەدەستی، پاش چەند ڕۆژێ هات بۆلام و ووتی: هەرگیز عەقڵی مرۆڤ ناتوانێ حیسـاب بۆمیراتی هەموو خزمان بکات بەوگشت گیریەو کەسی لەبیرنەچێ وئینجا بەشی هەریەکە لەوکەس‌و کارە بدات لەمیرات، بەو عەدالەتەو بەبێ ئەوەی سـتەم لەکەس بکات، پاشان موسڵمان بوو.

ئایـا ئەو قورئانە پیرۆزە، ئەو شـاخەڵاتە ئاسـمانیە، ئەو دەرمانە چارەسـازە بۆهەموو نەخۆشی وناخۆشـی ئەم سەرزەوی یە. ئایا ئەمە سوپاسی خوای ناوێ؟! ئەو قورئانەی کەهەرچی زانستی ئەم سەرزەویە هەیە تیایەتی، ئەو قورئانە لەوقەبارە دیاری کراومیدا، وەڵامی هەموو

پرسیارێکی تێدایە، هەرگیز کۆن نابێ، جگە لەقورئان هەر کتێبێکی تر بخوێنیتەوە، بەسێ چوارجار لێ ی وەرس دەبی، کەچی ئەو قورئانە هەتا دەیخوێنیتەوە، جار بۆجار وائەزانی یەکەمجارتەو هەرگیز لێ ی تێرنابیو ساڵ بۆ ساڵ کەزانستت بچێتە پێشەوە، ئەمجا زیاتر گەورەیی قورئانت بۆ دەردەکەوێ. قورئان تاکە کتێبێکە کەهەتا زانستو تەکنەلۆژیا پێش بکەوێ، ئەویش زیاتر ئیعجازو نهێنی یەکانی بۆ زانایان ئاشکرا دەبێ! بەپێچەوانەوە، هەموو کتێبێك کەلەنوسینی مرۆڤە بەتێپەڕبونی زەمان، کۆن دەبێ وتەنها وەکو کەلەپورێك تەماشا دەکرێ، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەقورئان دورە لەدەستی مرۆڤ وکەلامی (رَبُّ العالمينَ)، هەربۆیە ئەو قورئانە، ئەو شاخەلاّتە. بەڕاستی پێویستی بەسوپاس لەسەر کردنەو یەکەم ووشەی قورئانیش بە (الحَمْدُلِلّه) دەست پێ دەکات.. بەڵێ قورئان فێرمان دەکات کە (الحَمْدُلِلّه) بکەین لەسەرقورئان.

(الحَمْدُلِلّه الَّذي أَنْزَلَ عَلى عَبْدِهِ الكِتابَ ولَمْ يَجْعَلْ لَهُ عِوجَاً)

بەڕێزان: لای ئێمەی میللەتی کوردی موسڵمان، ئەوەی ناشکوری بەنانو خواردن بکات، بەچاوی سوك سەیری دەکەین، بەلاّم خەڵکانێك هەن، ڕۆژانە، شەوانە لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، ناشکوری بەم شەرعو قورئانە دەکەن، ئەوانە بەدنمەکن!..

ئیمانداران: (الحَمْدُلِلّه)، جیاوازی نێوان ئیماندارو بێ ئیمان دەردەخات. سەرنج بدەن: کاتێ مرۆڤ پەرداخێك ئاو دەخواتەوە، خواردن دەخوات، دەڕواتە ماڵەوە، لەگەڵ خێزان ومناڵیدا دادەنیشێ، قسەی خۆش دەکات، بەیەکەوە دژەین، نانێك هەیە بینۆشێ، بەرگێك هەیە بیپۆشێ، ماڵێك هەیە دایپۆشێ. ئەمەش خێرو بێرو خەلاّتی خوایە. مایەی خێرو خۆشی یە. هیچ کەس لەسەرزەویدا نی یە نکۆڵی لەمە بکات وئەمانە بەمایەی خۆشی وئاسودەیی ژیانی نەزانێ، بەلاّم: جیاوازیەکە ئەوەیە:

خەڵکانێك هەن لەســەر زەویدا، کەئەم خۆشــی وبەهرانە دەدەنە پاڵ مانگایەكو لەجیاتی (الله) ئەومانگایە ئەپەرستنو بەندایەتیو سوپاس گوزاری خۆیانی بۆدەردەبڕن!! خەڵکانێکیش ئەم خەڵاتو بەخششــانە دەدەنە پاڵ خۆر، مانگ، ئەستێرەکانو وائەزانن ئەوان پێیان بەخشیون، بۆیە سوپاس گوزاری خۆیان بۆئەو شتانە دەردەبڕنو سوژدەیان بۆدەبەن ودەبن بەرۆژو مانگ وئەســتێرە پەرست.. کەسانێکیش هەن بونی ئەم بەخششانە بەهی حکومەتێك، حیزبێك، سەرکردەیەك دەزانن‌و سوپاس گــوزاری‌و گوێڕایەڵی خۆیــان بۆئەوانە دەردەبڕن!.. بــەڵام ئیمانداری ڕاستەقینە هەموی پاڵ دەداتە لای خواو دەڵێ: (الحَمْدُلِلّه رَبِّ العالمين!)..

هەربۆیــە، خــوای پــەروەردگار بەندەکانی دابەش کردوە بەســەر دووبەشدا (شَكور، كَفُور) هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾ الإنْسان: ٣.

جاهەرکەســێ لەم ژیانی دونیایەدا، بەردەوام (الحَمْدُلِلّه) لەســەردەم بێ، ئەوا (إِنْشــاءالله) جێگای بەهەشتەو کەچوە ناوبەهەشتەوە، یەکەم ووشــەی ئەهلی بەهەشت (الحَمْدُلِلّه)یە هەروەکو لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴾. الزُّمَر: ٧٣ — ٧٤.

واتــە: لەولاشــەوە ئەوانــەی کەپارێــزگارو بەنــدەی مــل کەچــی پەروەردگاریان بوون، ئەوانەی حیســابیان بۆئەو ڕۆژە دەکرد، دەســتە دەستەو پۆل پۆل، بەوپەڕی ڕێزەوە بەڕێ دەکرێن بەرەو بەهەشت. هەتا کاتێ کەدەگەنــە ئەوێ دەروازەکانی لەڕویاندا کراوەیەو لەسەرپشــتە، فریشــتەکانی بەرپــرس وسەرپەرســتیارانی بەهەشــت زۆربەگەرمی

وڕووخۆشی یەوە پێشوازیان لێ دەکەن ودەڵێن: درودو سڵاوتان لێبێت، ئێـــوە پــاك وخاوێنـــن. کەواتە فەرمـــوون بچنە بەهەشـــتەوە، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشـــەیی ونەبڕاوەدا.. ئەوســـا ئیتر ئەو بەختەوەرانە دەڵێـــن: ســـوپاسو ســـتایش بۆئەو خوایـــەی، کەبەڵێنی خـــۆی بۆمان بردەســـەرو کردینی بەخاوەنی سەرزەمینی بەهەشت ولەهەرشوێنێكو لەهەرجێگایەکدا بمانەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینەسەر، ئای چەندە پاداشتی تێکۆشەرانوخەباتکارانوچاكوپاك وبەنرخە..

بەڵێ خۆشەویســـتان: (إِنْشاءالله) ئێمە لەودستە بەهەشتیانە دەبین، کەچۆن ئێســـتا لەم ماڵـــی خوایەدا بەیەکـــەوە کۆبوینەتـــەوە، ئاواش لەبەهەشـــتدا بەیەکەوە کۆدەبینەوەو دەڵێین: ئای بێ دینان، مولحیدو خوانەناســـان چەندیان پێ دەگوتین کەقیامەت نی یەو بەهەشـــت نی یـــەو دۆزەخ نی یەو کەمردی دەبیەوە خۆڵو تەواو. بەڵام ئێمە ئەهلی ئیمـــان دەمانگوت: نەخێر، ئـــەوە وەعدو بەڵێنی خوایەو وەعدی خواو پێغەمبەرەکەی ڕاست وڕەوایەو سوپاس بۆتۆ خوایە، وابەچاوی خۆمان بینیمان.

بەڵێ ئیمانداران: دوای ئەوەی بەهەشتیەکان چونە ناو بەهەشتەوەو حەســـانەوەو جێگیربوون. ئەمجا دیســـان هەر (الحَمْدُلِله) دەکەن، وەکو دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنۡ حَوۡلِ ٱلۡعَرۡشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡۖ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧٥ ﴾. الزُمَر: ٧٥.

واتە: ئەوسا ئیتـر فریشتەکان دەبینیت دەوری تەختی، شاهی شاهانیان، داوەو ســـەرگەرمی تەســـبیحات وســـوپاس وستایشـــی پەروەردگاریانن وحەق ودادوەری لەنێـــوان هەمواندا جێبەجێکرا، ئینجا بەیەك دەنگ لەهەموولایەکەوە دەوترێت: (الحَمْدُلِله رَبِّ العالمين).

بەڵێ هەرکەســـێ لەدنیادا، لەنوێژەکانیدا کەبـــەردەوام (الحَمْدُلِله رَبِّ

العالمين)ى لەسەر دەم بوە، (إنْشاءالله)، ئاوا لەبەهەشتا دەڵێ (الحَمْدُلِلّه رَبِّ العالمين). ئەمەش وەعدى خوايەو مژدەبێ لێتان. خواى گەورە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾. يونس: ٩ – ١٠.

**واتە: بەڕاستى ئەوانەى كەباوەڕيان هێناوەو كاروكردەوە چاكەكانيان ئەنجامــداوە، پەروەردگاريـــان بەهــۆى ئيمـــان وبـــاوەڕى ڕێك وپێك دامەزراويانـــەوە، هيدايەت وڕێنمووييـــان دەكات بۆئەنجامدانى هەموو كارو كردەوەيەكى چاك لەوجيهانيشـــدا، لەناو بەهەشتەوە جۆراوجۆرە پڕلەنازو نيعمەتەكاندا چەندەها ڕووبار بەبەردەمياندا دەڕوات.. دوعاو پاڕانەوەيان لەبەهەشتدا ئەمەيە: پەروەردگارا پاكى وبێگەردى وستايش شايســتەى تۆيە ئەى خواى ميهرەبان. چاك وچۆنيشـــيان لەوێ سەلام كردنە. دواهەمين گوفتاريشيان دواى هەموو خۆشى وبەهرەيەك، دواى هەموو بەخششێك ئەوەيەكە: پڕبە دڵ، لەناخى دەرونيانەوە بەڕاستى دەڵێن:** (الحَمْدُلِلهِ رَبِّ العالمينَ)..

**ئيماندارى بەڕێز: سوپاسى خواى گەورە لەسەرئەم شتانە بكە:**

**١. سوپاســـى خوابكە لەسەرئەوەى كەخواى گەورە بەمرۆڤ دروستى كردوى وئەم گەردونەى خســتۆتە خزمەتتەوەو هەموى لەبەرژەوەندى تۆيە.** (ولَقَدْ كَرَّمْنا بَني ادَم)، **دەى سوپاســى خواى پەروەردگاربكە. لەسەر ئەو هەموو ڕێزەى كەلێ ى گرتوى.**

**٢. سوپاسى خواى پەروەردگار بكە كەكردويتى بەئيماندارو هيدايەتى داوى بۆئيســلام. چونكە بەو ئيســلام وئيمانە بەهەشتى هەتا هەتايى بەدەست دێنى، كەهەموو سەروەتو سامانى دونيا، ناكاتە دڵۆپێك لەئاوى كەوســەر. (كەهەر بەراورديش ناكرێ) كەبەبەرەكەتى ئەو ئيسلامەيە،**

دەزانــی تــۆ کێ ی. خوات کێ یــە. پێغەمبەرت کێ یــە. یەك قیبلەت هەیە. قەبرت دیارە، قیامەتت دیارە، مەنهەجی ژیانت دیارە. بۆیە بڵێ: (الحَمْدُلِلّه عَلى الإِسْلامِ والإِيمانِ)..

٣. سوپاســی خوابکە لەســەر ئاوو خۆراك، دڵنیابــە دڵۆپێ ئاو یانی ژیانــی تۆ، دەگێڕنــەوە کابرایەکی ڕێبوار لەبیابانێکــدا تینویەتی زۆر بۆهێنا، زۆرگەڕا بەدوای ئاوێکدا، ئاوەدانیەکدا. کەسێك کەئاوی پێ بێ، بەڵام هیچی دەســت نەکەوت، بەڵام لەگەڕانەکەیدا کیسەیەکی گەورەی پڕلەئاڵتونی دۆزی یەوە، بەڵام کاتێ سەیری ئەو هەموو ئاڵتونەی کرد، ووتــی: خۆزگە لەجیاتــی ئەم هەموو ئاڵتونــە، پەرداخێك ئاو بوایەو ژیانم لەمردن وخنکان لەتینوان ڕزگاری ببوایە.. بەڵێ، هەتا تینویەتی تینت بۆنەهێنێ، قەدری ئاو نازانی، ئەمجا کەلەســەر تینویەتی ئاوت خواردەوە دەڵێ ی: الحَمْدُلِلّه..

الحَمْدُلِلّه، حەمدو سەنا بۆخوا لەسەرئەوەی کەئاوەکە شیرینەو تاڵو ســوێرنی یە. ئاهــا ئەو ماڵانەی کەبیری ئاویان هەیە، بەڵام ســوێرەو کەڵکــی لێ نابینێ، چۆن قەدری ئاوی شــیرین دەزانــێو زۆرجار ئەو خانــوە دڵگیرو خۆشــەی بەجێ دێڵێ ودەڕوات بۆشــوێنێکی تر، تەنها لەبەر ئاوی شیرین! پاشان (الحَمْدُلِلّه) لەسەرئەوەی کەبەئاسانی ئاوەکەت بۆقــووت چوو. دواتر سوپاســی خوابکەی لەســەرئەوەی کەبەئاســانی لەلاشــەت هاتــەدەرەوەو بۆری میزت نەگیراوە، جاربەجارێ ســەرێکی نەخۆشــخانەکان بــدەو بزانە حاڵی ئەوانە چۆنــە. کەمیزیان گیراوەو چــۆن هاوار دەکــەن تادڵۆپێ لەوئــاوەی خواردویانەتــەوەو بۆتە میز لەلاشەیان دێتە دەرەوە. ئالەوێدا یەکسەر (الحَمْدُلِلّه) دەکەی.

٤. (الحَمْدُلِلّــە) بکە لەکاتی پژمین دا.. چونکە ســوننەتی پێغەمبەری خۆشەویســتمانە (ﷺ) زانایان دەڵێن: ئەگــەر توند بپژمیت لەوانەیە

پەراسـوت بشـکێت!! خۆئەگەر بتەوێ، پژمینەکەت ڕابگری دورنی یە، دەمارێکی خوێن لەسەرتدا بتەقێت وبمریت. خۆئەگەر بپژمیت وچاوت کراوەبـێ. دەرونی یـە چاوەکانـت بتەقێت!! هەربۆیە خـوای گەورە بۆپاراستنی چاوەکانمان. وای کردوە، کەمرۆڤ هەرگیز ناتوانێ لەکاتی پژمینـدا چاوی کراوەبـێ. دەی پژمینێك کەئەو هەموو مەترسـیەی لەڕێگادایـەو تۆ ئاوا بەئاسـانی لێ ی ڕزگاربوی. ئایا سوپاسـی خوای ناوێ؟!

٥. (الحَمْدُلِلّهِ) بڵێ، ئەوکاتەی کەلەخەوهەسـتای، بڵێ: (الحَمْدُلِلّهِ الَّذي أَحْياني بَعْدَ ما أَماتَني وإِلَيْهِ النُّشُـور). واتە: سوپاس وستایش بۆئەو خوایەی کەزیندوی کردمەوەو ژیانی پێ بەخشیمەوە لەدوای مردن. گەڕانەوەش هەربۆلای ئەوە. لێرەدا پرسیارێك دەکرێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا مردن وخەوتـن پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە؟ لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، بەبێ گومـان، چونکە هەرچی خـواو پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویانە، هەموی لەسـەر بناغەو بنەمای زانسـتی یـە. ئەوەتا لەم سـاڵانەی دوایی دا. (ئارسـەر ئەلیسـۆن) زانای فیزیـای ناوکی لەکۆنگرەیەکـدا لەقاهیرە بابەتێکی دەربارەی مردن وخەو پێشـکەش کرد، تیایدا وتبووی: دوای نزیکەی (٢٥) سـاڵ لێکۆڵینەوەو ووردبونەوە بۆم دەرکەوتووە، کەخەو جۆرە مردنێکە، ئەوکاتە زانایەکی موسڵمان ئاماژەی بۆئەم ئایەتە کرد:

﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾. الزُّمَر: ٤٢.

واتە: هەرخوایە کەگیانەکان دەکێشـێت لەکاتی مردنیاندا. هەروەها ئەوگیانـەش کەنەمرد لەخەوەکەیدا، هەرخوا بۆی دەنێرێتەوە. جائەو کەسەی کەخوا بڕیاری مردنی دابێت، ڕوحەکەی دەگرێتەوەو ناگەڕێتەوە

بۆ لاشــەی، ئەو کەســەش کەڕۆژی تەواو نەبوبێت، دەینێرێتەوە بۆی، تاکاتێکــی دیاری کــراو، بەڕاســتی ئالەودیاردانــەدا چەندەها بەڵگەو نیشانەی زۆرهەیە بۆکەسانێك کەتێفکرنو بیربکەنەوە«..

کەزانا موســڵمانەکە ئەم ئایەتەی بۆخوێندەوەو بۆ شیکردەوە، ئیتر (ئارسەر) سەری سوڕماو سەرەنجام شایەتمانی هێنا، ئێستا موسڵمانێکی ئینگلیزی تێکۆشەرە.

بەڵــێ ئیمانداری بەڕێز، کەلەخەو هەڵســای دەبێ یەکەم ووشــەت (الحَمْدُلِلّه) بێ، کەبەلەشی ساغەوە لەخەو هەڵساوی، کەدەمت خوارنەبوە، کەجارێکی تر ژیانت پێ بەخشراوەتەوەو دەرفەتی چاکەکاریت هەیە.

٦. (الحَمْدُلِلّــهِ) بکــە، لەوکاتەدا کەلەســەر ئاو دێیتەدەرو پێویســتی چونە ســەرئاوت جێ بەجێ کردوە، ئالەوکاتەدا قاچی ڕاستت پێشخەو بڵێ: (الحَمْدُلِلّهِ الَّذي أَذْهَبَ عَنِّي الأَذَى وعافاني.) وەرە ســەیری ئەو کەســانە بکــە کەمیزیان گیراوە، بزانە تاچەند دڵۆپــێ میزدەکەن، چۆن هاوار دەکەن. چەند مەرگ بەئاوات دەخوازن، یان سەیری ئەوکەسانە بکە لە کەلەکەوە، پیســایی دەکەنە ناوکیسەوە. ئەمجا دەزانی کەچونە سەرئاو بەبێ ناڕەحەتی وگرفت وبەدەســتی خۆت خۆپاکردنەوە، چ خەڵاتێکی گەورەیەو چۆن (الحَمْدُلِلّهِ) دەوێ...

٧. (الحَمْدُلِلّهِ) وسوپاســی خواکردن لەســەر جەســتەو لاشەی خۆت: بێگومان هەمومان ئەوە دەزانین کەلەشــی ئێمــە لەخانە پێك هاتوە. خانــەش بەچــاو نابینرێ، مەگەر لەژێر ووردبینــدا (١٤٠) جار گەورە بکرێ. کێشــی یەك خانەش بریتی یە لە (یەك لەســەر هەزار ملیۆن غرام)!!، جائەم لاشــەیەی ئێمە لەهەرچرکەیەکدا (١٢٥) ملیۆن خانەی لــێ دەفەوتێ ولەناودەچێ. بەڵام ئەم لەناوچونی خانانە، لەئەندامێکی لاشــەوە بۆ ئەندامێکی تر جیاوازی هەیە.. بۆنمونە: خانەکانی پێست

(لەسێ سەعات زیاتر ناژین)!!، ئەوەتا کاتێ خۆت دەشۆی، شتێك لەلاشەت جیادەبێتەوە پێ ی دەڵێن: (چڵك) ئەوە خانەی مردووە!!.. هەروەها (خانەکانی ڕیخۆڵە)، کەپاشماوە بەکەڵکەکانی ناوڕیخۆڵە دەمژن، ئەم خانانەی ڕیخۆڵە لە (٤٨) کاتژمێر زیاتر ناژین. بەڵکو دەمرن وخانەی تازە لەشوێنیان دروست دەبێتەوە!!، لەڕیخۆڵەدا (٣٦٠٠) دەمیلە هەیە لەیەك سەنتیمەتر چوارگۆشەدا، بۆمژینی مادە سوودبەخشەکان وفڕێ دانی پاشەڕۆکەکان. کەواتە: دڵنیابە هەموو (٤٨) سەعات جارێ خوای گەورە ڕیخۆڵەکانی تۆ تازە دەکاتەوە، بۆئەوەی ناوسکت بۆگەن نەکات بەپیسی وکونیلەکانی ڕیخۆڵەت نەگیرێن ولەیەك زەڕە ماددەی سودبەخش بۆلاشەت بێ بەش نەبی!!.. سوپاس بۆخوای گەورە.

هەروەها خانەکانی تام وچێژ وەرگرتنی سەرزمان، هەموو حەفتەیەك جارێك دەمرن وخانەی زیندوو لەشوێنیان پەیدا دەبێت.. خۆئەگەر وانەبوایە بەماوەی چەند ساڵێکی کەم تاممان لەهیچ خواردنێك نەدەکرد، چونکە خانەکانی تامو چێژ وەرگرتن لەزماندا لەکاردەکەوتن!!، کەواتە: الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالمين..

هەروەها لەناودەمی مرۆڤدا (٥٠٠) هەزار خانەی تێدایە، لەهەموو پێنج خولەکێکدا (نیوملیۆن) خانە دەمرن لەناودەمتداو نیوملیۆنی زیندوو جێگای دەگرێتەوە. وە (خڕۆکە سورەکانی ناوخوێن) لەماوەی (١٢٥) ڕۆژ جارێکدا دەمرنو خڕۆکەی تازە دێنە شوێنیان، بۆئەوەی بەردەوام خوێنمان تەڕو تازەو پاك بێ..

هەروەها لەجگەردا، (٣٠٠) ملیار خانە هەیە، لەماوەی چوار مانگدا هەموویان دەمرن وهی تازە شوێنیان دەگرنەوە، ئاشکرایە مرۆڤ لە (٣) کاتژمێر زیاتر بەبێ جگەر ناژی، جاخوای گەورە هەرچوار مانگ جارێك جگەرت بۆ تازە دەکاتەوە، بەبێ ئەوەی هەرهەستیشی پێ

بکەی!! دەی هەزاران هەزار ســوپاس بۆخــوا. بەکورتی زاناکان دەڵێن: ئەگەر مرۆڤ ماوەی (٥) ساڵ بژی، دەبێ یەقینی ببێ کەتەواوی لاشەی ئێســتای هی پێنج ساڵی پێشــوی نیەو گۆڕاوە!!.. خۆئەگەر وانەبوایە، ئەوا مرۆڤ لەماوەی چەند ســاڵێکدا، کەنەدەگەیشــتە (٢٠) ساڵ تەواو پیردەبوو. دەم وچاوی چرچ هەڵدەگەڕا. بەلآم بەمردن وزیندوبونەوەی خانــەکان، هەتــا نزیکی (٤٠) ســاڵی زیاتریش مرۆڤ هــەردەمو چاوو پێست ولاشەیەکی جوانو بەهێزو تازەی هەیە. بەڕاستی ئەمەیە مانای ئایەتــی: ﴿ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾. ال عمران: ٢٧.

واتــە: ئــەی خوای گەورە تۆ ئــەو پەروەردگارە بەدەســەلآتەی کە: زینــدوو لەمردوو دەردێنێت، مردوو لەزیندوو دەردێنیت، ڕزق وڕۆزی بێ حساب وبێ شومار دەبەخشیت بەهەرکەس بتەوێت.

بەڵــێ ئەمڕۆ زانیت گەیشــتە ئەو ڕاســتی یــەی کەئەوەتا خانەی مردوو، خانەی زینــدوی لێ دەردێت. خانەی مردوو لەخانەی زیندوو دێتەدەرەوە!..

بــەلآم ئیمانداران: ئەوەی جێگای ســەرنجە، لــەم مردنی خانانەی ناولەشدا، مرۆڤ لەلەدایك بونیەوە، هەتا مردنی، دووبەشی لاشە هەیە، هەرگیز یەك خانەشی نامرێ، ئەوانیش:

یەکــەم: خانەکانــی دەمــاغ، چونکە ئەگــەر خانەکانــی دەماغیش بمردنایــە، ئەوا مرۆڤ هیچی لەبیرنەدەماو ســەرەنجام زانایەکت لەم سەرزەوی یە دەست نەدەکەوت..

دووەم: خانەکانی دڵ: چونکە دڵ نابێ بۆیەك چرکەش لەکاربکەوێ..

کەواتە: الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالمين..

٨. (الحَمْدُلِلّهِ)ی بکەی لەوکاتەدا، کەگەنجێکی موسڵمان دەبینی قورئان

دەخوێنێ، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) بکەین کە: (سَمِعَ النَبِــيُّ (ﷺ) مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، يَقْرَأُ مِنَ الَّليْلِ، فَقالَ: (الحَمْدُلِلّهِ الَّذي جَعَلَ فِي أُمَّتي مِثْلَهُ). أَخْرَجَهُ البَزَّار ورِجالُهُ ثِقَات، كما في (الإِصابَة لَابن حَجَر ج٢ ص٧).

واتــە: لەنیوە شــەوێکی تاریکــدا پێغەمبەری خــوا (ﷺ) گوێ ی لەدەنگی قورئان خوێندنی گەنجێك بوو، (مەولای ئەبوحوزەیفە) بوو. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: سوپاس بۆئەو خوایەی لەئوممەتەکەی مندا کەســی ئاوای دروست کردوە. کەئاوا لەخۆشەویستی خواو کەلامی خوا بەوشــەوە خەریکی قورئان خوێندنــە. دەی ئیمانداران: دەبێ ئێمەش ئــاوا کاتێ گەنجێك جاکــورِ بێ یان کچ دەبینیــن کەخەریکی قورئان خوێندنە. کەدیراســەی قورئان دەکات، کەئــەو کتێبانە دەخوێنیتەوە کەراڤەو شــەرحی ئایەتەکانی قورئــان دەکەن، کەچەند گەنجو لاوێکی لەخۆی کۆکردۆتەوەو قورئانیان پێ دەلێتەوە. دەبێ گەشاییو فەرەحی بــەدڵو دەرونماندابــێو چاومان پێیان رِوونو گــەش ببێتەوەو بڵێن: خوایەگیــان هەزاران جار ســوپاس بۆ تۆ، کەئەم گەنجــە جوانە، لەم تەمەنەدا. ئاوا رِوی لەســەرچاوەی هەموو خێرەکانە کەقورئانە. خوایە یارمەتــی بدەی. خوایە پشــتگیری بکەی. خوایە لەبــەلاّ لایدەی. ئاها بابو باپیرانمان چۆن ئەم فەرمودەی خۆشەویســتیان (ﷺ) جیبەجێ دەکرد. کاتــێ گەنج ولاوێکیان بینیایە کەخەریکــی خوێندنی قورئان وزانســتە شــەرعیەکانە. کەپێی دەوترا (فەقێ)، چەند پێ ی دڵخۆش دەبون، چۆن بەرِیشــی ســپی یەوە لەرِێگادا پێشی نەدەکەوتن. لەبەری هەڵدەستان، دەیانگوت: چونکە ئەولاوە، ئەوگەنجە. قورئانی هەڵگرتوەو لەخزمەت قورئاندایە. دەبێ هەمومــان لەخزمەتیدابین. دەبا ئێمەش ئەمرِۆ ئاوا لەخزمەت گەنجانی هەڵگری قورئاندابین.

بەڵــێ ئیمانداران: ئێســتا باباســی ئــەوە بکەین کەبەچەند شــێوە

**سوپاسی خوای گەورە دەردەبڕدرێ.. بۆئەوەی بەم شێوازانە شوکرانەی خوا بکەین:**

**١. بەزمان بڵێ ی** (الحَمْدُلِلّهِ). **پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێ ی لەکەسێك بـــوو کەووتی:** (الحَمْدُلِلّهِ حَمْداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاًفيهِ) **پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی:** (لَقَدْ إبْتَدَرَها بِضْعٌ وثَلاثُونَ مَلَكاً، أَيُّهُمْ يَحْمِلها).

**واتە: کاتێ ئەم کەســە بەو شــێوە جوانە، حەمدو ســەناو سوپاسی خوای کرد، سی وئەوەندە فریشتە هاتبوونو هەریەکەی پەلەی ئەوەی دەکرد، کەئەم ووشـــە جوانانە هەڵبگرێو بــەرزی بکاتەوە بۆ بارەگای خوای گەورە.**

**هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی:** (إنَّ اللهَ لَيَرْضَى عَنِ العَبْدِ يَأْكُلُ الاَكْلَةَ، فَيَحْمِدَه عَلَيْها، ويشربُ الشُّرْبَةَ، فَيَحْمِدَه عَلَيْها).

**واتە: بەڕاســتی خوای گەورە لەبەندە ڕازی دەبێ کاتێ کەخواردنێك دەخوات وکەتێری خوارد، حەمدو سەنای خوا دەکاتو دەڵێ:** (الحَمْدُلِلّهِ)، **یان کەخواردنەوەیەك دەخواتەوەو تێراو دەبێ دەڵێ** ، (الحَمْدُلِلّهِ)..

**دەی بابەردەوام بەزمانمان سوپاسی خوا بکەینو ووشەی** (الحَمْدُلِلّهِ ) **ویردی سەرزمانمان بێ.**

**٢. سوپاســی خوای بکەی لەڕێگەی سوجدەی شوکرەوە. لەفەرمودەدا هاتوە:** (أَنَّ النَبِيَّ (ﷺ) كانَ إذا أَتاهُ أَمْرُ سُروُرٍ- أَوْ بُشِّرَ بِهِ- خَرَّ ساجِداً شاكِراً لِلّهِ). (أَخْرَجَهُ أَبُوداود: **(٢٧٧٤)** والترمذي **(١٥٧٨)**.

**واتــە: پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) هەرکاتــێ، هەواڵێکی خۆشــی پێ بگەیشــتایە. یان موژدەیەکی خۆشــی پێ بدرایە. یەکســەر بەسوژدەدا دەکەوت وسوجدەی شوکری دەبرد. وەکو سوپاس کردنی خوا. هەروەها: کاتــێ کەجوبریل (عليه السلام) هاتــە خزمەتیو فەرموی: ئەی محمد (ﷺ):**

(إنَّ اللــه يَقُول: مَنْ صَلَّى عَلَيْكَ واحِدَةً، صَلّى اللهُ عَلَيْهِ بِها عَشْراً، فَسَــجَدَ سُــجُوداً

طَويلاً) واته: خوای گەورە دەفەرموێ: هەرکەسـێ صلاوەتێکت لەدیدار لێبدات، خوای گەورە، دەبەرەکەتی بەسـەردا دەڕێژێو (١٠) پلە بەرزی دەکاتەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکسـەر بەسوژدەی شوکردا کەوتو، سوجدەیەکی زۆر درێژی برد. عبدالرحمن ی کوڕی عەوف دەفەرموێ: لەوکاتـەدا من لەخزمەتی دا بوم. ئەوەندە سـوژدەکەی درێژ کردەوەو سـەری بەرزنەکردەوە. (حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ ماتَ مِنْ طُولِ السُّـجُودِ). رَواهُ الإمام أَحمد، وهُو حَديْثٌ صَحيحٌ..

واتە: ئەوەندە لەسوژدەدا مایەوە، تاوام گومان برد کەوەفاتی کردوە!...

وەحەزرەتی (ئەبوبەکری صدیق) کاتێ بیستی (موسەیلەمەی درۆزن) کەلافـی پێغەمبەرایەتـی لـێ دەداو خەڵکێکی زۆری گومـڕا کردبوو، کوژراوە، یەکسـەر سوجدەی شوکری برد. وەلەبەسەرهاتەکەی (کەعبی کوڕی مالیك)دا. کەباسێکی درێژە هاتوەکە: (أَنَّهُ لَما جاءَتْهُ البُشرى بِتَوْبَةِ اللهِ عَلَيْهِ، سَجَدَ). رَواهُ البُخاري: (٤٤١٨)و مُسْلِم: (٢٧٦٩).

واتـە: کاتـێ کەموژدەکەیـان دا بەکەعبی کوڕی مالیـك، کەخوای گەورە تەوبەی لێ قبوڵ کردوەو ئایەتی لەبارەی تەوبەکەیەوە ناردۆتە خوارەوە. یەکسـەر کەعب لەخۆشـیاندا سـوژدەی شـوکری برد. دەی بائێمەش، هەرکاتێ هەواڵێکی خۆشـمان بیسـت. لەباسی عیزەتی ئەم ئیسـلامە، لەباسی سەرکەوتنی موسـڵمانان. لەباسی شکستی ناحەزانی ئیسلام، لەوکاتانەی کەکارێکی چاك ئەنجام دەدەین. یەکسەر سوجدەی شوکر بۆخوا ببەین..

٣. هەروەهـا سـوپاس کردنـی خوای گەورە، لەسـەر ئـەو هەموو خەڵاتـە لەژمارە نەهاتوانـەی بەوە دەبێت، کەنوێـژ بکەی. هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ کەزۆر لەشـەونوێژدا دەمایەوەو پرسیاری لـێ دەکراو پێیان دەوت: باشـە خۆ خوای گەورە لەگوناهی سـەرەتاو

کۆتاییت. لەمەوبەرو داهاتوت خۆش بوە. ئیتر بۆچی ئەوەندە لەنوێژدا دەمێنیتەوە. بەڕادەیەك ئەوەندە لەشـــەونوێژدا وەستاوی کەقاچەکانت ئاوســـاون؟!! لەوەڵامـــدا دەیفەرمـــوو: أَفَلا أَكُـــوُنُ عَبْداً شَـكُوراً؟! ئەی نابێ بەندەیەکی سوپاس گوزاری پەروەردگارم بم؟!

واتە: ئەم نوێژە دورو درێژە. ئەم ڕکوع وســوجدە درێژە، بەشــێکە لەدەربڕینی حەمدو ســەنا بۆخوا. دەی خۆزگایە ئێمەش ئاوا بوینایە. نەك هەندێ کەس هەتا هەژارەو هیچی نیە، نیوەی شــەو بەخەبەرەو لەســەر بەرماڵــەو شــەونوێژ دەکات. کەچی کەخوای گــەورە هەندێ ماڵو ســامانی پێ بەخشیو بوژایەوە، ئەمجا نوێژی بەیانیش ناکات!!، کەبەپێچەوانەوە دەبێ مرۆڤی موسڵمان، لەهەبونی داو لەوەی کەچەندێ دەوڵەمەندتر بوو، ئەوەندە زیاتر سوپاسی خوا بکات ویەکێ لەڕێگاکانی دەربڕینی ئەو سوپاس کردنەش نوێژکردنی شەونوێژە.

٤. شــوکرکردنی خــوای گــەورەو حەمــدو ســەناکردنی، لەڕێــگای بەڕۆژووبونی ســوننەتەوە. حەزرەتی موســا (ﷺ) لەڕۆژی عاشوڕادا بەڕۆژوو دەبوو. چونکە لەورۆژەدا خوای گەورە لەدەست فیرعەون، خۆی وگەلەکەی ڕزگارکرد. وەپێغەمبەری خواش (ﷺ) ڕۆژی عاشوراو (دەی موحەڕڕەم) بەڕۆژوو بوو. وەفەرمانی کرد بەموسڵمانان کەبەڕۆژووبن، وەفەرموی: ســاڵێکی تر ئەگەر بمێنم ڕۆژی نۆهەمیشی بەڕۆژوو دەبم. ئەم ڕۆژووگرتنەشی وەکو سوپاسی خوای گەورە لەسەرئەوەی حەزرەتی موســاو ئیماندارانی قەومەکەی لەدەســت فیرعەون وزوڵم وســتەمی ڕزگاریان بــوە، دەی بائێمەش، کاتێ یادی ڕزگاربونمان لەدیکتاتۆریەت دەکەینــەوە، هەوڵبدەیــن بەڕۆژووگرتن سوپاســگوزاری خۆمان بۆخوا دەرببڕین نەك بەهەڵبەزو دابەزو تەپڵو مۆسیقاو بێ شەرعی ووتن..

ئیماندارانــی بەڕێــز: پێم خۆشــە ئەو حەقیقەتەش بــاس بکەین،

**کەسوپاس کردنی ڕاستەقینەی خوای گەورە سێ ئاستی هەیە:**

**١. دڵنیابی وبزانی کەئەو خۆشـــیو خەڵاتەی کەپێی شـــادمانی هی خوای پەروەردگارە بەتەنهاو هی هەوڵو تێکۆشـــان وئازایەتی ولێزانی خۆت نی یەو لوطفی فلانو فلان نیە.**

**٢. لەبەرامبەر ئەم خۆشـــیو خەڵاتەی خوای گەورەدا، سوپاسی خوا بکەی بەدڵو بەزمانتو لەیادی خوا غافڵ نەبی.**

**٣. ئـــەو بەهرەو خەڵاتەی خوای گەورە پێی بەخشـــیوی، لەچاکەدا بەکاری بێنیو کردەوەی چاکەی پێ بکەی ولەکارێکدا بەکاری نەهێنی کەخوای گەورە پێ ی نارازی یە.. دەگێڕنەوە: مامۆستا ئەمجەد زەهاوی، جارێکیان خەریکی دروســـت کردنی خانوویەکی ئاســـایی بوو. لەکاتی ئیـــش کردندا، گوێ ی لەیەکـــێ لەکرێکارەکان بـــوو، کەکوفرێکی کرد (پەنابەخوا). مامۆســـتا یەکســـەر بانگی ئەو کرێـــکارەی کردو کرێ ی ئەو ڕۆژەی پێداو بەوەستاکەی ووت: ئەو کرێکارە لەکوێدا بەشداربووە بیڕوخێنەوەو سەرلەنوێ دروستی بکەرەوە!!..**

**خـــوای پـــەروەردگار بمانگێـــڕی لەبەنـــدە ســـوپاس گوزارەکانـــت، کەبەگوفتارو کردار شـــوکرانەی تۆبکەین وبەردەوام بڵێین:** الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمينَ. اللّهُمَّ آمين.


سەرچاوەکان

١. يَضْحَكُ رَبُّنا وَيَضْحَكُ نَبِيُّنا - محمد مُتَوَلِّي الشَّعْراوي، ص٣٢١.

٢. ژیانەوە، ئەندازیار عُثمان - ل٤١٢.

٣. ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە: ٤٠٦ لە ٢٠١٠/١/١٦.

٤. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمين، ل٤٦٣.

٥. مَوْسُـــوعَة الأعجـــاز العِلمي، آياتُ الله في الإنْســـان. د.محمـــد راتب النابلُسي،

ص٤٣، ص٤٤، ص٥٩.
٦. حَصادُ المَحابرِ مِنْ خُطَبِ المَنابِرِ، سَعْد بن سَعيد عَبْدُالله، ص١٨٧.
٧. مَوْسُوعَة أَسْماءُ اللهُ الحُسْنَى. د.محمد راتب النابلُسي، ج٣ ص١٣٠٩.
٨. بڵاوكراوەی پەرواز، ژمارە: ٣ لە ٢٠١٠/١/١.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، وَالصَّلاة وَالسَّـلامُ عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ:

**ئيمانـــداران: كاتـــێ خوا گەورە ئـــەم خێرو خۆشـــی وخەڵاتەی پێ بەخشـــیوین، لەئاســـمانو زەویو خـــاك. لەمانگـو ڕۆژو ئەســـتێرەكان، لەلاشەی خۆمان، كەبەتێك چونی هەرنیزامێكی ژیانمان لێ تاڵ دەبێت، كەچی خوای گەورە منەتمان لەسەر دانانێ، بەڵام بۆ دووشت منەتمان لەسەر دەكات ئەوانیش:**

**١. ئیمان وئیســلامەتی، هەروەكو لەقورئانـــدا فەرمویەتی:** ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُواْ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ الحُجُرات: ١٧.

**واتـــە: ئەوانە منەت دەكەن بەســـەر تۆدا كەگوایە موســـڵمان بوون، پێیان بڵێ: منەت مەكەن بەســـەرمدا لەســـەر موســـڵمان بوونەكەتان، بەڵكو خوا منەت دەكات بەسەر ئێوەدا كەهیدایتیداون بۆ ئیمان وباوەڕ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن..**

**بەڵێ، بەڕاســـتی ئەم ئیمانە، ئەم ئیســـلامەتیە، گەورەترین خەڵاتی خوایە بۆمان، چونكە: (ژیانی دنیا بێ ئیمان ڕەزالەتە، ئیمان ئاسودەیی دڵە، ئیمان ڕەمزی بەڕائەتە، مردنیش وەكو ڕێگایە، ئەتبات بەرەو ئەو قیامەتە، كێ لەپێڕی محمد بێ، لەقیامەت سەر سەلامەتە)..**

**٢. دووەم شـــوێن كەخـــوای گـــەورە بەمنەت باســـی دەكات بەســـەر ئیماندارانەوە، (پێغەمبەری پێشەوایە (ﷺ) خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ ال عِمران: ١٦٤.

**واتە: سوێندبێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران، كاتێك پێغەمبەرێكی بۆ ڕەوانەكردون لەخۆیان، ئایەتەكانی ئەویان بەســـەردا**

دەخوێنێتــەوە، دڵو دەرونیان پاك وپوخــت دەكاتەوە. هەروەها فێری قورئانو داناییان دەكات، بەڕاســتی پێشــتر لەگومڕاییەكی ئاشــكرادا ڕۆچوو بوون..

بەڵــێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) شــاخەڵاتی خوایــە كەپێمان خەڵات كــراوە، ئەی خۆشەویســت: (تۆ چرابووی، دانرابــووی، بۆجیهانێك بە (رَحْمَــةً لِلْعالمين) هەڵكرابووی. قورئان هەمووی شــاهیدیە، كەڕەوشــتت ناوازەیەو بڵندیە. كەســێك وەك تۆ نەبوەو نیە. خۆشم دەوێ ی زیاتر لەخۆم. پێغەمبەرمی وئوممەتی تۆم، مەعشوقی حەقم (الله)یەو شەیدا منم، سەركردە (رَسُولُ الله) یەو هەودا منم..).

بەڵێ ئیمانداران: دڵنیام هەمووتان، چاوەڕێ ی ئەوەن باسی مەولودی، حەزرەتــی فەخری عالەم، خاتەمی ئەنبیاو مورســەلین، موحەممەدی ئەمیــن (ﷺ) بكرێ. چونكە مانگی ڕەبیعــی یەكەمە، مانگی بەهاری دڵەكانــە. مانگی لەدایك بوونی ســەروەرمانە. دەبا بەئەدەبەوە بچینە خزمەت ئەو خۆشەویستەمانو صلاوەتێكی لەسەر لێ بدەین. (اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وعَلى الِهِ وصَحْبِهِ وسَلِّم).

- دیســان (رَبيعُ الاَوَّل)ە، ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەخێرهاتی، تۆ هەتاو بووی، كەهەڵهاتی، بەختــو(هات)ی، شای خەڵاتی...

منداڵێكی بێ دەرەتان، چەند ساڵ شوان، گەل نەخوێندەوارو نەزان. كەچی تۆ بۆیتە مامۆســتا. نەك بۆ ئەوان، بۆ هەمووما‌ن.... لەحەڕڕاوە بەرێكەوتی، نەدەسرەوتی، تاســەركەوتی وبەدەركەوتی، هەتا دەوڵەتت دامەزراند، یەكەم دەستوور لەمێژوودا، تۆ ڕاتگەیاند، بتەكانی كەعبەت شــكاند، بیلالــی ڕەش تێی چریكاند: كەس خوا نــی یە، بێجگە (الله) (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله).. ئەی تریفەی عەشقو جوانی، ئەی كانیاوی میهرەبانی، كێ نەتناســێ پێغەمبەری هەرخۆی خاكبەســەر دەكا.. باغی ژینی بێ

بەردەکا.. واوەیلا بەحاڵی لەڕێی قیامەتا چۆن سەردەردەکا...).

بەڵێ ئیمانداران: مانگی مەولـودی ئەو پێغەمبەرەیە (ﷺ) کەخوا هێنـده ڕێزی لـێ گرتووە، لـە (٢١٥) جێگەی قورئانـدا، ناوی بەرزی پێغەمبەری (ﷺ) لەگـەڵ ناوی خۆیدا هێناوە.. خوای گەورە هێندەی خۆش دەوێ، دەفەرموێ: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴾. النساء: ٨٠.

واتە: ئەوەی فەرمانبەرداری پێغەمبەر (ﷺ) بکات، ئەوە بەڕاسـتی فەرمانبەرداری خوای کردووە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ ﴾ الفتح: ١٠

واتــە: بێگومــان ئەوانەی پەیمــان دەدەن بەتۆ ئــەی محمد (ﷺ) لەڕاستی دا هەرپەیمان بەخوا دەدەن... سُبْحانَ الله لەوڕێزو قەدرگرتنە..

بەڕێزان: خوای گەورە باسی حەزرەتی إبراهیم دەکات. ئەو (إبراهيم) ەی، لەسەرگەیاندنی پەیمانی یەکتاپەرستی خرایە ئاگرەوە، بەفەرمانی خوا کەلەخەودا پێ ی ڕاگەیەندرا، بێ هیچ سڵ کردنەوەو دوو دڵیەك ئامادەبوو. تاقە کوڕەکەی خۆی سەرببڕێ!

بۆبەجـێ هێنانی فەرمانــی خوا، بێ چەندو چونو پرسـیارکردن، هاوســەری خۆشەویســتی (هاجــەرە)و (ئیســماعیل)ی کۆرپەی ســاوای، لەبیابانێکی ووشکی بێ ئاوی، بێ ئاوەدانیدا بەجێ هێشت!. کەبەڕاستی ئەم هەڵوێستانە، هەربەدەم گێڕانەوەی ئاسانە، ئەینا لەمەیدانی کرداردا، مەردو پاڵەوان وئیمان پۆڵاینی وەکو ئیبراهیمی دەوێ! بەڵێ، حەزرەتی ئیبراهیم ئەم هەموو هەڵوێســتە مەردانە دەنوێنێ. ئەمجا دەفەرموێ: ﴿ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾. الشُعراء: ٨٤.

واتــە: پەروەردگارا یــادی خێرم با لەســەر زاری نەوەکانی داهاتوو بمێنێــت.. خوای پەروەردگار داواکەی وەرگرتو فەرموی: ﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُم

مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا ﴾. مريم: ٥٠.

**واتە: ئێمە زمانی خەڵکی دیندارمان هێناوەتەگۆ، کەهەتادنیا دنیایە، باسی ئیبراهیم وخانەوادەی بەچاکیو پاکی وبڵندی بکەن..**

**بەڵام سەرنج بدەن: حەزرەتی محمد (ﷺ) خۆی داوای نەکرد، کەخوای گەورە ناوی بەرز بکات. داوای نەکرد، زمانی خەڵکی بۆ والێ بکات کەبەچاکیو پاکی وبڵندی باسی بکەن، بەڵکو خوای گەورە خۆی ئەم مەقامەی پێ بەخشیو فەرموی:** (ورَفَعْنا لَكَ ذِكْـرَكَ) الشَرْح: ٤. **واتە: ئەی محمد (ﷺ) ئێمە ناوو ناوبانگی تۆمان بەرزکردەوە، لەشایەتماندا هاوڕێ لەگەڵ ناوی ئێمەدا ناوت دەبرێت. ناوت لەسەر زاری فریشتەو پەریو گرۆی ئادەمیزادە. لەم سالانەدا، توێژینەوەیەك دەری خستوە کەلەهەر (٤) خولەکدا لەم سەرگۆی زەوی یە، بانگێك دەوترێ، لەگەڵ** (لا إلهَ إلاّ الله)**دا، دەوترێ** (مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله).

**بەڵێ، خوای گەورە ناوی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی بەرز کردەوە بەوەی کەکردی بەچاوساغو چاولێکراوو قودوە چونکە کاتێ دەپرسی باشەکێ بکەم بەچاوساغی خۆم باشە؟ خوای گەورە یەکسەر وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:** (لَقَدْكانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كانَ يَرْجُو اللهَ واليَوْمَ الآخِرَ، وذَكَرَ اللهَ كَثيراً).

**واتە: بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا، بۆئێوە باشترین مامۆستاو پێشەواو پێشەنگی هەیە، بۆهەرکەسێك کەبەئومێدی ئەوەیە بەسەربەرزی بگاتەوە لیقای خوا، وەبەئومێدی ئەوەیە، قیامەتی ئاوەدان وسەرفرازی وبەهەشت بێ، وەحەزدەکات هەمووکات یادو زیکری خوای گەورە بکات.. بەڵێ ئەم ئایەتە موژدەیەکی زۆر زۆر گەورەی تێدایە بۆئەهلی ئیمان. کەهەرکەسێ لەگوفتارو کرداریدا، لەهەنگاوو هەڵوێستیدا، شوێن پێ ی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵبگرێ وپێ بەپێ ی ئەو خۆشەویستیە بڕوات. ئەوە** (إنْشاءالله) **جێگای بەهەشت دەبێ، وەژیانی**

دونیاشی هەمووی بەزیکرو یادی خوا بۆدەنوسرێ.

بەڵــێ ئیمانــداران: پێغەمبــەری خوا (ﷺ) پێشــەوایە بۆ هەژاران وهەتیــوان، بۆمناڵە بــێ باوکــەکان، ئەوەتا کاتێ خاتــوو (حەلیمەی سەعدیە) لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، بەسواری گوێدرێژێکی لات ولاواز، بەرەو شــاری مەککە دێن بۆئەوەی کەمناڵێك وەربگرنو لەگەڵ کوڕە شــیرە خۆرەکــەی خۆیدا، بەخێوی بکات ولەلایەن ماڵی ئەو مناڵەوە کۆمەکو یارمەتیەك وەربگرێ وتۆزی ژیانو گوزەرانیان باش بێت. بەڵام چونکە ئەوەندە ماڵێکــی هەژاربوون. نەیاندەتوانی ئالیکی گوێدرێژەکەشــیان دابیــن بکەنو تۆزێ هێزو گوڕی تێ بێتــەوە. بۆیە لەڕێگا نەیدەتوانی بڕوات وزۆر لەکاروان بەجێ مان! وەمناڵەکەی خۆشــی کەشیرە خۆرە بوو. شەو هەتابەیانی لەبرسان دەگریا. تەنانەت هاوسەرەکەی حەلیمە ووتی: بەڕاســتی ئەمە خۆخەڵەتاندنە، کەتۆ مناڵەکەی خۆتت بۆ تێر شــیر ناکرێ، چۆن دەتوانــی مناڵی تر وەربگــری؟! حەلیمە فەرموی: ئاخر من برسیمەو پڕبەسکی خۆم نانم دەست ناکەوێ بیخۆم وخۆمی پــێ تێربکەم. جائەگەر مناڵی ماڵێکی دەوڵەمەندمان دەســت بکەوێو یارمەتی باشــمان بدەن وتێرببم، بەدڵنیاییەوە دوومناڵیش تێر دەکەم لەشیرو بەبەخێوکردنی هەردوکیشــیان ڕادەگەم.. بەڵام بەهۆی خراپ ڕۆیشــتنی گوێدرێژەکەیانــەوە، هەتــا ئەوان گەیشــتنە نزیك مەککە، ئافرەتەکانــی تری دایــەن لەمەککــەوە دەگەڕانــەوەو هەرچی مناڵی دەوڵەمەنــدە وەریان گرتبــوو. بۆیە بەحەلیمەیان ووت: باشــتر وایە بگەڕێیتەوە، چونکە هیچ مناڵە دەوڵەمەندێك نەماوە. تەنها یەك مناڵی بێ باوك ماوەتەوە، کەبنەماڵەکەشی هەژارن. مەگەر ئەوە لەگەڵ خۆت بێنی، کەلەڕوی ماددیەوە ســوودی لــێ وەرناگری!. بەڵام ئەمە بینینی ڕووکەشــەو لەدیوی ناوەوە شــتی تر هەیەو خوای پــەروەردگار خۆی

دەیزانێ، زانایان دەفەرمون: (هەندێ جار خوای گەورە لێت دەگرێتەوە، بۆئـــەوەی بتداتـــێ)! ئەوەتا خوای گەورە وولاخی ســـواری چاك وتێرو تەســـەلی لەماڵی حەلیمەی ســـەعدیە دەگرێتەوە، بۆئەوەی کەدرەنگ بگەن ومناڵە دەوڵەمەندەکان وەرنەگرن و(محمدی) خۆشەویست بۆئەوان بێ، کەبەڕاســـتی بەگەیشـــتی حەلیمەو هاوسەرەکەی بۆمەککە، چونکە پێشـــتر پێیان ڕاگەیەنرابوو مناڵی تر نەماوە، یەکســـەر ڕوویان کردە ماڵـــی (عَبدالمُطلب) ی باپیری پێغەمبـــەر (ﷺ) چونکە (عَبْدُالله) چەند مانگ پێـــش لەدایك بونی محمد (ﷺ) لەســـەفەری مەدینەدا وەفاتی کرد. جاهەرکەچوەســـەر محمدی مەلۆتکە، یەکســـەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەردەخەنەی بەڕووی حەلیمەدا کردو یەکســـەر خۆشەویســـتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوەدڵیەوە. خستیە باوەشی یەوەو ئالەوکاتەدا، حەلیمەو خێزانەکەی توشی خێرو بەرەکەتی نەبڕاوەبون:

١. لـــەڕوی خێروبێری دونیایی وماددیەوە، بەچونە باوەشـــی محمد (ﷺ) بۆحەلیمـــە، یەکســـەر هەردوو مەمکی خاتـــوو حەلیمە پڕبوون لەشیر، لەکاتێکا خەریك بوون کەووشك ببن. جاکاتێ کەمەمکی ڕاستی خســـتە دەمی یەوە، دەستی کرد بەمژینی وشیرخواردنی تاوەکو دەمی لێ کردەوە، حەلیمە مەمکی چەپیشـــی بۆ دەرهێناو وویســـتی ئەویشی بداتێ. بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەمی بۆنەبردبوو، دەمی پیرۆزی لابردو بۆبراشیریەکەی هێشـــتیەوە!! هەرلەوێوە سەلماندی کەپەیامی یەکسانی پێ یەو ئەو زەمەنە بەسەرچوو کەیەکێ پڕبێ‌و یەکێ قڕبێ، یەکێ بڕشـــێتەوە لەتێریان، یەکێ ببورێتەوە لەبرسان. ئەم دوومەمکە، یەکیـــان مافی براشـــیریەکەیەتی ونابێ ئەو دەمی لێ بـــدات!. خاتوو حەلیمـــە دەفەرموێ: ئیتـــر لەوکاتەوە هەتا لەشـــیربڕانەوەی محمدو کوڕەکەی خۆم. هەرگیز مەمکم بێ شیر نەبوو، وەبەردەوام هەردوکیان

تێریان دەخوارد. وەمناڵەکەم کەپێشتر زۆر گرینۆك بوو، زۆر بێدەنگو ژیـــرو عاقڵ بوو. وەئازاری نـــەدەدام. وەبیابانەکەمـــان کەلەوەڕگاکانی ووشـــك ببون. بەهاتنی محمد (ﷺ) بۆی بارانی ڕەحمەتیان بەســـەردا باری وگژوگیا شـــین بوو. بەئاشکرا ڕزق ورۆزیمان بۆدەهات وبەتەواوی بوژاینەوە!. بەئاشـــکرا هۆزەکانی تر دەیانگوت ئەی حەلیمە ئەم مناڵە بەڕاســـتی ئـــەم مناڵە خێـــرو بەرەکەتی پێوە بوو بۆتـــان وخۆزگەمان بەخۆت!.

٢. خێـــرو بەرەکەتـــی مێژوییـــی: کەحەلیمەی گومناوو نەناســـراوو هەژارو بیابان نشـــین، بەهۆی دایەنی کردنی ئەو خۆشەویستەوە. بوو بەناودارترین ئافرەتی مێژوو، بوو بەناســـراوترین، خۆشەویســـتترین. لەبەردڵان شـــیرینترین ئافـــرەت، چونکە: لەهەموو کتێبێکی ســـیرەو ژیاننامـــەی پێغەمبـــەری خۆشەویســـتدا. هەرکەناوی خۆشەویســـتمان حەزرەتـــی محمد (ﷺ) دەهێنرێ وباســـی لەدایك بـــوونو گەورەبونی دەکرێ، یەکسەر ناوی حەلیمەی سەعدیەش دەبرێ ولەیەکتر دانابڕدرێن. دەی باشە چ ئافرەتێك هەیە ئەوەندە ناوی تۆمارکرابێ؟! پاشان مرۆڤی موسڵمان کەدڵی پڕاوپڕە لەخۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بەدەست خۆی نیە. کەباســـی حەلیمە دەبیستێ، یەکسەر خۆشەویستە لەدڵیاو وێنەی ئافرەتێکی ڕوح سوکی، پاکوخاوێنی، بەڕێزی، زمان پاکی، بەقەناعەتی، دەوڵەمەنـــدی، دێتە بەرچـــاوو بەهەزاران کچ لەخۆشەویســـتی خاتوو (حەلیمە)وە، ناونراوە (حەلیمە)!..

بەڵـــێ، هەرخوا خۆی دەتوانێ ناوت بەرزبکاتەوە، ئەوەتا ئەو هەموو ئافرەتـــە دایەنـــەی ناوخێڵی بەنی ســـەعد، کەلەوزەمانەدا، مەشـــهورو ناوداربوون لەبەخێوکردن وپەروەردەکردنی مناڵدا. ناوی یەك دانەشیان دیارنەمـــاوە، بەڵام ناوی حەلیمەی هـــەژارو گومناو، هەرگیز ناوی بزر

نابــێ و، هەموو ســات وهەموو کاتو هەمــوو ڕۆژێ لەناو دوو توێ ی هەرکتێبێکــی ژیان وڕێبازی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ناوی حەلیمەش دەبینرێ.

٣. خێروبەرەکەتــی قیامــەت بــۆ (حەلیمە) ئەومیــە کەلەخزمەت پێغەمبــەری خوادا (ﷺ) دەبــێ لەقیامەتدا، کەواتە: بامانگی مەولود، مانگی دڵخۆشــی بێ بۆ هــەژاران، بۆدڵتەنگان، بۆبێ نــاوان. کەئەگەر خواناســی بەڕاست بن، پشت بەخوا ببەستن، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر بــن (ﷺ) ئەوا (إنْشــاءالله)، وەکو حەلیمەو خانەوادەکەی بەختەوەری دونیــاو قیامــەت دەبن، ئــاوا خــوای گــەورە دەرگای ڕەحمەتیان لێ دەکاتەوەو لەزەحمەت ڕزگاریان دەبێ. خاتوو حەلیمە دەفەرموێ: محمد (ﷺ) هەرگیــز خۆی پیس نەدەکرد، گڕوی نەدەگرت. کاتێ خەوی لێ نەکەوتایــە، دەمبــردە دەرەوەو چاوە جوانەکانی بەرەو ئاســمان بەرز دەکردەوەو سەیری ئەستێرەکانی دەکردو چاوی بۆدەگێڕان، هەتاخەوی لێ دەکەوت. بەڕاستی هیچ ناڕەحەتیم نەچەشت بەبەخێوکردنیەوە.

بەڵێ خۆشەویســتان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشــەوایە بۆ زانایانی پزیشکی، ئەوەتا لەبواری (کۆرپەلەناسی)دا، گەورەترین ڕاستی زانستی پێشکەش کردوە، لەفەرمودەیەکدا دەفەرموێ: (إذا مَرَّ بالنُّطْفَةِ، إثْنانِ وأَرْبَعُونَ لَيْلَةً، بَعَثَ اللهُ إلَيْها مَلَكاً، فَصَوَّرَها. وخَلَقَ سَمْعَها وبَصَرَها، ولَحْمَها وَعِظامَها، ثُمَّ قالَ يارَبْ: أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى). (رَواهُ مُسْلِم).

واتە: هەرکاتێ چلو دووشەو بەسەر نوتفەدا تێ پەڕی. خوای گەورە فریشتەیەکی بۆدەنێرێ. شێوەی دەکێشێو گوێ وچاوی بۆدروست دەکاتو گۆشــتو ئێسقانی بۆدروست دەکات، پاشان فریشتەکە دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم ئایا نێرە یان مێ یە..

بەڕێزان، زانستخوازان: خۆتان باش دەزانن، دیاری کردنی کات لەڕوی

زانستی یەوە زۆر مەسەلەیەکی مەترسیدارەو نابێ هیچ گومانێك بمێنێ لەڕاســتی دا، ئایا ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلایەن خواوە ئەمەی پــێ نەوترابێ، ئایا لەکوێ فێری ئەم ڕاســتی‌یە زانســتی‌یە بوو؟! ئایا بەچ ئامێرێ پشکنینی کرد؟! ئەوەتا دوای (١٤٠٠) ساڵ لەم فەرمودەیە، ئێستا پرۆفیسۆر (کیث مور) کەپرۆفیسۆرێکی کەنەدی یەو یەکێکە لەو (١٢) پرۆفیســۆرەی کەبۆهەر باسێك لەمەسەلەی کۆرپەلەزانی دا پرس بەئەوان دەکرێت، ئەم زانایە بەخەیاڵی خۆی وویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵبســەنگێنێ، کەئایا چۆن ئاوا بەڕاشــکاوی‌و بەژمارە لەســەر ئەو مەســەلە حەســاس وگرنگانە قســە دەکات، لەکاتێکا ئەمە ئیشی ئەو کەســانەیە کەپســپۆڕی ئەو بوارەن! بۆیە هات بەپێشکەوتووترین ئامێــر، چاودێری کۆرپەلەی کرد لەڕەحمــی دایکی دا. ئەوەبوو کەبوو بە (٤٢) شەو، (سُبْحانَ الله) (قەدی مێشك) دروست بوو! کەقەدی مێشك لێپرسراوە بەرامبەر بە (بیستن، بینین، تامکردن، بۆنکردن). وەڕەگەزی کۆرپەش (نێرە یان مێ) دیاری دەکرێ!!

ئەم پرۆفیسۆرە کەمامۆستایە لەزانکۆی تۆرنتۆ لەکەنەدا، وەکتێبەکەی لەســەر ســوڕی ژیانی کۆرپەلە بۆ (٢٥) زمانی جیهانــی وەرگێڕدراوە. موسڵمان بوونی خۆی لەتەلەفزیۆنی کەنەدی یەوە ڕاگەیاندو فەرموی: بەڕاســتی (محمد) پێغەمبــەری خوایەو هیچ ووشــەیەکی لەخۆیەوە نەوتــوەو ئەوە قســەی کەســێکی نەخوێندەوار نی یــە کەبتوانێ ئاوا بەزانستی‌و بێ کەم‌و زیاد شتی ئاوا گرنگ بڵێ.

بەڵــێ بەڕێــزان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشــەوایە بۆهەموو چین وتوێژەکان، یەکێ لەوچین وتوێژانە، چینی ســەرکردەو لێپرســراوانی وولاتە. بەکردەوە بوو بەپێشــەوا بۆسەرکردەکان، کەخۆیان لەهاوڵاتی بەبەرزتر نەگرن وڕابردوی خۆیان لەیاد نەچێ، ئەوەبوو کاتێ کەکەسێکی

هەژارو بێ کەس وکار، هاتە خزمەتی (ﷺ) کابرا وایزانی پێغەمبەری خواش (ﷺ) وەکو سەرکردەکانی ئەوکاتەو هەموو سەردەمێك، کەسێکی سامدارو کەسێکی ڕوتاڵی وایە کەهاوڵاتی نەتوانێ پڕبەچاو تەماشای بکات وتف لەدەمیدا ووشك ببێ. بۆیە کابرای هەژار لەشی دەلەرزی، دەمی گۆی نەدەکردو سەری داخستبوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (هَوِّنْ عَلَيْكَ، إِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ. أَنا إِبْنُ إِمْرَأَةٍ كانَتْ تَأْكُلُ القَديدَ). فەرموی: براکەم مەترسە، مەلەرزە، لەسەرخۆبە، چونکە من پاشایەکی دونیایی نیم، بەخوا من کوڕی ئافرەتێکم کەدایکم لەبەرهەژاری ونەداری گۆشتی ووشکی ئەخوارد – کەووشك کرابۆوە. وەتواناى کڕینی گۆشتی تازەی نەبووا. ئیتر تۆ بۆچی ئەترسی وئەلەرزی؟!...

بەم هەڵوێستە زێڕینە، بەم پەیفە نورینە، بەسەرکردەکانی فەرموو، ئەی لێپرسراوانی گەل‌و وولات ئێوەش وابن، ڕابردوی خۆتان لەبیرنەچێ. هەزاران هەزار سەلاتو سەلامی خوات لەسەر کەسەرکردەکانت فێرکرد: میللەت ڕانەو شوانی دەوێ، شوانی پاسەوانی دەوێ، ڕەنج ودڵسوتانی دەوێ، لێپرسراوانت تێگەیاند: میللەت ئاوو نانی دەوێ، بێستان وخەرمانی دەوێ، بازاڕو ژیانی دەوێ، بێ جیاوازی خزمەتی یەکسانی دەوێ!.

فەرمووت پێیان: لێی ڕابکەن، بۆی ڕامەکەن، داوای مەکەن، چونکە کورسی حوکمڕانی ئەمانەتە. کێ حکومەکەی عەدالەتە، لەقیامەت سەرسەلامەتە، بەڵام پاداشتی ستەمکار، بەبێ کورسی‌و بێ پاسەوان. دەوەستێنرێ، لەدۆزەخا مورەغەی پشتی دەشکێنرێ... بۆمیللەتیش فەرمووت: کاریان بەڕاوێژبێ. ئەبێ زیرەك وحەق وێژبێت، نابێ سەرسەپۆلەو گێژبێ، وەك ڕانەمەڕ، بدرێتەبەر، بەدەمی تەڕ، سەد کڵاوی بکرێتەسەر، ووتەی لەدەم نەیەتەدەر...).

ئیماندارانی بەڕێز: بامەولود بکەین ویادی لەدایك بونی خۆشەویستمان نوری چاومان شـــەفیعی مەحشـــەرمان (محمد المصطفى) بکەینەوە، بەم شێوازە شەرعیانە:

١. زۆر صلاوەت لەدیداری بدەین. (اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَـيِّدِنا محمد وعَلى الهِ وصَحْبِهِ وسَـلِّم). چونکە هەرکات تۆ ناوی خۆشەویســت دێنی وصلاوەتی لەســەر دەدەی، خــوای گەورە نــاوت بەرزدەکاتــەوە، ڕەحمەتی خوات بەســەردا دەڕژێ، صــلاوەت لێــدان بەرەکەتی ماڵــە، پێغەمبەر (ﷺ) گوێ ی لێت دەبێ ولەڕۆژانی جومعەدا وەڵامی صلاوەتەکەت دەداتەوە. گەنجێکی موسڵمان، کەدڵی پڕبوو لەخۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ)، زۆر صلاوەت لەســەر پێغەمبەر ئەدات، شــەوێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێتــە خەوی ئەم کوڕە گەنجە، کوڕە گەنجەکە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئایا منت خۆش دەوێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەپەنجەی موبارەکــی ئاماژە بۆهەردوو چاوی پیــرۆزی خۆی دەکاتو دەفەرموێ: تۆ هەردوو چاوی منی!!.. دەی توخوا بادڵمان پڕکەین لەخۆشەویستی ئائەو خۆشەویســتە، کەبەڕاستی هەرئەو شایەنی ئەومیە خۆشەویستی ڕاســتەقینەمان بێت. بۆئەوەی ئاوا پێغەمبــەری خواش (ﷺ) ئێمەی خۆش بوێت.

٢. باخۆشــحاڵی خۆمــان دەرببڕین بــەوەی کەخوای گــەورە ڕێزی لێناویــن بەوەی کەکردوینی بەئوممەتی ئەوخۆشەویســتە. دەی باچی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان خۆشــە ئەوەبکەین، لەیارمەتیدانی هــەژاران، هەتیوان، نەخۆشــان، دڵپاکردنەوە لەڕق وقین وحەســودی وبەخیلی. کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بەمە خۆشحاڵ دەبێت..

٣. لــەم مانگی مەولــودەدا. مەولودی ڕاســتەقینە ئەومیە کەچاوێك بخشــێنیتەوە بەخــۆتو مــاڵو منالتدا، ئایــا کچو کــوڕت، خێزانت..

ســەتەلایتو کەناڵەکانت. کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامەکانت لەو بابەتانەیە کەئەگــەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەژیانــدا بوایەو بهاتایەتە ماڵەکەت لەڕوت دەهات، یەکسەر پێشوازی لێ بکەی بۆ ژورەوەو شەرم نەتگری؟!
ئای چەند خۆشە ماڵەکەت ڕازاوەبێ بەقورئان. بەفەرمودە زێڕینەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەشــریتی دینی، ماڵو منالَت جلوبەرگی شــەرعیانە بپۆشن. ئای چ خۆشە ئەوەندە موسڵمانانە بژی، کاتێ ئەو نوری چاوە هاتە ماڵەکەت، یەکســەر بەرەو خزمەتی بڕۆیتو دەســتی ماچ بکەیو ئەویــش بفەرمــوێ: ڕەحمەتی خوات لێ بێ بۆ ماڵــە پڕ لەدینەکەت. دەرۆمو شوێنی یەکتربینینەوەمان، سەرحەوزی کەوسەربێ.

٤. لەم مانگی مەولودەدا بڕیاربدە، سوننەتێکی ئەو ڕابەرو چاوساغە زیندوو بکەیتەوە، لە (شەونوێژ، نوێژی چەشتەنگاو، زمانت ڕابێنی لەسەر (بِسم الله والحَمْدُلِلّه وإنْشاءالله) کردن. بڕیاربدە نوێژەکانت بەجەماعەت لەمزگەوتــا بکەی. لەســیواك کــردن، خۆبۆنخۆشــکردن، پاکوخاوێنی جلوبەرگت، لاشــەت، ناوماڵت، حەوشــەو بەرماڵت. کەئەمانە هەمووی ســوونەتی پێغەمبەری خوان (ﷺ)، هەوڵبدە سوننەتی ڕوخۆشی، دەم بەزەردەخەنە بوون. زمان پاکی، ووشەی شیرین لەخۆتا دروست بکەی.

پاشــانیش ئیمانداران: دەبێ زۆر ئاگاداری ئەوەبین کە: هەرکەسێك، خێزانێك، کاســبکارێك، دەوڵەمەندێك، لێپرسراوێك، ئەمە پیشەی بێ (پەنابەخوا) ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: من لێی عاجزمو بەئوممەتی خۆمی قبوڵ ناکەم. ئەو ڕەوشتە خراپانەش وەکو:

١. غەش کردن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (مَنْ غَشَّــنا فَلَيْسَ مِنّا) رَواهُ مُسْــلِم. هەرکەســێ غەش بکات لەئێمە نیــە. جاغەش کردنی فرۆشــیاربێ لەکڕیار. غەش کردنــی هاولاتی بێ لەحکومەت، کەموچە وەربگرێو دەوام نەکات، یان غەشــی کاربەدەست لەمیللەت. کەقسەیان

**بۆ بکاتو بەڵێنیان پێ بداتو پاشـــان درۆشـــیان لەگەڵ بکات. غەشـــی قوتابی بێ لەکاتی تاقی کردنەوەدا، غەشـــی مامۆســـتابێ لەخوێندکار بـــەوەی کەهەموو هەوڵو زانســـتی خۆی نەخاتەگەڕ بۆ ســـەرکەوتنی خوێندکارانی. یان غەشی دکتۆر لەنەخۆش بەوەی کەجوهدو تێکۆشانی بەردەوامی لەگەڵ نەکات!..**

**٢. پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:** (مَنْ حَمَلَ عَلَيْنا السِّــلاحَ فَلَيْسَ مِنّا). رَواهُ مُسْلِم.

**واتە: هەرکەسێ سیلاحو چەکمان دژ هەڵبگرێ، ئەوە لەئێمە نیە.**

**جاچەکو سیلاح، هەربەئاسن ناوترێ، بەڵکو چەکی لێدان لەئیسلام لەم ســـەردەمەدا بریتی یەلە: ئافرەتی سفور، سیدی خراپو ناشەرعی، گۆڤارو ڕۆژنامەی بێ ســـود، کەدورە لەڕەوشـــتو بەهای موســـڵمانانە، نوسینی کتێبی پڕ لەژەهر لەقاپی هەنگویندا!!. ئەمانە چەکی سەردەمن بۆ لێدانی موسڵمانانو ئیسلامو هەرکەس ئەمانە بکات ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێ ی بێ بەری دەبێت. پەنا دەگرین بەخوا...**

**٣. پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) فەرمویەتی:** (لَيْسَ مِنّا مَنْ لَـمْ يُوَقِّرَ الكَبير، ويَرْحَمَ الصَّغير، ويَأْمُرُ بالْمَعرُوفِ ويَنْهَي عَنِ المُنْكَرِ). رَواهُ أَحمد.

**واتە: لەئێمە نی یە ئەو کەســـەی کەڕێز لەڕیش سپیو بەسالاچوان ناگرێ، وەبەزەیی وسۆزی نیە بەرامبەر منالی بچوکو تازەپێگەیشتوو. وەفەرمـــان بەچاکە نـــاکات وڕێگری لەبێ شـــەرعی وخراپـــە ناکات... بەداخـــەوە ئەمڕۆ لەژێر بەردەی ئـــازادی دا: لەجیاتی ڕێزو حورمەت بۆپیرو بەتەمەنەکان، دەڵێن ئەمە پیرسالاری یەو دەبێ ئەو بەتەمەنانە دوربخرێنەوەو هیچ ســـود لـــەو هەموو ئەزمونەیـــان وەرنەگرین، یان چەنـــد ڕەحم وبەزەیی کەم بـــوە بەرامبەر منالو هەرزەکاران. ئەویش بەوەی کەهی واهەیـــە لەپێناوی چەند پارەیەکی کەمدا، ئامادەیە چی**

**منالّو هەرزەكارى پێ دەفەوتێ، ئەوە بفرۆشێ!! یان شیعارى (دەست بەكلاوى خۆتەوە بگرە بابانەیبات.) بۆتە كلتورو كاردانەوەى لەسەر ڕەفتارو هەڵوێستمان دژى خراپەو بێ دینى هەیە...**

**لەكۆتایی دا ڕوو لەڕۆحی هەمیشە زیندوى خۆشەویستمان دەكەینو دەڵێین: (بیلبیلەكەى چاوى كوردان، بەجل وبەرگى كوردیمانەوە، بەمەولودو صلاوەتی دەممانەوە، بەپیرو لاوو منالّو پزیشكو ئەفسەرمانەوە، بەنێرگزى شارەزورو بەباخو دێبەرمانەوە، بەصەلاحەكەى ئەیوبیو بەقازى ڕابەرمانەوە. بەقانع وپیرەمێردو چاپخانەو هونەرمانەوە. بەمێژوى هەڵپڕوزاوو بەخاكى گەوهەرمانەوە.**

**بەچی كوردو كوردستانو ئاسمانى سەرسەرمانەوە.. بەقوربانى تۆى سەروەرین.. كوردێكى ئیسلام پەروەرین..)**

**خواى گەورە خۆشەویستى خۆتو پێغەمبەرەكەت، بچەسپێنە لەناو دلّو دەرونماندا. لەسەر ڕێبازى حەزرەتى محمد (ﷺ) دامەزراومان بكەو لەڕۆژى قیامەتدا لەچاوپێكەوتنى خۆت وشەفاعەتى پێغەمبەرەكەت (ﷺ) بێ بەشمان مەكە.**

آمین یارَبَّ العالَمین

سەرچاوەكان


١. تەفسیرى ئاسان- بورهان محمد أمین.

٢. ژیانەوە، ئەندازیار عُثمان، ل٣٠.

٣. ئاشكرابوونى موعجیزە زانستییەكان، عبدالرزاق أحمد ل١٢٦.

٤. السِلْسِلَة الذَّهَبِيَة- الشَّيْخ محمود المِصري ج٣ ص٦٥٥.

٥. فرمێسكى گوڵ. مامۆستاى پەخشان نوس. غەریب پێنجوێنى، ل٩١، ل١٠٦.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِنَ:

**خوایه: پەنا خۆتی، خوا خۆتی، هەموو کاریٚ بەدەست خۆتە، ئەگەر من موزنیبم خۆتۆ خواوەندێکی غەففاری..**

**ئەی پێغەمبەر (ﷺ):**

**ئەی کەسیٚ کەوا دیدارت بەنـــــــدە بەعەرشی ئەعلاوە**
**لەپشتی قابە قەوسەینا جــــــــوبرەئیلت جیٚ یەلاٌوە**
**لەئەدناو لامەکانا، ڕووت لەزاتی خـــــــــــوا ناوە**
**لەبەهەشتی نەبڕاوەدا، کەوســـــــــەرێکت پیٚ دراوە**
**بــەنوری پێغەمبەریەتیت، چـــــــاوی بونەوەر کراوە**
**نەهەر ئـــــــــەمڕۆ لەئینجیلا، موژدەی هاتنت دراوە**
**ئازادی ڕاستەقینە تــــــــــــەنها بەناسینی تۆیە**
**بەجێهێنانی سوننەتت، شــــــــەئن وشەوکەت وشکۆیە**
**ئەی کەسیٚ ئارەقی لاشـــــەت میسك ونێرگزو شەوبۆیە**
**کۆیلـــــــەیە ئەوەی نەتناسیٚ، ووتەو بەرنامەی درۆیە**
**لەبەڕاوی وولاتـــــــــــانی بیٚ باوەڕا تۆ عەبقەریت**
**فەیلەسوفی، ئاشتی خـــوازی، چارە دۆزی دەردی سەریت**
**زمانیان لالــــــە پێت بلێن، دوا زنجیرەی پێغەمبەریت**
**گێلن، هێشتاکـــــە چوزانن، تۆ تکا خوازی مەحشەریت**

**ئیماندارانـــی بەڕێز: شـــتێکی بەڵگەنەویســـتە، کەمرۆڤ پێویســـتی بەپێشـــەنگو پێشـــەوا هەیە. کەچاوی لیٚ بکاو شـــوێن پیٚ ی هەڵبگریٚ ولەئەزمونی ژیانی سودمەندبیٚو ڕێگای تاریکی ژینی بۆ ڕۆشن بیٚ، جا خوای گـــەورە وەلامی ئەو داخوازیەی مرۆڤی داوەتەوەو، پێغەمبەرانی بۆمرۆڤایەتـــی نـــاردوە، کەئـــەو پێغەمبەرانـــە چاولێکـــراون هەریەك**

لەبوارێکدا.. چەند جوانە کەســی بازرگان، وەکو ســولەیمان پێغەمبەر بێ (ﷺ). کەئەو هەمووو ماڵو سامانو کۆمپانیاو دەزگایەی بەهی خوا بزانێ وەبڵێ: (هذا مِنْ فَضْلِ رَبِّي) بەڵام نەك هەربە نوسینی سەر دیواری نوسینگەکەی، بەڵکو وەکو حەزرەتی سولەیمان، لەخزمەتی دینی خواو مرۆڤایەتی دا بەکاری بهێنێ وپاشان منەت بەسەرکەسدا نەکاو تەکەبور لێ نەداو بڵێ: ئەمە هەموی فەزڵو بەخششــی خوایە. وەچەند جوانە گەنج ولاو، یوســف پێغەمبەر بکاتە قودوەو چاوســاغو پێشەنگی خۆی لەبواری عیففەت وداوێن پاکی داو، کاتێ زینا یەخەی پێ دەگرێ، ئەم لەبەری ڕاکا، نەك بۆی ڕابکا، لەبەری ڕابکاو بڵێ: (مَعاذَ الله)!..

چەند شیرینە نەخۆش چاو لەحەزرەتی (ئەیوب) بکات وئارام بگرێ وئاوا داوا لەخوابکا کەبڵێ: (رَبِّ إِنِّي مَسَّنِيَ الضُرُّ وأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّحِمين).

چەنــد جوانە ڕۆڵەو نەوە، چاو لەئیســماعیل بکــەن، بۆگوێڕایەڵی فەرمانی خواو پاشان گوێڕایەڵی باوکیان، کەبڵێ: (ياأَبَتِ افْعَلْ ماتُؤمَرُ).

چەند بەڕێزە ئەوپیــاوەی کەچاو لەحەزرەتی (زەکەریا) بکاو دوای چەندین ســاڵ لەژیانی هاوسەری کەمناڵی نیەو بەئاواتی مناڵێکەوەیە، کەچی ژن بەسەر خێزانەکەی نەهێنێ وڕۆژێ لەڕۆژان دڵی ئازار نەداو ئارام بگرێ.

ئــای چەند بەڕێزە ئەو بانگخوازەی کەچاو لەحەزرەتی (نوح) بکات وشــەوو ڕۆژ بخاتە ســەریەك بۆئامۆژگاری گەلەکەی وبڵێ: (إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمي لَيْلاً ونَهاراً).

چەند بەڕێزە ئەوکچەی کەوەکو خاتوو مەریەمە پاك داوێن وڕەوشت بەرزو خاوێن بێ. کەخوای گەورە شاهیدی داوێن پاکی بۆدەدات: (يامَرْيَمُ إِنَّ اللهَ اصْطَفاكِ وطَهَّرَكِ واصْطَفاكِ عَلي نِساءِ العالَمينَ).

چەند بەڕێزە ئەو ژنەی کەچاو لەخاتوو ئاسیە دەکات، کاتێ کەلەژێر

دەســـتی پیاوێكی خوانەناســـدا گیردەخوات، كەناهێڵێ ســـوژدە بۆخوا ببات. كەوەكـــو فیرعەون دیكتاتۆرەو ناهێڵێ ئـــەو خێزانەی بەئازادی سەرپۆشـــی حەیاو حورمەت بەسەر سەروسینەیدا بدات. ئەویش وەكو خاتوو (ئاسیە) بڵێ: من لای خوای پەروەردگارم هەڵدەبژێرمو ئامادەم دەســـت لەخۆتو ماڵو كۆشـــكو تەلارو زێڕو زیووت هەڵدەگرمو خوای پەروەردگارم هەڵدەبژێرم، وەبڵێ: (رَبِّ ابْنِي لِي عِنْدَكَ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ)..

بەڵێ بەڕێزان: بەم شـــێوەیە پێغەمبەرانو صالحانو چاكانو پاكان، دەبنە باشـــترین پێشـــەنگ بۆ مرۆڤی ئیماندار، بـــەلام ئەوەندە هەیە، هەریەك لەوانە، پێشـــەنگە بـــۆ بوارێك لەبوارەكانـــی ژیان. بۆچینێك لەچینەكانـــی كۆمەڵگا. بەڵام ناتوانێ ببێتە پێشـــەنگ بۆهەموو چین وتوێژەكان. بۆهەموو ئاســـتەكانی تەمەن. ئەوەتا حەزرەتی سولەیمان، ناتوانرێ ببێتە پێشـــەنگ بۆكەسێكی هەژار!، حەزرەتی عیسی ناتوانێ ببێتـــە پێشـــەنگ وچاولێكراو بۆخێزان، چونكە خێـــزانو ماڵی نەبوە، تاوەكو باوك فێرببێ لێوەی كەچۆن ڕەفتار لەگەڵ منداڵ بكات. حەزرەتی ئەیوب نابێتە پێشەنگ بۆكەســـێك، لەژیانی دا، بەنەداری ودەردەداری تاقـــی نەكراوەتـــەوە. بەڵام: تاكـــە مرۆڤێك، تاكـــە پێغەمبەرێكی خوا، كەببێتە پێشەنگو پێشەوا بۆ هەموو چینو توێژێك، بۆ هەموو ئاستی زانســـتی وتەمەنێك. حەزرەتی (محمـــد المصطفى)یە (ﷺ) خوای گەورە (سُبْحانَهُ وتَعالى) خۆی شاهیدی بۆ داوە، كەفەرمودوەو چاوساغ بێ بۆتەواوی بەشـــەریەت. هەتا قیامەت. چونكە ئەگەر كەســـێ، بەزمانی حاڵ بڵێ: ئـــەی پـــەروەردگارم ئەی خالیقو ڕازیقم، شـــوێن پـــێ ی كێ هەڵگرم، كەهەرگیـــز گومڕانەبم. كەكردەوە پەشـــیمان نەبـــم، كەتەف لەڕابردوو نەكـــەم. كەتۆم لێ ڕازی بی. كەقیامەتم ئـــاوەدان بێ. كەهەموو ژیانم زیكـــری تۆبێ، خوای گەورە لەقورئانـــدا وەڵامت دەداتەوەو دەفەرموێ:

چاو لە(محمد) (ﷺ) بکە. ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾. الأحزاب:٢١.

بەڵێ حەزرەتی محمد (ﷺ) خاتەمی ئەنبیاو مورسەلین بکە بەپێشەنگی خۆتو بێخەم بە. خۆئەگەر لەخوای گەورە بپرسی: ئایا کەس هەیە لەخۆم دڵسۆزتر بێ بۆ خۆم؟ خوای پەروەردگار، دیسان وەڵامی ئەو پرسیارەشمان دەداتەوە لەقورئانەکەیداو دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ الأَحْزاب:٦.

ئیمانداران: هیچ کەس نیە لەم سەرزەویەدا، کەهەموو ژیانی ئاشکراو ڕوون دیاربێ، کەشەویشی وەکو ڕۆژی ڕووناك بێ، کەهیچ لایەنێکی ژیانی شاراوە نەبێ، تەنهاو تەنها یەك کەس هەیە، کەئەویش پێشەواو چاوساغمان، شەفیعی مەحشەرمان (محمد مُصْطفی)یە (ﷺ) چونکە قورئان هەموو ژیانی ئەو خۆشەویستەی تێدا تۆمارکراوە. ئەوەتا کاتی هەتیویو منالّی باس دەکاتو دەفەرموێ: (ألم يجدك يتيما فآوى). باسی هەژاریو نەداریو شوانی دەکاتو دەفەرموێ: (ووجدك عائلا فأغنى ). باسی ئەوکاتانەی ژیانی دەکات کەبیر لەم ئەرزو ئاسمان وگەردونە دەکاتەوەو دەڵێ: نابێ ئەم بتانە ئەم گەردونەیان بەم نیزامە ڕێکوپێکە دانابێ، دەبێ خوا شەریك وهاوبەشی نەبێ، خوای گەورە بەنوری پێغەمبەرایەتی، ئەو گرێ یەی سەردڵی کردەوەو باسی دەکات ودەفەرموێ: (ووجَدَكَ ضالاً فَهَدَى).. کاتێك وەحی خوای بۆدێ لەئەشکەوتی (حِراء) دا، دەفەرموێ: (إقْرَأْ باسْـمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَقَ). کاتێ لەئەشکەوتەکەوە بەرەوماڵەوە بۆلای خاتوو خەدیجەی دڵسۆزو هاوسەری دەگەڕێتەوەو دەفەرموێ: دام پۆشن، دام پۆشن، (زَمِّلوُني، زَمِّلوني)، خوای گەورە باسی ئەودیمەنەی ناولێفەکەی دەکات ودەفەرموێ: (يأَيُّها المُزَّمِّلُ قُمِ الَّيْل إلاّ قَليلاً). (يأَيُّها المُدَّثرْ قُمْ فَأَنْذِرْ).. دواتر کاتێ کەدێتە ناوخزمەکانی وپەیامی خوایان

پێ ڕادەگەیەنێ، ئەویش تۆمار دەکات بەئایەتی: (وأَنْذِرْ عَشِرَتَكَ الاَقْرَبِينَ).. هەرلەوشوێنەشـدا کە (أَبُولَهَب)ی مامەی لێ ی دێتە وەڵام وبەرپەرچی دەداتـەوەو دەڵـێ: (تبًا لـكَ أَلِهـذا جَمَعْتَنا؟). خوای گـەورە خۆی وەڵامی ئەبولەهـەب دەداتەوەو دەفەرمـوێ: (تَبَّتْ يدا أَبی لهَـبٍ وتَبْ).. هەروەها ئەوکاتانەی کەخۆشەویستمان (ﷺ) خەریکی شەونوێژە، قورئان باسی دەکات وتۆمـاری دەکات بەئایەتی: (ومِنَ اللَّيْلِ فَتَهجَّدْبِهِ نافِلةً لكَ، عَسَـى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقاماً مَحمُوداً). وەباسـی شێوەی قورئان خوێندنەکەی دەکات ودەفەرموێ: (ورَتِّلِ القُرْآنَ تَرْتِيلاً). کاتێکیش خەریکی بانگەوازی ناودارانی قورەیشـەو هەژارانی ئیماندار دێنەلای وپێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ ی ناخـۆش دەبێ لەم دەرفەتە زێڕینەدا، کەئەو گەورەو ناودارانەی کوفر گوێیـان بۆ گرتوە، ئەم موسـڵمانە هەژارانە هاتونـەلای، خوای گەورە ئاگاداری دەکاتەوە بەئایەتی: (وَاصْبِرْ نَفْسَـكَ مَعَ الَّذِيـنَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَـشِيِّ...). هەروەها کاتێ بەتەنهایەو خەفەت دەخوات کەکافران ئیمان ناهێنـنو ئەم نورو ڕۆشـنایییە قبوڵ ناکـەنو حەزدەکەن لەتاریکیو تاریکسـتانی بت پەرسـتی دا بژین. ئەم مەشهەدەی ژیانی تۆماردەکات ودەفەرموێ: (فلعلك باخع نفسك على آثارهم إن لم يؤمنوا بهذا الحديث أسفا).

یان ئەوکاتەی کەیەکێ لەسەرکردەکانی کوفر ئیمان دێنێ، بەڵام کاتێ ئەبوجەهل لەسەفەر دەگەڕێتەوە، پەشیمانی دەکاتەوەو کافردەبێتەوەو دێتەسـەرماڵی پێغەمبەری خواو (ﷺ) دڵە پیرۆزەکەی ئازار دەدات. ئالەوکاتەدا قورئان دێتە خوارەوەو دڵە مەحزونەکەی سـاڕێژ دەکاتو دەفەرموێ: (ويوم يعض الظالم على يديه يقول يا ليتني اتخذت مع الرسـول سبيلا (٧٢) يـا ويلتى ليتني لم أتخذ فلانا خليـلا (٨٢) لقد أضلني عن الذكر بعد إذ جاءني وكان الشيطان للإنسان خذولا).

بەڵـێ ئیماندارانـی بەڕێـز: گەورەتریـن ڕێزو خۆشەویسـتی خوا

بۆحەزرەتــی محمــد (ﷺ) ئەوەیــە: کەهەمــوو ژیانــی لەقورئانــدا تۆمارکــراوە. دەی خوای گەورە لەبارەی قورئانەوە دەفەرموێ: (إنّا نَحْنُ نَزَّلْناالذِّكْـرَ وإنّا لَـهُ لَحافِظُونَ). جالەم ئایەتەوە ئــەوە وەردەگرین کەچۆن قورئــان پارێــزراوە. ئاوا پێغەمبــەری خواش (ﷺ) پارێــزراوە. بەبێ هیــچ گومانێك لەسەرتاســەری مێــژووی مرۆڤایەتــی دا. ژیانی هیچ سەرکردەیەك نەبوەو ناشبێ، کەوەکو ژیانی حەزرەتی محمد (ﷺ) ئاوا شــەوو ڕۆژ، لەلایەن چین وتوێژێکەوە بخوێندرێتەوە. بۆچی؟! چونکە قورئان ژیاننامەکەی تۆمارکردوەو خۆبەلگەنەویستە، کەهیچ پەرتوکێ لەجیهاندا، نەبوەو ناشــبێ، کەبەئەندازەی قورئان بخوێندرێتەوە. خۆ بەشــاهیدی هەموو دەزگاکانی پەخــش وکتێبخانەکانی جیهان. قورئان لەهەمــوو کتێبێ زیاتــر چاپ دەکرێ. قورئان تاقــە کتێبە کەفەتحەو کەسەرەیەکی زیادو کەم وبەهەڵەی تێدانی یە. تاقە کتێبە لەسەر ڕووی زەوی کەلەقەبارەدا، لەبچوکترین قەبارەوە هەیەتی کەیەك سم بەیەك ســم. تاگەورەترین قەبارەو لاپەڕە. دەی بەژمارەی موصحەفی قورئان، ژیاننامــەی پێغەمبەری خوا هەیە (ﷺ). ئایا هیچ کەس هەیەو دەبێ ئــاوا ژیاننامەی بڵاوو پارێزراوبێ؟! بەدڵنیاییەوە، نەخێر. دەی کەواتە دەبێ هەر محمد (ﷺ) قودوەو چاوســاغ بێ!. بەڵێ ئەی ئەوکەسانەی کەدڵتــان پڕە لەخۆشەویســتی حەزرەتی محمــد (ﷺ) موژدەتان لێ بێ، چاوتان ڕۆشــن بێ، کەئەم نوری چاوەمــان. ناوی هەربەرز دەبێ، چونکە خوا شاهیدی بۆدەدات ودەفەرموێ: (وكَفَي باللهِ شَهيداً، مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللـهِ). وەلەبارەیەوە دەفەرمــوێ: (وإنَّكَ لَعَلي خُلُقٍ عَظيـم.) وەدەفەرموێ: (وما أرْسَــلْناكَ إلاّ رَحْمَةً لِلْعالَمينَ)... دەی کەســێ خوا ئاوا شاهیدی بۆبدات، دەبێ هەرســەردارو سەروەربێ. وە پێغەمبەرانی خوا شاهیدیان بۆداوە، حەزرەتی عیسی فەرمویەتی: (ومُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعدي اسْمُهُ أَحْمَد).

هەروەها ئامینە خاتوونی دایکی شاهیدی بۆداوەو فەرمویەتی: کاتێ محمد لەسکمابوو، هیچ پێوەی نارەحەت نەبووم. جیاواز لەهەموو ئافرەتێکی حامیلە. کەلەماوەی دووگیانی دا ئازاری زۆر دەبینێ، وەخاتوو (حەلیمەی سەعدیە)ی دایەنی شایەتی بۆ دەدات بەوەی کە: هیچ کات خۆی پیس نەدەکردو ورگی نەدەگرتو شەوان سەیری ئەستێرەکانی ئاسمانی دەکرد تاوەکو دەخەوت. وەلەکاتی لەدایك بونی دا (عَبْدُالمُطلّب) ی باپیری ناوی نا (محمد)، کاتێ پرسیاریان لێکرد: چۆنە ئەو ناوەی لێ دەنێ ی کەلەباوك وباپیرانتدا ناوی ئاواتان نیە؟! عَبْدُالمُطلّب ووتی: بۆیە ناوی دەنێم (محمد) بەئومێدی ئەوەم کەحەمدو سوپاسی بکرێ لەئەرزو ئاسماندا!! بەڕاستی فەڕاسەتەکەی پێکای وئاواتەکەی هاتەدی.. وەدواتریش کەباپیری مردو چوەلای مامەی (أَبُوطالب). ئەبوطالب منالی زۆری هەبوو، بەلاّم هیچ کامیان زاتی ئەومیان نەدەکرد کەبچن لەتەنیشتیەوە لەسەر ئەو دۆشەکەو ڕاخەرە دابنیشن کەوەکو ڕێزو حورمەت شوێنی تایبەتی خۆی بوو لەپەنای کەعبەدا بۆی دانرابوو! بەلاّم محمدی دەبردە تەنیشت خۆیەوەو دەیفەرموو: وادەبینم ئەم کوڕە، پیاوێکی گەلێ گەورەو ناوداری لێ دەردەچێ!.. وەپاشانیش خەدیجەی ژیرو دنیادیدەو دەوڵەمەند، تەنها حەزرەتی محمدی بەشایەنی هاوسەری خۆی زانی. لەکاتێکا چەندین گەورە پیاوی ناودارو بازرگان داوایان کردبوو. وەمێژوش بخوێننەوە، ئەبینن کەچۆن ناودارانی جیهان، شایەتی پایەبەرزی وبڵندی ئەو پێغەمبەری ئاخر زەمانە دەدەن. وەکو: (د.مایکل هارت، وە (بەرنادشۆ). یان (ماهتما غاندی).. وەچەندانی تر، کەبەشانازیەوە ناوی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) لەناو ژیاننامەی هەموو گەورە پیاوانو ناودارانو سیاسەتمەدارانی جیهاندا هەڵبژاردوە. وەشایەتیان بۆداوە، کەبەڕاستی (محمد) شایەنی ئەوەیە،

سەرداری سەرداران بێ، گەورەی ناو گەوران بێ. تاجی سەران بێ، ڕێنیشاندەری مرۆڤایەتی بێ.

ئیمانداران: خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە. ئەویش ئەوەیەکە: هەموو سەرکردەیەك لەجیهاندا، لەژیانی خێزانی دا. حەزدەکات، کەئەگەر کەمو کوڕی وئاژاوەیەك هەبێ لەماڵەکەیدا، بیشارێتەوەو پاشان ئەوانەی پێیان زانیوە، بیشارنەوەو دەنگوباسەکەی بڵاونەبێتەوە. یاخود لەناو ژیاننامەکەی دا ئاماژەی پێ ناکرێت.. بەڵام بەپێچەوانەوە، ژیاننامەی حەزرەتی (محمد) (ﷺ) بەپیتی گەورە نوسراوەتەوەو هیچ باس وبابەتێك نەماوە کەئاماژەی پێ نەکات.. لەم ڕێگەیەوە بەسەرکردەکانی فەرموو: سەرکردەی ڕاستەقینەو دڵسۆز دەبێ ژیانی ماڵو خێزانی لەشوێن کەوتوانی لەخوارتربێو نابێ خۆی تێرو تەسەلو ئەوان برسی بن. نابێ سەرکردە ماڵی میللەت بۆبەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکاربهێنێ.. ئەوەتا دەنگە دەنگێك لەناو ماڵی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پەیدادەبێت، ئەویش ئەوکاتەی کەخێزانە بەڕێزەکانی. کەدایکمانن، بەنەصی قورئان، خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دایکمانن. (وَأَزْواجُهُ أُمَّهاتُهُمْ).. ئەم خێزانە بەڕێزانەی دوای چەند ساڵ لەژیانی هەژارانەو مەمری ومەژی، کاتێ کەبینیان هەرزانی ڕوی لەمەدینە کردوە، وا دەسکەوتی جەنگ ڕژێندرایە (بَيْتُ المال)ەوەو حکومەتی مەدینە زێڕو زیوی زۆری هەیە، زۆرکەسی وادەوڵەمەند بوون کەلەوەوپێش هیچیان نەبووە. کەچی هێشتا لەماڵی ئەم خێزانانەی پێغەمبەردا (ﷺ) بەمانگ ئاگرناکرێتەوە بۆچێشت لێنان. بۆیە هەمویان کۆبونەوەو دەربارەی بژێوی کولەمەرگیو هەژارانەی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دوان وداوای گەشەپێدانی باری ژیانی ئابوری خۆیان دەکرد. بەڵام پێشنیازەکەیان لەلایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) پەسەند

نەکراو ڕەتکرایەوەو پێشنیازەکەیانی زۆر لەسەر دڵو دەرون گران بوو، پــێ ی ناڕەحەت بــوو. چونکە پێغەمبەری خــوا (ﷺ) هەرگیز بەوە ڕازی نەدەبوو، کەماڵی گشــتی موسڵمانان بۆبەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکاربێنــێ. وەخۆی وخێزان ومناڵــی ژیانیان خۆش بێ، بەڵام هەژارو نەدار هەبێ لەئوممەتەکەی وبرســی وکولەمەرگانە ژیان بەســەرببات، لەبەرئــەوە وویســتی بەکــردەوە بیســەلمێنێ، کەدڵســۆزی هــەژاران ونەدارانە، نەك هەربەقسەو دروشم. بۆیە ئەم پێشنیازەی خێزانەکانی ڕەت کردەوەو، تەنانــەت ئەوەندە بەم داواکاریە دڵتەنگ بوو، هێندەی لەسەرشان گران بوو. ماوەیەك لەماڵ دەرنەچوو، لەهاوەڵانی کەناگیربوو. خۆبەلگەنەویســتە دەرنەکەوتنی پێغەمبــەرو نەهاتنی بۆناو هاوەڵانی ئەوپەڕی کارەســات و ناخۆشی بوو. بۆیە هاوەڵانی هەرچەندە کردیان، خۆیان بۆڕانەگیراو وویستیان بچنە خزمەتی بۆ ماڵەوە، بەڵام ڕێگایان پــێ نەدرا. دواتر ڕێگادرا بەحەزرەتی أبوبکرو عومەر کەبچنە ژورەوە، کەهەردوکیان خەزوری بوون. هەروەکو لەوفەرمودەیەدا هاتوە کەئیمام ئەحمەدو موســلیم ونەسائی لەجابیرەوە ڕیوایەت دەکەن ودەفەرمون: ئەبوبەکــر هات بۆماڵــی پێغەمبەر (ﷺ) داوای چونــەژورەوەی کرد، ڕێــگای پــێ نەدرا، دوایــی عومەر هــات وداوای چونــەژورەوەی کرد، ڕێــگای پێ نەدرا، پاشــان ڕێگادرا هەردوکیان چونەژورەوە، ســەیریان کــرد واپێغەمبەر (ﷺ) دانیشــتوەو خێزانەکانــی دەوریان داوە، بەڵام پێغەمبــەری خوا (ﷺ) بێدەنگەو هیچ قســەناکات. حەزرەتی عومەر فەرموی: دەبێ قســە لەگەڵا پێغەمبەر (ﷺ) بکەم وبیهێنمە پێکەنین. ئەمجا عومەر فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەگەر کچی زەید (مەبەســتی خێزانی خۆیەتی) داوای نەفەقەم لێ بکات، منیش بکێشم بەلاملــی دا چی دەبێت؟! پێغەمبەر (ﷺ) دەســتی کــرد بەپێکەنین

تــا خرێکانی دەرکەوتن. واتە زۆرپێکەنــی.. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: خێزانەکانــم لەدەورمــدانو ئەوانیــش داوای نەفەقــەم لــێ دەکەن. حەزرەتی ئەبوبەکر هەســتا پەلاماری عائیشە بدات، عومەر هەستا لە (حەفصە) بدات. ووتیان: ئەوە داوای شتێك لەپێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، کەنیەتی بۆتان دابین بکات؟! ئالەم کاتەدا خوای گەورە ئەم دووئایەتی ســورەتی (الاحْزاب)ی ناردەخوارەوەو فەرموی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ۝ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾. الأحزاب: ٢٨ — ٢٩.

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەهاوســەرانت بلّــێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دونیاو ڕازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن باهەندێك شتومەك وپارەو ســامانتان پێ ببەخشم، لەوەودواش بەجوانترین شێوە دەستبەردارتان ببم. خۆئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەی وپاداشــتی ڕۆژی قیامەتتان دەوێت. ئەوە دلّنیابن کەخوا بۆچاکەکارانتان پاداشــتی زۆرگەورەو بێ ئەندازەی ئامادەکردووە.

کاتێ کەخوای گەورە ئەم دووئایەتەی لەبارەی (سەرپشك) کردنەوە، لەنێــوان مانەوەو تەلاّقدانــدا ناردەخوارەوە. پێغەمبــەری خوا (ﷺ) لەخاتوو (عائیشــە)وە دەســتی پێ کردو فەرموی: من شتێکت بۆباس دەکەم، حەزناکەم پەلەبکەی تێیدا، هەتا پرس بە دایك وباوکت دەکەی. خاتوو (عائیشــە) پرســی: چیــە؟! پێغەمبەری خــوا (ﷺ) هەردوو ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە کەباس لەسەرپشك کردن دەکات. خاتوو (عائیشە) فەرموی: ئایا لەهەلّبژاردنی تۆدا پرس بەدایك وباوکم بکەم؟! ئەوە شتێك نیـیە جێگای پرسو ڕابێ، بەلّکو من خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەلّدەبژێــرم. ئەوە شــتێك نیـیە من تــۆی دا دوودلّ بم. بەلاّم

داوام ئەوەیـــە، ئەم هەڵبژاردنەی مـــن بۆخێزانەکانی ترت نەگێڕیەوە.
پێغەمبـــەر (ﷺ) فەرموی: (إنَّ الله لَمْ يبْعَثْني معنتــاً ولامتعَنِّتاً، ولكِنْ بَعَثَني مُعَلِّماً مُيَسِّراً، لاتَسْأَلْني إمْرَأَةٌ مِنْهُنَّ عَمّا اخْتَرْت، إلاّ أَخْبَرْتُها)..

واتـــە: بێگومان پـــەروەردگار منـــی ڕەوانە نەکـــردوە بەتوندوتیژو خۆســـەپێنەر، بەڵکـــو منـــی ڕەوانەکـــردووە بەمامۆســـتاو ئاســـانکار، هەرئافرەتێك لەوخێزانانەم پرسیارم لێ بکا تۆ چیت هەڵبژاردووە، بێ سێو دوو پێ ی دەڵێم..

بەڵێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەك بەیەك لەگەڵ خێزانە بەڕێزەکانی دا، هەمان گفتوگۆی کردو سەرپشـــکی خســـتنە بەردەم لەنێوان ئەوەدا بەوژیانە زبرە ڕازی بنو لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بمێننەوە. یان ژیانی نازپەروەردەیی دونیا هەڵبژێرن ولەپێغەمبەر (ﷺ) جودابېنەوە، هەموو خێزانەکانـــی تێکـــڕا ووتیان: نەبەخوا ئیتر ئێمە شـــتێك لەپێغەمبەر (ﷺ) داواناکەیـــن کەنەیبێ. خوداو پێغەمبـــەری خودا هەڵدەبژێرینو ژیانـــی نازپەروەردەیـــی جیهانمان ناوێ. پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) بەم هەڵوێستەی خێزانەکانی زۆردڵخۆش بوو..

ئیمانـــداران: من ئەم پرســـیارە لەســـەرجەم مرۆڤایەتی دەکەم: ئایا ســـەرکردەی ئاوا دروســـتدەبێ ئامادەبـــێ، واز لەخێزانـــی خۆی بێنێ، لەهاوژینو هاوسەری خۆی جیاببێتەوە. بەڵام ئامادەنەبێ. پارەو پوڵی میللەتو حکومەت بۆ ژیانی خۆیو خێزانی بەکاربهێنێ. دەی بەڕاستی هەرئەو پێغەمبەرە شایانی ئەوەیە ڕابەرو سەرکردەو پێشەواو پێشەنگ بێ، بۆهەموو ســـەرکردەکان. کەئەوانەی تۆزێ ویژدانیان هەیە دەســـت پاك وبەڕەحمن لەگەڵ میللەتەکەیاندا. هەرلەو ســـەرچاوەی ڕەحمەتە، کەفەخری عالەمە، دەســـتیان کەوتوە، خوای پەروەردگار، ئێمە (محمد المصطفى)مان، قبوڵکردووە. بەپێغەمبەرو پێشـــەواو پێشـــەنگی دونیاو

**قیامەتمان. خوایەگیان تۆش لەڕۆژی قیامەتدا، لەشەفاعەتی بێ بەشمان نەکەی ولەســـەر حەوزی کەوســـەرەکەی بەخزمەتی بگەین وبەدەستی پیرۆزی ئاوی کەوسەر بخۆینەوە.**

آمین یارَبَّ العالَمین.

**سەرچاوەکان:**

١. تەفسیری ڕەوان، مەلامحمودی گەڵاڵەیی، بەرگی (١١) جزمی ٢١، ل٢٧٣.

٢. تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین.

٣. گوڵستانی ئیرەم لەوەصفی فەخری عالەم. عُثمان سەنگاوی ل٣٣١.

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسـلام على سـيدنا محمـد وعلى آله و صحبه أجمعين

**ئيمانداران: ئێمەی موسـڵمان سوپاسـی خوای پەروەردگار دەکەین. کەچەند ووتارێکه لەخزمەت پێغەمبەری پێشـەواداین (ﷺ) کەخوای گەوره ئەوەنده دڵی ڕادەگرێ کاتێك لەسورەتی** (عَبَس)**دا، لەباسی نابینا بەڕێـزو خاوەن قەدرەکەدا لای خوا، کەنـاوی** (عَبْدُالله ی کوڕی أُمُّ مَكْتُومَ) **بوو، کاتێ کەهاته خزمەت پێغەمبەری خواو فەرموی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ). ڕێنمایـی وڕێنمویـم بکە. لەوکاتەشـدا گەوره موشـریکەکانی مەککـە لـەلای پێغەمبـەر (ﷺ) دانیشـتبون وپێغەمبەریـش (ﷺ) قسـەی بۆدەکردن. پێغەمبەر (ﷺ) پشتی تێ کردو وەڵامی نەدایەوەو رووی گرژبوو. ڕوی کردە موشـریکەکانو قسـەی لەگـەڵ ئەوان کرد. ئالەوکاتەدا یەکسەر قورئان هاتەخوارەوەو فەرموی:** ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴾ عبـس: ١ - ٢ .. **واته: ڕووی گرژکردو ڕوی وەرگێڕا، لەبەرئەوەی نابیناکەهات بۆلای...). جاسـەرنج بدەن. خوای گەوره لەم هەڵوێستەدا کەشوێنی** (عیقاب) **وسەرزەنشته ئەوەنده دڵی پێغەمبەر (ﷺ) ڕادەگرێ. بە** (صیغەی ضەمیری غائب) **باسی دەکاو دەفەرموێ: ڕووی گرژکردو ڕووی وەرگێڕا. ئەمە زۆری فەرقه لەگەڵ ئەوەی بفەرموێ: ئەوە بۆچی ئەی محمد ڕووت گرژ کردو ڕووت وەرگێڕا!! بۆئەوەی دڵی خۆشەویستەکەی پێغەمبـەره ئازیزەکەی، عاجز نەبـێو غەمگین نەبێ ولەهەمان کاتدا هەڵەکەشی بۆڕاست بکاتەوە.**

**جائیمانداران: هەرلەخزمەت سورەتی** (عَبَس)**دا دەبین، دەبینین کاتێ عیتابەکە تـەواو دەبێ، ئەمجا ئایەتەکە دەگـۆڕێ بۆ** (صیغەی ضەمیری موخاطەب)**. وەکو دەفەرموێ:** ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴾ عبس: ٣. **واته: جاتۆ چوزانیـت بەڵکو ئەوهاتبێـت تادڵو دەرونی خاوێن بکاتەوە.. پاشـان هەرلەخزمەت ئەوسورەته گەورەو گرانبەهایەدا دەبین، دەبینین ئەمجا**

بەئاشكراتر گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەكات ودەفەرموێ: ﴿ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴾. عَبَس: ١٠.

واتە: كاتێ كەئەو نابینا لەخواترسە هاتۆتە لات (تۆ) گوێ بەونادەیت وخۆتی لێ بێئاگا دەكەیت؟!.. تەماشــاكەن، ئەمجا بەئاشكراتر ووشەی (أَنْــتَ) تۆ بەكاردێنێو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەئاگادێنێتەوە، كەئەمە ئەوپەڕی دڵڕاگرتنە، كەئەوەندە پەیوەندی نێوان، ئەم خالیقو بەندەو پێغەمبەرە بەهێزە، پەروەردگاری نایەوێ دڵی ئەم بەندەو پێغەمبەرەی یەكسەر بەووشەی (تۆ) ئاگاداربكاتەوە، چونكە ڕەنگە بەرگەنەگرێ! بۆیە هێواش هێواش ئاگاداری دەكاتەوە، كەبەڕاستی ئەمە قەدرو حورمەتو گەورەیی حەزرەتی محمد (ﷺ) دەردەخات لەلای خوای پەروەردگاری. كەئەمەش دەرسێكی هەرەگەورەیە بۆئێمە كەفێرمان دەكات ئاوا ڕێزی پێغەمبەری خوابگرینو ئاوا قەدرو حورمەت وگەورەیی بزانین.

بەڕێزان: یەكێ لەوشــتانەی كەئێمەی ئیماندار بەهۆی سەرقاڵیمان بەدونیــای ئەمــڕۆوە وای لــێ كردویــن لەیــادی بكەین، یــان كەمتر بیڵێین، یان وەكو پێشــینانمان نەبین بریتی یە لە (صلاوەتدان لەسەر پێغەمبەر) (ﷺ). كەخوای گەورە خۆی فەرمانی بەئیمانداران كردوە، كەصلاوەت لەپێغەمبەری خۆشەویستیان بدەن. وەكو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾ الأَحْزاب: ٥٦.

واتە: بەڕاســتی خواو فریستەكانی سڵاوەت دەدەن لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)، ئــەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێناوە، ئێوەش ســەلامو ســڵاواتی لەسەربدەنو بەردەوام یادی خێری بكەن..

ئیمانــداران: صڵاوەتــی خوا بۆ پێغەمبــەر (ﷺ) بریتی یە لەباس كردنــی پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەن خــواوە. بەچاكەو بەڕێزو حورمەتی

ئەوپێغەمبــەرە لــەلای خوا. بۆ فریشــتەکانی، تائەوانیــش بزانن ئەو پێغەمبــەری کۆتایە، کەخاتەمــی ئەنبیاو مورســەلینە چەند بەڕێزە لــەلای خوای پەروەردگار!.. صلاوەتدانی مەلائیکەت لەســەر پێغەمبەر (ﷺ) بەوەیە کەئەو فریشــتانە دوعادەکەن ودەڵێن: خوای گەورە پلەو پایەی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەت، بەردەوام هەرئاوا بەرزو بڵندبێ هەتا قیامەت، صلاوەتدانی ئێمەی ئوممەتیشی (خوایە بەئوممەتی ئەو پێغەمبەرەمــان قبوڵ بکەی) ئەوەیەکە: کاتــێ صلاوەتێك لێ دەدەین، ئەوە لەناخی دڵمانەوە دەڵێینو بەزمان دەری دەبڕین کە: خوایەگیان، ئــەی پەروەردگارمــان، ئەوپێغەمبــەرە (ﷺ) بەرزبکــەوە لەدنیــادا، بــەوەی بەردەوام ناوی بەرزو بڵندبێ، وەدینەکەی هەرلەگەشــەکردنو بڵاوبونــەوەی زیاتردابێ، وەعەمەل بکرێ بەشــەریعەتەکەیو یاســاو ڕێسای ژیانی موسڵمانان بێ، وەلەقیامەتیشدا بیکەی بەشەفاعەتخوازمان وبەرشــەفاعەتی ئەوپێغەمبەرەمــان بخــەی. ئــەی پەروەردگارمــان، پلەوپایەی ئەو (محمد)ە، پێش بخەی بەسەر پلەوپایەی هەموو نزیکان ودۆستانتدا.

بەڕێزان: هەندێ لەزانایان دەفەرمون: صەلاتو ســەلام ســێ مانای هەیە: (صَلاة) بەمانای:

١. خۆشەویستی دێ، واتە: کاتێ تۆ صلاوەت لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەدەی. ئەوە مانای ئەوەیە کەدەڵێ ی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من تۆم خۆش دەوێت. تۆ خۆشەویستتری لەلام لەهەموو خۆشەویستانم.

٢. مەدحی بکەی، بەوەی کەهەرچیت بیستووە لەفەرمودەو ڕەفتارو هەڵســوکەوتی ئــەو پێغەمبەرە (ﷺ) لەخۆتدا بەکــردارو گوفتار جێ بەجێ ی بکەی وبەخەڵکیشی بگەیەنی. بەپێ ی ئاستی زانستو توانای خۆت. (بلغوا عني ولو آية). هەمووکەس دەگرێتەوە.

٣. دوعای بۆبکەی. کەخوای گەورە، ناوی وپەیام وڕێبازەکەی بەردەوام بەرزو بڵند بکات.

مانای (سەلام)یش، سێ شت دەگرێتەوە:

١. ئەبێ یەقینت هەبـێ کەحەزرەتی محمد (ﷺ) لەهەموو عەیبێ دوورە، هەموو کەماڵاتێکی بەشەری تێدایەو خوای گەورە پاراستویەتی لەهەموو نوقصانی وکەم وکورتیەك.

٢. بەمانـای (محمـد) (ﷺ) بپارێـزن، لەدەمی ناحەزانی ئیسـلام ودەمکوتیان بکەن.

٣. شوێنی بکەونو کار بەفەرمودەکانی بکەن وپێ بەپێ ی هەنگاوەکانی بڕۆن.

جالێرەوە دەگەینە، ئەوڕاستی یەکە: ئەگەر کەسێ (صلاوەتی) لەسەر پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئەوە بەڕاسـتی پێویستە ئەم مانای صلاوەتە باش لەدڵو دەرونی دا ئامادەبکاتو بیکاتە بەرنامەی کارو ژیانی، وەجار بۆجار کەصلاوەتەکەی زیاتر کرد. ئەم بیروباوەڕەشی لەگەڵ پێغەمبەری خـوادا (ﷺ) نوێتربکاتەوە، وەبەکردەوە لەژیانی ڕۆژانەیدا لەخزمەت پێغەمبـەری خوادابێت (ﷺ). نەك خوانەکردە، بەتەسـبێح صلاوەت لێدا، بەلام لەخزمەت ئەوکەسـانەدابێ، کەدژی پێغەمبەرن. کەهەوڵی لەناوبردن ولابردنی شـەریعەتی ئەومحمدە دەدەن: چونکە بەداخەوە هەنـدێ کەس (هەندێ جار بەبێ ئاگایی) دەبنە داردەسـتی دوژمنانی پێغەمبەر (ﷺ) کەچی بەتەسبێحیش صلاوەتی لەسەردەدەن!!

جاهەرکەسـێ بەوشـێوەیەی کەباسـمان کـرد، صـلاوەت لەسـەر پێغەمبەر (ﷺ) بدات، ئەوە پاداشـتێکی زۆرگەورەی دەست دەکەوێت.. لەفەرمودەیەکدا هاتـوە کەفەرمویەتی (ﷺ) (مَنْ صَلَّي عَلَى واحِدَةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْراً) رَواهُ مُسْلِم، وصَحَّحهُ الألْباني في صَحيح الجامِع: **(٦٢٣٤)**.

واتە: هەرکەســێ صڵاوەتێکم لەســەر لێ بدات، خــوای گەورە (دە) صڵاوەت لەســەر ئەوکەسە دەدات، بەومانایەی (واللهُ أعْلم) خوای گەورە دەجار ناوی ئەو کەســە لای فریشــتەکانی نیشــان دەدات. بۆ خوا زۆر ئاســانتر، لەئاســانە، کەهەموو فریشتەیەك شاشــەیەکی کۆمپیوتەری لەبەردەمابێ وهەرکاتێ کەسـێك لەئوممەتی محمد (ﷺ) صڵاوەتێکی لەسەر ئەو خۆشەویستەدا، لەلای دەفریشتە ناوی لەڕیزی ئەوکەسانەدا نیشــان بدرێ، کەخوا خۆشــی دەون وڕێزیان لێ دەگــرێ. دەی ئەگەر کردت بەدوو صڵاوەت، لای (٢٠) فریشتە خوا ناوت تۆمار بکات لەڕیزی چاکەکاران وخۆشەویستانی خوادا، بێگومان هەرکەسیش خوا خۆشی بوێ، هەموو فریشتەکان خۆشیان دەوێ وپاشانیش خۆشەویستی دەکەوێتە ناو دڵی هەموو ئیمانداڕانی ڕاســتەقینەوە، لەوانەی کەدەیناسن یان کتوپڕ چاویان پێی دەکەوێ. کەچی بەدەســت خۆیان نی یە خۆشــیان دەوێ. کەنیشــانەی ئەومیە (إنْشاءالله) خوا خۆشــی دەوێ. وەلەفەرمودەیەکی تــردا خۆشەویســتمان (ﷺ) موژدەمان دەداتێ ودەفەرمــوێ: (مَنْ صَلَّي عَــلَيَّ واحِدَةً، صَلَّي اللــهُ عَلَيْهِ عَشْر صَلَوات، وحَطَّ عَنْهُ عَشْر خَطيئات، ورفِعَ لَهُ عَشْر دَرَجات). رَواهُ البُخاري وأَحمد، (٨٨٤٠) وصَحَّحهُ الألْباني في صَحيح الجامِع: (٦٢٣٥).

واتە: هەرکەســێ صڵاوەتێکم لەســەر لێ بدات، خــوای گەورە (١٠) صڵاوەتــی لەســەردەدات، (١٠) ڕەحمەتی خوای بەســەردا دەبارێت. وە (١٠) گوناهــی لەکۆڵ دەبێتەوە. وە (١٠) پلــە بەرزدەبێتەوە! الله أكبر، لەوخۆشــیو بەرەکەتە، کەبەڕاســتی لوتفـو ڕەحمی خوایە لەگەڵمان. کەئــەو ڕەحمەتەی پێ بەخشــیوینو بەوصــڵاوەت لێدانە ئاوا ئەجرو پاداشتمان دەست دەکەوێت.

ئیمانــداران: زۆرصــڵاوەت لەســەر پێغەمبەری خــوا (ﷺ) بدەن، بەتایبــەت زۆر ئاگاداری شــەوو ڕۆژی (هەینی) بــن، کەمەهێڵن بەبێ

صلاوەت دان بەسەرتاندا تێ بپەڕێ، چونکە ئەمە وەصیەت وئامۆژگاری پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بۆمان، کەفەرموی: (أَكْثِرُوا الصَّلاةَ عَلَيَّ يَوْمَ الجُمُعَةِ ولَيْلَـةَ الجُمُعَةِ، فَمَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْراً). رَواهُ البَيْهَقي وحَسَّـنَهُ الألْباني في صَحيح الجامِع: (١٢٢٠).

واتە: زۆرصلاوەتم لەسەر لێبدەن لەڕۆژی هەینی وشەوی هەینی دا، چونکە هەرکەسـێ صلاوەتێکم لەسەرلێبدات، خوای گەورە دەصلاواتی لەسەر دەدات.

ئیمانداران: صلاوەت دان لەسـەر حەزرەتی فەخری عالەم ئەوەندە گەورەیە، کەخوای گەورە لەچەند شوێن لەعیبادەتەکاندا واجبی کردوە کەدەبێ صلاوەت لێبدرێ، ئەینا ئەو فەرزە جێ بەجێ نابێتو بەتاڵە، وەکو:

١. لەتەحیاتـی دوەمـی نوێژدا، لەونوێژانـەی دووتەحیاتی تێدایەو لەتەحیاتی نوێژی دووڕکاتیشـدا. ئەگەر هەرچی ڕوکن وواجبی نوێژە، هەمویت تەواوو بێ کەم وکوڕی بێ، تەنهاو تەنها صلاوەتەکەت لێنەدابێ، ئەوە نوێژەکەت دروست نی یەو بەتاڵە!!

٢. لەووتاری ڕۆژی جومعەدا (لەووتاری عەرەبی دا) واجبە صلاوەت لێبـدرێ، ئەینا ئـەو خوطبەیە، چەند بەهێـزو بەپێزبێت لای خوای گەورە قبوڵ ناکرێت.

٣. لەنوێـژی مـردودا: کەنوێـژی مردوو فـەڕزی کیفایەیەو واجبە کاتێ کەسـێك مرد کەسێك یان کەسانێك بەجەماعەت نوێژی مردووی لەسـەربکەن. ئەگەر کەس ئەو نوێژەی نەکرد، هەموو دانیشتوانی ئەو شوێنە گوناهبارن! جائەم نوێژی مردووە، یەکێ لەپایەکانی ئەوەیەکە: صلاوەتی تێدا لێبدرێ لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەینا قبوڵ نابێ!!

٤. کاتێ دووعا دەکەیو لەخوا دەپاڕێیتەوە، پێویستە ڕاستەوخۆ نەچیە

ناودوعاکردنەوە، بەڵکو حەمدو سوپاسو ستایشی خوای پەروەردگار بکەی بە (الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالمين) وەدوای ئەوە، صلاوەت لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لێبدەی، ئەمجا دوعابکەیو داواکاریو موحتاجیەکانت پێشکەش بەبارەگای خوای پەروەردگار بکەی! چونکە هەرپاڕانەوەیەك بەحەمدو سەنای خواو صلاوەت دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) نەکرێ، بەرزنابێتەوە بۆلای خوا. وەصلاوەت لێدان، وەکو کلیلی دەرگا وایەو دەرگاکەت بۆدەکاتەوە، ئەمجا دەتوانی بچیتە ژورەوە.. لەیەکێ لەبەسەرهاتەکاندا کەلەپیاوچاکانەوە گێڕدراوەتەوە، ئەوەیەکە: پیاوێکی صاڵحو دیندارو خواناسی بەحەق هەبوو، کەدڵی پڕبوو لەخۆشەویستی خواو پێغەمبەر (ﷺ) ئەم پیاوە بەکەسابەتو ڕەنجی شانی خۆی دەژیا، لەسەر کارو کەسابەتەکەی، وەلەکاتی خەوتنو بێداریدا زۆر صلاوەتی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەدا، زمانی پاراو بوو بەناوی حەزرەتی محمد (ﷺ). بەیانیەکیان کەلەخەو هەڵدەستێ ماڵو منالی ئەچنە ئەوژورەی کەئەو لێ ی خەوتوە، سەیردەکەن بۆنێکی زۆر سەرنج ڕاکێش لەوژورە دێت، کەهەرگیز عەتری وا بۆن خۆشیان لەماڵدا نەبوەو بۆنی واخۆشیان نەچوە بەلوتدا.. هەربۆیە منالو خێزانی دەچن بەلایەوەو سەیردەکەن خۆشی هەمان ئەو بۆنە خۆشەی لێدێت. لێ ی دەپرسن: ئەم عەترەت لەکوێ بوو؟! ئەم بۆنە خۆشە لەچ دوکانێك هەیە؟! باشە بۆچی بەشی ئێمەشت نەداوە؟! پیاوچاکەکەش دەفەرموێ: بڕوابکەن، نەهیچ عەترێکم بەخۆم کردوە، نەهیچ عەترێکم کڕیوەو دەستم لێداوە! ئەوانیش دەڵێن: ئەوە تۆ دەڵێ ی چی؟! ئەم بۆنە خۆشە هەمووومانی سەرسام کردوە کەچی تۆ دەتەوێ لێمان بشاریتەوە! هەرچی ئەم پیاوباشە هەوڵدەدات سودی نابێ ژنو منالو پاشان ئەهلی مزگەوت وناسیاوو خزم وازی لێ ناهێنن وداوای ئەم عەترە بۆن خۆشەی لێ دەکەن، بەلام ئەو هەرنکوڵی لێ دەکاو سەرەنجام

ناچار دەبێ کەڕاستیەکەیان بۆباس بکات، کەزۆر هەوڵی دەدا خۆی لەباس کردنی بپارێزێ. بۆئەوەی ئەمە نهێنی یەك بێت لەنێوان خۆیو پێشەواو چاوساغو نوری چاوەکەیدا. کەفەخری عالەم حەزرەتی محمدە (ﷺ)، بەڵام ناچاردەبێ کەبۆیان بگێڕێتەوە، کەئەو شەوەی کەبۆبەیانیەکەی ئەو بۆنە خۆشــە بەژورەکەداو بەدەم وچاوو لاشەی ئەوەوە بڵاوبۆوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتۆتە خەوی وفەرمویەتی: فلأن کەس تۆ خۆشەویستی منی. چونکە زۆر صلأوەتم لەســەر لێدەدەی، بێنە باناو دەمت ماچ بکەم. ئەو دەمو زمانەی کەبەفەرمانی خوا، منت خۆشــدەوێو صلأوەتم بۆدەنێری!! ئەم پیاوە باشــەش دەفەرموێ: ئەوەندە شەرمو ئەدەبم دەکرد لەخزمەت پێغەمبــەری خوادا (ﷺ)، نەمدەتوانی دەمم بــەرم بۆ دەمی موبارەکی. چونکە دەمی خۆم بەشایانی ئەوە نەدەزانی، کەئەو زاتە ماچی بکات، شەرم دایگرتمو رومەتم بردە بەردەمیو خۆشەویستی خوا (ﷺ) ڕومەتی ماچ کردم. لەخۆشــیاندا، کەئەو جەستە پڕبەرەکەتەی، ئەو دەمە موبارەکەی بەرلاشــەم کــەوتو هەمــوو گیانم موچڕکــەی شــادمانی وبەختەوەری پێداهاتو لەخۆشیان خەبەرم بۆوە، ئیتر ئەو بۆنە خۆشە بەناو ژورەکەو سەرڕومەتمو لاشەمدا بڵاوبۆوە، بەڵام بەخوا حەزم نەدەکرد باسی بکەم. ئەگەر ئێوە ناچارتان نەکردمایە، وەتکام وایە ئێوەش هەرئەو کارە بکەن کەمنــی کرد بەخۆشەویســتی پێغەمبەری خــوا (ﷺ) ئەویش ئەوەیە: زۆر صــڵاوەت لەدیداری ئەو ســەروەرو ســالارە بــدەن! چونکە من هیچ کردەوەیەکــی تر شــك نابەم کەشــایانی باس بێ، غەیــری صلأوەت دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ). ئەوانەی ئەو باسەمان بۆ دەگێڕنەوە دەفەرمون: ماوەی (٨) ڕۆژ ئەو بۆنە لەوژورەو لەڕومەتو لاشــەی ئەو پیاوە بەڕێزە نەبڕا.. دەی ئیماندارانی بەڕێز: وەرن بائێمەش ئاوا زمانمان پاراو بکەین بەصلأوەت لێدان لەدیداری سەرداری مرۆڤایەتی حەزرەتی محمد (ﷺ)،

بەئومێـــدی ئەوەی لەژیانی دنیاماندا بەخەون ولەقیامەتیشـــدا بەلاشـــە بەخزمەتی بگەینو دەســـتی پیرۆزی ماچ بکەینو لەو هەموو ڕەحمەتو نورو بەرەکەتە بەهرەمەندبین، بەویستی خوا.

بەڕێزان: زانایانو ئەدیبان و شـــاعیران لەهەموو گەل ونەتەوەیەك، هەوڵیـــان داوە کەخۆیـــان بۆنخۆش بکەن بەوەی کەلەمەدح وستایشـــی پێغەمبەری خۆشەویســـتدا، بەشعرو پەخشانو بەووتەی ڕازاوەو جوان. بەشـــداری باســـی حەزرەت بکەین. ســـوپاس بۆ خوا میللەتی ئێمەش، زانایـــان ودانایانی ئێمەش. شـــاعیرو ئەدیبەکانـــی میللەتی کوردیش! ئەگەر لەمیللەتانی تر لەپێش تر نەبن. لەدواترنین.

ئەوەتا (مەحوی) دەفەرموێ:

هەتا بولبول لەسەر گوڵ، نەغمە خوان ونالە سەنجانە.

بڵێن ئینسو مەلەك، پڕبەم زەمینو ئاسمانە.

(وصَلَّى الله) على ئەو بەحری نوری عیلمو عیرفانە.

کەدەرکی غەوری ناکا، (غَيْر عِلْمِ اللهِ) سُبْحانَهُ..

ئەوەتا (بێخودی) شاعیریش دەفەرموێ:

هەتا تەجەلی خوا لەعەلەما بکا ظهور.

بەئاگری گوڵی چەمەن، چیا ببێتە کێوی طـــــــــــور

فریشتەو ئادەمی دەڵێن، هەتا ئەبەد لەخـــــــوارو ژوور

صەلاتی حەق لەسەر شەهێ کەشەق ئەکا قەمـەر لەدوور

سەلامی حەق لەسەر مەهێ، کەئەسپی خۆر لەغار دەکات

ئیماندارانی بەڕێز: کەباســـی (بێخود)ی شاعیرمان کرد. پێم خۆشە ئـــەم بەســـەرهاتە شیرینەشـــی بگێڕینەوە. کەبەڵگەیە لەســـەر ئەوەی پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) ئـــاگادارە بەحاڵی ئوممەتەکـــەی. دەفەرمون باگوێ بۆبگرین: مامۆستا مەلا محمودی بێخود دەفەرموێ: شەوێکیان

لەخۆشەویستی ســەرداری مرۆڤایەتی دەستم کردە دانان ونوسینەوەی قەصیدەیەك کەبۆئەو زاتە دەریای مەحەبەتی شەپۆل دەدات لەناخمدا، زۆرم ووشەی جوانو پڕواتام بەدوای یەکدا ڕیزکرد، بەڵام ماندوبونو کەم کەرەســەیی وسەریەشە نەیهێشــت قەصیدەکە بێنمەپایان، هەروا بەقامیشو مەرەکەب وکاغەزەوە خستمەژور سەرمو نوستم، بۆیە بەیانی چومەســەر حەوزێ بۆگرتنی دەســت نوێژ، بەڕەحمەت بێت مامۆستا (عَبْدُالله)لەژوور ســەرمەوە وەستاو فەرموی: بێخود.. پێم بڵێ ئەمشەو چیت کرد. چ کارێکت ئەنجامداوە زۆر خێربووبێ؟! منیش سەرم هێناو سەرم برد، هیچم شك نەدەبرد کەشایستەی وەڵامەکەی بەڕێزیان بێت. بۆیە لەوەڵامیا عەرزم کرد: قوربان هیچ کارێکم نەکردوە، بۆ دەپرسی؟! بەڕێزیــان دوبارەی کردەوە: باش بیربکــەرەوە بزانە چکارێکت کردوە زۆر خێربووە، ئەوکاتە بیرم لەقەصیدەکە کردەوەو ووتم: قوربان ئەم شــەو قەصیدەیەکم لەخۆشەویستی ڕەسولی نازدار دانا. قسەکەم تەواو نەکرد بەڕێزیان فەرمویان: بەڵام قەصیدەکەت تەواو نەکرد، وانییە؟! ســەرم ســوڕما. ئەم چۆن ئەزانــێ؟! ئەمە تەنها نهێنــی خۆمو خوای گەورەیە. بەڵێ بەڕاســتو دروســتی ووتم: قوربان سەرم ژانی دەکرد، هیلاك وشــەکەت. نەمتوانی کۆتایی پێ بهێنم.، فەرموی: تەواوە! ئەمە ناوەڕۆکــی خەوەکەیە. پاشــان بەڕێزیان وتیان: ئەمشــەو لەخەوما تۆ ئەی بێخود لەچۆڵەوانیەکدا وەستابوی وردە وردە هەنگاوت دەنا بەرەو کەســێك. ئەویش وردە وردە هەنگاوی دەنا بــەرەو تۆ، کەنزیك بۆوە، بەنوری جەمالیو هەیئەتو هەیبەت زانیم ئەمە (رَسُــولُ الله) یە، زۆر لەیەکتــر نزیك بونەوە. هەرئەوەندەی مابوو دەســت بکەنە ملی یەك. بەڵام تۆ وەســتایتو ئەویش وەستا. هەنگاوەکان کۆتاییان هات ومنیش خۆزگەم دەخواســت بگەنــە ئامێزی یەکتر، بەڵام ئــەو لەئامێزگرتنە

دروست نەبوو. خەبەرم بۆوە!.. ئای بێخود خۆزگە قەصیدەکەت تەواو دەکرد. ئەوسا لەخەونەکەمدا لەئامێزی خۆشەویستی خۆشەویسترین کەسی سەرزەویدا ئەمبینیتەوە... خەوەکەی ڕای چڵەکاندم. بۆیە دوای نوێژی بەیانی دانیشتم قەصیدەکەم تەواوکرد. ئێستا ئەو موناجاتو قەصیدەیە زیاتر لە (٦) لاپەڕەی دیوانەکەی گرتۆتەوە!! بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز، ئاوا خوای گەورە ڕێزی لەپێغەمبەرەکەی گرتوەو بەویستی خوا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگادارە بەکاری جوانی ئوممەتەکەیو لەدوای مردنیشی پێ ی شادمان ئەبێ. جائێمەی میللەتی کوردی دیندارو عاشقو شەیدا بەپێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئاوا لەخزمەت پێغەمبەردا بوینو بائاگاداربین، ئەو پەیوەندی یە بەهێزە نەشێوێنین، ئێمەی کورد بەئیسلامەوە بونو مانمان هەیەو دەمێنێ، دەبا بیپارێزین.

شاعیر بەحەق فەرمویەتی:

فَتَأريخُنا مِنْ رَسُولِ اللهِ مَبْدَأُهُ
فَما عَــــداهُ فَلا عِزٌّ ولا شَأْنُ

خوای پەروەردگار لێت دەپاڕێینەوە، خۆشەویستی ئەو خۆشەویستەت زیاتر بکە لەدڵو دەرونمان داو لەسەر ڕێبازەکەی دامەزراومان بکەو بەرشەفاعەتی ئەو خۆشەویستەمان بخەو لەبەهەشتدا لەخزمەتی دا کۆمان بکەوە. اللّهُمَّ آمين.

سەرچاوەکان:

١. مَعَ الأَنبياء في القُرْآن الكريم. عفيف عبدالفَتاح طَبّارَة.
٢. کۆباسەکانی میحراب. م.شەماڵ موفتی.
٣. بەخۆداچونەوەیەك لەخۆشەویستی پێغەمبەردا (ﷺ)، ئەندازیار عُثمان ل٤٥.
٤. ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم. ئاوات أبوبكر أَحمد، ب٣، ل١٦١.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّـدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: بەبۆنەی هاتنەوەی وەرزی دڵگیرو ڕەنگینی بەهارەوە، کەلەکوردستانی ئازیزماندا، بەفەزڵو کەرەمی خوا بەهەشتێکی بچکۆلانە دەبینین لەوەرزی بەهاردا، پێم باش بوو کەهەندێ لەسەر وەرزی بەهار بدوێین. وەلای هەموان ئاشکرایە، کەوەرزی بەهار بەیەکەم ڕۆژی مانگی نەورۆز دەست پێ دەکات. بۆیە پێویستە لەبارەی (نەورۆز) یشەوە، شارەزایی وبەرچاوڕوونی زیاترمان هەبێت... نەورۆز سەرباری ئەوەی ناوی جەژنێکی نەتەوەیی کوردە، لەهەمانکاتدا یەکەمین مانگی وەرزی بەهاری ساڵنامەی کوردیشە. کە (٣١) ڕۆژە، لەڕوی زمانەوانیشەوە لە (دوو) ووشەی (کوردی - ئێرانی) وەرگیراوە، (نو) بەمانای (نوێ)و (رۆز) بەمانای (ڕۆژ)ە، کەبەسەریەکەوە واتای (ڕۆژی نوێ)ی گەیاندوە. هەمان زاراوە لەفەرهەنگی زمانی فارسیشدا بەهەمان واتا دێت. بۆیە پێناچێت خودی زاراوەکە لەبنەڕەتدا نەکوردی ونەفارسی بێت، بەڵکو زاراوەیەکی ئێرانی کۆنەو چووەتە ناو هەردوو زمانی فارسی وکوردی یەوە، چونکە هەمان زاراوە، وەك جەژنێکی نیشتمانی لای فارسەکان ونەتەوەیی لای کوردەکان ناسراوە، تەنانەت لای گەلانی تاجیكو ئەفغان وبەلوچ وئازەریش ناسراوە.. هەروەها بەهەڵەشدا ناچین گەربڵێین: واتای نەورۆز، کەڕۆژی نوێ یە. بەوپێیەشی (جەژنەکە) دەکەوێتە یەکەمین ڕۆژی ساڵێکی نوێ وە. مانگەکەش یەکەمین مانگی ساڵە، کە (نەورۆز)ە، وەرزەکەش یەکەمینو دڵفرێنترین وەرزی ساڵە. کەسەردەمانێکە ناوی (بەهار)ە. لێرەوەش ئەو زاراوەیە واتای یەکەمین ڕۆژوو مانگ وساڵێکی نوێ ی بەخۆوەگرتوە. بەوپێیەشی پێگەی خاکی کوردستان لەسەر ڕووی زەوی کەوتۆتە بەشی نیوگۆی باکورو بەری خۆرهەڵاتی ئەو نیوگۆییە، بۆیە خاك ودانیشتوانەکەی لەلایەك (باکوری) واتە (چیایی) ولەلایەکی**

دیکەوە بە(خۆرهەڵاتی) ناسراون. بەم پێگەیەش یەکەمین گۆڕانکاری دەرکەوتنی ڕۆژی نوێ لەساڵدا کەوتووەتە (١ی نەورۆز) کەلەساڵنامەی زایینیدا بەر (٢١)ی ئازار، کەوتووە. ئەم ڕوداوەش لەڕوانگەی زانستی جوگرافیاوە گۆڕانکاریەکی لەگەڵ خۆی هێناوە. کاتێکیش دەچینە ناو قوڵایی ڕوداوەکانی مێژووەوە دەگەینە ئەوەی کەئەم جەژنە تەنیا تایبەت نەبووە بە(کورد)، بەڵکو بەشێکی گەل ونەتەوە جیاجیاکانی سەرڕووی زەوی بەگشتیو گەلو نەتەوەکانی بەری خۆرهەڵاتی نیوگۆی باکوری زەوی بەتایبەتی یادی ئەم (جەژنە)یان ساڵانە کردۆتەوەو دەکەنەوە، تەنانەت بەجەژن وبۆنەیەکی خۆیان زانیوەو دەیزانن، لەم پێودانگەشەوە (سۆمەرییەکان) وەك یەکێك لەکۆنترین کۆمەڵانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ومیسۆپۆتامیا بەر لە(چوار هەزار) ساڵ یادی ئەم (جەژنە)یان کردۆتەوە. جەژنەکەشیان بەڕۆژی دارو درەختو سەوزایی وداباڕینی بەخشندەیی خودا لەئاسمانەوە بۆبەندەکانی لەسەر زەوی زانیووەو ئەو ڕۆژەشیان خسووەتە یەکەم ڕۆژی مانگی تەمووزەوە... بۆ (کورد) یش، کەوەك نەتەوەیەکی خۆرهەڵاتی لەباشوری خۆرئاوای کیشوەری ئاسیا، (دەوڵەتی ماد) بەکۆنترین ئاماژە بۆسەرەتایی دەرکەوتنی جەژنی نەورۆز دادەنرێت. ئەوەش بەوەی ئەو دەوڵەتە بەنزیکترین دەوڵەت دادەنرێت لەمێژوی کۆندا. کە(ڕەگەزی کورد) ی تێدا دەرکەوتبێت ولەدەرکەوتنی ساڵنامەی کوردیەوە نزیك بێت. ئەمەو مێژوونوسی ئەرمەنی (موساخورناتیس) پێی وا بووە (زوحاك)ی ئەفسانەکەی جەژنی نەورۆزی کورد، هەمان (ئەستیاگز)ی دوایەمین پاشای مادەکان بوە، بۆیە لای ئەویش باشتر بووە، کەمێژوی جەژنەکە بۆ (دەوڵەتی ماد) بگەڕێتەوە، نەوەك بۆئەفسانەیەکی دروستکراوی بێ بنەما.. بەدەریش لەوانە ساڵنامەی کوردی لەژێر هەردەقو

سیاسەت وبارودۆخێکدا دانرابێت، ڕێچکەی مێژویی خۆی گرتوەو وەك ساڵنامەیەکی تایبەت بەکورد سەلمێنراوە. تاکە مێژویەکیش بەو ساڵنامەیەوە بەسترابێتەوە، (دامەزراندنی دەوڵەتی ماد)ە، لەسەدەی هەشتەمی پێش زایین. بۆیە گومانی تێدا نییە کەنەورۆز وەك جەژن وبۆنەیەکی نەتەوایەتی بۆ کورد بۆ یادی دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە دەگەڕێتەوە.. کەواتە: باشترە لێرە بەدوا هەمومان وەك کوردو لەسەرتاسەری کوردستان نەورۆز وەك یادی دامەزراندنی (دەوڵەتی ماد) بکەینەوە، نەوەك بیبەستین بەئەفسانەیەکی هەڵبەستراوی وەك کاوەی ئاسنگەرو زوحاکی ستەمکار. چونکە ئەو ئەفسانەیە نەهیچیان لەبارودۆخی ئێمەی کورد گۆڕیوە، نەلێی دەگۆڕن. بەڵکو تەنیا ئەوە نەبێت کەساڵانە بەیادی کاوەی ئاسنگەرو زوحاکی ستەمکارەوە، لاوو خوێن گەرمەکانی کوردیان ڕاپێچی زیندانە تاریکەکانی دوژمنان بەکورد کردوە!.. لەڕوی مێژوویشەوە، ناوی (زوحاك) بەناوی کەسانی جیاواز لای مێژوونوسان هاتووە، لەم بارەوە. (ئەبوحەنیفەی دینەوەری) کەسایەتی زوحاکی بەبرازای (شەدید کوڕی عیملاق کوڕی عاد کوڕی ئارم کوڕی سام) داناوە. ئیبن کەسیریش زوحاکی بەبرای فیرعەونی میسر زانیوەو پێی وابووە ناوی تەواوی (سفانی کوڕی عەلوان کوڕی عویج کوڕی عیملاقە). لەشانامەی شاکاری (فیردۆسی) شاعیری گەورەی ئێرانیدا باس لەتاج لەسەرنانی جەمشید کراوەو ئاماژەی بەوەداوە کەزوحاك وەك پاشایەك بەوە ڕازی نەبووە، بۆیە نامەیەکی بۆنوسیوە، بەڵام لەڕاستی دا ئەمە وانییە. بەڵکو ئەو نامەیە نامەی ئەردەوانی پێنجەمی پادشای ئەشکانییە بۆ ئەردەشێری کوڕی بابەکان کوڕی ساسانی دامەزرێنەری ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی. لەسەرچاوە عەرەبی وئیسلامیەکانیشدا، زاراوەی زووحاك لەگەڵ دەرکەوتنی سوپای عەرەبی

ئیسلامی بۆناوچەکانی دەرەوەی نیوە دورگەی عەرەبی‌و بەتایبەت بۆ بەری خۆرهەڵاتو باکوری خۆرهەڵات بەکوردستانیشەوە دەرکەوت. دیاترین ناوەکانیش ئەمانە بوون:

زوحاك کوڕی قەیس کوڕی سەعلەبە، زوحاك کوڕی قەیس کوڕی موعاویەی تەمیمی، زوحاك کوڕی قەیس، زوحاك کوڕی موخەلەد کوڕی موسلیم... کەواتە: بالێرە بەدوا ئەوبۆنە نەتەوایەتییەمان نەکەینە قوربانی ئەفسانەیەکی بێ بنەما. کەلەلایەن دوژمنانی کوردەوە تۆمارکراوە. باچیتر دوژمنانی کورد پێمان نەڵێن: جەژنێکیان هەیەو نازانن سەرو بنی کامەیە!..

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: ئێمە کەلە (٣/٢١) دا دەچینە وەرزی بەهارەوە، بەڕاستی بۆمرۆڤی موسڵمان گەلێ دەرس ووانەی گەورە لەبەهار وەردەگیرێ، وەکو:

١. وەرزی بەهار نمونەیەکی بچوکی بەهەشتە، چونکە بەهەشت، نە گەرمایە، نە سەرمایە. دڵو دەرون بەردەوام تێیدا کراوەو گەشەو چاو بەبینینی دیمەنەکانی ڕۆشندەبێتەوە. بەڵێ، بەهار ئەو وەرزە دڵگیرو ڕەنگین‌و کەمەند کێشەیە، کەوای لەمامۆستا (سەعیدی نورسی) کرد، لەو وەرزەدا، (پەیامی بەهەشت) بنوسێت..

٢. بەهار وەرزی زیکرو تێڕامان‌و تێفکرینە لەدروستکراوەکانی خوا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ ﴾ ال عمران: ٢٩١.

بەڵێ بەهار هەموی جێگای سەرنج دان‌و بیرکردنەوەیە، جێگای لێوردبونەوەیە، وەکو: ڕۆژی درێژ، شەوی کورت. خۆ ئەگەر لەبەهاردا ئاوا ڕۆژ درێژ نەبوایە، تیشکی خۆر ئاوا کاریگەری نەدەبوو. بۆئەوەی

ناوا گژوگیا بڕوێ وگەشە بکاو بەفری کوێستانەکان بتوێنەوە. هەوای نەرم، کەبەهۆی ئەوشێوە لێدانەی تیشکی خۆر لەزەوی ئەو هەوا نەرمو خۆشە دروست دەبێ، کەنەساردێکی بێزارکەرە، نەگەرمێکی پڕوکێنەرە، خۆئەگەر ئاوو هەوا بەوشێوەیە نەبوایە. ئەوا چڵە گیایەك شین نەدەبوو. بیهێنەبەر دیدەو مێشکتان: ئەگەر لەهاویندا ئاوا ڕۆژ درێژبێ، خۆمرۆڤ بەرگەی ناگرێو ژیانی تاڵ دەبێ، خۆئەگەر لەچلەی زستاندا ڕۆژ ئاوا درێژبێ، دیسان مرۆڤ بەرگەی ناگرێ وڕەق دەبێتەوە. کەچی لەبەهاردا بەوڕۆژگارە درێژە، ئەگەر هەر لەبەیانیەوە هەتا ئێوارە لەدەرەوەبی لەشت هەرزیاتر پێ ی خۆشەو گەشەی پێ دەکات.

بەڵێ بەهار ئامۆژگاریمان دەکات وپێمان دەڵێ: تابلۆی بەهار، پێشانگایەکی خودایی پان وبەرین، خاکی ڕەنگین، زەردەخنەو نازو نەوین، هەرتابلۆیەك دانراوە، پەیامێکی لێ نوسراوە، بیخوێنەوە. لێ ی تێبگە، ئاشنابەو زوو پێ بگە..

گوڵ دەڵێ: باڕوتان جوانو بۆنتان خـــــــــــۆش بێ

مەل دەڵێ: بەستەی ووتەتان، باپـــــڕ لەجۆشو خرۆش بێ

هەنگ دەڵێ: شانەی هەنگوین ڕەنـــــجی دەوێ، ڕامەوەستن

سەوزەگیا دەڵێ: بۆئەوەی بونتان دیـــــــاربێ ڕیز ببەستن

بنار دەڵێ: بـــــــــــــــارانی خێر لەخۆگرن

چیا دەڵێ: وەکـــــــــــــو ئێمە دامەزراوبن، خۆڕاگرن

لەدارســــــــــتاندا دار دەڵێ: چڕو پڕ بن، خاك داپۆشن

مێرولەکــــــــــــــــان پێمان دەڵێن: تێبکۆشن

ڕەنگــەکان پێمان دەڵێــن: نابێ ڕەنگەکان بۆخۆمــان قۆرخ بکەینو بەهــی خۆمانیان بزانین، بەڵکو تەواوی ڕەنگەکان هی خوای گەورەنو بەڵگەن لەسەر گەورەیی‌و دەستڕەگینی خوای پەروەردگار، بەهار پێمان

دەڵێ: کەزۆر ئاسایی یە، دیدو ڕاو بۆچونمان لەیەك نەچێو وەك یەك بیرنەکەینــەوە، چونکە ڕەنگەکانو گژوگیاو بەرهەمەکانی بەهار، هیچ کامیان لەیەك ناچن وهەریەکە لەسەر بنچینەیو بنجی خۆی دەڕوێو هەموش لەپەنای یەکتردا جێیان دەبێتەوە. بێ ئەوەی دژایەتی یەکتربکەن ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴾. الروم: ٢٢.

بەڵێ، بەهار فێرمان دەکات، کەهەرگیز نائومێدو ڕەش بین نەبین، هەرچەندە ژیان بەستەڵەكو سەرمابێ، دەبێ ڕۆژی شادی بەدوادابێ..

بەهار دەڵێ: دونیا پێنج ودوو ڕۆژێکە، تەنها پێچی مێزەرێکە، چێژو تامی هەتاوێکە، دەبڕێتەوە لەپڕێکا، ئامانو دەخیل ووریابە، لەڕاستە ڕێ لاڕێ نەبیو لەگەڵ خوابە. منیش وەك تۆ خۆش پێکەوتوو گەشو سەوزو دەم بەخەندەم. پاش کەمێکی تر دەژاکێمو دەپێچمەوە بارگەو بنەم.

(لەزانستی جوگرافیادا، بە بەهارو پایز دەوترێ: وەرزە میوانەکان)..

ئیمانداران: بەهار دیاترین بەڵگەو نمونەی بەرچاوە لەسەر زیندوو بونــەوەی دوای مــردن، کەلەچەند ئایەتێکی قورئانــدا، خوای گەورە ئەمــەی بۆ تۆمار کردویــن. وەك دەفەرموێ: ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ الروم: ٥٠.

واتە: جا ئیتر سەرنج بدەو تەماشای چەندەها ئاسەواری ڕەحمەتی خوابکە. کەچۆن زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردنی. بێگومان ئەوزاتەی کەئەوکارانە ئەنجام دەدات. مردوان زیندوو دەکاتەوەو هەرئەو زاتە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.. مردوانیش وەك ڕووەك لەکاتی خۆی دا لەزەوی دەردەهێنێتەوە بۆلێپرسینەوە.

ئازیزان: بەهار دەڵێ: ئەی ئادەمی، بۆ وا غافڵو بێ خەمی، تۆش پایزت بەسەردا دێو ئەسپەردەی ناوقەبر دەکرێ ی، کەبەهاری قیامەتیش هات، وەك سەلکە پیفۆکێکی من، دەژێیتەوەو حەشر دەکرێی... گەرلەم بەستەیەم تێبگەی بەویژدانی، لەژیرانی، چونکە تۆش تاقە گوڵێکی وبۆچەند بەهارێك میوانی..

ئیمانداران: بەهار وەرزێکی موبارەكو پڕ بەرەکەتە. هەرچی لەبەهاردا دەردەچێ جێگای خۆشحاڵی یە بۆ مرۆڤ. صەحابەکان دەفەرمون: (كانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إذا حَمَلَ إلَيْهِ باكورَةَ الثَّمَرِ، مَسَحَ عَيْنَيهِ، بِها وأَكْرَمَها وقالَ: إنَّهُ قَرِيبُ العَهْدِ بِرَبِّنا سُبْحانَهُ وتَعالى). واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ کەنۆبەرەی میوەیان بۆدەهێنا، بەهەردوو چاوی پیرۆزیدا دێناو ڕێزی دەگرت ودەیفەرموو: ئەمە تازە لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە، بۆیە موبارەکەو دیاری خوایەو هەرخوا دەتوانێ پێمان ببەخشێ.

بەڵام بەداخەوە: زۆرکەس ئاوا لەبەهارو نەورۆز ناگات. ئەوەی تێی دەگات تەنها: (سەیران) کردنە! بەڵام خۆزگە بەجوانی لە(سەیران) تێبگەیشتنایە. کەلەڕاستیدا سەیرانو گەشتکردن، بەشێکە لەپشودان بەگیانو ڕۆحی مرۆڤ، مەفهومی سەیران، مەفهومێکی کولتوریە. لەووڵاتانی دەرەوە. سەیرانکردن بریتی‌یە لەبەسەربردنی ئەوکاتانەی کەکاری تێدا ناکەن. بەتایبەتی ڕۆژانی شەممەو یەك شەممە. بەدەر لەمەش ڕەنگە ئەگەر کەسێك لەو ووڵاتە ئەورووپیانە، لەڕۆژانی دەوامو کارکردندا بچێتە سەیران شتێکی نامۆو نەشازبێت! ئەوانەی کەچوونەتە دەرەوەی ووڵات باس لەوەدەکەن، کەسەیرانگاکانی ئەوێ زۆر مونەزەمن. بۆنمونە: برژاندنی گۆشتو ئاگرکردنەوە بۆ خواردەمەنیەکان، شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، شارەوانی لەهەموو سەیرانگاکاندا شوێنی تایبەتی بۆتەرخان کردووە. ئاوی پاکی هەیە. ڕێگاوبانەکانی زۆرباشە. پارکی

ڕاگرتنی ئوتومبێلیان زۆر ڕێکوپێکە، بۆت نیە لەهەموو شوێنێ یاری بکەیت، بۆت نیە بەدەنگی بەرز قسەبکەیت.. بەڵام بەداخەوە لەووڵاتی ئێمە گەشتو سەیرانمان لەزۆرلایەنەوە ناتەندروستە. بۆنمونە: باوکێك لەبەرچاوی منالی بچوکی عەرەق دەخواتەوە! سەرخۆش دەبێو لەسنور دەردەچێ، لەئوسولیەتی مرۆڤایەتی دەردەچێ. هاتو هاوار دەکات، بەسەرخۆشی پەلاماری یەکتری دەدەن!! خۆلە سەیرانگاکانی ئێمەدا منالْ مافی فەوتاوە، چونکە ئەو شوێنانەی کەگەورەکانی تێدان، بەهەمان شێوە منالەکانی تێدایە. کەپێویستە منالْ شوێنی پشوی تایبەتی خۆی هەبێ. نەك تائێوارە لەژێر کەپرێکدا سجن بکرێ! کە چوشە دەرەوە لەئاودا بخنکێ، یان سەیارە لێی بدات! لەڕاستی دا سەیرانو گەشت بۆ حەوانەوەو ئاسودەبونی ڕۆحە. بەڵام گەنجان لەسەیرانەکانو سەیرانگاکاندا، بەداخەوە زیاتر ڕۆحی خۆیان ماندوو هیلاك دەکەن! کەلەئاینی ئیسلامدا گەشتو سەیرانو بینینی دیمەنی دڵڕفێنو سەرنجڕاکێش، دەرون ئاسودە دەکاتو خەمو خەفەت دەڕوێنێتەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆخۆی لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی دا گەشتو سەیرانی کردوەو ئەویش لەئامادەکردنی خواردندا هاوکاری کردونو داروچیلکەی کۆکردۆتەوە.. بەڵام بەداخەوە بەهۆی خەڵکی ڕەفتار خراپ ودور لەدینو یاساوە سەیران بۆتە ناشیرین کردنو خراپ بونی دڵەکان، کەخەڵکێکی زۆرخراپ مومارەسەی سەیران دەکەن، دەڕوا مەشروب دەخواتەوە، ژینگە پیس دەکات، ئازاری دارو درەخت دەدا، ئازاری ئافرەتان دەدا، لەجیاتی گوڵوگوڵزار، خوێنی سور دەڕێژێ! بەچاوی پیسو ڕوانین بۆئابڕوو ناموسی خەڵکی، بەدەنگی بەرزی تەسجیلو خۆگێلکردنو خۆبەنج کردن، خەڵکی ناتوانێ لەتەنیشتیەوە دابنیشێ. پاشان لەگەڕانەوەدا بەسەرخۆشیو نیوهۆشیەوە ئوتومبێل لێ دەخورێو کارەساتی سامناکی لێ دەکەوێتەوە! بۆیە لەوەختی بەهارو

سەیرانو گەشتدا، ئەم هەموو هێزی پۆلیسو ئاسایشە دەخرێتە حاڵەتی ئامادە باشی یەوەو دەبێ بەدیار ئەوخەڵکەوەبن ولەخەڵکی لادەرو خراپەکار بیانپارێزن! ئەو هەموو خەستەخانە گەڕۆکە دادەنرێ، دەنگی حەریق وئیسعاف دەبیسترێ، دنیایەك مەترسیو دڵەڕاوکێ دروست دەبێ. کەبەڕاستی لەجیاتی پشووی دەرونو ڕۆح، دەبێتە پشێوی وخەمۆکی ودڵ نیگەرانیو دوژمنایەتی ورِق وقین! یان هەیە بەسەیرانەوە خۆی بادەداو تەکەبوری بەسەر خەڵکی هەژارو لێقەوماودا پێ لێ دەداو باسی ئەوە دەکات چەند سەیرانیان کردوەو چونەتە کوێ وچیان خواردوەو ئەم هەژارەش کەهەتا نانی هەیە ئاوی نیەو، کەتا ئاوی هەیە ناوی نیە. بەرگی نیە، نەخۆشە گیرفانی خاڵی یە. دڵی تەنگ دەبێ ولەناخەوە ڕقی لەوکەسەو لەهەموو ئەوانە دەبێ کەچونە سەیران ڕەنگە توشی نەخۆشی دەرونی ببێ. دەی باهەوڵبدەین بەهارو سەیران وگەشت بکەینە هۆکاری وردبونەوە لەعەزەمەتو دەسەڵاتو گەورەیی خوای پەروەردگارو سنورەکانی شەرع نەشکێنینو داوا لەخوا بکەین دڵو دەرونمان پڕبێ لەئیمانو خواناسیو گەشیو خۆشیو سەیرانو گەشتمان ببێ بەمایەی لابردنی خەمۆکیو دڵتەنگی دەرونی.

رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَة وَ في الآخِرَةِ حَسَنَة ، وَقِنا عَذابَ النّار
اللّهُمَّ آمين.

سەرچاوەکان:

١. تەفسیری ئاسان - بورهان محمد أمين.

٢. فرمێسکی گوڵ. م.غریب پێنجوێنی ل١٢، ل٩.

٣. ڕۆژنامەی (کۆمەڵ) ژ: ٥١٤، لە ٢٠١٠/٣/٠٢ ل٧. بابەتێکی د.کەیوان ئازاد ئەنوەر.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّلام عَلي سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلي آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمَعِينَ:

ئیمانداران: وەرزی بەهار، قەشەنگترین وەرزی ساڵە. چونکە: (کەبەهاردێ، سروشت کاڵای ڕەنگاوڕەنگی لەبەردەکا، دارودەومن وگژوگیا، شکۆفەی چرۆ دەردەکا، چیا پێ ی لەخەنە دەگرێو تاجی بەفرین لەسەر دەکا، خۆر بەگورزە، تیشکی گەرم، خاك ئاودارو تەڕونەرم، گیا ڕایەخ وگوڵ بێ شومار، مێش ومەگەز، خشۆك باڵدار، دێن ودەچن هەزار...).

بەڵێ مرۆڤ سەرسام دەبێ. بەجوانی بەهارو دیمەنەکانی، بەڵام بەداخەوە زۆرجار بێئاگاین لەدروست کەرو خالیقی ئەم بەهارەو هەموو وەرزەکان وزەمین وزەمەنەکان.

ئەمرۆ دروست کردنی موشەك وگەیشتنی بەهەسارەکان، ئەوپەڕی پێشکەوتنە لای زۆرکەس. کەچی نابینان لەئاست مانگ وئەو هەسارانەی کەمرۆڤ لەزەویەوە دەچێتە سەریان!! سەیرم لەوانەدێ کەنەشتەرگەری (گۆڕینی دڵ) بەدەستکەوتێکی گرنگی پزیشکی دەزانن، کەچی بێئاگان لە بەدیهێنەری گشت دڵەکان!!

مرۆڤ سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕێ لەئاستی هۆکارەکانی گەیاندن. وەکو (مۆبایل، ئەنتەرنێت) کەچی غافڵە لەوخوایەی کەئەو هەوایەی بەجۆرێك دروست کردوە، ئاوا دەنگ دەگوازێتەوە. لەکاتێکدا ئەمانە هەموی: (دروست کراون)، نەك: (بەدی هێنراو)!!..

بۆیە تۆی موسڵمان، پێویستە لەسەرت. کاتێ چویتە دەشت ودەرو سەیران، ئەوەندەی سەرنجی جوانی بەهارو دیمەن وسەیرانگاکانی دەدەی. لەوە زیاتر بیرلەگەورەیی وعەزەمەتی (خالیق) بکەیتەوە، سُبْحانَهُ وتَعالى..

سەرنج بدەن. دارو درەخت وگژوگیاو گوڵ، کەسەرنجی مرۆڤ

ڕادەکێشن، هەر (سەوزایی) بۆخۆی ئارامی بەخشە. ووتراوە:

(ثَلاثَةٌ يُذْهِبْنَ مِنْ قَلْبٍ حَزَن .... الماء والخَضْراء والوجْهُ الحَسَن).

واتە: سێ شت حوزن وغەمگینی لەدڵی مرۆڤ لادەبەن، ئەوانیش: دیمەنی ئاوو تافگەو سەرچاوەی ئاو، وەسەوزایی وپاشان دەم وچاوی جوانی ئینسانی خواناس، کەبەسەیرکردنی ئەو دەم وچاوە مرۆڤ هەست بەئاسودەیی دەکات. پاشان گژوگیاو دارو درەخت وگوڵ، بۆمرۆڤ دەبنە:

١. جوانی.

٢. خۆراك بۆمرۆڤو بۆ ئاژەڵ.

٣. چەندین دەرمانی لێ دروست دەکرێ.

٤. بەردەوام بوونی ژیان بەوەی کەهەوای ($O_2$)ی پاکمان دەدەنێ و ($CO_2$)ی ژەهراوی ئێمە هەڵدەمژن.

ئیمانداری بەڕێز: بیربکەوە ئەو سەوزەگیایەو گوڵو گوڵزارەی تێیدا دانیشتوی، هەروا لەخۆوە بەوجوانیە نەڕواوە. کێڵگەی گەنم وجۆ، دەبێ بیکێڵی وبیچێنی وکودی کیمیایی بەسەردابکەی وپاشان باران لێ ی بدات. دواتر کەپێگەیشت بیدوریتەوە، ئەمجا بەرهەمەکەی هەڵدەگری.. بەڵام ئایا کێ سەرپەرشتی ڕوانی گژوگیای سەرلوتکەی شاخەکان وچیاو گردو دۆڵەکان دەکات؟!! خۆبەدڵنیاییەوە هەرلەخۆیەوە ناڕوێ، نەخێر بەڵکو ئەوە (الله) یە (سُبْحانَهُ وتَعالى) سەرپەرشتی دەکات. ئەویش بەم شێوەیە: هەموو چڵەگیایەك دەبێ لەتۆوێك پێك بێت. جا (تۆوە)کان جیاوازن. بۆئەوەی بچێنرێن، هەندێکیان وەکو (موو) باریکە، هەیانە وەکو باڵی مێش وایە. کەئەمانە بەئاسانی (با) دەیانهێنێ ودەیانبات ولەشوێنی دیاری کراو دەیانخاتە سەرزەوی. (سُبْحانَ الله)، شوێنێك تەنك نیە وشوێنێ پڕنیە. بەخوا مرۆڤ بەپێشکەوتوترین ئامێر بیچاندایە،

ئاوا جوان دەرنەدەچوو.

بەڕێزان: تۆوی واهەیە شێوەی (دڕکی) هەیە. کەبەلەشی گیانەوەرانەوە دەنوسێت ودەیگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر، هەیانە ماددەیەکی کەتیرەیی هەیە. کەبەقاچی گیانەوەرانەوە دەنوسێت ودەیگوێزنەوە. تۆوی واهەیە کەبەشێوەیەك پێچراوە، کەئاو نەچێتە ناویەوە ولەڕێگەی ئاوی (جۆگەو ڕوبارەوە) دەگوێزرێتەوە بۆجێگایەك کەئەو تۆوەی لێ نی یە. ئایا ئەمە بەبێ سەرپەرشتیار وخالیقێك کە (الله) یە دەبێ؟!! پاشان کەتۆوەکە تەقی. لەبچوکترین چڵەگیاوە، تاگەورەترین درەخت، دوولای هەیە (چەکەرەو ڕەگ) کەڕەگەکە بۆلای خوارەوە دەڕوات وقەدەکەش ڕوو لەسەرەوە دەکات. ئەگەر بەدەست هەڵی بگێریتەوە، دەبینی جارێکی تر (ڕەگ) پێچ دەخواتەوەو هەردێتەوە بۆناو زەوی!!

دواتر: لەگەڵای ڕووەك دا، ماددەیەك هەیە پێ ی دەڵێن: سەوزە مادده، کاتێ ئەم ماددەیە بەرتیشکی خۆر دەکەوێت. وەك کارگەیەکی گەرمی گرنگ ڕەفتار دەکات وگەردەکانی ئاوی گەڵای تیا لەت دەبێت بۆ ئۆکسجین وهایدرۆجین. ئەمە بەبێ ئەوەی کەس هەستی پێ بکات. لەکاتێکدا کەئەگەر ئەمە لەتاقیگەدا بکرێت، ئەوا ووزەی پێویست بۆئەم کارە خەمڵێنراوە، بەبڕی ووزەی پێویست بۆگەرم کردنی ئاو تا: (دووهەزارو پێنج سەد)پلە!!!..

باشە کێ گەڵای ڕووەکی فێرکرد، کەبەشێوازێکی ئەندازەیی بۆ بەرکەوتنی تیشکی خۆر بەرکەوێ وبەهۆیەوە کاربۆهیدرات ئامادەبکات وگازی دوانە ئۆکسیدی کاربۆنیش بگۆڕێ بۆ ئۆکسجین. تابەهۆی بەروبومی بەتام وگوڵی جوان وبۆنی خۆشەوە مرۆڤ ئاشنا بکات وبەوپەڕی وردەکاری وئەندازەگیری ژینگەشی بۆپاك بکاتەوە؟!!..

سُبْحانَ الله، بەوردی سەرنجی درەخت بدە. بەشێوەیەك دروست

بووە، هەموو گەڵایەکی تیشکی خۆری بەردەکەوێ!! سەرنج بدە: ئەگەر ئەو گەڵایە، یان ئەو گوڵە کەوتە پەنا درەختێکی گەورەتر لەخۆی یان: دیوارێك کەسێبەری بەسەردا دەکات، ئەوا بۆ ڕزگارکردنی خۆیو نەمردنی، هەروەکو مرۆڤ، ئەویش دەکەوێتە تەنگانەوە. خۆی لار دەکاتەوەو ئاڕاستەی گەشەکردنەکەی ڕووەوسەرچاوەی ڕوناکی دەگۆڕێ.

پاشان ووردببنەوە: گەڵای درەختەکان وگوڵەکان وگیایەکان. پێویستە بەشێوەیەکی لەبار ڕابگیرێت. بۆئەوەی پێشوازی لەتیشکی خۆر بکات، بیهێنە بەرچاوت، هەوڵبدە پەڕەیەکی نووسین لەسەرزەوی ڕاگیر بکەیت، سەیردەکەی دەچەمێتەوە بەرەو زەوی. جابۆئەوەی کارەکەت جێ بەجێ بکەیت، پێویستە ئەملاولای بەشێوەیەکی لەبار لارکەیتەوە تاڕاگیربێت.. ئێستا سەرنج بدە لەگەڵاوگوڵی ڕووەك. بزانە چۆن ئەملاولای ڕێك خراوە تاڕاگیربێت وپێشوازی لەخۆر بکات وئەوەی زیاتریش یارمەتی گەڵای داوە لەم بارە، بونی دەمارێکی سەرەکیە لەناوەڕاستی گەڵاو دەمارە بچوکەکانی ئەملاو ئەولای!!!...

ئیمانداران: ڕووەکەکان پێویستی زۆریان بەئاو هەیە. چونکە بەردەوام لەژێر تیشکی خۆردان، جا بۆئەوەی ڕێگا لەوون کردنی ئاو بگرن. ڕووبەری گەڵاکان، کەبەردەوام ڕووبەڕوی خۆرن. بەچینێکی مۆمیی (پیانەڕۆ) (غَيْر نفوذ)ی ئاو داپۆشراون کەپێ ی دەوترێ: (ڕوپۆشی پتەو)!، وەهەروەها درەختەکانو گوڵو گژوگیاکان دەتوانن بەڕێکوپێکی ئاستی بەرزی خەڵك بکەنە کەشەوە، درەختەکان لەناوچەیەکدا کەڕووبەرەکەی بگاتە (هەزار مەتر چوارگۆشە)، ئەوا (٧,٥) تەن ئاو بەشێوەی هەڵم دەکەنە کەشەوە، درەختەکان وەکو ترومپای گەورەی ئاو وەهان کەئاو لەخاکەوە وەردەگرن پاشان دەینێرن بۆکەش. ئەم کارە زۆر گرنگە، ئەگەر درەختەکان ئەم خاسیەتە (تایبەتمەندی)

بەیان نەبوایە، ئەوا سوڕی ئاو لەسەرزەوی وەك ئەمڕۆ ڕوی نەدەدا وئەمەش مانای تێکچونی هاوسەنگیەکانە لەجیهاندا.. ڕوەکەکان دەتوانن چەندین تەن ئاو بەنێوجەستەیاندا ببەن. وێڕای ئەوە کەقەدەکانیان بەماددەیەکی دارینی ووشك داپۆشراوە. ئاو لەخاکەوە وەردەگرن ولەدوای بەکارهێنانی لەکارگە زۆر نایاب وپڕ ووردەکاریەکانی جەستەیاندا، دووبارە بەبێگەردی دەیگێڕنەوە بۆسروشت. لەمیانەی ئەم کارەشدا بەشێك لەئاوە مژراوەکە بەش دەکەن بەئامانجی بەکارهێنانی هایدرۆجینەکەی لەکرداری بەرهەم هێنانی خۆراکدا...

ئیمانداری بەڕێز: کاتێ تۆ لەژێر ئەو درەختەدا دانیشتوی ولەسەر ئەو گژوگیا جوانە دێی‌و دەڕۆی‌و ئەو هەوا سازگارو فێنکەت پێ دەبەخشێ، کەچی گوێت لەدەنگی هیچ مەکینەو کارگەیەك نی یەو بێ دەنگ سودت پێ دەبەخشێ. دەی سوپاسی پەروەردگار بکە.

دیاردەیەکی تر، لەکاتی نەگەیشتنی ئاو بەڕووەك‌و تینوبوونی، بەدی کراوەو سەرنج دراوە کە: ئەو ڕووەکە سەرەتا ئاوی گەڵاکانی بەکاردێنێ. دواتر ئاوی لاسکەکانی، ئەمجا ئاوی لقەکانی، ئینجا ئاوی قەد، پاشان دێتەسەر بەکارهێنانی ئاوی ڕەگ!. زیاتر ڕونی بکەینەوە: ڕووەك بەویستی خوای پەروەردگار وابەدی هێنراوە کەلەسەرەتای تینویەتیەوە ئاو لەوشوێنانە بەکاربێنێ کەنەبونی نابێتەهۆی ووشك بوونی. بەئومێدی ئەوەی لەداهاتویەکی نزیکدا ئاوی پێ بگات وزیندوو ببێتەوە. بەڵکو دوابەشی ئاو کەبەکاری دێنێ ئاوی ڕەگەکانیەتی، چونکە کەووشك بوو، ئیتر ڕووەکەکەش ووشك دەبێت. ئایا غەیری الله (سُبْحانَهُ وتَعالی) کێ ئەمەی فێری ڕووەك کرد؟! (لا إلهَ إلاّ الله).

بەڕێزان: ڕەنگە یەکێ بپرسێ: باشە ئەی بۆچی ئەم بەهارەو ئەم وەرزە دڵگیرەو ئەم درەختو گەڵاو گوڵ‌و گیایە، ووشك دەبێ ودەبێتە

پوش وگەڵاو هەڵدەوەریێ؟! لەوەڵامدا دەڵێین: ئەمەش هەروەکو ڕوان وسەوز بونەکە، بەزنجیرەیەك کارلێکی گرنگ ڕودەدات، کەهەروا سادە نی یە. بەڵام بەکورتی بزانین کەهەڵوەرینی هەر گەڵایەك وبوونەپوشی هەرچڵەگیایەك، سودی زۆری بۆ ڕووەك وژینگەو زیندەوەران هەیە. وەکو:

١. گەڵا هەڵوەریوەکان وپوشەکان دەبنەهۆی دەوڵەمەند بوونی ئەو خاکانە بەچەند ماددەیەکی پێویست و وەکو کودی کیمیایی وایە زەویەکە بەپیت دەکاتەوە.

٢. یارمەتی مانەوەی ئاوی باران دەدەن وناهێڵن بەسەر زەویەکەدا بڕوات وهەڵی نەمژێ.

٣. چەندین زیندەوەری بچوك لەژێر ئەو گەڵا وەریوو پوشە ڕزیوانەدا خۆیان حەشار دەدەن ودەمێننەوە، خۆئەگەر وانەبێ لەسەرمای زستاندا دەفەوتێن.

٤. ئەو گەڵاو پوشە ووشکانە. وەکو خۆراکو ئالیکیش بەکاردەهێنرێن بۆ ئاژەڵەکانو کە ئەگەر بەسەوزی بمانایانەوە، دەڕزین وبۆگەن دەبوون!!.

کەواتە: خوای گەورە هەموو کارەکانی پڕن لەجوانی وحیکمەت، بەڵام مرۆڤی نەزان تێ ی ناگات.﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴾. الأنعام: ١٠١ – ١٠٢.

واتە: بێگومان ئەوزاتە بەدیهێنەری ئاسمانەکان وزەوی یە. لەجوانترین وڕێکوپێکترین شێوەدا. چۆن ڕۆڵەی دەبێت؟!، خۆئەو زاتە هاوسەری نەگرتووە؟! بەڵکو هەمووشتێکی دروست کردوە. بەڕاستی

ئەو زاتە بەهەمووشتێك زانایە.. ئائەوخوایە پەروەردگارتانە، جگە لەویش هیچ خوایەکی تر نییە. بەدیهێنەری هەموو شتێکە. کەواتە: هەرئەو زاتە بپەرستن وبەندایەتی تەنها ئەو بکەن. ئەوخوایە ئاگادارو چاودێری هەمووشتێکە..

بەڵێ ئیمانداران: بەم شێوەیە خوای گەورە هەموو ڕووەکەکان ووەرزەکان ومانگ ورۆژو گیانەوەران وزیندەوەرانی ڕام کردووە بۆئەوەی:

١. بەسەلامەتی بمێننەوەو دووربن لەفەوتان..

٢. بۆئەوەی خزمەتی مرۆڤ بکەن. بۆنمونە: ئەگەر داری میوە تەنها بۆئەوە بەری بگرتایە تاوەکو تۆوی نەفەوتێ. خۆئەوکات هەردارێك یەك دوو دانە میوەی بەس بوو. وە لەکیسەیەکی بچوك دا دوو سێ دەنکی تێدا بوایە بەس بوو. بۆنمونە: پرتەقاڵ، سێ چوار دەنکی لەناو توێکڵەکەیدا بوایە. بەس بوو بۆمانەوەی ڕووەکەکە. بۆئەوەی جارێکی تر بوەرێتە سەرزەوی وبڕوێتەوەو هۆکارێك بێ بۆمانەوەی جۆرەکەی!! یان ئەگەر مریشك بەس بۆئەوە هێلکەی بکردایە، تاجۆرەکەی بمێنێتەوە. ئەوە زۆر لەوەکەمتری دەویست کەلەهێلکەدانیا بەدی بێت .. خۆئەگەر شیری مانگاو مەڕو بزن وحوشتر تەنها لەبەر بەچکەکەی بوایە، زۆر لەوە کەمتری دەویست کەلەگوانیا ئامادەیە..

یان ئەگەر هەنگ هەنگوینەکەی تەنها بۆخۆی وبێچووەکانی بوایە. زۆر لەوە کەمتری دەویست کەلەشانەکانیدا بەرهەمی دێنێ!.. دەی خوای گەورە ئەم هەموو بەزەیی وخۆش وویستنەی بەمرۆڤ بەخشیوە، تامرۆڤیش، ڕاستەقینە مرۆڤ بێ وبەندایەتی خوای پەروەردگاری بکات.. چونکە مرۆڤ تەنها بەعیبادەتو طاعەتی خوای پەروەردگار لەئاژەڵ جیادەبێتەوە، کە ئاژەڵ تەنها دەخواو دەخەوێ وڕادەبوێرێ ودێ ودەچێ. بەڵام مرۆڤ لەهەمووشتێکا شوێنکاری دەسەڵاتی خوا

دەبینێ.

زۆر بەداخەوە، (٨٠٪)ی ئەوانەی لەبەهاردا دەچنە دەشت ودەرو سەیران. تەنها هەموو غەمیان خواردن وگۆرانی وهەڵپەڕین وسوڕدانە!، کەبەڕاستی ئەمە بێ هۆشی یە..

ئیمانداران: بەهار حەشرێکی بچوکە، نمایشی مۆزەخانەی ساڵانەیە. مانای چونو هێنانەوەی ئەم بازاڕو دوکانەیە. کێ تێدەگا لەوناڵەو چریکەو دەنگە، لەوجوانی‌یە ڕەنگاو ڕەنگە. ئەوە هەنگەو بۆشیلەی گوڵ پەروانەیە.. کێش تێناگا، کوێرو کەڕەو ماڵی دڵی وێرانەیە، دێوانەی ناو ئەو جەنگەڵی کێوانەیە.. بەهار وەکو لەبیری خەم دەرماندێنێ خۆئەگەر ڕوح نەلاوێنێ، دەیان پرسیار لەناخدا هەڵنەتۆقێنێ. کەواتە ئێمە لەگەڵ بەرد چ جیاوازین؟! بەکام ئاوازدا بنازین.. وەرزی بەهار کەدەچین بۆگەشتوگوزار، ئەوەی هەرنزیك بڕوانێ، هەرهەڵبەزێو مەلەو تۆپێنو دیلانێ، ورگی هەمبانەی چلێسی وپێبکەنێ تائەتوانێ، ڕانەمێنێ لەدار لەگیا. لەگوڵزاری دەشت وچیا، لەهەوری کەل، لەپۆلی مەل، لەشەپۆلی ڕۆخی دەریا. زۆرنەزانە. تێناگا لەونوسینانە. ناڵێ ئەم نەخش ونیگارە، ئەم کانیو چەم وڕووبارە. شۆڕەبی وبەرزە چنارە. گژوگیای پڕگوڵو خارە. نەخشێنراوی کردگارە.. کەسێ کەپایزو بەهار لەیەك جودا نەکاتەوە. لەم ئەرشیفی ژیانەوە ڕوحی زەنوێر نەکاتەوە. بەلای (ئایەتی مەنزور)ا، بڕواو ئاوڕیان لێ نەداتەوە. دەیان پرسیار لەناخیدا گینگڵە بداو وەڵامێکیان نەداتەوە. زیندووە، بەڵام مردووە. ڕێ ی بەهاری هەمیشەیی وون کردوە...

دەگێڕنەوە: کابرایەك دەمرێ، لەخەودا دەیبینن، دەڵێن: خوا چی لەگەڵ کردی؟! دەڵێ: خوای گەورە لێم خۆش بوو. بەوەی کەڕۆژێکیان شیعرێکم بەسەر گوڵێکدا ووت لەبەهاردا. باسی گەورەییو دەسەڵاتی

خوای گەورەم کردبوو. کەچۆن ئەو گوڵەی ئاوا جوان دروست کردوە.

بەڕێزان: ڕاستە مرۆڤ بەسەیران وگەشت، لاشەی ئیسراحەت دەکات وشاد دەبێ، بەڵام ئەی دڵو دەرون بەچی پشوو دەدات وشادمان دەبێ. چونکە (خۆشی ودڵخۆشی) دووشتی لەیەك جیاوازن. زۆرکەس هەیە، خۆش دەخواو خۆش دەنۆشێ. بەڵام دڵخۆش نىیە. زۆریش هەیە دڵخۆشە، بەڵام ئەوەی دەیخواو دەینۆشێ ودەیپۆشێ وئەوخانوەی دایدەپۆشێ، باش نی یەو خۆش نی یە. کەواتە: ئەگەر بەسەیران وگەشت خۆشیمان دەست دەکەوێ، ئەی بەچی دڵخۆشیمان دەست دەکەوێ؟! بەخواناسی ودینداری.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾. یونس: ٥٧ - ٥٨.

واتە: ئەی خەڵکینە بەڕاستی ئێوە ئامۆژگاریەکی گەورەو گرنگتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە(قورئانە) شیفاو چارەسەریشە بۆنەخۆشی دڵو دەرونەکانو ڕێ نیشاندەرو ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران. ئەی محمد (ﷺ) بەئیمانداران بڵێ: با دڵشادو شادمان بن بەفەزڵو بەخشش ورەحمەتی خوایی. کەقورئان وبەرنامەی خوایە. کەوابوو باهەربەوە دڵخۆش بن. هەرئەوەش چاکترە بۆیان لەهەموو ئەوشتانەی کەخەڵکی خەریکن کۆی دەکەنەوەو کەڵەکەی دەکەن..

بەڕێزان: زانای گەورەو بەناوبانگ. (د.محمد عبدالرَّحمن العریفی) لەیەکێك لەکتێبەکانی دا بەناوی: (رَقائِق العریفي) بەم باسەو بەسەرهاتە سەرنج ڕاکێشەمان بۆدەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: یەکێ لەبرایانی بانگخواز بۆی گێڕامەوە. کەبۆچارەسەری نەخۆشی سەردانی وولاتی (بریطانیا)ی کردوە. وەچۆتە یەکێ لەگەورەترینو

ناودارترین نەخۆشخانەکانی تایبەتی ئەو وولاتە، کەزۆربەی مەلیكو پیاوەگەورەکان وسەرمایەدارو وەزیرەکان بۆچارەسەری نەخۆشیەکانیان ڕویان تێدەکرد. ئەو مامۆستایە دەفەرموێ: جاکاتێ چومە لای دکتۆر لەونەخۆشخانە گەورەیە. دکتۆرەکە کە تەماشای سەروسیمای کردم، لێی پرسیم: تۆ موسلْمانی؟! ووتم: بەلْێ، ووتی: زۆردەمێکە، لەوکاتەوەی کەخۆم ناسیوە، گرفتێکی گەورەم هەیە، ئایا دەتوانی گوێم بۆبگری؟! ووتم: بەلْێ فەرموو، پزیشکەکە ووتی: من لەمالْو سامانی دونیا چی بلْێی هەمە. لەباشترین نەخۆشخانەی ئەم وولاتەدا کاردەکەم وەکو دەبینی. هەلْگری بەرزترین بڕوانامەم، بۆخۆشی ژیانم، چی شتە تاقیم کردۆتەوە. لەگرانبەهاترین جۆری شەرابم خواردۆتەوە، لەڕوی جنسەوە بەدلْی خۆم کارم کردوە. سەفەرو گەشتم بۆ زۆربەی وولاتانی جیهان کردوە، کەچی لەگەلْ ئەوەشدا بەردەوام هەست بەدلْ تونْدی دەکەم. هیچ لەزەتێك، کەدەرونم، کەناخم ئاسودە بکات لەوخواردنو خواردنەوەو گەشت وسەیرانە نابینم، تەنانەت چومەتەلای دکتۆری نەخۆشییە دەرونییەکان. بڕوابکە جاری واهەبوە، خەریکی ئەوەبوم خۆم بکوژم بۆئەوەی لەم ژیانە ڕزگارم ببێ وبگەمەوە بەژیانێکی تر، کەئەم ناڕەحەتیەی دلْو دەرونی تێدانەبێ!!، ئایا تۆش هەست بەم هەموو ناڕەحەتیە دەرونی یە بێزارکەرە دەکەی؟!

بانگخوازەکە دەفەرموێ: ووتم نەخێر. سوپاس بۆخوا بەردەوام دلْم شـــادە. ئەوەتا هەرچەندە نەخۆشم بەلاشـــە. بەلاّم بەدلْو دەرون هیچ گیروگرفتێکـــم نی‌یە. بەلاّم جەنابی دکتـــۆر من ڕێگەچارەی ڕزگاربون لەوگرفتـــە دەرونی‌یەت پـــێ دەلْێم، ئەگەر گوێم بۆبگریو ڕاشـــکاوانە وەلاّمی پرســـیارەکانم بدەیتەوە!، ووتی: زۆر شـــادمان دەبم. ووتم: ئایا ئەگەر بتەوێ چاوت تام وچێژ وەربگرێ چی دەکەی؟!، ووتی: ســـەیری

نافرەتێکی جوان، یان دیمەنێکی جوان دەکەم. ووتم: ئەی ئەگەر ویستت گوێت لەزەت وخۆشی پێ بگات چی دەکەی؟! ووتی: گوێ لەپارچە مۆسیقایەکی هێمن دەگرم. ووتم: ئەی بۆ لوتت چی دەکەی؟! ووتی: بۆنی عەترێك دەکەم، یان دەچمە باخێکی گوڵەوەو بۆنی گوڵو ڕەیحانە دەکەم. ووتم: زۆرباشە. ئێستا پرسیارێکت لێ دەکەم. ئایا: هەرکات ویستت چاوت تام وچێژ وەربگرێ، بۆچی گوێ بۆ مۆسیقا ناگری؟! بەسەرسوڕمانەوە وەڵامی دامەوەو ووتی: ئەمەنابێ، چونکە مۆسیقا پەیوەندی بەبیستنەوە هەیە. نەك بینین، ووتم: ئەی باشە ئەگەر بتەوێ، لوتت خۆشی پێ بگات، بۆچی سەیری دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش ناکەی؟! ووتی: ئاخر ئەوە ناگونجێ، چونکە تەماشاکردنی دیمەنی جوان. تایبەتە بەچاو نەك بەلووت. ووتم: زۆرباشە، ئێستا گەیشتم بەوەی کەدەمویست دەستم بکەوێ لەبارەی تۆوە. ئایا جەنابی دکتۆر تۆ هەست دەکەی ئەم وەڕسیو بێ تاقەتیو نائارامی‌یە ڕووی لەچاوت بێو چاوت ئازاربدات؟! ووتی: نەخێر. ووتم: ئەی بەگوێت هەستی پێ دەکەی ئازاری گوێو لوتت دەدات؟! ووتی: نەخێر، من یەکەمجار ووتم: من ناودڵو سینەم نائارامە، ووتم: دەی تۆ هەست دەکەی کەدڵو سینەت نائارامە. ئەبێ ئەوەش بزانی کەدڵیش خۆشی وچێژی تایبەت بەخۆی هەیە.. کەناکرێ بەغەیری ئەوەی تایبەتە بەخۆیەوە بەشتێکی تر تێر بکرێو ئاسودە بکرێ. بۆیە دەبێ ئەوشتە بدۆزیتەوەو بەدەستی بێنی. چونکە تۆ بەگوێگرتنت لەمۆسیقا، وەخواردنەوەی عەرەق، وەنەزەرو تەماشای ئافرەت. تەنها ئەندامەکانی چاوو گوێو گەدەو داوێنت چێژی وەرگرتوە، بەڵام دڵت بێ بەش بوە! دکتۆر زۆر سەری سوڕماو ووتی: ڕاستە. زۆرتەواوە، بەڵام باشە ئەی بەچی دڵم ئاسودە بکەم. بەچی چێژو خۆشی بەدڵم ببەخشم؟! ووتم: بەوەی

کەلەناخی دڵتەوە، دوای تێگەیشـــتن‌و ناسین‌و قبوڵکردن. بلێ: (أَشْهَدُ أَن لا إِلَهَ إلاّ الله. وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُــولُ الله) . وە سوژدەبەری بۆ پەروەردگارت. کەلەنەبونەوە دروستی کردوی، وەکاتێ هەستت بەتەنگژەیەکی دەرونی کرد. خێرا پەنابەریتەبــەر خوای پەروەردگار بۆئەوەی بەهاناتەوەبێ. ئابەم شێوەیە. بەم (ئەڤینی ئیمان)ە، بەردەوام سینەت شاد دەبێ وهەست بەئارامــی وئۆقرەیـــی دەرونی دەکەی. دکتۆرەکە ســەری جوڵاند وەکو بەڕاست دانانی قسەکانم وپێ ی ووتم: لەبارەی ئیسلامەوە کتێبێکم بۆ بێنە، دوعای خێریشم بۆبکە. پشتیوان بەخوا دوای تێگەیشتنی تەواوم لەئیسلام، موسڵمان دەبم وخۆم ڕزگار دەکەم.

بەڵێ جێگای سەرسوڕمانە، کەسێك بەدوای بەختەوەری‌و گەشانەوەی دڵ‌و دەرون دا بگـــەڕێ، کەچـــی لەوڕێگەیەوە نـــەڕوات، کەئەمانەی پێ بەدەست دێ، کەئیمان وکردەوەی جوانە. بەڵکو وابزانێ بەئەنجامدانی بێ شـــەرعی دەگاتە ئاسودەیی وبەختەوەری وخۆشی ودڵخۆشی!، خوای گـــەورە دەفەرمـــوێ: ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾.العَنْكَبُوت: ٤.

واتە: ئایا ئەوانەی خراپەو نادروستی دەکەن، وادەزانن کەلەدەستمان دەردەچن ودەرباز دەبن؟! ئای چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کەدەیدەن..

ئیمانـــداران: دەبـــا لەبەهـــاردا، لەگەشـــت وســـەیراندا، ووردبینەوە لەگەورەیی ودەســـەڵاتی خوای پـــەروەردگار. باوەکو چاومان بەدیمەنە دڵفرێنەکانی گەش دەکەینەوە. گوێمان بەدەنگی مەل‌و باڵندە وتاڤگەی ئـــاوەکان. ئاو دەدەیـــن. لوتمان بەوهەموو بۆنەخۆشـــەی گوڵاڵەو گوڵی بەهـــاری تێردەکەیـــن. گەدەمان بـــەو هەموو خۆراکـــەی کەخوا پێ ی بەخشـــیوین تێردەکەیـــن. بائاگاداری ئـــەوەش بین کـــەڕوح وناخمان لەیادنەکەین. ئەویش بەدینداری وخواناسی وخواپەرستی دەکرێ، ئەینا

وەکو ئەوکەسانەمان لێ دێ. کەلەسەیران وسەفەردابون لەهیچیان کەم نەبوە. بەڵام کەگەڕاونەتەماڵەوە، تەڵاق کەوتۆتە نێوان ژن ومێردەوەو هەر لەڕێوە بۆخزمەت مامۆستایەکی دڵسۆز وخەمخۆری ئاینی ئیسلامی بەڕێ کەوتوون!! کەخۆشـــیان سەریان ســـوڕماوە لەوەی کەباشە بۆچی نەوان. توشی ئەم کێشە خێزانیە بوون. لەکاتێکا لەهیچیان کەم نەبوو! بەڵام بێ ئاگا لەوەی لەو هەموو ماوەیەدا زیکرو یادێکی خوایان نەکرد. ســـوژدەیەکیان بۆ ئـــەو خالیقە نەبـــرد. کە (الله) یـــە، کەئەم هەموو خۆشـــیانەی پێ بەخشـــیون. بۆیـــە ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾ طه: ١٢٤.

داواکارم لەخـــوای گەورە ئەڤینی ئیمـــان لەدڵەکانماندا زیاتر بکاتو لەغەفڵەتو بێ ئاگایی بمانپارێزێ وبەدورمان بکات. اللّهُمَّ آمين..


سەرچاوەکان:

١. جیهانی ڕوەکەکان. سەروەر حەسەن. ل٦٨.

٢. ڕوناکیەکانـــی باوەڕو تاریکیەکانی بێ باوەڕی، بەندەی پەرســـتکار، ل١٠٦، ل١٠٩.

٣. فرمێسکی گوڵ. م.غەریب پێنجوێنی، ل٨.

٤. رَقائِق العريفي، د.محمد عبدالرّحمن العريفي، ص٢٦٢..

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمَعِينَ:

ئيماندارانى بەڕێز: موســڵمان خاوەن پەيامە. بەهۆى ئەو پەيامەوە بەرچــاوى ڕوونە. جيائــەوەى دينى حەق دەشــێوێنىو ديــنو ديندار ناشــرين دەكات ئەوەيــە: ديــن لەخۆتــەوە تێبگەى. نــەك لەخواوەو لەڕێگــەى وەحى خواوەو پێغەمبــەرى خواوە (ﷺ) وەرى بگرى. دينە ئاســمانيەكانى مەسيحىو يەهودى، بەوە تێك چون. كەڕاهيبو قەشەو پێشەوا ئاينيەكانيان دينيان بۆخەڵك دادەنا. ئەوەبوو بەخەڵكيان ووت: (دينو دنيــا بەيەكەوە ناگونجێن). ڕاهيبى واهەبوو. بەناوى دينداريو خواناســىو نزيك بونەوە لەخواوە دەيگوت: چل ساڵە خۆم نەشۆردوەو ئــاو بەرلاشــەم نەكەوتــووە!! كەئەمــەى كردبوە نيشــانەى وازهێنان لەدونيــاو خۆشــيەكانىو پاكيەكانــىو خۆيەكلاكردنەوە بــۆ قيامەت. بەڵام كەدوائاينى خــوا. دوا پەيامى خوا، كاڵاى پڕبەباڵاى مرۆڤايەتى، كەئيسلامە، هات. ئيســلام فەرموى: (إنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإنَّ لِبَدَنِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإنَّ لأهْلِكَ عَلَيْكَ حَقّاً). رَواهُ البُخاريُّ: (١١٥٣).

واتە: بەڕاســتى بۆ پەروەردگارت لەســەرت ماف هەيە. وە بەڕاستى بۆ لاشەى خۆتو ئەندامەكانى لاشەتو هەموو خانەيەكى لاشەت مافت لەســەرە. وەبەڕاســتى بۆماڵو خێــزانو مناڵت مافت لەســەرە. ئەمجا فەرموى: (وأَعْطِ كُلَّ ذي حَقٍ حَقَّهُ). دەى مافى هەموو خاوەن مافێك بدەو هيچيان فەرامۆش مەكە لەسەرحيسابى ئەوى تريان.

بەڕێزان: هەركەســێ لەســەرچاوەى ڕاســت ودروســتى ئيسلامەوە، خواپەرســتى نەكات، دەبێتەهۆى ناشيرين كردنى دين. دەبێتە پەڵەى ڕەش، لەســەر بەفرى ســپى بێ پەڵەى ئيســلام. هەروەكو لەسەردەمى فەرمانڕەوايــى حەزرەتى (عومەرى كوڕى خطاب)دا، حەزرەتى عومەر كەســێكى بينى نوێژ دەكات، بــەڵام لەنوێژەكەيدا، ملــى لاركردبۆوەو

کزۆڵو کلۆڵ خۆی دەنواند وئەوەی سەیری بکردایە وای دەزانی ئێستا ڕۆحی دەردەچێ!. بەحیســابی خۆی. ئەمە خشوعەو دین ئاوا جوانە!. بەڵام بێ ئاگا لەوەی کەیەکێ لەڕوکنی نوێژ ئەوەیە: (القِيامُ مَعَ القُدْرَةِ). بەپێوە وەســتانو قیتو قنج ڕاوەســتان لەنوێژدا. بۆکەسـێك کەساغ بـێ وتوانای هەبــێ، بۆیە حەزرەتی عومەر لێی چوە پێشــەوەو ملی بۆ ڕاســت کردەوەو فەرمــوی: (لاتُمِّيتَنَّ عَلَيْنــا دينَنا مَوَّتَــكَ الله) هەی خوا بتکــوژێ، دینەکەمان مەمرێنە. وەکو مردوو ڕەفتار مەکە، ڕێکوڕاســت بــە. قیت وقنــج بە. خشــوع وا لەناودڵدایە. لەبەئاگایی وتێگەیشــتن لەنوێژەکەدایە. لەوەدایە کەلەدوای نوێژەکە بەرەوچاکە ئاڕاستەت بکاو لەخراپە بتگێڕێتەوە. ئەی مەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرموو: (المُسْــلِمُ كالنَّحْلِ). موســڵمان وەکو مێش هەنگ وایــە. پاك نەبێ نایخوا وپاك پێشــکەش دەکات. باوێشــك دەرو وەڕس نیـیە.. بۆنخۆش وگەش وبەئاگایە.

ئیماندارانی بەڕێز: بەرەو وەرزی گەرما دەڕۆین، مرۆڤ زیاتر عەرەق دەکاتەوەو ئەگەر باشــتر لەجاران ئــاگای لەخۆی نەبێتو پاکوخاوێنی خۆی نەپارێزێ، ئەوا بەبۆنی عەرەقی لاشــەی وبۆنی جلوبەرگی چڵکن وگــۆرەوی وبۆنی ناودەمی، دەبێتە مایەی ئازارو ناڕەحەتی بۆخەڵکانی نزیــك ودەوروبەری. بەتایبەت لەکاتــی هاتن بۆ مزگەوت وئامادەبونی جومعــەو جەماعەت. بەتایبەت لەڕۆژانــی جومعەدا، کەخەڵکێکی زۆر لەمزگەوتــدا کۆدەبێتەوە. هەموومان دەزانین کەنوێژو خوتبەی ڕۆژی جومعە چەند گەورەیە. یەك ســوڕەتی تەواو لەقورئاندا ناوی سوڕەتی (الجُمعــە) یە. جومعە ئەوفــەڕزە گەورەیــە. کەقەزاکردنەوەی نی یە. ئەگــەر جومعــەت فەوتا دەبێ چوار ڕکات نوێژی نیــوەڕۆ بگێڕیتەوە. یــان لەماڵەوە بیکەی (بۆنەخۆش وگرفتــارو بەندی). هەرگیز ناتوانی

کەنەتتوانـــی بچی بۆمزگەوت بەهەر عوورزێکی شـــەرعی بێ، لەماڵەوە، لەجێـــگای کارەکەت، دوو ڕکات نوێژی جومعـــە بکەی. هەردەبێ چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆ بکەی. وە وەکو ووتمان کەفەوتاش قەزا ناکرێتەوە. وە هەرکەســـێ بەئەنقەست ســـێ جومعە لەســـەریەك بفەوتێنێ، مۆر لەسەر دڵی دەدرێ وئیتر ڕەق دەبێ بەرامبەر وەرگرتنی حەق وڕاستی وخواناســـی ودینداری.. بەڵام بەوردی سەرنـج بدەن بۆئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خۆشەویســـتمان (ﷺ) خاڵ بەخاڵ لێ ی وورد دەبینەوە. بزانیـــن ئەو هەموو گەورەیەی نوێژو خوتبەی جومعە کەلەفەرمودەی پێغەمبـــەری خـــوادا (ﷺ) هاتوە کە، جومعە بـــۆ جومعە دەبێتەهۆی ســـڕینەوەی گوناهـــی نێوان ئـــەو دوو جومعەیە!، ئایا ئـــەم بەرەکەت وبەخششـــە هەروا بەئاســـانی دەســـت دەکەوێ، هەربەوەندەی کەڕۆژی جومعـــە لەمزگەوت ئامادەبیو گوێت لەخوتبە گرت ودوو ڕکات نوێژی جومعـــەت بەجەماعـــەت کـــرد. تـــەواو؟! نەخێر. بەڵـــکو پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) ئاوا باسی (جومعە)مان بۆدەکات. دەفەرموێ: (إِذَا كَانَ يَوْمُ الجُمُعَةِ) هەرکاتێ وەختی ڕۆژی جومعەهات.

١. (فاغْتَسَلَ الرَّجُلُ وغَسَلَ رَأْسَهُ). ئەوکەسەی کەدەچێ بۆنوێژی جومعە نەوپیاوە، - (بۆیە باسی پیاو دەکات، چونکە ئافرەت وەکو ڕێزلێنانێك بۆئـــەرك‌و ماندوبونی لەماڵەوە بەماڵ‌و مێـــردو ماڵ‌و میوانەوە. خوای گەورە نوێژی جومعەی لەســـەر پێویســـت نەکـــردوە. خۆئەگەر توانی بچێ وبەشداری بکات، ئەوە پاداشتی وەکو پیاوان بۆ دەنوسرێ). بەڵێ، فەرموی: ئەگەر پیاوێك خۆی شت، وەسەری شۆرد.. ئالێرەدا حەزدەکەم لەخزمەت فەرمودەکەدا هەڵوێستەیەك بکەین، ئەویش ئەوەیە: بۆچی بەتایبەت باســـی شـــۆردنی ســـەری جیاکردەوە. واتە: پێویستە هەموو لاشەت بشۆی، خۆئەگەر نەتتوانی هەموو لاشەت بشۆی، بەهۆی سەرمای

زۆر. کاتی کەم، ئاوی گەرمی کەم، کەم ئاوی. ئەوە باسەری هەربشوات. چونکــە زاناکان دەڵێن: (٨٠٪)ی چەوری لاشــە لەســەرەوە دەردەچێ. (٢٠٪)ی لەهەموو لەشــەوە دەردەچێ. کەواتە: پێویســتە سەرت بشۆی. ئــەوە خاڵــی یەکەم کەلەڕۆژی جومعەدا، موســڵمان دەبێ پێش چونی بۆمزگەوزت ئەنجامی بدات، کەخۆشــۆردن وپاك کردنەوەی لاشەیەتی لەعەرەقەو چڵك وبۆنی ناخۆش.

٢. (ثُمَّ تَطَيَّبَ مِنْ أَطْيَبِ طيبِهِ) پاشان لەبۆنخۆشترین عەترو گوڵاو بەخۆی بکات... (سُبْحانَ الله) لەعەظەمەتی ئەوپێغەمبەرەو پێشبینیە ووردەکانی. ســەرنج بــدەن نەیفەرموو، عەترو بۆنی خــۆش لەخۆت بدەی. بەڵکو فەرموی: لەبۆنخۆشــترین عەتر بەکاربهێنــە. چونکە عەتری واهەیە، بەســەرچوە. ئەوەندە بۆنی ناخۆشــە، لەجیاتی مێشك بکاتەوە، مێشك دەگرێ ومــرۆڤ وڕوکاس دەکات. لەبەرئەوە ئەو عەترەی کەبۆڕۆژانی هەینــی وچونە جومعە بەکاری دێنی، دەبێ لەبۆنخۆشــترین عەتربێ وهەڵبژاردەبــێ، چونکە تەنها بۆخۆت نــی یە. خەڵکیش بۆنی دەکەن. دەبێ لەجوانترین وبۆنخۆشــترین بۆنی عەترو گوڵاو پێشــکەش بەبرا ئیماندارەکــەت بکەی. (ئای لەپاکی وڕێزگرتنــی مافی مرۆڤ لەئاینی ئیسلامدا، ئەگەر وەکو خۆی لێ ی تێ بگەین وجێ بەجێ ی بکەین!)..

٣. (ولَبِسَ مِنْ صالِحِ ثِيابِهِ). وە لەباشترین جلوبەرگەکانی خۆی لەبەرکرد. واتە: نەچوو کام جلوبەرگەی خراپە ئەوە لەبەربکات. بەبیجامەوە بێت بــۆ نوێژی جومعە. نەخێر. بەڵکو گەڕا بەناو جلوبەرگەکانیدا. ئەوەی کەباشــترین وجوانترینیانە ئەوەی لەبەرکرد. (ئەم سێ کارە لەماڵەوە ئەنجــام بدات)، (ثُمَّ خَرَجَ إِلي الصَّــلاةِ) ئەمجا لەماڵەوە دەرچێت بەنیەتی بەجــێ هێنانی نوێژی هەینی لەمزگەوت. کەگەیشــتە ناو مزگەوتیش ئاگای لەم دووخاڵە بێت:

١. (لَـمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ إِثنَيْنِ)، کەلێن نەخاتە نێوان دووکەســەوە. هەنگاویان بەسەردا هەڵ نەهێنێ، ئازاریان نەدات. تەماشابکات لەکوێ جێگا هەیە لەوێ لەدواوە دانیشێ، نەك لەدوای هەموو کەسەوەبێ. ئەمجا بیشیەوێ بچێتە ڕیزی پێشەوەو هەنگاو بەسەر ئەو هەموو خەڵکەدا بهاوێ وخەڵکی ئازار بدات. یان دووکەس بەیەکەوە لەتەنیشــت یەکتر دانیشتون وهیچ کەلێنێــك لەنێوانیاندا نی یە، ئەم خۆی بخاتە نێوانیانەوەو لەیەکیان جیابکاتەوەو واجێگاکەیان بەرتەسك بکاتەوە کەنەزانن چۆن دانیشن..

٢. (ثُمَّ اسْتَمَعَ الإمامَ) پاشان کەئیمام دەستی کرد بەووتار خوێندنەوە، بێدەنگ دابنیشێ وهیچ قسەیەك نەکاتو خۆی بەشتی ترەوە مەشغوڵ نەکات. بەدڵ گوێ بۆ ووتاری جومعە بگرێ.

جاپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: کەسێك ئاوا بەم مەرجانە نوێژی جومعەی کرد، پاداشتەکەی ئەوەیە: (غُفِرَ لَهُ مِنَ الجُمُعَةِ إلى الجُمُعَةِ، وزِيادَةِ ثَلاثَةِ أيّامٍ). خوای گەورە لەم جومعە بۆئەو جومعە. وەسێ ڕۆژیش زیاد. واتە (دە) ڕۆژ، خوا لەگوناهی خۆش دەبێت. بەمانای ئەوەی، دەفتەری کردەوەکانی پاك بونەوەی بەســەرداهات. وەسپی بۆوە. وەخوای گەورە بەبەرەکەتی ئەم نوێژی جومعەیە، کەئاوا چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) باســی کردوە. ئەنجامــی دا. دڵو دەرونی والــێ دەکات. کاریگەری ئەو جومعەیــە تاوەکو (١٠) ڕۆژ لەســەری دەمێنــێ. بۆیە جومعەو ووتاری هەینی. شەحن کردنەوەی ئیمانە.

بەڵــێ ئیماندارانــی بەڕێــز: کۆمەڵێ شــت هەن کەئاینــی پیرۆزو پڕبەرەکەتی ئیســلام گرنگــی تایبەتی پێ داون وکردونی بەبەشــێك لەدینو لەهەندێ حاڵەتدا واجبی کردون: وەکو ئەم شتانەی کەباسیان دەکەین..

١. خۆشۆردن: ئاینی ئیسلام خۆشۆردنی کردوە بەفەڕز لەسەر مرۆڤی

موسـلمان ژن بێ یان پیاوبێ، لەهەندێ حاڵەتدا. وەلەهەندێ حاڵەتدا، بەسـونەتی گێڕاوەو موسڵمان بەوخۆشـتنە ئەجرو پاداشتێکی زۆری دەسـت دەکەوێ. لەشەریعەتی ئیسلامی دا زانایان (١٧) جۆر خۆشتنیان باس کردوە. کەموسـلمان ئەنجامیاندەدا، جاهەندێکیان فەڕزو واجبەو ئەگەر ئەوخۆشـتنە ئەنجام نەدرێ، ئەوکەسە گوناهبار دەبێ وناتوانێ فەرزەکانی وەکو نوێژو ئەوانی تر ئەنجام بدات. هەندێکیشی سونەتەو موسڵمان وەکو سونەت. ئەم خۆشتنانە ئەنجام دەدات..

تەنانەت مێژونوسان دەڵێن: لەپورتوگال وئیسپانیا، کاتێ موسڵمانان دەربەدەرکران وبەشوێنیاندا دەگەڕان. بۆئەوەی بزانن کەماڵی موسڵمانە یان نا، تەماشای ئەوەیان دەکرد. کەئایا حەمامی هەیە یان نا، هەرماڵێ حەمامی خۆشتنی تێدابوایە ئەوە دەیانزانی موسڵمانە!!. چونکە گاورو ئەوانی تر، خۆیان نەدەشتو پاکوخاوێنی خۆیان نەدەپاراست. تابزانن حەمام چی یەو بۆپێویستە. بەڵام بەداخەوە هەیە بەحیساب موسڵمانەو دێتـە جومعەو جەماعەتیش کەچی بۆنی گۆرەوی وعەرەقەی لاشـەی وبن باڵی مرۆڤ هەراسان دەکات!.

پێغەمبەری خۆشەویست ودڵسۆزمان ئەوەندە لەخەمی پاکوخاوێنی وجوانی دیمەنو ڕوخساری هاوەڵانی دابوو. کەهەرگیز لێیان بێ ئاگانەبوو. جارێکیان کەسێك هاتە مزگەوت. سـەری زۆرهاتبوو. ئاڵۆزکابوو. تێك باهەڵدرابوو. هەرمویەکی ڕووی لەلایەك کردبوو. دیاربوو زۆر دەمێکە نەشۆڕاوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەهەرگیز کەسی تەریق نەدەکردەوە. بەڵام نەیتوانی لەوەبێ دەنگ بێ کەئەمە موسڵمانەو هاتۆتە ناوخەڵکی ولەمزگەوتایەو ئەوە حاڵی بێو دیمەنی موسـلمان ناشرین بکات. بۆیە فەرموی: (أَما وجَدَ هذا مايَسَـكِّنُ بِهِ شَـعْرَه) ئـەرێ ئەوە ئەم پیاوە هیچی دەست نەکەوتوە قژی خۆی پێ ڕێك بخا؟! ئایا ئاوو صابون، شانەیەکی

نیه. ســەری پێ بشــواو پێ ی دابێنێ؟! واتە: ڕەنگە ئەم کەســە خۆی هۆشی نەبێ بۆیە ئەمە حاڵی یەتی. بۆیە فەرموی: ئادەی بیبەن سەری بۆبشــۆن وقــژی بۆچاك بکەن. صەحابەکان دەســتیان گــرت وبردیان قژیان بۆچاك کردو بۆیان شــتو شانەیان کردو هێنایانەوە بۆخزمەت پێغەمبــەری خوا (ﷺ) بۆمزگــەوت. پێغەمبەری خــوا (ﷺ) ئەمجا زۆر دڵخــۆش بوو. وەفەرموی: (أَلَيْسَ هذا خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدُكُمْ ثائِرَ الرَّأْسِ، كَأَنَّهُ شَـيْطانٌ). واتە: ئایا ئەمە باشــترو جوانترو دڵگیرتر نىیە لەوەی کەیەکێ لەئێــوە بێت بۆناوخەڵکو قژی تێکهاڵابێ، وەکو شــەیطان؟!! هەروەهــا صەحابەی بەڕێز (ئەبی قەتادە) دەفەرموێ: چومە خزمەت پێغەمبــەری خوا (ﷺ) وەعەرزم کرد: ئــەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): من قژم زۆرەو هۆنیومەتەوەو کردومە بەپرچ. ئایا بۆم هەیە خزمەتی بکەمو دای بێنمو کاتی خۆمی لەگەڵ ببەمەســەر؟! ئایا نابێتە گوناهو کات بەفیرۆدان؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (نَعَمْ وأَكْرِمْها.) بەڵێ بۆت هەیە خزمەتی قژەکەت بکەیتو ڕێزی بگرە. وەفەرموی: (مَنْ كانَ لَهُ شَعْرٌ، فَلْيُكْرِمْهُ، ولْيُدْهِنْهُ).. واتە: هەرکەسێ قژی هەیە. باڕێزی قژەکەی بگرێ. پاکوخاوێن ڕای بگرێ. بیشــۆرێ. وەچەوری بکات.. ئەبو قەتادە دەفەرمــوێ: لەدوای ئەوەی کەئەوەم لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بیســت ڕۆژی دووجار قژم چەور دەکرد.

کەچــی بەداخەوە ئەمڕۆ بەناوی دیــن ودینداری یەوە. گەنج مەنع دەکرێ لەسەرداهێنان وقژ درێژکردن وسەرچەورکردن. یان بەچاوێکی نامۆ تەماشــای دەکــرێ، لەکاتێکا هیچ ڕەوشــتێکی ناشــەرعی نىیە. وەلەبارەی قژ وســەریەوە، ئەو فەرمودەو سوننەتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) جێ بەجێ کردوە.. جارێکیان، کەســێك بەناوی ئەوەی شارەزایی لەئاینی ئیســلامدا هەیــەو هەندێ کتێبی خوێندۆتــەوە. لەمزگەوتاو

تبوی: دروســت نی‌یه له‌لای ئه‌م گه‌نجه ســه‌ر رووته، ســه‌رچه‌ورانه‌وه نوێژبکه‌ی!!..

به‌ڵێ ئیمانداران: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) زۆر گرنگی ده‌دا به‌دیمه‌نو روخساری پیرۆزی. خاتوو عائیشه ده‌فه‌رموێ: پێغه‌مبه‌ری خوام بینی که‌له‌گۆزه‌ئاوێکدا سه‌یری خۆی ده‌کرد. واته: سه‌ری به‌سه‌رده‌می گۆزه‌که‌دا گرتبوو. وه‌سه‌یری خۆی ده‌کرد له‌ئاوه‌که‌داو ده‌ستی به‌قژو ده‌م وچاویدا ده‌هێنــا. وه‌کو ئاوێنه‌ی ئه‌مڕۆ ئه‌و گۆزه‌ی به‌کارهێنا. خاتوو عائیشــه ده‌فه‌رمــوێ: که‌ئه‌وه‌م بینی، عــه‌رزم کرد: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ئــه‌وه چی یه. تــۆش خه‌ریکی خۆت ده‌بی ودەســت به‌قژو ده‌موچاوتا دێنــی؟! پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمــوی: (إذا خَرَجَ الرَّجُلُ إلــى إخْوانِهِ، فَلْيُهَيِّء مِنْ نَفْسِهِ، فَإِنَّ اللهَ جَميلٌ يُحِبُّ الجَمالَ).

واتــه: هه‌رکاتــێ یه‌کێ وویســتی بڕوات بــۆلای برایــان وهاوڕێیان ودۆســتانی، باخۆی ڕێکوپێك بخا. قژی دابێنێ. جلی جوان له‌به‌ربکات، خۆی بۆن خۆش بکات، چونکه به‌ڕاســتی خوای گه‌وره (سُبْحانَهُ وتَعالى) بۆخۆی جوانه‌و شــتی جوانیشــی خۆش ده‌وێ. به‌ڵێ ئه‌مه‌یه ئیســلام وئه‌وه‌یــه پێغه‌مبه‌ره‌کــه‌ی (ﷺ) که‌چه‌نده کراوه‌و پێشــکه‌وتووو‌بوه، له‌شــوێنێکی بێ ئاوی وه‌کو عه‌ره‌بستاندا. له‌وزه‌مه‌نه‌دا که‌وه‌کو ووتمان: پیس‌و په‌ڵۆخی به‌دینداری ده‌زانرا. پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ئاوا هه‌ڵه‌کانی ڕاست کرده‌وه‌و سه‌لماندی ئیسلام ئاینی فیطرته‌.

٢. بۆن خۆشی: خاتوو عائیشه‌ی دایکی ئیمانداران بۆمان ده‌گێڕێته‌وه‌و ده‌فه‌رمــوێ: بۆنی لاشــه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) له‌میســك خۆشــتر بــووه. به‌هه‌ر ڕێگایه‌کدا بڕۆیشــتایه دوای ماوه‌یه‌ك، خه‌ڵکی ده‌یانزانی که‌پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) به‌وڕێگایه‌دا ڕۆیشــتوه. چونکه ئه‌و شــوێنه هێشتا بۆنی خۆشی پێغه‌مبه‌ری خوای لێ ده‌هات.. وه‌هه‌روه‌ها هه‌رکاتێ

خۆشەویســتمان (ﷺ) دەســتی بخستایەتە ناودەســتی هەرکەسێکەوە، دەستی ئەوکەسەش بۆنی خۆشی دەگرت: وەدەستی پڕبەرەکەتی بەسەر سەری هەرمناڵێــکا بهێنایە، بۆنی موی ســەری ئــەو مناڵەش خۆش دەبــووا، کەواتە: بائێمەی موســڵمانیش هەوڵی ئــەوە بدەین کەبۆنی خۆمان خۆش بکەین. بەڵام بەبۆن خۆشترین بۆن، وەکو لەفەرمودەکەدا فەرموی: (مِنْ أَطْيَبِ طيبِهِ) نەك عەتری بەسەرچوو دڵپڕکەر.. ئای چەند جێــگای داخە کەهەیە لەموســڵمانان لەجیاتی ئەوەی کاتێ لەشــوێنی هەڵسـا بۆنی خۆشی بەجێ بهێڵێ. بەپێچەوانەوە بۆنی ناخۆش بەجێ دێڵێو بۆنی گۆرەویەکانی لەو شــوێن‌وجێگە نابێتەوە. چەند مزگەوت هەیە بەتایبەتی ناوبازاڕو شوێنە قەرەباڵغەکان. کەلەبەربۆنی گۆرەوی ناتوانــی ســوژدەکەت بەتەواوی ببــەی. ئەو فەرش‌و کاشــییەش بۆنی گۆرەوی گرتووەا..

لەکاتێــکا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (مَــنْ أَكَلَ ثُوماً أَوْ بَصَلاً، فَلْيَعْتَزِلْنا، أَوْفَلْيَعْتَزِلْ مَسْــجِدَنا) واتە: هەرکەســێ سیری خوارد. یان پیازی خــوارد. بالێمــان دورە پەرێزبێ، یــان فەرمــوی: بالەمزگەوتەکەمان دورەپەرێزبێ ونەیەت بۆمزگەوت. وەفەرموی: (فَلا يَقْرَبَنَّا، ولايُصَلِّيَنَ مَعَنا) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. بالێمان نزیك نەبێتەوە بانوێژمان لەگەڵ نەکات. وەفەرموی: (فَــإِنَّ المَلائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُوا ادَمَ). واتە: بەڕاســتی فریشــتەکانی خوا، ئازار دەچەژن بەهەموو ئەوشتانەی کەبەنی ئادەم (مرۆڤ)ئازاری پێ دەچێژێو پێی نائاسودە دەبێ.

سُبْحانَ الله، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەبەردەوام هانی ئیمانداران داوە کەڕوو لەمزگەوت بن. نوێژی جەماعەتیان نەفەوتێنن. کەچی کەســیر یان پیاز خورا، دەفەرموێ: بائەو هەموو خێرو چاکەت بۆنەنوســرێو لەماڵەوە نوێژەکەت بکەو مەیە ناو مزگەوت وموســڵمانانەوەو ئەوبۆنە

ناخۆشـــە بەسەر خەڵکا بڵاومەکەوە.. وەفریشـــتەکانی ناو مزگەوتیش ئـــازار مەدە! دەی خۆبۆنی لاشـــەی چڵکن وعەرەقـــەو گۆرەوی لەبۆنی سیرو پیاز ناخۆشـــترە!. وەهەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) زۆرگرنگی بەپاکوخاوێنی ناودەم دەدا، چونکە بۆنی ناخۆشی ناودەمیش مرۆڤ بێزار دەکات. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ســـیواك كردنی زۆر پێ خۆش بوو. وەدەیفەرموو. ئەم ســـیواك كردنـــە: (مُطَهِّرَةٌ لِلْفَمِ، مَرْضاةٌ لِلْـرَّبِ). پاككەرەوەی دەمەو، مایەی ڕەزامەندی خوایە. وەتەنانەت كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدواســـاتەكانی ژیانی دا بوو. لەســـەرەمەرگدا بوو. ئالەوكاتەشـــدا فەرموی: (ئادەی ســـیواكم بدەنێ، خاتوو عائیشـــە دەفەرموێ: دەمزانی بێ تاقەت بوە، بەدەمی خۆم سیواكەكەم بۆ نەرم كردەوەو ئەمجا خســـتمە ناودەمی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ســـیواكی كرد:.

بەڵام دەبێ ئاگاداربین، سیواكەكەش بەخاوێنی بەكاربهێنین. هەموو كاتێ جوان بیشـــۆرین. لەبەرخۆر دای بنێین. چونكە ســـیواكی واهەیە بۆگەنـــی كـــردوە!، هەیە زوڵم لەســـیواكیش دەكات.. وەزۆر پێویســـتە فلچەو هەویری ددان شـــتن بەكاربهێنیـــن. بەتایبەتی كاتی خەوتن. وە لـــەدوای ژەمی نـــان خواردنەكان. چونكە بۆنی نـــاودەم ئەگەر ناخۆش بێ، بەڕاســـتی پێویستی بەچارەسەرو دەست نیشان كردنی هۆكارەكەی هەیە. چونكە بۆنی ناخۆشی ناودەم گەلێ هۆكاری هەیە وەكو مانەوەی پاشماوەی خۆراك لەناو ددانەكاندا. ددانی كلۆر. قورگ هێشەو لەوزەتێن ســـوتانەوەی گەدە، كەم وكورتی لیكە ڕژێنەكانی ناودەم. فلێشی زمان... هتد.

كەپێویســـتە سەردانی پزیشكی پســـپۆری ناودەم وددان وكۆئەندامی هەرس بكرێ. وەچارەســـەری بكرێ. خۆئەگەر كەســـێك هەوڵی تەواوی

خـۆی دا كەبۆنی ناودەمی نەهێڵێ بەڵام هیچ دەرمان وچارەسـەرێكی دەست نەكەوت. وەدەیزانی كەبۆنی ناخۆشی ناودەمی چۆن خەڵك ئازار دەداوخەڵكـی ناتوانن ڕوی تێبكەن. لەم كاتانەدا عوزری هەیەو لەڕوی شـەرعیەوە بۆی هەیە نەیەت بۆنوێژی جەماعەتو جومعەو لەماڵەوە نوێژەكەی بكات. باشترەو خێری زیاترە!..

٣. لەبەركردنـی جلوبەرگی جوانو پاكوخاوێن: كەبەڕاسـتی ئاینی ئیسـلام زۆرگرنگی بە جلوبەرگ داوە. یەكێ لەمەرجی دروسـت بونی نوێژ. ئەوەیە كەئەو جلوبەرگەی كەنوێژخوێن لەبەری دایە. پاكوخاوێن بێ، چونكە ئەگەر ئەونوێژە هەرلەدەست نوێژەوە. لەلەشی خاوێنەوە. لەركوع وسـجودو فـەرزو واجبیەوە تەواو بوو. تەنهـا جلوبەرگەكەی خاوێن نەبوو. ئەو نوێژە قبوڵ نیـیە!.. كەواتە: پاكوخاوێنی جلوبەرگ بەشێكی هەرەگەورەی دینەكەمانە. چونكە لەگەڵ نوێژدا كەگەورەترین ڕوكنی ئیسلامە بەیەكەوە باس كراون.. وەئاینی ئیسلام هانی موسڵمانانی داوە كـە باجلوبەرگیـان ڕازاوەو جوان بێ، ئوتوكرابێ، شـڕۆڵە نەبێ، بەتایبەتی كاتێ مرۆڤی موسـڵمان دەچێتە مزگەوتو خەڵك دەیبینێ. خـوای گەورە لەقورئانـدا فەرمویەتـی: ﴿ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴾.الأَعْراف: ٣١.

واتـە: ئەی نەوەی ئادەم، خۆتان بڕازێننەوە بەپۆشـاك لەبەركردن. لەكاتـی هەموو نوێـژو چونە ناومزگەوتێكـدا... كەچی بەداخەوە هی واهەیـە كەدێتە مزگەوت، جلی شـڕو دڕاو لەبـەردەكات. كەچی كەبۆ كۆڕو كۆبونەوەو میوانداریەك دەڕوات. جلوبەرگی تازەو جوان وسەرنج ڕاكێش لەبەردەكات، لەكاتێكا پێویستە بۆمزگەوتیش هەرئاوا جلوبەرگی جوان بێ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (ماعَلی أَحَدِكُمْ - إنْ وجَدَ - أَنْ يَتَخِّذَ

ثَوْبَـيْنِ لِيَوْمِ الجُمُعَةِ، غَيْرَ ثَوْبَي مِهْنَتِهِ). ئايا چ گرانيەكى تێدايە. ئەگەر يەكێ هەيبێ وتواناى دارايى باش بێ، كەدوو دەست جلوبەرگى تايبەتى هەبێ بۆ ڕۆژانى هەينى لەبەرى بكات كاتێ دەچێ بۆمزگەوت وناوموسڵمانان. جگە لەجلوبەرگى پيشەو كارەكەى.

يەكێ لەصەحابەكان بۆكورەكەى دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ڕۆڵەگيان. ڕۆژێكيان چومە خزمەت پێغەمبەرى خوا (ﷺ)، كاتێ چومە خزمەتى جلوبەرگێكــى زۆر كــۆن ودڕاوم لەبەردابوو. پێغەمبــەرى خوا (ﷺ) تەماشــاى كردم وفەرموى: ئايا نەبــوو نەدارو هەژارى؟! ووتم: نەخێر ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ســوپاس بۆخوا موڵكو ماڵو ئاژەڵى زۆرم هەيە. هەژارنيم. پێغەمبەرى دڵســۆزو خۆشەويســتمان فەرموى: (فَإذا اتاكَ اللهُ مالاً، فَلْيُرَ عَلَيْكَ أَثَره).

واتــە: دەى ئەگــەر خــواى گــەورە ماڵو ســەروەتو ســامانى پێ بەخشــيوى. دەى باپێتەوە ديارىێ. بافەزڵو كەرەمى خوا بەســەرتەوە ديارىــێ لە جلوبەرگتا. باديمەنى هەژارى ونەدارى لەناوكۆمەڵدا بەرەو كــەم بونەوە بچێ ودەوڵەمەندەكــەش هەروەكو هەژارەكە دەرنەكەوێ. وەلەفەرمودەيەكــى تردا هاتــوە كەپێغەمبەرى خوا (ﷺ)، كەســێكى بينى كە جلوبەرگێكى شــڕى چڵكنى لەبەردابوو. ئەوەندە دەمێك بوو نەشۆرابوو. ڕەنگى ئەصلى خۆى ديارنەمابوو. يەكسەر پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ئــەم ديمەنە كارى تێكــردو فەرموى: (أَمــا يَجِدُ هذا مايَغْسِــلُ بِهِ ثَوْبَهُ)؟! ئايا ئەم پياوە هيچى واى دەست ناكەوێ كە جلوبەرگەكەى پێ بشوات؟! ئالەوزەمەنەدا كەتايت وصابون نەبوە، پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ئاوا خەمى پاكى جلوبەرگى بوەو پێى ناخۆش بوە. لەناوموســڵماناندا كەســێكى پيس‌وچەپەڵ هەبێ. تەنانەت لەشــەريعەتى ئيسلامدا هاتوە كەئيمانداران نەك هەرزيندوەكانيان. بەڵكو مردوەكانيشيان پێويستيان

بـەوە هەیە کەدەبـێ بەمردویش جلوبەرگی سـپیو پاکو بۆن خۆش بپۆشـن، کە(کفنە)کەیەتی، هەروەکو لەفەرمودەی سەروەرماندا (ﷺ) هاتوە کەفەرمویەتی: (أَلْبِسُـوا مِنْ ثِيابِكُمُ البَياضَ، فَإِنَّها مِنْ خَيْرِ ثِيابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيها مَوْتاكُمْ).

واتـە: جلوبەرگی سـپی بپۆشـن، چونکە ڕەنگی سـپیوجلی سـپی لەباشـترین پۆشـاکەکانتانە وەهەروەها مردوەکانتانی پێ کفن بکەن. واتـە: باکفنـی مردوەکانتان سـپی بـێ، کەڕەنگی سـپی قبوڵی پیس وچەپەڵـی ناکات وبەردەوام دەبێ خاوێن بێ.. بەڵام بەداخەوە کەسـی واهەیـە مەگەر ئەوکاتەی کفنی لەبەردەکـرێ، جلوبەرگی خاوێن بێ، ئەمینا بەردەوام لەچڵك وچەپەڵی دا دەژی!..

ئیمانـداران: جارێکیان پێغەمبەری خـوا (ﷺ)، لەگەڵ هاوەڵانی دا لەغەزایـەك دەگەڕانەوە، لەدەرەوەی شـاری مەدینـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: بوەسـتن. کەتەماشـای کرد، بەهۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆرە لەماڵ نین. وەلەمەیدانی غەزادا عەرەقیان کردۆتەوەو تەپوتۆزاوی بوونو لاشەیان عەرەقی زۆری کردۆتەوەو قژیان ئاڵۆزکاوەو جلوبەرگیان چڵکن بوە. فەرموی: ئەی هاوەڵانم ئاوا بەوشـێوەیە مەچنەوە ناوماڵو منداڵتـان. چونکە: (إِنَّكُـمْ قادِمُونَ عَلى إِخوانِكُـمْ فَأَصْلِحُوا رِحالَكُمْ، وأَحْسَـنُوا لِباسَكُمْ).

واتە: ئێوە دەگەڕێنەوە بۆلای براکانتان لەناوشار، دەچنەوە ناوکۆمەڵگا. لەبەرئـەوە با ئاوا بەچڵکنیو سـەرئاڵۆزکاوییەوە نەتـان بینن، بۆیە باووڵاخی سـواریەکەتان. زینو ئەوەی لەسەرپشتی ئەسپەکانتانە، ڕێك وپێك بـێ. لەتەپوتۆز پاك بکرێتەوە. وەجلوبەرگی جوان وپاکوخاوێن وبۆنخۆشـیش بپۆشـن وخۆتان پاك وخاوێن بکەنەوە، ئەمجا بڕۆنەوە بۆناو شاری مەدینە.

بەڵێ ئەمەیە مەدەنیەت. ئەمەیە ڕۆشنبیری وپێشکەوتن. کەفەرموی: (فَأَصْلِحُوا رِحالَكُمْ)، واتە: بائوتومبێلەکەت پاك وخاوێن بێ. کوشنیو شوێنی دانیشتنی تەپوتۆزاوی نەبێ، دیوی دەرەوەی قوڕاوی نەبێ. جادەو ڕێگاوبان پیس نەکات. ئایا غەیری ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە (ﷺ) کێ بیری لەوەکردۆتەوە کەئاوا لەبیری پاکوخاوێنی لاشەو جلوبەرگ وخاوێنی وڕێکوپێکی کەرەستەی گواستنەوەو سواری بێ بۆ لەشکرو سەرباز، کەلەکۆنەوە، هەتا ئێستا وهەتاقیامەتیش. سەربازو لەشکر، کاتێ کەلەجەنگ گەڕانەوە ڕاستەوخۆ دەچنەوە ناوشارەکانو نیشانەی هیلاکیو ماندوبونو چڵکو چەپەڵی بەخۆیان وئۆتۆمبێلەکانیانەوە دیارە. وەکەسانی تورەو خۆسەپێنن بەسەر خەڵکی دا، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکەم فەرماندەی سەربازی بوو. کەئەوەی لەبەرچاوگرت کەنابێ کەموکوڕی ئوتومبێلی سەربازی وسەربازەکان لەناوشاریشدا چاك بکرێ، بۆنمونە: تایەیەکی پەنجەرە، دەنگێك لەمەکینەیدا هەیە، ئۆتۆمبێلەکە کارناکات. نابێ بەدوای ئۆتۆمبێلێکی تردا ڕای بکێشێ. بەڵکو فەرموی: (أَصْلِحُوا رِحالَكُمْ) ووشەی چاك کردنی بەکارهێنا کەلەعەسکەریدا پێ ی دەڵێن: (تَصليح). بائەمە ناوشاری پێ مەشغوڵ نەکرێ! هەزاران هەزار سەلات وسەلامی خوات لەسەربێ، ئەی پێشەوامان.

ئیماندارانی بەڕێز: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام هانی پاکوخاوێنی دەدا. لەهەموو بوارەکاندا. صەحابەکان دەفەرمون: (أَمَرَنا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ نَتَّخِذَ المَساجِدَ في دِيارِنا، وأَمَرَنا أَنْ نُنَظِّفَها).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێدەکردین کە: لەئاوەدانیەکانماندا، لەگوندو شارەکانماندا مزگەوت دروست بکەین. وەفەرمانیشی پێ کردین بەپاکوخاوێنی ڕای بگرین. واتە: مزگەوت هەردروست کردنی مەرج نیە بەڵکو مەرجە کەئەوشوێنە گشتی یە

پاكوخاوێـــن بێ، بەخوا مزگەوتی واهەیە لەبەربۆن قاچ وبۆن گۆرەوی ناتوانی هەناســەی بەئاســودەیی تێدا هەڵبمژی. ئیتــر چۆن (ئەڤینی ئیمانـــت) بۆدروســـت دەبێ لەومزگەوتـــەدا؟!، موســـڵمان هەبوە لەناو مزگەوتا ئینۆكی كردوەو لەسەرفەڕشی مزگەوتەكە جێ ی هێشتوە.. یان كەسی واهەیە لەكاتی دەست نوێژ هەڵگرتندا بەشێوەیەك قوڕگـو لوتی پـــاك دەكاتەوەو ئەوناوە پوخڵ دەكات كەخەڵكی بێزی لێ دەكەنەوە!..

پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) فەرموی: چاكـــەو خراپـــەی ئوممەتەكەمم نیشان درا، لەڕیزی چاكەكانیدا بینیم كەلابردنی ئازارێك لەسەر ڕێگا، لەلیستی چاكەكانی كەسێكدا نوسراوە. وەلەڕیزی خراپەكانیشیدا بینیم كەسێك تفێكی لەناو مزگەوتدا، یان لەحەوشەی مزگەوتدا فڕێ داوە!! لەفەرمودەیەكـــی تردا، خۆشەویســـتمان (ﷺ) فەرمویەتی: (البُصاقُ في المَسْجِدِ خَطيئَةٌ وكَفارَتُها دَفْنُها). مُتَّفَقَ عَلَيْهِ.

واتـــە: ڕۆكردنی تـــف لەمزگەوتدا خراپەو تاوانەو كەفارەتەكەشـــی شـــاردنەوەیەتی، لابردنیەتی كەئەمەش پاكوخاوێنی وزەوق وسەلیقەی ئیمانـــدار دەردەخـــات. كەنابـــێ بەتف ڕۆكردنێك چ جـــای بەڵغەمێك، ئیمانداڕێـــك ئـــازار بدات، چونكە هی واهەیە كەچـــاوی بەوتفە كەوت تەبیعەتی تێك دەچێ وناڕەحەت دەبێ. ئەمە سەرەڕای ئەوەی كەلەڕوی تەندروســـتی یـــەوە خراپـــەو ڕەنگە هەنـــدێ نەخۆشـــی بلاوبكاتەوە. كەخۆزگایـــە موســـڵمانان ئـــەم فەرمودەیەیـــان بەكردار جـــێ بەجێ بكردایەو هەوڵیان بدایە، كەلەمزگەوت وهەموو شوێنە گشتی یەكاندا، خۆی لەوەبپاراســـتایە كەتف وبەڵغەم فڕێ بدات وژیان وژینگەی خۆی وخەڵكی پیس بكات.

بەڕێـــزان: دیاردەیەكـــی تـــر كەپێویســـتە ئامـــاژەی پـــێ بكـــەم لەسەرفەرمودەكەی پێغەمبەر (ﷺ) كەفەرموی: مزگەوت دروست بكەن.

وەپاکوخاوێن ڕای بگرن. کەڕاخەری ناومزگەوت پشکی شێری بەردەکەوێ لەوەدا. بەڵام جێ ی داخە هەندێ کەس فەڕشەکەی کەلەماڵەوە لێ ی بێزاربوەو بەتەواوی کۆن بووە، وەچڵك وچەپەڵی چەند ساڵی پێوەیە. دەیهێنێ بۆمزگەوت!!، لەکاتێکا کەپێویستە جوانترین وپاکترین ڕاخەرو فەڕش پێشــکەش بەمزگەوت بکرێ. کەلەزۆر لەووڵاتانی جیهاندا، هی واهەیە فەڕشێکی لەمزگەوتدا ڕاخستوە، ساڵی داهاتوو کەفەڕشی جوانتر پەیدابــوو. ئەوکۆنــەی مزگــەوت دەباتەوە بۆماڵەوەو فەڕشــە تازەکە لەمزگەوتا ڕادەخات!!. دیســان جێــگای داخە. هەندی مزگەوت خەڵکی تەنهــا بۆ خۆبەتاڵ کردنەوە لەســەرئاو، ڕوی تێدەکــەنو زۆری نوێژ ناکاو دەڕوا. لەکاتێکا مزگەوت زۆر جیاوازە لەوەی کە وەکو شــوێنێکی گشــتی چوونە سەرئاو تەماشابکرێو خزمەتەکەی هەرئەوەبێ! چونکە ئەوە ئیشی حکومەتە، ئاودەست دروستبکات. لەکاتێکا پەیامی مزگەوت ئەوەیە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاری کردو فەرموی: (إِنَّ هذهِ المَساجِدَ لاتَصْلُحُ لِشَــئٍ مِنْ هذا البَوْلِ ولا القَذَرِ، إِنَّما هِيَ لِذِكْــرِ اللهِ تَعالى، وقِراوَةِ القُرْانِ) (رَواهُ مُسْلِم).

واتە: بەڕاســتی ئەم مزگەوتانــە کەماڵی خوان، ناشــیەن بۆئەوەی کەمیــزو پیســیان تێدابکرێ. چونکــە مزگەوت تەنهــا وتەنها بۆ یادو زیکری خواو خوێندنی قورئانە..

ئیمانــداران: لەکۆتایی ووتارەکەماندا دەڵێین: بەداخەوە بۆئوممەتی ئیســلام کەقورئانەکــەی بە: (إِقْرَأ - بــە - ن والقَلَمِ وَمايَسْــطُرُون - وبە - ورَبَّــكَ فَكَــبِّرِ وثِيابَكَ فَطَهِّرْ) دەســتی پێ کردوە، کەچــی خوێندن وقەڵەم وکتێبــی نی یەو لەخەڵکــی وەردەگرێ، وەبەداخــەوە پیس وپەڵۆخە. لەکاتێکا کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (تَنَظَّفُوا حَتَّي تَكُونُوا كالشّــامَةِ بَيْنَ الأُمَمِ). پاکوخاوێن بن. باوەکو خاڵی سەر ڕومەت دیاربن لەناو گەلو

**نەتەوەکانداو بەپاکوخاوێنی بناسرێنەوە.**

**خــوای گــەورەو میهرەبان ڕەحممان پێ بکەی، دڵو دەرونو لاشــەو جەستەمان پاکوخاوێن بێت. عاقیبەتمان خێربکەی. اللّهُمَّ آمين...**

**سەرچاوەکان:**

**١. خُلُق المُسْلِمْ - الشَّيْخ محمد الغَزالى. ص١٥١.**

**٢. سَبيلُ المُهْتَدينَ، محمد مُخْتار السَّلامي ج١ ص٣٣٤.**

**٣. زادُ الخَطيب، عَبْدُالخالِق محمد الشّامي. ص١٠٣.**

**٤. مِنْهاجُ الصّالِحينَ في الآداب الأسْلامِيّة، محمد عَبْدُالعاطي بُحَيري. ص٤٧٩.**

# ووتاری چوارەم
# بۆ مانگی ربيع الثاني
# موسڵمانو خۆ جوانكردن

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمَعِينَ:

ئيمانداران: ئيســلام دوولايەن ودوولای هەيە. لايەنی ماددی وديارو بەرچاو. وەهەروەها لايەنی ڕوحی ومەعنەوی.. مرۆڤ لەديدی ئيسلامەوە كائينێكی مزدەوەجە، گۆشت وخوێنە، هەست وسۆزە، جالەقورئانی پڕ بەخشــش دا، هەروەكو باســی پاككردنەوەی دەرون كراوە. (قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكّاها)، باســی پاككردنەوەی لاشەش كراوە، وەكراوە بەبناغەو ئەساسی عيبادەت. ســەرنج بدەن: نوێژ بەبێ لابردنی لەش گرانی ودەست نوێژ دروست نی يە. (وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُباً فَاطَّهَروا). بەئەمرو فەرمان خۆشتنی واجب كردوە، وەبۆدەســت نوێژيش دەفەرمــوێ: (يأَيُّها الَّذينَ آمَنُــوا إذا قُمْتُمْ إلى الصَّلاةِ فَاغْسِــلوُا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إلى المَرافِقِ...الخ). تەماشای فعلی (فَاغْسِلوُا) بكەن، كەئەمرە، موسڵمان بەهۆی دەست نوێژەكەيەوە، واجبە لەسەری كەدەست ودەم وچاوو قاچی بشوات، ڕۆژی چەند جارێك. ئەگەر هەموو فەرزێك دەســت نوێژ تازەبكاتەوە، ئەوە ڕۆژی پێنج جار دەســت ودەم وچاوو قاچی دەشوات!.. ئای چ پاكوخاوێنيەكە..

هەروەها بۆئافرەتيــش كردويەتی بەدين كەدەبێ دوای پاكبونەوەی لەخوێنی سوڕی مانگانە (بێنوێژی)وەخوێنی دوای منداڵ. خۆی بشوات، ئەمجا عيبادەتی نوێژ بكات. لەئيســلامدا شــڕۆڵی وكزۆڵی وچڵكنيمان نی يەو ناوی زوهد نی يە. وەپۆشــتەيیو پوختەيیو فنجو فيتی ناوی تەكەبور نی يە.. هەروەكو كەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (لايَدْخُلُ الجَنَّةَ مَنْ كانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقالُ ذَرَّةً مِنْ كِبْرٍ). ناچێتە بەهەشــتەوە ئەوكەســەی كەبەئەندازەی مســقاڵە زەڕەيەك خۆبەزل زانين لــەدڵو دەرونيدابێ. ئالەوێدا پياوێك ووتی: (إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكوُنَ ثَوْبُهُ حَسَــناً وَنَعْلُهُ حَسَــناً). ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باشە هی واهەيە حەز دەكات جلوبەرگەكەی جوان بێ، وەنەعلو پێڵاوەكانی جوانو پوختو گرانبەهابن، ئايا ئەمە

خۆبــەزل زانینە؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (إِنَّ اللهَ تَعالى جَميلٌ يُحِبُّ الجَمالَ). (رَواهُ مُسْلِم).

واتــە: نەخێــر ئەوە خۆبەزل زانین نی یە. ئەگــەر لەدڵدا تەکەبور نەبێ، چونکە خوا جوانەو حەزی لەشتی جوانە.

جارێکی تر، کەسێك لەپێغەمبەری خوای پرسی، من حەزم لەشتی جوانە، (حَتَّى ماأُحِبُّ أَنْ يَفُوقَني أَحَدٌ بِشِراكِ نَعْلٍ، أَفَمِنَ الكِبْرِ؟!) واتە: ئەوەندەم حەز لەشتی جوانە. تەنانەت پێم خۆش نی یە کەس قەیتانی پێڵاوەکەشی لەمن جوانترو چاکتربێ، جاتۆ بڵێی من لەڕیزی خۆبەزل زاناندابم‌و ئەم کارەم خۆبەزل زانین بێ؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (الكِبْرُ بَطْرُ الحَقِّ وغَمْطُ النّاسِ). کیبرو خۆبەزل زانین ئەوەیە کەئینکاری حەق بکەی وچاوت لەئاستی دا بنوقێنی وسەیری حەق نەکەی‌و نەیسەلمێنی کەئەوە حەقە.. وەبەبچوك تەماشاکردنی خەڵکیشە. ئەم دوانە خۆبەزل زانینن. چونکە جاری واهەیە. هەژارترین وشرۆڵترین کەس موتەکەبیرە. ئینکاری حەق دەکات ولەناخی خۆی دا ڕوحی زلە!.

ئیماندارانی بەڕێز: (دە) شت هەیە کەلەسوننەتی هەموو پێغەمبەرانن. ئەوانیش:

١- بەرسمێڵ کردن، کەلێو دیاربێ.

٢- ڕیش هێشتنەوە.

٣- سیواك کردن‌و پاکوخاوێنی دەم‌و ددان.

٤- ئاو لەلوت وەردان (نەك دامشاندن‌و هەڵمژینی ئاو).

٥- نینۆك کردن.

٦- شۆرینی ئەو جێگایانەی کەئاو باش نایانگرێتەوە.

٧- لابردنی موی بن باڵ.

٨- تاشینی موی بەر.

٩- دەست بەئاو گەیاندن وخۆپاککردنەوە وتارەت گرتن.

١٠- ئاو لەدەم وەردان.

بەڵێ ئیمانداران: هەموو ئەم (دە) شتەی لەفەرمودەکەدا هاتون. پاکوخاوێنیو ڕێکوپێکی بەمرۆڤ دەبەخشن. ئەوەتا لەگۆڤاری پزیشکی نوێ دا نوسرابوو: کلێنسی تەوالێت کەخۆی پێ دەسڕنەوەو بەئاو خۆیان ناشۆنەوە. ئەو کلێنسە هۆکارێکە بۆتوش بون بەبیرۆ. کەبیرۆ نەخۆشی یەکی پێستی زۆر مەترسیدارە!. کەچی بەداخەوە فەریکە ڕۆشنبیرو لاسایی کەرەوە. وائەزانێ خۆپاککردنەوە بەکلێنس نیشانەی پێشکەوتنە!

ئیمانـــداران: لەنـــاو ئەو (دە) شـــتەدا. پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) زۆر تەئکیدی لەسەر سێ شتیان کردۆتەوە. کەلەم فەرمودەیەدا هاتوە: (مِنَ الفِطْرَةِ حَلْقُ العانَةِ، وَتَقليمُ الاَضافِرِ وَقَصُّ الشَّارِبِ). رَواهُ البُخاري.

واتە: لەفیطرەتە تاشینی موی بەرو، نینۆك کردن وکورت کردنەوەی سمێڵ..

لەبارەی مانای (فیطرە)تیش کەلەفەرمودەکەدا هاتوە، ئیمامی نەوەوی لەشەرحی صەحیحی موسلیم دا ج١ ص٤٩٢دا دەفەرموێ: زۆربەی زانایان دەڵێن مەبەست لەفیطرەت یەعنی سوننەت. هەندێکیش دەڵێن، سوننەت بۆپێغەمبەری خۆمانەو کەووتت فیطرەت ئەوە مانای ئەوەیە سوننەتی هەموو پێغەمبەرانە. هەندێکیش دەفەرمون: فیطرەت بەمانای دین هاتوە..

بەڕێزان: دیاردەیەك کەپێویستە ئاماژەی تەواوی پێبکەین ئەوەیەکە: لەناوگەنجانـــدا بەکـــوڕو کچـــەوە. بەتایبەتی چینی کچـــان وئافرەتان، هێشـــتنەوەی نینۆك تاوەکو زۆر درێژ دەبێ، بۆتە دیاردە. کەبەڕاســـتی

ئەمە شـــتێکی باش نـــی یەو لادانە لەفیطـــرەت. خۆهیچ کەس نی یە ئینـــکاری ئەوە بکات کەنینۆك ئەگەر زۆر ئاگاداری پاکوخاوێنی نەبی. گونجاوترین شوێنە بۆئەوەی کەلەژێر ئەو نینۆکەدا بەکتریاو فیطریات وڤایـــرۆس ومیکرۆبی زۆر کوشـــندە، کەبەچاو نابینرێـــن. کۆببنەوەو گەشـــەبکەن وگەرا دابنێن. پاشـــان کەمرۆڤ نانی خوارد. ئەو ڤایرۆس ومیکرۆبانە، بەتایبەت کەلەکاتی چونەسەر ئاودا چونەتەژێر نینۆکەوە – کەپاشـــەڕۆ پڕیەتی لەڤایـــرۆس وفیطریات وبەکتریای زیان بەخش ولاشـــە ڕزگاری بوە لێیان. ئەگەر زۆر پاکوخاوێنی دەســـت ونینۆکەکان نەپارێـــزرێ، جارێکی تر ســـەرلەنوێ لەگەڵ نـــان خواردندا، دەچنەوە ناودەمـــەوەو لەوێـــوە بۆگـــەدەو ڕیخۆڵەکان ومرۆڤ توشـــی ناڕەحەتی گەورە دەکەن. ئەمە بەهۆی نینۆکی درێژو پیسەوە! لەبەرئەوە پێویستە ژن وپیـــاو گەورەو بچوك هەفتەی جارێك نینۆکیان بکەن. خۆئیســـلام نەیفەرموە کەنابێ هیچ نینۆکت هەبێ، نەخێر دەتوانی لەسنوری خۆی دا بەپاکوخاوێنی ڕایبگری. بەڵام لەســـنور نەچێتەدەرەوە، وەمەبەست پێ ی لاســـایی کردنەوەی بێ دینان وخوانەناسان نەبێ.. لە(صەحیحی موســـلیم)دا هاتوە. کەئەنەس دەفەرموێ: (وقتَ لَنا في قَصِّ الشَّارِبِ وتَقليمِ الاَظْفارِ ونتفِ الإبْطِ وحَلْقِ العانَةِ أَنْ لانَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعينَ لَيْلَة).

واتە: کاتی بۆدانایین بۆکورت کردنەوەی سمێڵو نینۆك کردنو لابردنی موی بن باڵو تاشینی موی بەر، کەلەچل شەو زیاتر نەیهێڵینەوە.

پێشەوا - إبنُ حَجَر - یش لە (فَتْحُ الباري ج١٢ ص٤٦٧ دا دەفەرموێ: (وهذا التَوقيت قَدْ يَخْتَلِفُ بِإخْتِلافِ الاَشخاصِ والاَحْوالِ، والظابِطُ في ذالِكَ هُو الحاجَة).

واتە: ئەم کات دیاری کردنە دەگۆڕێ بەپێ ی کەسەکان وبارودۆخیان. کەبەپێ ی بۆگونجان وپێویستی دەگۆڕێ، بۆنمونە کەسی واهەیە کەبەلابردن وتاشینی موو توشی حەساسیەت ونەخۆشی پێست دەبێت،

ئەمە دەتوانێ تاچل شەو لاینەبات. یان هەیە بەنینۆك كردن توشی ئازار دەبێت، ئەمیش بەهەمان شێوە بۆی هەیە نینۆكی تەواو درێژببێ ئەمجا لاییبات. بەمەرجێ پاكوخاوێنی بپارێزێ.

بەڕێزان: ئەو ئافرەتە بەڕێزانەی كەنینۆكیان درێژ دەكەن ولەدرێژیدا جێگای سەرنجن. وەوادەزانن كەئەمە جوانی بەئافرەت دەبەخشێ. بەبێ گومان بەهەڵەدا چون وتەنها لاسایی كردنەوەیە. ئەینا مرۆڤ بەنینۆك درێژكردن لەفیطرەت دەردەچێ، چونكە فیطرەتی ساغ وتەواو دژە لەگەڵ ئەوەی كەمرۆڤ نینۆكی درێژی هەبێ، چونكە بونی چنگ ونینۆك لەبنەڕەتدا هی باڵندەو دڕندە گۆشت خۆرە هێرش بەرەكانە. كەبەونینۆكە تیژانەیان شەڕ دەكەن. وەبەرامبەرەكەیانی پێ لەناودەبەن. شاعیر وتویەتی:

(إِنَّ المَخالِبَ لِلْوُحُشِ نخالها ..... فَمَتَى رَأَيْنا لِلْظَّباء مَخالِبا؟)..

كەواتە: باخوشكانی بەڕێز، لەفیطرەتی پاكی خۆیان كەنەرم ونیانی وجوانی ئافرەتە لانەدەن ونینۆكی درێژ نیشانەی توندوتیژی وناشیرین كردنی ئافرەتە..

ئیمانداران: یەكێكی تر لەوشتانەی كەزۆر پرسیاری لەبارەوە دەكرێت بریتی‌یە لە: ڕەش كردنەوەی مووی سەرو سمێڵو ڕیش بۆ پیاو، وەقژی سەر بۆ ئافرەت. كەلەم بارەوە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە. بەڵام لەكۆی فەتوای زانایاندا دەتوانین بڵێین كە: دروستە بەكارهێنانی هەموو جۆرە بۆیەیەك بەهەموو ڕەنگەكانیەوە. بەڕەشیشیەوە چ بۆپیاو چ بۆئافرەت. بەڵام بەم مەرجانەی لای خوارەوە:

١. ئەوكەسەی بۆیەی قژی دەكات بەڕەش دەبێت لەتەمەنی گەنجیدابێت، هێشتا كاتی ئەوەی نەهاتبێ كەموی سپی ببێ، بەڵام بەهۆی ویراسی یان نەخۆشی یان تێكچونی هۆڕمۆناتی لاشەی، موی

سپی بوبێ، ئەمە بۆی هەیە بەڕەنگی ڕەش یان هەررڕەنگێکی تر کەپێ ی جوانەو لەگەڵ پێستی دەگونجێ، بۆیەی بکات. بەڵام کەسێك پیربوبێتو چوبێتە تەمەنەوەو سەروڕیشی هەموی سپی بوبێت شیاو نی یە وجوان نیە بۆ ئەو پیرە بەڕەنگی ڕەش موەکانی ڕەش بکاتەوە. هەروەکو لە(صەحیحی) موسلیم دا هاتوە کە: لەڕۆژی فەتحی مەککەدا، باوکی حەزرەتی ئەبوبەکر کەناوی (ئەبوقەحافە)یە، هێنایانە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)، سەروڕیشی وەکو قارچکی سپی وابوو. لەسپی یەتیدا بریسکەی دەدایەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: بیبەنو ڕەنگی موەکانی بگۆڕن بەڵام بەڕەش نا.

کەواتە: بۆپیریش جوانە کەڕەنگی موی سەروڕیشی بگۆڕێ، بەڵام بەڕەنگی ڕەش نا، چونکە لەگەڵ پێستی دەم وچاویدا ناگونجێ ولەهەیبەت وڕێزی ئەوکەسە دادەبەزێنێ، کەبەو تەمەنە زۆرەوە تازە بیەوێ خۆی گەنج بکاتەوە. لەزایانی حەنبەلی، زانای گەورە، (إِبْنُ قُدامَة) فەرمویەتی: سوننەتە ڕەنگکردنی سەروڕیشی سپی بەهەموو ڕەنگێك بێجگە لەڕەش. کاتێ پیرێك دەبینم سەروڕیشی بۆیەکردوە، دڵم پێ ی خۆش دەبێت. جارێکیان پیاوێکی پیرم بینی ووتم: بۆ سەروڕیشت بۆیەناکەی؟! ووتی: شەرم دەکەم. (إِبْنُ قُدامَة) دەفەرموێ: ووتم، پاك وبێگەردی بۆخوا. ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ). بەڵام ڕەنگی ڕەش کەراهەتی هەیە. (المُغْني والشَّرْح الكبير) ج١ ص٧٥.

وەژمارەیەك لەصەحابە گەنجەکان موی سەروڕیشیان بەبۆیەی ڕەش بۆیەکردوە، وەکو: حەزرەتی عثمانو حەسەنو حوسەینو عوقبەی کوڕی عامر، وەلەتابعینیش، وەکو: ئیبن سیرین وئەبوبەردەو غەیری ئەوانیش.

٢. دەبێت مەبەستی ئەوکەسە بەوبۆیەکردنە بەڕەنگی ڕەش.

خەڵەتاندن وفێڵو گزیو ساختەکاری پەنهان کردن نەبێت. وەکو ئەوەی کوڕێك کەتەواوی قژی یان زۆربەی سپی بوە. کاتێ دەچێتە خوازبێنی کچێك، سەری ڕەش بکاتەوەو ئەم کچە وابزانێ ئەم قژە ڕەشە هی خۆیەتی. کەچی پاشان کەگواستیەوە بۆی دەربکەوێ ئەمە بۆیەیە، ئیتر دڵی بگۆڕێ لەهاوسەرەکەی، ئەمە حەرامەو خەڵەتاندنە، یان کەسێك کەتاوانێکی کردوەو لەدەستی یاسا هەڵاتووە، بۆئەوەی نەناسرێتەوە، ڕەنگی قژو ڕیشی ڕەش بکات، لەکاتێکا پێشتر هەموو کەس بەسەری سپی یەوە بینیویەتی، ئەمەش حەرامە.

٢. ئەو ئافرەتەی سەری بۆیە دەکات بەڕەش. بەمەرج گیراوە دەبێت مێردی هەبێتو بەپرسی مێردەکەی بێت، بەڵام ئەگەر کچ بوو. ئەوە دروست نییە، چونکە خەڵەتاندن وپەنهان کردنی تێدایەو دوای ئەوەی شوی کردو هاوسەرەکەی زانی ئەوقژە ڕەشە هی خۆی نییەو بۆیەکراوە، دڵی دەگۆڕێو سەرەنجام ئاژاوەی خێزانی ڕوودەدات..

بەڕێزان: یەکێکی تر لەومەسەلانەی کەلەلایەن خوشکانەوە زۆر پرسیاری لەبارەوە دەکرێت بریتیە لە: (لابردنی مووی زیادەی دەمو چاو)؛ کەپەیدابونی موی زیادە لەدەم وچاوی ئافرەتان یەکێکە لەو هۆکارانەی کەزۆر ئافرەت ئازاردەداتو ماندوو بێزاری دەکات. چونکە جوانی ڕووی ئافرەت ودەرنەکەوتنی موو تێیدا، یەکێکە لەڕەگەزەکانی جوانیو درەوشاوەیی وڕازاوەیی. کاتێك بەشێوەیەکی دیارو بەرچاو هەندێ موو لەسەر ڕووی ئاشکرا بوون. جۆرێك ناشیرینی دروست دەبێت، ئەو ئافرەتە پێی ڕازی نابێتو هەوڵی لەناوبردنی دەدات لەچەند ڕێگەیەکی جیاجیاوە. بۆیە دەتوانین بڵێین: ڕێژەیەکی زۆر لەئافرەتان ئەم گرفتەیان هەیە. بەتایبەتی لەشوێنی بەرچەناگەو سمێڵا، ئەمەش لەئافرەتێکەوە بۆ ئافرەتێکی تر دەگۆڕێت ولەناوچەیەکەوە بۆ

ناوچەیەکی تر ڕێژەکەی جیاوازە. هۆکاری دروست بونی ئەم موانە لەسەر گۆناو چەناگەی ئافرەتان کۆمەڵێ هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە. بەکورتی ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین، لەوانە:

١. هۆکاری بۆماوەیی (العَوامِل الوِراثِیَّة). ئەم دیاردە زیاتر لەناو ئافرەتانی ناوچەکانی دەریای سپی وناوەڕاست وئاسیادا دەردەکەوێت.

٢. بەکارهێنانی هێندێ دەرمان کەدەبێتەهۆی زیادکردن وگەشەکردنی موو لەلاشەی مرۆڤدا، وەك: (کالیکورتیزون) یابەکارهێنانی هۆڕمۆنی نێری بۆ چارەسەری هەندێك نەخۆشی.

٣. گەیشتنی ئەو ئافرەتە بەتەمەن وقۆناغی بێ هیوایی (سَن اليَأْس) لەدوای سوڕی مانگانەو منالْ بوون.

٤. تێکچوونی هۆڕمۆنات لەهەندێك لەڕژێنەکان لەئەندامەکانی ئافرەتدا.

جالەبارەی لابردنی موی دەمو چاو، هەرچەندە کەزانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەبارەیەوە، بەڵام بەگشتی جەماوەری زانایان ڕایان وایە: لابردنو نەهێشتنی مووی دەمو چاوو سمێڵو بەرلێو دروستەو ڕێگەپێدراوە، هیچ گۆڕانکاریو دەستکاری یاساو ڕێسای دروستکراوەکانی خوای گەورەی تیانییە. بەڵکو جێگیرکردنی دروستکراوەکانی خوای گەورەی تێدایە، چونکە ئەسڵ لەدەمو چاوی ئافرەتاندا ئەوەیە موی پێوە نەبێت.

ئیمامی (العَيْني) لە (عُمْدَةُ القارئ، شَرْح صَحيح البُخاري - ج٢ ص١٩٣)دا دەفەرموێ: (ولاتَمْنَعُ الَاَدْوِيَة الَّتي تزيل الكلف وتُحْسِنُ الوجْهَ لِلْزَوْجِ وكَذا أَخْذُ الشَّعْرِ مِنْهُ). واتە: قەدەغەنەکراوە کەئافرەت بۆمێردەکەی خۆی، دەم وچاوی جوان بکاتو خۆی زیاتر جوان بکات، ئەویش بەبەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی کەچەوریو پەڵەی سەردەم وچاو لادەبەن. وەهەروەها

دروسته بۆ مێردەکەی خۆی دەم وچاوی پاکو لوس بکات، بەلابردنی موی سەردەم وچاوی.

هەروەها زانای گەورە (الحافِظ ابنُ الجوزي) فەرمویەتی: (وأمّا الَادْوِيَة الّتي تزيل الكلف وتحسِنُ الوجْهَ لِلْزّوْجِ فَلا أرى بِها بَأْساً). واتە: بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی کەچەوریو پەڵەی سەردەمو چاو لادەبەنو جوانی پێ دەبەخشن، کاتێ ئافرەت بۆ مێردەکەی خۆی بەکاریان بهێنێ، من هیچ خراپەیەکی تێدانابینم. وەپاشان لەمامۆستاکەیەوە کە (عَبدالوهّاب بن المُبارَك الَانماطي)یە هێناویەتی، کەئەویش فەرمویەتی: (إذا أخذت المَرْأَةُ الشَّعْرَ مِنْ وجْهِها لَاَجْلِ زَوْجِها بَعْدَ رُؤيَتِهِ إيّاها فَلا بَأْسَ بِهِ).

واتە: ئەگەر هاتوو ئافرەت موی دەمو چاوی لابرد بۆ هاوسەری خۆی، دوای ئەوەی کەیەکەم جار دەم وچاوی خۆی چۆنە ئاوابینیبوی. ئەوە هیچ خراپەیەکی تێدانی یە. واتە: ئەمە بۆ ئەوکچانەی کەمارەکراون ودەزگیراندارن. مادام یەکەمجار ئەو کوڕەی کەئەم شوی پێ کردوە بەبێ دەم وچاو چاککردن بینیویەتیو پێی ڕازی بوە. ئێستا دوای دەستگیرانی هەرکات ئەم کچە وویستی دەستگیرانەکەی ببینێ، دەتوانێ موی دەم وچاوی لابباو خۆی بۆبڕازێنێتەوە بۆئەوەی زیاتر لەبەرچاوی جوان بێ ولەدڵیا جێگیربێ.

(سُبْحانَ الله)، لەفراوان بیری شەرعزانانی ئەم ئیسلامە. ئەوسەردەمە، باسی بەکارهێنانی دەرمانی دەم و چاوو لابردنی پەڵەو هەروەها سورو سپیاو کەدەمو چاوی ئافرەت بۆمێردەکەی جوان دەکات، باسیان کردوەو هیچ ڕێگریان لێ نەکردوە. بەڵکو تەماشای ئامانجەکەیان کردوە، کەئەگەر بۆمێردەکەی خۆی ئاوا خۆی بڕازێنێتەوەو مەبەستەکەی ئەوەبێ، چاوی هاوسەرەکەی بەبینینی دەم وچاوی پوختو سپیو جوانی گەش ببێتەوەو پێویستی بەوەنەبێ بڕوانێ بۆنامەحرەم.

ئەوە دروستەو بەڵکو زۆر باشیشە.. خۆ ئەگەر ئافرەتێك بۆغەیری هاوسەرەکەی خۆی خۆی بڕازێنێتەوەو مەبەستی ئەوەبێ کەپیاوی بێگانە سەیری بکەن، نەك ڕازی کردنی چاوو دڵی مێردەکەی خۆی. ئەمە حەرامەو بێ شەرعیەکی گەورەیە. جالەبەر دەم وچاو چاککردن وبەکارهێنانی دەرمانی ئاریشتگەکەنا. بەڵکو بەهۆی ئەوەی کەئەم ژنە، بەشێك لەناپاکی هاوسەری تێدایە. کەمێردەکەی خۆی بەلاوە گرنگ نی یەو چاوی لەسەر غەیری مێردەکەی خۆیەتی، بێ گومان هەرشتێ، ئەم وویستەشی بێنێتەدی حەرامە. وەوائەزانم غەیری موسڵمانیش ئەمەی بەلاوە ناڕەوایە، کەژن چاوی لەسەر غەیری مێردەکەی بێ، ئەگەر ئەو ناموسڵمانە فیطرەتی مرۆڤانەی نەشێوابێ!..

هەروەها زانای گەورەو ناودار (إِبْنُ حَجَر العَسْقَلاني) لة فَتَحُ الباري ج١٢ ص٥٠٠ دا باسی کردوە کەخێزانی (أَبی إِسْحاق) فەرمویەتی: شوم کردبوو، ئافرەتێکی گەنجی جوان بوم. چومە خزمەت دایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشەو پێم ووت: (المَرْأَةُ تحفُّ جبينَها لِزَوْجِها) ئافرەت ئەگەر موی ناوچەوانی لابباتو ناوچەوانی هەڵگرێ، مەبەستیشی ئەوەبێ، کەمێردەکەی ڕازی بکات وخۆی بۆئەو جوان بکات، ئایا دروستە؟! خاتوو عائیشە فەرموی: (أميطي الاَذَى عَنْكِ ماﺍسْتَطَعْتِ) هەرچی دەبێتە مایەی ئازارو نیگەرانیت لەموی زیادەی دەمو چاوو پەڵەو زیپکەو هەرشتێ لەناسکی ونازداریت کەم دەکاتەوە، لایبە چەندە دەتوانی، یانی بەچی دەتوانی لایبەی لایبە، جابەدەرمانە، بەلێزەرە، بەهەرشتێکی سەردەمە. (بەمەرجێ لەبواری تەندروستی دا زەرەر بەپێست نەگەیەنێو ئەم لایەنەش دکتۆری پسپۆری پێست بڕیاری لەسەر دەدات).. هەروەها ئیمامی نەوەوی لەکتێبی (المَجموع)دا - ج١ ص٣٤٩ دا فەرمویەتی: (لَوْنَبَتَتْ لِلْمَرْأَةِ لحيَةٌ، اسْتَحَبَّ لَها نَتْفُها وحلقها، لَاَنَّها مثلة في حَقِّها، بِخِلافِ الرَّجُلِ وكَذا

يَستَحَبُّ نتف وحلقُ الشّارِبِ والمنفقة لَها).

واته: هەرئافرەتێك موی ڕیشی هەبوو، سوننەتە هەڵیکەنێ یان بیتاشێ، بەهەرجۆرێك دەیەوێت. چونکە بوونی ئەو موانە دەبنە لەکەو ناشیرینی بۆی بەپێچەوانەی پیاو. هەروەها سوننەتە هەڵکەندنو تاشینی موی سمێڵو بەرلێوو چەناگەی ئافرەتان..

هەروەها (شافیعیەکان) بەشێوەیەکی سەرنجدار فەرموویانە: سوننەتە بۆ ئافرەت هەرکاتێ دەمو چاوو سمێڵی هەبوو لای ببات، ئیتر بەهەڵکەندن بێت، یان بەتاشین، یا هەرشتێکی تری گونجاو، چونکە ئەو موانە دەبنەهۆی ناشیرین کردن ولەکەدارکردنی ئافرەت..

جا سەرنج بدەن. نەك هەربەخراپیان نەزانیوە، بەڵکو بەسوننەتیان داناوە بۆ ئافرەت، کەچی بەداخەوە زۆرکەس لەپیاوان، کەخۆی ڕۆژانە موی دەمو چاوی هەڵدەکەنێ وڕیشی دەتاشێ. کەچی لابردنی موی دەم وچاوی ئافرەتو بەکارهێنانی دەرمان بۆی بەحەرام دەزانێ!! وەخەڵکی واحاڵی دەکات کەئیسلام دژی هەموو جوانی یەکەو ئافرەت بۆی نیە یەك موو لەلاشەی بکاتەوە، چونکە دەستکاری خەڵقی خوای کردوە. وەسەرەنجام ئەم ئیسلامە گەورە، ئەم ئیسلامە فراوانە. کەهەرهەموی جوانی وڕێزی مرۆڤە بەگشتی وئافرەت بەتایبەتی بچوك دەکاتەوەو ئافرەتانێکیش، کەهیچ لەئیسلام حاڵی نین، دەکەونە ڕەخنەو تانەو تەشەردان لەئیسلام کەگوایە مافی ئافرەتی پێشێل کردوەو ناهێڵێ لەئاوێنەشدا سەیری ڕوخساری خۆی بکات!!..

بەڕێزان: مەسەلەیەکی گرنگی تر کەپێویستە قسەی لەسەر بکەین بریتی یە لە (باریککردن ولابردنی موی برۆ). کەیەکێکە لەومەسەلە گرنگ وبەبایەخانەی کەشەقامی ئیسلامی هەندێکی بەخۆوە خەریك کردوە، بەتایبەتی ئافرەتان. لەنێوان ڕێگەپێدان وڕێگەپێنەدان.. سەرەتا بابچینە خزمەت فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کەفەرمویەتی: (لَعَنَ اللهُ

الواشِمات والمُسْتَوشِمات، والنّامِصات والمُتَنَمِّصات، والمُتَفَلِّجات لِلْحُسْنِ المغيراتِ خَلْقِ اللهِ) رَواهُ البُخاري ومُسْلِم.

واته: لەعنەت ونەفرینی خوا لەخاڵکوت بێت ولەوژنەش بێت کەبەئارەزوی خۆی خاڵی بۆدەکوتن ولەدەم وچاو هەڵگرو لەوژنەش بێت کەبەئارەزوی خۆی داوای هەڵگرتنی دەم وچاوو برۆی دەکات، هەروەها لەوژنەش بێت کەبرپەندو زبرە ددانی خۆی باریك وتەنك وشاش دەکات بۆجوانی. چونکە ئەمانە بەم دەستکاریە خۆیان نەخش ونیگارو ڕەنگ وریسی خوا دەگۆڕن..

ئیمانداران: ووشەی (لەعنەت) کەبەکاردەهێنرێ، ئەبێت بۆکردەوەو کارێك بێت کەحەرام بێت لەڕیزی گوناهە گەورەکان بێت. چونکە (لەعنەت) بەمانای دووربونە لەسۆزو بەزەیی پەروەردگار، شتێکی وائاسان وسانا نی یە لەشتێکی بچوکدا بەکاربهێنرێ.

خۆ ئەگەر بەوردی پشکنینێك بەدوای گوناهە گەورەکاندا بکەین دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە گوناهە گەورەکان ئەوانەن. کەبەئەنجامدانی هەریەك لەوانە، لەدەست دان وبەفیرۆدان ولەناوبردنی یەکێك لەپێنج بەرژەوەندیە بنەڕەتیەکان دەبێت. (المَصالِح الخَمْسَة الاَصْلِيَّة). کەئەو پێنجەش بریتین لە: پاراستنی ئاین، پاراستنی ژیری، پاراستنی سامان، پاراستنی وەچەو نەوە، پاراستنی ژیان) ئەوەتە: کوفر کەگەورەترین گوناهە لەدەست دانی ئاینی تێدایە، خواردنەوەی مادە کحولیەکان وماددە هۆشبەرەکان دەبێتە هۆی لەکارخستنی ژیری. دزیو دەست درێژکردنەسەر سامانی خەڵکی، تیابردنیماڵو بنەچەکان تێکەڵ دەبنو کەس نازانێ ئەولادی کێیە.. وەکوشتنی بەناحەقو خوێن ڕشتنو لەناوبردنی ژیانی تێدایە.. هەندێ گوناهی گەورەش هەیە لەژێر ئەم پێنج بەرژەوەندی یە بنەڕەتی یە جێگەی نابێتەوە وەکو: ئازاردانی دڵی دایك وباوك، شایەتی درۆ، فێڵو تەڵەکەو خەڵەتاندن..

هتد. هەربۆیە دەبێ ئەسڵێکی تر زیادبکەینو ناوی بنێین: پاراستنی ئاسایش. ئەم ئاسایشەش دووبەشە، بەشێکی ناوخۆیی یە وەکو: دوربوون لەغەیبەت وشایەتی درۆو فێڵو وێنەی ئەمانە، بەشەکەی تریشی پاراستنی ئاسایشی دەرەوەیە وەك ئەوە کەسێك بیەوێ دۆستایەتی لەگەڵ دوژمنانی ئایینو گەل ونیشتمانەکەیدا بکات.. جائەگەر بەوردی لێکۆڵینەوە لەسەر هەموو ئەوشتانە ئەنجام بدرێت کەنەفرینیان (لَعْنَة) لەسەرهاتووە، ئەگەر لەدەست دانی هیچ یەکێك لەوشەش شتە بنەڕەتیانەی تێدانەبێت کەباسمان کرد. ئەوا ئەو قەدەغە (نەهی) کردنە، دەربارەی حاڵەتێکی تایبەتی دەبێت، یان سیفەتێکی تایبەتی. کەواتە: لێرەوە دەتوانین ئەوپرسیارە بکەین: باشە ئەو فەرمودەیەی نەفرینی (لەعنەتی) کردوە لەوئافرەتانەی دەستکاری برۆکانیان دەکەن، فەرمودەیەکی ڕاست ودروست وبێ گومانە، خۆلابردنی برۆ یەکێك نی یە لەوشەش شتەی کەباسمان کرد. ئەی چۆن لێی تێبگەین وراڤەی بکەین؟! ئەوانەی ئەم فەرمودەیان گێڕاوەتەوە لەوسەردەمەدا، ڕاڤەی ووشەی (النّامِصَة والمُتَنَمِصَة) یان نەکردوە. مەبەستەکەیان دیاری نەکردوە بۆمان کەئایا ماناکەی گشتی یە یان سیفەتێکی تایبەتە کەلەکاتی ووتنی فەرمودە (سَبَب وُرود الحَديث) یەکێکە لەوهۆکارە سەرەکیانە بۆتێگەیشتن لەو فەرمودەو پاشان وەرگرتنی بڕیارو حوکم لێی. ئێستاش ڕاوبۆچونی هەندێ لەزانایان باس دەکەین بەکورتی، کەڕاڤەو تەفسیریان لەبەرامبەر فەرمودەی (النامِصات والمُتَنَمِّصات) کردوە. کەهەریەکەیان ڕاوبۆچونی زانایەکی گەورەیە:

١. هەندێك لەزانایانی شەرع دەفەرمون: دەستکاری کردنی برۆ حەرامەو قەدەغەیە، جگە لەوکاتە نەبێت کەمێردەکەی ڕێگەی پێدابێت. ئەوکاتە دروستەو ڕێگە پێدراوە. چونکە ئافرەت پێویستی

بەخۆجوانکردن وخۆڕازاندنەوەیە بۆمێردەکەی. مادام بەپرسی ئەوبێت. دروستەو هیچ جۆرە فێڵو خەڵەتاندنێکی تیانییە.

ئەمەش لە (فَتْحُ الباري ج١٠ ص٣٧٨، وە: مُغْني المُحْتاج - الخَطيب الشربيني، ج١ ص١٩١)دا هاتووە. کەدانەری (مُغني المُحْتاج)، لەگەورە زانایانی مەزهەبی شافیعی یە.

٢. هەندێکی تر لەزانایانی شەرع. برۆ باریك کردنەوە، ئەبەستنەوە بەنیەتی ئەو ئافرەتەوە، وەدەفەرمون: ئەگەر بەمەبەستی خۆڕازاندنەوەبێت بۆنامەحرەم، ئەو کارە ئەنجام بدات، حەرامە. بەڵام ئەگەر بۆ مێردەکەی بێت دروستەو ڕێگەپێدراوە چونکە ئافرەت پێویستی بەجوانکاری وخۆڕازاندنەوە بۆمێردەکەی هەیە.

کەئەمەش لە (حاشِيَة إِبْنُ عابِدين ج٦ ص٣٧٣)دا هاتوە، لەمەزهەبی ئەبوحەنیفە.

٣. هەندێکی تر لەزانایانی شەرع دەفەرمون: دەستکاری کردنی برۆ بۆئافرەتێك حەرامە کەلەڕوی شەرعیەوە ڕێگەی پێنەدرابێت بەخۆڕازاندنەوە، ئەمەش ئەو ئافرەتانە دەگرێتەوە کەمێردەکەیان مردوە. یان مێردەکەیان ون بوون. (مَفقود). بێجگە لەمان بۆئافرەتانی تر دروستەو ڕێگەپێدراوە. هەروەکو لەکتێبی: (الفَواكه الداني، ج٢ ص٣١٤ي شرح الشَّيْخ أَحمد بن غنيم النفراوي المالِكي)...

٤. هەندێکی تر دەفەرموون: دەستکاری کردنی برۆ حەرامەو قەدەغەیە لەم دووکاتەدا:

- ئەوەی بۆخەڵەتاندن وساختەکاری وپەنهان کردن وگزی بێت..

- یا ئەوەی هێماو دروشم بێت بۆئەو ئافرەتانەی کەسۆزانین وڕەوشت نزم ولەش فرۆشو داوێن پیسن. هەروەکو لەکتێبی (أَحكامُ النِّساء - إِبْنُ الجوزي ص٣٣٩ وە - الفروع ج١ ص١٠٨، وە - الإِنْصاف ج١ ص٢٧٠)دا هاتوە.

٥. هەندێکی تریش لەزانایان وەکو (إِبْنُ جَرير الطَّبَري) کەیەکێکە لەگەورە زانایانی ئیسلام فەرمویەتی: دروست نی یە گۆڕانکاری لەشتێکدا کەخوای گەورە گەورە دروستی کردوە. بەبێ زیاد کردن یان کەم کردنی، بۆمێرد بێت یان بۆغەیری مێرد. وەك ئەوەی ئافرەتێك هەردوو برۆکانی بەیەکەوە پەیوەست بوبن، بیەوێ لێکیان جیابکاتەوەو ناوەندەکەیان لابەرێت. هەروەکو (المُحَلّى- إِبْنُ حَزم الظاهري ج٢ ص١٣٨، ونيلُ الَاوصار، الشَوْكاني ج٦ ص٢١٧)دا هاتوە.

٦. زانای گەورەی مەزهەبی شافیعی، ئیمامی نەوەوی لە (المَجْمُوع ج١ ص٣٤٣)دا دەفەرموێ: برۆ دەستکاری نەکرێت باشترەو کەڕاهەتی هەیە لابردنی مووی برۆ.

بەڕێزان: ئەمە ڕاوبۆچونی زانایان بوو لەسەرباسی باریککردنەوەو لابردنی موی برۆ، کەبەگوشراوی ئەوەی لێ ی تێدەگەین وگونجاویشە لەگەڵ بارودۆخی ئەم ڕۆژگارەی ئیمڕۆمانو جیهانی ئیسلامی، ئەوەیە: (هەر ئافرەتێك برۆکانی درێژبون، یا پەیوەستبونەوە بەیەکەوە. یالەشێوەی ئاسایی برۆی سروشتی دەرچوون. دروستە لابردنی ئەو زیادە موانە. یان کورتکردنەوە بەهەرشتێك بیەوێ، ئیتر ئامێری مقەست بێت یالێزەر یاهەرشتێکی تر، چونکە ئەم ئەندازە ساختەو گزی وپەنهان کردن وخەڵەتاندنی تێدانی یەو نەخش ونیگارو ڕەنگ وڕیسی خوا ناگۆڕن. ئەوەی کەهەموو زانایان یەکدەنگن لەسەر نادروستی وڕێگەپێنەدانی ئەوەیە: بەتەواوی برۆکان لابەرێت. بچێت برۆی دەستکرد (تاتۆ) لەشوێنەکەیاندا دابنێت. زانای ناودار (د.وهْبَة الزُّحَيلي)، لەکتێبەکەیدا فَتاوى معاصِرة. ص١٦٧)دا فەرمویەتی: (واسْتَثْنَي مِنَ النَّماص. أَخْذُ بَعْضُ الشعراتِ مِنَ الحاجِبِ الثَّخين. لَاَنَّ ذلِكَ لايُسَمَّى نَمْصاً، لَاَنَّ النَّمْصَ المَنْهِيَ عَنْهُ هُو نَتْفُ جَميعِ الحاجِبِ) واتە: ئەوەی نەفرەتی

لێکراوه لەفەرمودەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەو برۆ لابردنە ناگرێتەوە کەهەندێ موو لەبرۆی پڕو گەورە لاببرێن ورێك بخرێن. بەڵکو ئەوەی نەفرەتی لێ کراوەو قەدەغەکراوە، لابردنو هەڵکەندنی تەواوی هەردوو برۆکانەو دانانی برۆی دەستکردە لەشوێنیاندا..

ئامۆژگاریو بیرهێنانەوەشمان بۆهەموو خوشکانی بەڕێز ئەوەیە: لەم مەسەلەی چاککردنی (برۆ)دا. لەبەرئەوەی زانایان یەکدەنگ نین لەسەری. هەندێ بەحەرامو هەندێ بەمەکروهو هەندێ ڕێگەیان پێداوە، زیادەڕەوی نەکەن وبەپێ ی توانا هەوڵبدەن کەمتر دەستکاری بکەن. ئەوەش کەبرۆکانی نارێك وچڕوپڕن، دەتوانێ دەستکاریان بکات تادێنەوە سنوری سروشتی خۆیان. لەبەرئەوەش کەدەستکاری کردنی برۆکانو هەڵکەندنی مووی برۆ. بەڕێژەیەکی زۆرو بەردەوام، زەرەرو زیانێکی زۆر لەپێستی پشت چاوی ئەوکەسە دەدات کەموەکە هەڵدەکەنێ. وەڕەنگە کاریگەری زۆرخراپی لەسەر ئەو دەمارە ووردانە هەبێ. کەبەشوێنی برۆدا تێدەپەڕن. چونکە لەزانستی پزیشکی دا دەڵێ: نزیکەی (٤٥) میل دەمار بەناولەشی مرۆڤدا تێدەپەڕێت. دەی زۆر نزیکە لەکاتی ئەو دەستکاری کردنی برۆیەدا یەکێ لەودەمارە زۆر ووردانە زیانی پێ بگات وئەو ئافرەتە توشی گرفتی تەڤینی دەماری ژێر برۆ ببێت وشین بونەوەو خوێن بەربونی ناوەوە ڕوبداتو ئەوکات چارەسەری زۆر گرانە!! هەروەها هەندێ لەپزیشکانی چاو فەرمویانە: هەڵکەندنی موی برۆ دەبێتە هۆی ووشك بونی بۆری فرمێسك ڕێژ لەچاوداو چاو وەکو پێویست ئەو مادده پاککەرەوە، کەفرمێسکە نایرێژێ. جابەڕاستی ئەم پێغەمبەرە دڵسۆزە. کەبەنصی قورئان، (بِالْمُؤْمِنِيَن رَؤُوفٌ رَحِيمَ). هەرشتێ هەرکارێ، بچوکترین زەرەرو زیانو ئازار بەمرۆڤ بگەیەنێ، لێی ئاگادار کردوینەوەو بەتوندی ڕای چڵەکاندوین کەئاگاداربین ئەوکارە نەکەین، چونکە مەترسی لەڕێگادایە. خۆزگە کەسێ بڵێ: باشە

دميان وسەدان ئافرەت برۆشی چاككردوە هەیە هەربەتەواوی لایداوەو برۆی تری داناوەو هیچیشی لێ نەهاتوە؟! لەوەلامدا دەڵێین: كاتێ دەوترێ مەترسی لەسەر فلان شت هەیە، مەرج نیە یەك بەیەكی ئەوكەسانە توش ببن، وەكو ئەوەی كەسێ ئامۆژگاری كەسێك دەكات كەئاگاداربە دەستكاری مین مەكە، بەلام ئەو هەردەستكاری دەكات ودەگونجێ هیچیشی لێ نەیەت. دەشگونجێ لەپڕێكا یەكیان پیابتەقێتەوەو نابیناو بێ دەست وقاچی بكات. ئەگەر نەیكوژێ، خۆكەس نی یە زەمانی سەلامەتی بداتێ، وەپاشانیش مەرج نیە ئەو زەرەرو زیانەی لەبرۆ هەڵگرتندا دروست دەبێ. هەرلەیەكەم سەعاتەوە هەست پێ بكرێ. بەڵكو لەوانەیە دوای چەند ساڵێك ئەمجا نیشانەكانی لێ دەربكەوێ.. ئەی نابینی جاران ئافرەت زۆركەم چاوی كزدەبوو. وەچاویلكەی لەچاو دەكرد. بەلام ئەمڕۆ هەربەگەنجی چاوی كزدەبێ وزۆربەی ئافرەتان چاویلكەیان لەچاودایە. كەڕەنگە یەكێ لەهۆكارەكانی ئەو هەڵكەندنی موی برۆیەبێت وەبەخوشكانی بەڕێزو ئافرەتانی ئیماندار دەڵێین: باڵەجیاتی ئەوەندەی بەبرۆ باریك كردنەوەوە خەریكن. خەریكی وردبونەوەبن لەدروستكردنی برۆكاندا، كەخوای گەورە چۆن وەكو جوانیەك بەمرۆڤ بەگشتی وبەئافرەت بەتایبەتی بەخشیوە، وەچۆن ئەوبرۆیە باشترین پارێزەرە لەوەی كەعەرەقی ناوچەوانی مرۆڤ بچێتەوە ناوچاوی یەوە. وەپاشان وەرە بەراوردێك بكە لەنێوان مووی (برۆ) لەگەڵ موی (برژانگ)دا، كەچۆن دەسەلات وكارسازی خوای خالیقمانی تێدا دەردەكەوێ، سەیركە موی برۆ نەرمە. بەملاولادا لادەدرێ، بەلام موی برژانگ ڕەق وتیژەو لارنابێتەوە!! چونكە ئەگەر موی برۆ وەك برژانگ بوایە، ئاوا تیژو ڕێك بوایە، چ ناشیرینیەكی دەبەخشی بەمرۆڤ وچۆن هیچ عەرەقەیەكی ناوچەوانی بۆلانەدەدراو هەموی دەهاتە ناوچاوەوە. وەبەپێچەوانەشەوە ئەگەر موی برژانگ نەرم وشل وخاو بوایە وەكو موی

برۆ، ئەوا بەردەوام دەچوە ناوچاوەوەو خۆزۆربەمان ئەوەمان بینیوە، کاتێ یەك تاڵ موی برژانگ دەکەوێتە ناوچاوەوە چی ڕوودەدات وچۆن تادەری دەکەین هەراسان دەبین. وەهەروەها ئەگەر موی برژانگ ئاوا تیژو ڕەق نەبوایە، ئەودەورە کاریگەرەی کەبۆی دیاری کراوە لەشکاندنەوەی تیشکی خۆر کەناهێڵێ ئازار بەچاو بگەیەنێ. وەگرتنەوەی تەپوتۆزو نەهێشتنی بۆگەیشتنی بەناوچاو. ئەو دەورەی نەدەماو دەبوایە هەمووکەس هەرکەچوە بەرخۆر چاویلکەیەکی ڕەشی لەچاودابوایەو هێشتا لەمەترسی تیشکی خۆر بۆسەرچاوی ببەش نەدەبوو. دەی توخوا ئەمە غەیری (الله) کێی تر، توانی ئاوا ئەو دوو مووەی برۆو برژانگ ئاوا ڕێك بخات؟! پاشان سەرنج بدەو بیر لەعەزەمەت ودەسەڵاتی خواو لەکاربەجێیی خوا. کەچۆن موی برۆو برژانگ کەگەیشتە ئاستی پێویستی خۆی دەوەستێو لەوە زیاد ناکاتو پێویستی بەچاککردن وکورت کردنەوە نییە! (سُبْحانَ الله) چەند سانتیمەترێ لەپشتی برۆوە قژی سەر هەیە. هەرلەو پێستە ڕواوە، کەچی ئەوقژی سەرە بەردەوام زیاد دەکات وچاککردنی دەوێ. بەلام ئەو موی برۆو برژانگە هەرلەپەنای ئەوەوەو هەرلەسەر ئەو پێستە. لەئەندازەی دیاری کراوی خۆی تێناپەڕێو خۆ خوانەکردە زیادی بکردایە دەبوایە کورتمان بکردایەوەو ئەوکاتیش توشی چەندین نارەحەتی دەبوین، کەووردە موی کاتی چاککردنی دەکەوتە ناو چاومانەوەو توشی زۆر نارەحەتی دەبوین، یاخود: ئەگەر موی برۆو برژانگ وەکو موی سەرو ئەندامەکانی تری لاشە زیادی بکردایە. ئەوا ئەوانەی ماوەیەك دەکەونە حاڵەتی تەنگانەو نارەحەتی وسجنەوە، وەناتوانن دانیشن مووی لاشەیان کورت بکەنەوە. ئەوە ئەوکاتە، بەهۆی درێژبونەوەی موی برۆو برژانگ مرۆڤ چاوی دادەخراو دەبوایە بۆبینینی تۆزێ ڕووناکی یان دیمەنێك، زۆر هەوڵی بدایە تائەو موانەی برۆو برژانگی لابردایەو پاشان دادەپۆشرایەوە!!

کەچی بەرەحم وبەزەیی خوا، ئەگەر مرۆڤ چەند مانگو ساڵیش نەتوانێ موی لاشەی کورت بکاتەوەو لاببات. هەرگیز توشی ئەوگرفتە نابێت کەموی برۆو برژانگی بێنە ناوچاویەوە!!، دەی ئائەمە غەیری قودرەتو دەسەڵاتی خوا کێ بەخشی بەمرۆڤ؟!! (سُبْحانَ الخالِق). دەی باسوپاسی خوای لەسەربکەین وخوشکان بەتایبەتی ناشکوری بەبرۆو برژانگەکانی چاویان نەکەنو بیرلەوەبکەنەوە، ئەگەر هەربرۆیان لێ نەڕوایە چیان دەکرد. چونکە خوای گەورە جاروبارێ مرۆڤی ئاواشمان دەخاتە بەرچاو کەهیچ مویەکی بەلاشەوە نىیەو برۆو برژانگو قژی سەری نىیە. بزانە لەچ نارەحەتیەکدا دەژی: دەی بۆ سوپاسی پەروەردگارت ناکەی! بەڕاستی (أَصْدَقُ القائِلين) کە (الله) یە. جوانی فەرموە: (لَقَدْ خَلَقْنا الإنْسانَ في أَحْسَنِ تَقويم). وەفەرمویەتی: (يأَيُّها الإِنْسان ماغَرَّكَ بِرَّبِكَ الكريم، الَّذي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ، في أَيِّ صُورَةٍ ماشاءَ رَكَّبَكَ).

لەکۆتایی ووتارەکەماندا: ئەوەی کەماوەو پێویستە ئاماژەی پێ بکەین بریتی یە لە (نینۆك بۆیەکردن). کەبەڕاستی دەبێ ئافرەتان لەخوشکان ودایکانی بەڕێز ئاگاداربن کە: بەکارهێنانی بۆیەی نینۆك لەدوو ڕووەوە قەدەغەیە بەکارهێنانی:

١. توێکڵ لەسەر نینۆك دروست دەکاتو ناهێڵێ ئاوی بەربکەوێ، بەم شێوەیە دەست نوێژو غوسڵی ئەو ئافرەتە دروست نابێ، کەئەمەش نوێژی لێ قەدەغە دەکات!

٢. زانایانی پزیشکی دەفەرمون، وەکو لەگۆڤاری (پزیشکی نوێ) ژ:٨. لاپەڕە ١٢دا هاتووە کە: بۆیەی نینۆك، قەڵەمی چاو، سوراوی لێو، ئەمانە هۆکاری سەرەکین بۆئەوەی ئافرەت توشی نەخۆشی پێست بکەن، بەتایبەتی نەخۆشی (بیرۆ). ئالێرەدا گەورەیی شەریعەتی ئیسلام دەردەکەوێ، کەهەرچی قەدەغە دەکات، لەقازانجی مرۆڤ خۆیەتی وهەمووی لەسەر

بنەمای زانستی بۆسودی مرۆڤو لادانی زیان لیٚ دانراوەو مرۆڤ تەنها بەپەیڕەوکردنی شەریعەتی ئیسلام بەختەوەر دەبیٚ. بەڵام هەروەکو پێشتریش ووتمان: ئیسلام مەنعی جوانی لەئافرەت نەکردوە، بەڵکو هانی داوە، ئەوەتا کاتیٚ مەنعی بۆیەی نینۆکی لیٚ دەکات، کەتوێکڵ دروستدەکاتو ئەو نینۆکە دەمرێنیٚو لەگەشەی دەخاتو کونیلەکانی دادەخات. شەرع خەنەی بۆداناوە. کەهەم جوانی دەبەخشیٚو هەم سودی زۆر دەبەخشیٚ بەنینۆکو پەنجەی ئافرەت. کەبەڕاستی (خەنە) لەزۆرکۆنەوە، لەپێش زاینەوە هەبوەو وەکو چارەسەرێکی پزیشکی بۆنەخۆشی یەکانی پێست بەکارهاتووە. وەیەکێکە لەوشتانەی کەلە دێرزەمانەوە بۆ جوانکاریو ڕەنگ کردنی قژ بەکارهاتوە. کەهەرچەندە بەداخەوە ئەوخەنەی ئەمڕۆ بەهۆی ئەوەی کەجگە لەخەنەی ئەصڵی کەماددەیەکی سووکە. شتی تری تێکەڵ دەکەن بۆئەوەی قورس بیٚ لەکێشانداو ئەمەش لەکاریگەری سودەکانی کەم دەکاتەوە. بەڵام هێشتا هەرسود بەخشەو دوورە لەزیان گەیاندن. دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە دەفەرمویٚ: جارێکیان ئافرەتێك لەپشتی پەردەوە شتێکی دایە دەستی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەمە دەستی پیاوە یان هی ئافرەت؟! کەسەکە ووتی: دەستی ئافرەتە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (لَوْكُنْتِ إِمْرَأَةً لَغَيَّرْتِ أَظْفارَكِ بالْحَناءِ). ئەگەر ئافرەت بویتایە، ئەوە نینۆکەکانت ڕەنگ دەکرد بەخەنەو خەنەت لەدەستو پەنجەت دەدا.. بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت کەئیسلام نەك هەردژی جوانیو خۆڕازاندنەوە نییە. بەڵکو فەرمانی پیٚ دەکات وهەرگیز ڕێگری لەهیچ حەزو ئارەزویەکی فیطری مرۆڤ بەگشتیو ئافرەت بەتایبەتی ناگریٚ. بەمەرجیٚ ئەو خۆڕازاندنەوەو خۆجوانکردنە لەڕوی تەندروستییەوە بۆ ئێستاو بۆداهاتوی زەرەر لەومرۆڤە نەدات، کەئەمەشی قەدەغەکردوە،

هەرلەبەر خاترو ڕێزی مرۆڤە. بەڵام بەداخەوە زۆرجار موسڵمانان توشی (إفْراط وتَفريط) دەبن. زیادەڕەوی وکەم تەرخەمی دەکەین، ئەوەتا ئافرەتی واهەیە لەماڵەوە پیرەژنە. کەچی لەدەرەوەی ماڵ کچێکی چواردە ساڵە!! بۆ هاوژینو هاوسەرەکەی هیچ خۆی ناڕازێنێتەوە، بۆنی خۆش لەخۆی نادات، جلوبەرگی جوان وسەرنج ڕاکێش لەبەرناکات، کەچی بۆدەرەوەو بۆبەرچاوی گورگەکان، واخۆی دەڕازێنێتەوە کەڕەنگە مێردەکەی خۆی نەیناسێتەوە، خۆجاری واهەیە پیاوانیش ئاوان، بۆ ژنەکانی خۆیان خۆیان ناڕازێننەوە، کەچی کاتێ لەماڵ دەچنە دەرەوەو سەفەردەکەن، ئەمجا گرنگی بەخۆیان دەدەنو خۆ دەڕازێننەوە!. یاخود ئەگەر سەرنج بدەی!. ئەوەندەی (صالۆنی جوانکاری ئافرەتان هەیە، سەنتەری لێزەر بۆ برۆ باریك کردن هەیە) ئەگەر ئەوەندە سەنتەری توێژینەوەی زانستیو ڕۆشنبیریمان هەبوایە، بەسمان بوو!

بەئومێــدی ئەوەی کە (إنْشـاءالله) پابەندبیــن بەئاینی پیرۆزی پڕ ڕەحمەتــی پڕجوانیو جەمالی ئیســلامەوە. وەدووربیــن لەزیادەڕەویو کەمتەرخەمــیو خــوای گەورە ڕەحمــان پێ بکاتو ژیانــی هەردوو دنیامان بەختەوەری بێت. اللّهُمَّ آمين.

سەرچاوەکان:

١. يَسْأَلُونَكَ، د.حسام الدِّين عَفّانَة ج٢ جُزء:٤ ص٤٢١، ص٤١٥.

٢. گۆڤاری پزیشکی نوێ، ژ:٨. شوباطی٢٠١٠، ل١٢.

٣. فتاوى مُعاصرة. د.وَهْبَة الزُّحَيلي. ص١٩٧، ص١٧٦.

٤. وولامەکانی تۆ، م.أحمدی شافعی. ل١٢٧، ل١٩-٢٤.

# ووتاری یەکەم
# بۆ مانگی جمادي الأولی
# هاتنی ڕۆژی قیامەتو
# یادی کارەساتی
# ئەنفال

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمَعِينَ:

ئيماندارانی بەڕێز: پێشــینانی ئێمە، ســەلەفی صاڵحی ئەم ئومەتە، ئەگــەر هەســتیان بكردایە دڵیــان ڕەق بووە، دەچون بــۆلای یەكترو بەیەكتریــان دەووت: (تَعالَ، إجْلِسْ بِنا نُؤمِنْ ســاعَةَ). وەرە باچەند كاتێك بەیەكەوە دانشین وئیمانەكەمان تازەبكەینەوە. دەی بائێمەش لەم چەند خولەكەدا، لەم ووتارەدا، هەندێ لەسەرقاڵی دونیاو بگرەو بەردەی بازاڕ دووربكەوینەوەو باسی قیامەت بكەین. لەڕۆژگارێكی وەكو ئەمڕۆدا، ئەم ووتاری ڕۆژانی هەینی یە، بەوویســتی خــوا، ئاودانی درەختی ئیمانە. چونكــە ئەگەر ووریانەبی، ئەوا دڵت ڕەق دەبێ، تاوای لێ دێ لەبەرد ڕەقتر دەبێ، (ثُمَّ قَسَــتْ قُلُوبُهُمْ فَهِيَ كالْحِجارَةِ أَوْ أَشَــدُّ قَسْوة، إنَّ مِنَ الحِجارَةِ لَما يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الآنْهار)..

بەڵام ئومێدەوارین بەڕەحمی خوا، ئێمەی ئەهلی جومعەو جەماعەتو مزگەوت، لەوكەسانەبین كەخوای گەورە لەبارەیانەوە فەرمویەتی: (إنَّما المُؤمِنُــونَ الَّذينَ إذا ذُكِرَ اللهُ وجِلَتْ قُلُوبُهُــمْ، وإذا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ اياتُهُ زادَتْهُمْ إيماناً وعَلى رَبِّهِمْ يَتَوكَّلُونَ).

جابــۆ نەرم كردنەوەی دڵەكانمان وشــەحن كردنەوەی ئیمانەكەمان وزیادكردنی چاكەكانی قیامەتمان، بەپشتیوانی خوا. لەم ووتارەدا باسی قیامەت دەكەین. كەبڕوابوون بەقیامــەت لەبناغەكانی ئیمانە. كەچی بەهۆی ســەرقاڵی زۆرمــان بەدنیاوەو ماددی گەرایی ئــەم ڕۆژگارەوە، خەریكە لێی بێئاگا دەبین. (إقْتَرَبَ لِلْنّاسِ حِسابُهُمْ وهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ).

بەڵــێ، چەنــد هەناســە دەدەی، چەند شــەو دەكەی بــەڕۆژو ڕۆژ دەكەی بەشــەو، چەند ســاڵ لەتەمەنــت تێدەپەڕێ. تــۆ لەقیامەتت نزیــك دەبیتەوە. چونكە بەمردن قیامەتی تۆ دەســت پێ دەكات. هەر لەوكاتــەوەی كەخرایتــە نــاو دارەمەیتەكەوە، ئــەو دارەمەیتەی كەوا

قســـەت لەگـــەڵ دەكاتو بەزمانی حاڵ پێت دەڵێ: (أَنا المُهَــيءِ لِنَقْلِكَ، كَمْ صــارَ مِثْلِي بِمِثْلِكَ). من ئامادەكراوم كەبت گوازمەوە ئەمڕۆ ناتوانی لەناو ئۆتۆمبێلەكەتدا لەپشـــتی ســـوكانەوە دابنیشـــی. ئەمڕۆ ناتوانی لەسەر كوشنی ئوتومبێلەكەت دابنیشی. بەڵكو دەبێ ڕاكشێ ی. وەلەناو منیشدا ڕابكشـــێ ی. من ئێســـتا لەماڵەوە دەتگوازمەوە بۆمزگەوت، لەوێشـــەوە بۆســـەر گۆڕســـتان، ئای چەند دارەمەیتی وەكو من. چەندی وەكو تۆی گواستەوە.

بەڵـــێ هەرلەناو ئەو دارەمەیتەدای كەچارەنوســـت دیـــاری دەكرێ، ئـــەوەی پیاوچاكەو خواناســـە. هـــاوار دەكات ودەڵێ: (قَدِّمُـــونِي، قَدِّمُونِي). پێشـــم خەن، پێشـــم خەن توخوا پەلەبكـــەن. زوو بمگەیەننە ناو ئەو باخچەیـــە لەباخچەكانی بەهەشـــت. چونكە ئەو مـــردوە لەكاتی ڕوح دەرچوندا شوێنی خۆی نیشان دەدرێ كەجێگای بەهەشتە. خوای گەورە لەوكەســـانەمان حیساب بكات. بەڵام پەنابەخوا خوانەناس وخراپەكار، هـــاوار دەكات ودەڵـــێ: (ياوَيْلَها أَيْنَ تَذْهَبُونَ بِهـــا). ئەی هاوار بۆخۆم. ئای قوڕبەســـەری بۆخـــۆم. توخوا بۆكوێم دەبەن. بـــۆ واپەلە دەكەن؟! من شـــیوێك، چاڵێـــك لەچاڵەكانی دۆزەخم بۆئامادەكراوە. شـــوێنی خۆمم لەكاتی ڕوح دەرچوندا بینیوە، دەئیتر بۆ ئاوا بەپەلە دەمبەن بۆناوی!!

بەڵێ بەڕێزان، دڵنیابن، هەموو كەس ئاوا لەناو ئەو دارەمەیتەدا هاوار دەكات، بـــەڵام ئێمە گوێمان لێ نی یەو ئەوەش ڕەحمی خوایە، چونكە ئەگەر گوێمان لێ بوایە هیچ كەس مردویەكی بۆ نەدەشاردرایەوە. بەڵام ئەوەی گرنگە كە ئێمە لەوانەبین كەهاوار دەكەن پێشمان خەن، پێشمان خەن بۆبەهەشـــت. نەك پەنابەخوا بڵێین: ئـــەی هاوار بۆخۆمان ئەوە بۆكوێمـــان دەبەن.. بەڵێ دوای ئەوەی هیچ مرۆڤێك، هیچ زیندەوەرێك لەســـەر زەوی نامێنـــێ، وەئەم لاپەڕەی ژیـــان وژینگەیە دەپێچرێتەوە.

ئەمجـا قیامەت دەسـت پێدەکات ئەویش بەزینـدوو بونەوەی هەموو زیندەوەران ومرۆڤەکان.

﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴾ یس: ٥١.

سەرنـج بدەن. نافەرموێ: (يَأْتُونَ، يَسيرُونَ، يَتَوجَّهُونَ) بەڵکو دەفەرموێ: (يَنْسِلُونَ). بەبێ ڕاگیری، بەنەرمی بۆمەیدانی مەحشەر دەڕۆن.

بەڵێ، کاتێ کەخەڵکی لەقەبرەکانیان هاتنە دەرەوە، کافرو بێ باوەڕ هاوار دەکات، ئاڵـەورۆژەدا دەبینی کەبەملیارەها مولحید هاوار دەکات. (ياويْلَنا). ئای هاوار بۆخۆمان، ئای قوڕبەسەر خۆمان، ئای تازە تیاچوین! (مَـنْ بَعَثَنا مِـنْ مَرْقَدِنا). ئەوە کێ ئێمەی لەم قەبرە هێنایە دەرەوە؟! خۆ ئێمە دەمانگوت: ژیان هەرئەم ژیانی سەردونیایەیە. کەمردی دەبیتەوە بەخاکو تەواو. بەڵام خۆ زیندوبوینەوە. (ياويْلَنا) ئەی هاوار بۆخۆمان، خـۆ هیچمان پـێ نـیـە بۆئـەم ڕۆژە!! ئاڵەوکاتەدا لەلایـەن خواوە بانـگ دەکرێ. (هذا ماوعَدَ الرَّحْمن). سـەرنـج بـدەن ئیماندارانی بەڕێز، نافەرمـوێ: (هذا ماوعَدَ الله). نافەرموێ: (هـذا ماوعَدَ العَزيز). نافەرموێ: (هذا ماوعَدَ الجَبّار). بەڵکو لەناو هەموو ناوەکان وسیفەتە بەرزو باڵاکانی خـوای پەروەردگاردا دەفەرمـوێ: (هذا ماوعَدَ الرَّحْمـن). ئائەمە بەڵێنی خوا میهرەبانە. جابەبیسـتنی ووشـەی (الرَّحْمن) ئیمانداران ئەوترس و قەلەقیەیان نامێنێ. چونکە دەزانـن بۆبەردەم خوای (الرَّحْمن) دەچن. کافرانیش بەبیستنی ووشـەی (الرَّحْمن)شەرمەزارتر دەبن، خەجاڵەتتر دەبـن. ئەمجا دێتەوە بەرچاویان کەخوای گـەورە لەنەبونەوە خەڵقی کردون. لەسـکی دایك دا گەورەی کردن، ئەو هەموو ماوەیە لەناوسکی دایکیاندا خۆراکیان وەرگرت وگەشـەیان کردو هیچ پیسیەکیان نەکردە ناوسـکی دایکیان!، بەپاکـی لەدایك بوون، کەلەدایکیش بوون شـیری مەمکـی دایکی بۆ ئامادەکردن. کەبەڕاسـتی شـیری دایك بەسـە بۆ

ئەوەی مرۆڤ ســەری بەندایەتی لەحزوری پەروەردگاریدا دابنەوێنێ.
کەبەڕاســتی گەورەیــی ودەســەڵاتی خــوا چــۆن لەشــیری دایــك دا دەدرەوشێتەوە. شــیری دایك پێکهاتەکانی لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تری ژیانی منالْ دەگۆڕێت. واتە: شــیری دایکێك کەمناڵەکەی تەمەنی (٣) مانگ بێت، جیاوازە لەشــیری ئەو دایکــەی کەتەمەنی مناڵەکەی (٦) مانگــە. هەروەها شــیری ئەو دایکەی کەمناڵەکــەی بە (٧) مانگی لەدایك بووە، لەشیری ئەومناڵەی کەبە (٩) مانگی لەدایك بوە جیاوازە.
وەشــیری دایك بەپێ ی وەرزی ســەرماو گەرما پێکهاتەکەی دەگۆڕێت.
بۆنمونــە: لەهاویــن دا، ڕێژەی ئاوی ناوشــیرەکە زۆر زیاترە لەڕێژەی ئاوی شــیری هەمــان دایك لەوەرزی زســتاندا. هەروەهــا لێکۆڵینەوە زانســتیەکان دەریان خســتوە کەشیری مەمکێك لەشــیری مەمکەکەی تر جیاوازەو بەهەمان شــێوە شیری یەك مەمك لەساتێکەوە بۆساتێکی تری تەمەنی مناڵەکە لەهەمان دایك دا جیاوازە!! بەیانیان زوو شیری دایك ماددەیەکی بەئاگاهێنەرەوەی تێدایە کەچالاکی وجموجوڵی مندالْ دەخاتەگەڕ، بەڵام لەشــەودا، شــیری دایــك پێکهاتەیەکی خەولێخەری لێ دروســتدەبێت، کەمناڵەکــە پێ ی دەخەوێ وپشــوو دەدات!! بەبێ ئەوەی دایك هەرئاگای  لەمەبێت، بگرە زۆربەی هەرەزۆری دایکان ئەم ڕاستی یە زانســتیەیان هەرنەبیستوە!!.. پاشان کەلەدایك بوویت سۆزو ڕەحم وخۆشەویستی خستە ناودڵی دایك وباوکتەوەو تۆی تازە لەدایك بوو، کەلەئەوپەڕی بێ دەســەڵاتی دابوی. کەبەڕاستی بەچکەی هەموو زیندەوەرێــك لەمرۆڤ بەجموجۆڵ تــرو چالاکترە کاتێ لەدایك دەبێ.
مامۆســتا هەژار چەند جوانی فەرموە، کاتێ لەشیعرێکدا کەوەرگێڕانی شعرێکی (د.عەلی شەریعەتی)یە، دەفەرموێ:

تۆ لەجوچك بێهێزتر بوی، بێ دەرمتــــــــانو پێزتر بوی

ئەو دێتە دەر بەجوکە جوك، بۆدان ئـەکوتێ پەلو دەنوك
بەڵام تۆ پارچە گۆشتێ شل نەمل، نەپل، نەگوڕ، نـــــەتل

بەڵێ، مرۆڤ ئاوا بێ دەســەڵات دێتە سەرزەوی، کەچی خوای گەورە هەموو پێداویستیەکانی بۆ فەراهەم دەکاتو ئەو سۆزو خۆشەویستی یە بێ ســنورە دەخاتە دڵی دایكو باوکیەوەو پاروی دەمی خۆیان دەکەنە دەمی منداڵەکەیانەوە. هەموو ئازارێك قبوڵ دەکەن لەپێناوی خۆشــیو ئاســودەیی ئەودا. زۆرجار مــل کەچی بەردەم کەســانی نامەرد قبوڵ دەکەن. تەنها لەپێناوی سەربەرزی ڕۆڵەکەیاندا...

بەڵێ خۆشەویســتان: ئاوا خــوای گەورە لەکاتی هاتنــە دەرەوەمان لەقەبرەکەمان. بەووشەی (الرَّحْمن) بەبیر هەموو مرۆڤەکانی دێنێتەوە کەخوای گەورە چۆن دروستی کردی و پێ ی گەیاندی. کەچی تامردی بەهەزاران جار سەرت چەماندەوە بۆخەڵك. بۆپارویەك نان. بیربکەوە ڕۆژی چەندجــار دەچەمیتەوە (لەهەرپیشــەیەکدا بی). کەچی جارێك بۆخوا ســەرت نەخستە ســەرزەوی وســوژدەیەکت بۆنەبرد. لەپێناوی ژیاندا سەرت بەماڵو دائیرەی زۆر کەسو شوێندا کرد. کەچی بەقاچی خۆت ســەرت بەمزگەوتی ماڵی خوادا نەکرد، کەجێگای ســەربەرزیو ســەربەرزانە. ئەوەی لەمزگەوت سەری لەسوژدەدایەو نزمە لەدەرەوەی مزگــەوتو مەیدانــی ململانــێ یژیاندا ســەری بەرزەو قنــجو قیتەو عیزەتدارو شــکۆمەندە.. ئای مرۆڤ ڕۆژی چەندجار ووشەی (سوپاس) ت، بەســەردەمدا هات بەرامبــەر خەڵکی کەچاکەیــان لەگەڵ کردوی. لەکاتێــکا کەیارمەتــیو چاکەیەکی زۆر بچکۆلەبوە. ئەو کەســەی ئاوا بەدڵو زمان سوپاسی دەکەی نە (خالیقت بوە، نەڕازیقت بووە). کەچی جارێك بەرامبەر بەو خالیقو ڕازیقــەت نەتوت: الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمین.. بەڵێ ئالەوێدا کەخوا فەرموی: (هذا ماوَعَدَ الرَّحْمن)، بەبیســتنی ووشەی

(الرَّحْمــن) ئەمجا مرۆڤی بێ بڕوا. بیری دەکەوێتەوە، کەچی لەدەســت داوەو شەرمەزار دەبێ هاوار دەکات بۆتیاچونی خۆی. خۆزگە دەخوازێ ببێتەوە خۆڵو ڕزگاری ببێ، بەڵام تازە ڕزگاربوون نىیە.

بەڕێــزان: گەورەیی‌و عەزەمەت هەر بۆ (الله)یە. کاتێ کەئەو هەموو مرۆڤــە، لەئادەمەوە تادوایین مرۆڤ لەقەبــرەوە دێنە دەرەوەو بەرەو مەیدانی مەحشــەر دەڕۆن. خوای گەورە ئەو دیمەنەمان بۆباس دەکات وئاوا بۆمان وێنا (تصویــر) دەکات کەدەفەرموێ: (يَخْرُجُونَ مِنَ الَاَجْداثِ، كَأَنَّهُمْ جَرادٌ مُنْتَشِرْ).

واتە: کاتــێ لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوەو بەرەو مەیدانی مەحشــەر بەڕێ دەکەون. هەردەڵێ ی ڕەوە کوللەن کەئاوا بڵاوبونەوەو هەریەکەی بەلایەکدا دەڕوات وگرمەو ناڵە دروســت دەکەن. یان دەفەرموێ: (وَلَقَدْ جِئْتمُونا فُرادى، كَما خَلَقْناكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ.) چۆن لەسکی دایکت هاتویتە دەرەوە بەڕوتی، بەبێ بەرگ وپۆشــاك. ئاوا دەچیتە مەیدانی مەحشــەر هیچ پارچەیەکی لاشەت نوقصانی نیە. کەس بەکەمئەندامی نایەت بۆمەیدانی مەحشــەر. لەفەرمودیەکــی خۆشەویســتماندا (ﷺ) ووشــەی (غُرْلاً) بەکارهاتوە، کەبەو پارچە گۆشتە دەوترێ، کەلەکاتی خەتەنەکردندا لێ دەکرێتەوە. مرۆڤ کەهاتە مەیدانی مەحشەر ئەو پارچە گۆشتەشی بۆ دەگەڕێتەوە!! تەنانەت خوای گەورە دەفەرموێ: (بَلي قادِرينَ عَلي أَنْ نُسَوِّيَ بَنانَهُ). هێڵەکانی کەلەسەری پەنجەتدانو هی هیچ کەسێ لەکەسێکی تر ناچێ. وەکو خۆی دروست دەبێتەوە!!

دایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشــە. عەرزی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کرد: (يارَسُــولَ اللهِ، النِّســاء والرِّجــالُ جَميعاً يَنْظُرُ بَعْظُهُمْ إِلــى بَعْضٍ؟!). ئەی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) یانــی ئەو هەمــوو ژن وپیــاوە. لەمەیدانی مەحشەردا، هیچیان لەبەردانی یە. چۆن دەبێ ئاوا بەڕووتی یەکترببینن

وتەماشای یەکتری بکەن؟!!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (یا عائِشَــةُ الْأَمْرُ أَشَــدُّ مِنْ ذٰلِكَ). ئەی عائیشە کارەکە لەوە گەورەترەو هەڵوێستەکە لەوە سامناکترە، کەخەڵکی بیری ئەوەیان هەبێ. کەکەسـێك تەماشــای کەسێکی تر بکات... پاشان یــەك بەیەك ئەو خەڵکە دەبرێتە بەردەم خوای پەروەردگار (سُــبْحانَهُ وتَعالی) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ﴾. ق:٢٠- ٢١.

واتە: لەوەودوا فوو دەکرێت بە (صور)دا، ئیتر ئەوە ڕۆژی پێشهاتنی هەڕەشــەو ئاگادارکردنەوەکانە. ڕۆژی قیامەت دێت وهەموو کەســێك. دووکەســی لەگەڵدایە. یەکێکیان دەیگەیەنێت وئەوی تریشیان شایەتە بەسەریەوە. (سائِقٌ يَســوقُهُ إِلى اللهِ). (وشَهيدٌ: يَشْهَدُ عَلى أَعْمالِهِ). جائەوەی لەدنیادا خواناس‌و دیندار بوبێ، ئەوا لەوڕۆژەدا دووفریشـــتەکە دەبنە هاوەڵ‌و دۆســـتی. وەکو دووهاوڕێ وبـــرادەری لەمێژینە لەگەڵی دەڕۆن بۆحــزوری پـــەروەردگار. چونکە لەدنیـــادا ئەم ئیمانـــدارە ئەوەندەی کردەوەی چاك کردوەو ئەم فریشتانە، ئەوەندەیان خێر لێبینیوە. وەکو دۆستی گیانی بەگیانیان لێ هاتوە لەگەڵی.

بەڵـــێ ئیمانـــداران: کاتێ مرۆڤ چوە حزوری پـــەروەردگاری، خوای گەورە چوار پرســـیاری لێ دەکات. هەموو کەسێك ئەم چوار پرسیارەی لێ دەکرێت.

١. تەمەنت لەچیدا بەسەربرد.

٢. گەنجیەتیت چۆن تێپەڕاند.

٣. زانســـتەکەت چـــۆن بەکارهێنـــا. (جا زانســـت هەروەکو زانســـتە شـــەرعیەکان وزانســـتە مرۆیـــی یـــەکان دەگرێتەوە، بەهەمان شـــێوە پیشەکانیش وەکو: وەستایی، کرێکاری، بەرگدوری، دارتاشی، ئاسنگەری،

مۆزەفــی فەرمانگەیەك ..هتد) پرســیاری ئەوەی لێ دەکرێ، ئایا بەبێ ئەوەی کەس چاودێربێت بەســەریەوە، ئــەوەی دەیزانی بەکاری هێنا؟ کاری پێ کرد؟ ئایا خیانەت ودرێغی لێ نەکردو بەپێ ی توانا، هەوڵی خــۆی خســتەگەڕ. یان هەرکاتی پێ بەڕێ کــردو تاقەتی لێ ی نەبووا. ئەمە هەمووی وورد پرسیاری لەبارەوە دەکرێت.

٤. پرسیار لەمرۆڤ دەکرێت لەسەر ماڵەکەی، سامانەکەی. ئایا چۆن پەیدای کرد. لەچ ڕێگایەکەوە پەیدای کرد؟! وەپاشان چۆنیشی صەرف کرد. وەلەچیدا صەرفی کرد..

دەی بەڕێزەکەم: وابزانە ئێستا والەحزوری خوای گەورەدا وەستێنراوی، ئایا وەڵامت چۆن دەبێ، ئایا سەربەرزانە وەڵام دەدەیتەوە؟! هەرکەسێ لەم چوارشتە ووریابێ قیامەتی ئاوەدانە. هەرکەسێ لەم چوارەدا (تەمەنی، گەنجیەتی بەتایبەتی، زانستو پیشەی، ماڵو سامانی).. بەردەوام خوای خۆی لەبیربــێ، ئیمانی بەوە هەبــێ، ڕۆژێ دەچێتەوە حزوری خوای گەورەو پرسیاری لێ دەکرێ، ئەوا لەبەردەم خوای گەورەدا ڕوو سورەو خوای گەورە بەڕەحمی خۆی (إنْشاءالله). لێ ی خۆش دەبێ وبەهەشتی پــێ دەبەخشــێ. ئالەوێــدا دوای ئــەوەی کەمرۆڤ وەڵامــی ئەو چوار پرســیارەی بەڕێکوپێکی دایەوە، خوای گەورە نامەی ڕزگاربونی دەداتێ وئەوبەندە موسڵمانەش دەستی ڕاستی درێژ دەکات ودەفتەری ئەعمالی بەدەستی ڕاســتی وەردەگرێ. هەروەکو قورئان ئەوەمان بۆتۆمار دەکاو دەفەرمــوێ: (فَأَما مَنْ أُوتِيَ كِتابَهُ بِيَمينِــهِ، فَيَقُولُ: هاؤمُ اقْرَءوا كِتابِيَه، إِنِّي ظَنَنْتُ أَنِّي مُلاقٍ حِسابِيَه. فَهُو فِي عِيشَةٍ راضِيَة).

واتە: بەڵام ئەوکەسەی کەکتێبەکەی بەدەستی ڕاستی وەرگرت، دەڵێ: وەرن تەماشــای کتێبەکەم بکەن وبیخوێننەوە، خوای گەورە لێم خۆش بوو. دەرچوم لەتاقیکردنەوەی دونیایی. بەڕاستی من دڵنیابوم کەقیامەت

هەیەو دەگەمە لێپرسینەوەو خۆم بۆئامادەکردبوو. جائەوکەسە کەئاوا کتێبەکەی بەدەستی ڕاستی وەرگرتوە، لەژیانێکی زۆر خۆش دایە. کەبەڕاستی ڕازی یە. دەگات بەژیانێك کەناڕازی بونێکی تێدانی یە. ئەو ئاواتەی مرۆڤ کەژیانێکی بێ کەم وکوڕی وکورتی یە، تەنهاو تەنها لەبەهەشت دا دێتەدی! خوای گەورە بەڕەحمی خۆی پێمان ببەخشێ..

کەواتە: بەرهەمی (إِنِّي ظَنَنْتُ أَنِّي مُلاقٍ حِسابِيَه) بریتی یەلە (فَهُو فِي عِيشَةٍ راضِيَة).

بەڵام: بەپێچەوانەوە، ئەوەی لەم چەند ڕۆژەی ژیانی دونیای دا، قیامەتی لەخەیاڵدا نەبوبێ، بەباسی قەبرو قیامەتو حەڵاڵو حەرام پەست بوبێ. نەك هەرئیمانی پێ ی نەبوبێ. ڕقیشی لەوانەبوبێ، کەباوەڕدارن. کەحەڵاڵو حەرام دەزانن. کەسەری بەندایەتی بۆخوا دەخەنە سەرزەوی. ئەوە لەقیامەتا لەکاتی وەرگرتنەوەی دەفتەری ئەعمالی دا، ناتوانێ دەستی ڕاستی بباتە پێشەوەو دەستی ڕاستی ووشك دەبێ، چونکە لەدنیادا هەموو ژیانی فرتو فێڵو ناڕاستی بوو. بۆیە بەدەستی چەپی لەپشتەوە نامەکەی وەردەگرێ. وەکو نیشانەی خەجاڵەتی وتیاچون وتوڕەیی خوا لێ ی. کەلەدەفتەرەکەی نوسراوە دەرنەچووەو سزای دۆزەخی بۆهەیە. قورئان ئەمەشمان بۆباس دەکات ودەفەرموێ: (فَأَمّا مَنْ أُوتِيَ كِتابَهُ بِشِمالِهِ، فَيَقُولُ يالَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتابِيَه، ولَمْ أَدْرِ ماحِسابِيَه، يالَيْتَها كانَتِ القاضِيَة. ماأَغْنَي عَنِّى مالِيَة. هَلَكَ عَنِّي سُلطانِيَة).

بەڵێ ئەوەی کەدەفتەری کردەوەکانی بەدەستی چەپی وەردەگرێ. هاوار دەکاتو دەڵێ: ئای خۆزگایە ئەم کتێبەم هەروەرنەگرتایە. خۆزگە هەرنەم زانیایە چیم بۆ بڕیار دراوە. خۆزگە هەرزیندوو نەکرامایەوە. ئای ئەو هەموو سەروەتو سامانەم هیچ سودی پێ نەگەیاندم، ئای ئەو هەموو دەسەڵات وهێزو توانایەم، کەباڵی باڵدارم پێ دەشکاند. ئێستا

هیچ دەوری نی یە بۆم وناتوانێ هیچم بۆبکات. بەڵکو کۆڵی قورســتر کــردوم. بەڵێ، ئەوەی مرۆڤ لەدنیــادا تەکەبوری پێوە لێ دەداو خۆی پێوە بادەدا، دووشتە: ماڵو سامان. لەگەڵ: پلەو پۆستو دەسەڵات.

جاخوای گــەورە دەفەرموێ: (خُــذُوهُ). بیگرن. یەکســەر بەهەزاران فریشــتە پەلاماری دەدەن بۆئەوەی هەریەکــە زوتر ئەمرەکەی خوای پەروەردگار جێ بەجێ بکات. (خُذُوهُ فَغُلُّوهُ. ثُمَّ الجَحيمَ صَلُّوهُ. ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُها سَــبْعُونَ ذِراعاً فَاسْلُكوهُ). هۆی چونە جەهەنەمیشی. کەئەو (خُذُوهُ) ی پێ دەوترێ.

١. إنَّهُ لايُؤْمِنُ باللهِ العَظيم. ئیمانی بەخوا نەبوو!. ئەمە لەگەڵ خوا.

٢. ولايَحُضُ عَلى طَعامِ المِسْكينَ. لەگەڵ خەڵکی خوا. بێ بەزەیی بوو. نەك هەرماڵی پێ نەدەبەخشین. بەڵکو ئامادە نەبوو. هانی دەوڵەمەندێکیش بــدات بۆیارمەتی دانی هەژارێك. ئەگــەر خەڵکێکیش یارمەتی نەدارو هەژارێکــی دەدا، ئەم پێ ی ناخۆش بوو. بەکورتی: کەســێکی دڵ ڕەق وبێ بەزەیی وچروك وبێ خێرو ڕێگری خێر بوو..

ئیمانداران: بەڕاستی لەعەدلی خوای گەورەیە. کەدەبێ ئەم قیامەتە هەبێ. کەئێمەی موســڵمان لەشەوو ڕۆژێکدا، تەنها هەرلەنوێژی فەڕزدا (١٧) جــار دەڵێین: (مالِكِ يَوْمِ الدِّين). (يَوْم الدِّين) بەمانای ڕۆژی قیامەت مانا ناکرێ، بەڵکو دەبێ بوترێ، ڕۆژی پاداشــت وسزا. کەبونی قیامەت وزیندوبونــەوەی دوای مردن بۆئەوەیە: پاداشــت وســزای کردەوەکان بدرێتەوە بەمرۆڤ. خۆئەگەر ئەم ڕۆژی پاداشــت وســزایە نەبێ، ئایا ژیان هیچ مانایەکی هەیە؟! ئەگەر ئەم قیامەتە نەبێ، چۆن فیرعەون ونەموردو کیسراو قەیصەرو ئەبوجەهل وئەبولەهەب وهیتلەرو ستالین ومۆســۆلۆنی وصدام وئەمثال وشــاگردو شــوێن کەوتوو میراتگرانیان تۆڵــەی ئەو هەموو زوڵم وســتەمەیان لێ دەکرێتــەوە. ئەگەر لەئاودا

بخنكێ، لەئاگردا بسـوتێ، بەپەت هەڵواسـرێ ولەسـێدارە بدرێ. ئەوە تەنهـا لەجیاتی یەك نەفس تۆڵەی لێ كراوەتـەوە. ئەی ئەوانی تر؟!! ئەی ئەوكەسـەی كەزوڵمی لێ كرا.بەناحەق كـوژرا، زیندەبەچاڵ كرا، ماڵی خورا، تالان كرا، ژیانی لێ كرا بەژان. ڕۆژی لێ كرا بەتاریكستان. ئەی نابێ ڕۆژێك ببێ قەرەبوی بۆبكرێتەوە؟! باشە بابیربكەینەوە، ئایا هەرچی ئازادی خوازو شـۆڕش گێڕو ڕۆشـنبیرو سیاسیو فەیلەسوفە. داوای ئەوە ناكات. دادگەری وعەدالەت هەبێ، زاڵم سـزا بدرێو مەزڵوم ڕزگاری ببێ وبحەسـێتەوە؟! دەی سـوێند بەخوا ئەمە تەنها لەڕۆژی پاداشـت وسـزادا دەكرێ، كەڕۆژی قیامەتە، خۆئەگەر لەدنیادا شتێك بكرێو زاڵمێك لەسـێدارە بدرێ وبكـوژرێ. ئەوە هەرزۆر كەمەو تەنها تۆڵـەی كەسـێكە، بەڵام خۆئـەم بەهەزارانی لەناوبـردوە، ئایا ئەگەر بەیـەك مـردن لەوهەموو تاوانە ڕزگاری ببێ. ئایا ئەو لەسـێدارەدانە بۆی خەڵات وپاداشـت نـیە؟! ئایا مەزڵومێك، جەرگ سـوتاوێك. ڕۆڵە بەناحـەق كوژراوێك. تەنها بـەوەی موچەیەكی پێ بـدرێ، توانراوە. قەرەبوی ئەو هەموو ئازارە دەرونی ومەعنەویەی بۆبكرێتەوە؟! نەخێر. بۆیە پێویسـتەو دەبێ هەروابێ، كەبەهەشت ودۆزەخ هەبێ.. هەربۆیە ئەوكەسـەی كەبڕوای بەبونی قیامەت وڕۆژی پاداشت وسزاو بەهەشت وجەهەنەم نەبێ. وەئەمانە بەئەفسانەو ناڕاست ونالۆژیكی ناوببات. ئەوە گەورەترین زاڵمەو گەورەترین دۆسـتی سـتەمكارانەو سەرسەختترین دوژمنـی هەژاران وماف خـوراوان ومەزڵومانە. جـاچ ناوێكی لەخۆی نـاوەو چ دروشـمێكی بەرزكردۆتەوە گرنگ نی یـە.. چونكە قەرەبوی مەزڵومێكی ماف خوراو تەنها بەچەند دینارێك دەبینێ، باشـە ئەگەر موچـەو پارە قەرەبوی ماددی بكاتەوە. ئەی چی قەرەبوی دڵو دەرون وكسپەی دڵو جەرگ سوتاوی وماڵوێرانی ودەربەدەری وحەسرەتەكانی

دەكاتەوە.

نمونەیەكـــی بەرچاو: لە ١٩٨٨/٤/١٤ دا. (....) ســـاڵ لەمەوبەر ئەنفالی میللەتی كوردكرا. میللەتێكی موســـڵمانی پاك، لەسەر نیشتمانی خۆی، نەچوبوە سەرماڵو موڵكی هیچ كەس. بەچنگ ونینۆكی خۆی لەوزەوی یە نانی خۆی پەیدادەكرد. لەهەموو ســـەركانیو ئاوێك بەردەنوێژێكی هەبوو. لەهەرگوندێكدا مزگەوتێكی هەبوو!! ڕوولەخواو بەقەناعەت بوو. بەڵام ڕژێمی بەعسی دژ بەئیسلام ومرۆڤ. هاتو بەكافری لەقەڵەم داو ســـەرو ماڵی حەڵاڵ كردو بەهاوكاری كرمی ناوخۆ. لەچەند قۆناغێكی بەنـــاو ئەنفال دا. نزیكی (١٨٢) هەزار مرۆڤـــی كورد. كەزۆربەی هەرە زۆری ژنو منداڵ بوو. هەموی بێ چەك بوو. لەماڵو حاڵی خۆی خەریكی كاروكەســـابەتی ڕۆژانەی بوو. دەســـتگیركراو براو بێ سەروشوێن كراو دوای لەناوچونـــی ڕژێم ئەمجا دەزانرێ، كەبەكۆمەڵ كراونەتە ژێرگڵو زیندەبە چاڵكراون!.

بەســـەدان كـــەس لەیـــەك چاڵی گەورەدا بەشـــۆفڵ گڵیان بەســـەردا كراوەو تەنها دەنگیان بەخوای گەورە گەیشـــتوە. كەبێ گومان لەوكاتە سامناكەدا، هاواریان كردوە (یاالله). بەڵێ (الله) دەنگی بیستنو تۆڵەی ئەو مەزڵومانەی لەودیكتاتۆرە دڵڕەشـــە دڵڕەقەو دارو دەستەكەی كردەوەو هەموی دووســـاڵ دوای ئەوە، تەختی دەســـەڵاتی هەڵتەكاو چۆن ئەوبێ تاوانانـــەی كردەچاڵەوە، ئاوا لەچاڵێك وەكـــو جرجی ناوزێراب دەریان هێنـــاو وەكوشـــێت ودێوانەی لێ هاتبوو. كـــەس نەیدەتوانی یەكەمجار كەبەوحاڵـــەوە بینی قەناعـــەت بەخۆی بكات كەئـــەوە دیكتاتۆرەكەی عێراقـــە. تەنانەت ئەمریكیەكانیـــش بڕوایان نەدەكـــرد كەئاوا زەلیل بوبێت وبەپشكنین بۆیان دەركەوت كەخۆیەتی. ئەی خۆسەرانی بەعسی عەفلەقیمـــان بینی چۆن ئەوانەی وەكو عەلی كیمیاوی. كەڕاســـتەوخۆ

سەرپەرشتی ئەنفالیان دەکرد. لەبەردەم دادگای دونیایی دا میزی بەخۆیدا کرد!!! ئەی بۆ دادگای ئەودنیا دەبێ چی لێ بێ!. بەڵام خۆئەوەی بەچاوی خۆمان بینیمان لەزەلیل بون وپاشان لەسێدارەدانیان. تەنها تۆڵەی خوێنی یەك مرۆڤە، یەك منالی یەك ڕۆژمیە. ئەی تۆڵەی ئەو هەموو هەزاران کەسەی تر، ئەی قەرەبوی ئەو هەموو منالو گەنج وپیرو ژنەی کەبەناحەق شەهیدکران. ئایا بەدروست کردنی (مۆنۆمێنتێك) قەرەبودەکرێنەوە، دوای مردن چی بەوان دەگات؟! ئەوە دەبێ قیامەت هەبێ وتۆڵە لەستەمکارو بکوژو ئەنفالچی بکاتەوەو پاداشتی مەزلومأو کوژراوو ئەنفال کراو بەبەهەشت بداتەوە، تەنها ئەوە لەقیامەتا دەکرێو تەواو. پاداشتی ئەنفال کراوی زیندەبەچاڵ کراو تەنها لەبەهەشتا دەدرێتەوە. کاتێ کەخوای گەورە پرسیاریان لێ دەکات: (وإذا المؤودةُ سئِلَتْ بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ). وەخوای گەورە دەیانخاتە بەهەشتەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يُؤْتَى بِأَشَدِّ النَاسِ بُؤْساً في الدُّنيا مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، فيصبغ فِي الجَنَّةِ صِبْغَةً، فَيُقالُ لَهُ: يابْنَ آدَم. هَلْ رَأَيْتَ بُؤْساً قَطُّ؟! هَلْ مَرَّبِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟! فَيَقُولُ: لاوالله يارَبْ، مامَرَّبِي بؤسٌ قَطُّ، ولارَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ). رَواهُ مُسْلِم: (٢٨٠٧).

واتە: لەرۆژی قیامەتدا کەسێك دێنن کەلەدنیادا، لەژیانی دنیادا. لەهەموو کەسی ئەو سەرزەویە ژیانی تاڵتترو نارەحەتترو بەئازارترو ناخۆشتربوە. هەرچی تۆ بینیوتە لەژیان تاڵو بەئازارو بەش مەینەت، ئەوکەسە لەویش زۆر ژیانی ناخۆشتر بووە. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو تاڵی وسوێری یەی کەلەژیاندا بەقوڕگیا چووە. ناشکوری نەکردوە، پەنای بۆحەرام وخیانەت نەبردوە. ماڵی کەسی نەدزیوەو تالان نەکردوە. خوێنی کەسی نەڕشتوە. خوای خۆی بەحەق ناسیوە. بەندایەتی خوای کردوە، ئەم بەندەیە ئەهلی بەهەشتە. جاکاتێ

دەیبەنە بەهەشتو یەکجار لەبەهەشتی هەڵدەکێشن، دەیخەنە ئەو دیوو دەرگای بەهەشتەوە. ئالەوکاتەدا پێی دەوترێ: ئەی نەوەی ئادەم. ئەی فلان کەس. ئایا هەرگیز ناخۆشـیت بینیـوە؟! ئایا هەرگیز بەخەیاڵو بیرەوەریتـدا دێ، کەئـازارو ناڕەحەتیو نەبونـی وداماویت بینیبێ؟! ئەوکەسـە بەهەشـتیەش دەفەرموێ: نەخێر سوێند بەگەورەییت ئەی پـەروەردگار!. بیرم نایـەت وبڕواناکەم هەرگیـز ناڕەحەتیم بینیبێ. وەهەرگیـز ڕۆژێ لـەڕۆژان تەنگانەو داماوی بەلەشـما تێپەڕی بێ!!.. (سُبْحانَ الله) لەخۆشـی بەهەشـت. دەی بەخوا تەنها بەهەشتە کەئەو هەمـوو ناسـۆزو ئـازارو زیندەبەچاڵ کردنـەی ئەنفالـەکان لاببات وهەرلەیادیشیان نەمێنێ!. هەرلەوفەرمودەیەدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: لەقیامەتا کەسـێکیش دێنن کەلەهەمـوو ژیانی دنیای دا، ڕۆژێـك لـەڕۆژان ناڕەحەتیەکـی نەبینیوە. خۆشـترین ژیانی هەبوە، دەوڵەمەندترین کەس بوە. دەسـەلاتدارترین کەس بوە هەرچی لەزەت وخۆشی دونیابووە، لەبەردەسـتیابووە، بەلام خوای نەناسیوە. ستەمی کردوە. خەڵکی لەناوبردوە. بۆ کورسیو پارەی خۆی بەهەزاران خەڵکی کردۆتە قوربانی. ئەم کەسـەش کاتێ کەموستەحەقی جەهەنەم دەبێ یـەك جار دەیخەنـە دۆزەخـەوەو دەری دەهێننـەوە، تەنهایەك جار بۆچەنـد چرکەیەکی زۆرکەم! ئەمجا پێی دەوترێ. ئەی نەوەی ئادەم. ئـەی فلان کەس. ئایا هەرگیز خۆشـیت بینیوە. ئایا دێتە خەیاڵتەوە. جارێك لەجاران پارویەك نانی خۆشت خواردبێ، لەسەر جێگایەکی نەرم خەوتبـی. ئارەزویەکت کردبێ وهاتبێتەدی. یەك خۆشـیت لەوهەموو ژیانەی دونیات بینیبێ؟! دەڵێ: سوێند بەگەورەییت ئەی پەروەردگارا. هەرگیز نایەتە خەیاڵم خۆشـیم بینیبێ. نازانم خۆشی وشادی بەچی دەڵێن تابڵێم بینیومە یان نا!! ڕۆژێ لەڕۆژان خۆشـی وشـادی نەبۆتە

میوانم!!.

بەڵێ تەنها بەم جەهەنەمە تۆڵە لەوخوێنرێژە دڕندانە دەگرێتەوە، ئەمینا خۆ لەدنیادا، چەندین ساڵی تەمەنیان لەخۆشترین ژیانی ماددی دا بەســەربردوە، هەمووشــی لەســەرماڵو ســامان وڕەنج وماندوبون وخوێنــی خەڵــك بــوە. دەی كــێ ئەمــەی وا لەبیردەباتــەوە كەهەر بەخەیاڵیشــیا نەیەتەوە؟! چوونە جەهەنــەم!. هەربۆیە دەبێ قیامەت هەبێو هەركەســیش بڵێ قیامەتی چــی وجەهەنەمی چی. ئەوە پەنا بەخوا. گەورەترین ســتەمكارەو دۆســتی ستەمەو دوژمن بەچەوساوەو مەزڵومانە! چونكە بڕوای بەو دادگەریە تەواوە بێگەردە نی‌یە كەمافی كەسی تێدا نافەوتێ. ئایا ئەم ڕوداوە واقیعیەی كەلەكاتی ئەنفالەكاندا ڕوی داوەو ئێســتا بۆبەرێزتانی باسی دەكەین بەقیامەت وبونی دادگای خوایی وبەهەشتو دۆزەخ نەبێ، پاداشت دەدرێتەوە؟! یەكێ لەوكەسانەی كەلەئەنفال ڕزگاری بوە، دوای گیرانی، ناوی (نێرگز عەزیزە). ئێســتا تەمەنی (٥٥) ســاڵە. ئاوا باســی ئەو كارەساتە ســامناكە دەگێڕێتەوەو دەڵــێ: (لــەدوای گرتنمان لەمانگــی (٤)ی ســاڵی ١٩٨٨دا. هێنایانین بۆ چەمچەماڵ بۆ لیوا. هەرئەوشــەوە بردیانینە تۆپزاوای كەركوك. ســێ شــەو لەتۆپزاوای كەركوك ماینەوە، ئەوەی تەمەنــی گەورەبوو، لەژن وپیاو جیاكرانەوە لێمانو بردیانن بۆ نوگرە ســەلمان. ژنو كچو مناڵ ماینــەوە. دواتــر لەوێوە بردیانیــن بۆ (دووبز). بۆمــاوەی (٦) مانگ. ژمارەمــان زیاتــر لە (٢٥) هــەزار كەس بووە. دواتــر (٥) كاروانیان لێ بردین، نازانین بۆ كوێیان بردن. ئەو مناڵانەی لەلامان بوون، تەمەنیان (٤- ٥) ســاڵان دەبــوو. چۆن گەڵا لــەدار دەبێتەوە لــەو ماوەیەدا ئاوا مناڵمــان لــێ دەمرد. چونكە خــواردن نەبوو بیخۆیــن. لەماوەی (٢٤) كاتژمێردا. تەنها یەك ســەمونیان دەدایێ!! ژنــی واهەبوو (٣) مناڵی

لەسـەریەك دەمرد)!!.. نێرگز عەزیز دەڵێ: من ئیشی مامانیم دەزانی، چەندین مناڵ لەدایکبوون. ناوکیانم بەبەرد دەبڕی، ئێستاش مناڵ هەیە لەناحیەی شـۆڕش. گەنجە، کاتی خۆی من لەوێ لەوسـجنەدا بەبەرد ناوکیم بڕیووە. زۆربەی ئەو مندالآنەی لەدایك دەبوون. چونکە دایکیان لەبەربێ خۆراکی شیریان تێدانەبوو. لەبرسان دەمردن!!.. ئەو ئافرەتە دەڵێ: ئەوەی زۆر لای من کاریگەری هەبوو. ئەوەبوو: ژنێك کەئێستاش ماوە، لەوسـجنەدا (٣) کچی مـرد. کچێکی پێش مردنی داوای خەیاری دەکرد- دیارە بەدەست ئەو سەربازە پاسەوانەوە بینیویەتی، کەلەودیوو تەلەکـەوە خەیاری خواردوەو ئەم مناڵە کچەش حەزی لێ بوەو داوای کردوە. بەڵام دایك لەکوێ خەیاری بۆبێنێ؟! بۆیە کەئەو مناڵە ووڕکی لەخەیـار گرتو هەرداوای دەکرد. ئەوەندە بۆ خەیارێك گریا. تانزیکی بورانەوە بۆوە!. لەوکاتەدا دایکـی لەتاوی کچە بچکۆلەکەی نەیدەزانی چی بکات، لەتاوان تاکێکی نەعلە سـەوزەکەی خستە دەمی مناڵەکەوە، مناڵەکەش وای دەزانی خەیارە، دەیویسـت بیخوات، دەیمژیو گازی لێ دەگـرت، هەتا گیانی دەرچووا!! بۆیە ئێسـتاش دایکی ئەو کچە دەڵێ: خەیار ناخۆم. لەبەرئەوەی ئەوکات مندالەکەم تامرد. هەرداوای خەیاری کرد. لەو سـاتەوە. خەیار نەهاتۆتە سـەردەمەو بەبینینو باسکردنی برینەکەم دەکولێتەوەو مناڵە جگەرگۆشەکەم دێتەوە بەرچاو!..

- یەکێکی تر لەو ئافرەتانەی کەهەموو بنەماڵەکەی لەشالآوی ئەنفالدا شـەهید بوونو بەتەنها ماوەتەوە، بۆ کەناڵێکی ئاسمانی کوردی قسەی کـردو ووتی: ماوەی چەند سـاڵ درویێنەم کردوە لەگەڵ هەندێ پیاودا کەخزمم بوون، کەس نەیزانیوە ئافرەتم!! بۆئەوەی سواڵ نەکەمو چاو بەرەژێری منەتی کەس نەبم.

باشـە بەڕێزان: ئەگەر قیامەت نەبێو ڕۆژی (يَوْمُ الدِّين) نەبێ. ئەم

زاڵمو ســتەمکارانە ئەم وەحشــیو دڕندانە، کەزۆر لەوەحشی دارستان دڕندەترن، چونکە وەحشیو دڕندەی ناو دارستانیش بەزەیی بەبەچکەی تازە لەدایکبــودا دێتەوە، لەیەکێ لەکەناڵە ئاســمانیەکاندا، دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشی نیشاندا. ئەویش ئەوەبوو کە: پڵنگێك کەتازە بەچکەی ببوو. لەتاوبرســیەتی پەلاماری مەیمونێکی دا، کەمەیمونەکە خەریك بــوو بەدارێك هەڵبگــەڕێ. کەقوڕگی مەیمونەکەی گــرت، مەیمونەکە بەچکەی لەســکدا بوو. لەترساندا بەچکەکەی ناوسکی لێ هاتەدەرەوەو بەچکەکــەی فڕێــدا!! وە مەیمونە دایکەکە مــرد. بێگومان ئەو پڵنگە دڕندە چنگ بەخوێنە زۆربرســیە، کەئەگەر زۆری برسی نەبێ گۆشتی مەیمون ناخوات. کەبەو برسیایەتیەشــەوە، ئەو بەچکە مەیمونە تازە لەدایك بوەی بینی، کەبێ دایکبووە، یەکســەر وازی لەدایکە مردوەکەی هێناو نەیخواردو بەزمان بەچکە مەیمونەکەی لستەوەو بەنەرمی هەڵی گرتو بردی بۆلای بەچکەکانیو شیری دەدایەو بەخێوی کرد!!

بــەڵام ئەو زاڵمانەی کەئەنفالی میللەتی کوردیان کرد، هاوچەشــنی هیــچ دڕندەیەك نەبــوون، چونکە مرۆڤ ئەگەر ترســی خوای لەدڵدا نەبــوو، لەدڕندە خراپترە. ئایا ئەم ســتەمکارانە بەلەسـێدارە دانێك. یان چەند ســاڵ زیندانی کردن ڕزگاریان ببێت. ئەمە خەڵات کردن نی یــە بۆیان؟! ئایا ئەوکــەسو کارە دڵ بریندارەی ئەنفالەکان. بەپێدانی موچەیەك وخانویەك. کەزۆریان هێشــتا ئەوەشــیان بۆنەکراوە. تەواو پاداشــت کران؟! نەخێر، هەروەکو دایکێك کەجگەرگۆشــەکەی ئەنفالە ووتی: (هەموو داهاتی کوردســتانم بدەنــێ، بەیەك پەنجەی مناڵەکەم نابــێ بۆمــن!). ئافرەتی واهەیە کەلــە (نوگرەســەلمان) گەڕاوەتەوەو خوای گەورە ڕزگاری کردوە تاوەکو شــایەتحاڵ بێ لەســەرئەو ستەمە گەورە، ئەوەندەی زوڵمو ســتەمی چاوەڕوان نەکراو بینیوە. یەك مانگ

نەیتوانیوە قسە بکات!..

ئایا ئەمە لەقیامەتا نەبێ مافی بۆدەگێڕدرێتەوە؟! نەخێر. هەربۆیە ئێمەی ئەهلی ئیمان. شـــانازی بەوەوە دەکەین. کەیەکێك لەبناغەکانی ئیمانمـــان بریتی یـــە لەبڕوابون بەڕۆژی دوایی. بەبەهەشـــتو دۆزەخ، کەتەنهـــا لەوێدا. مرۆڤی چاکەکارو خراپەکار، بەپاداشـــت یان ســـزای دادوەرانەی خۆیان دەگەن.

خـــوای پەروەردگار ســـەرفرازی دونیاو دوارۆژمـــان بکەی وئەوانەی کەئەنفال کران ودووجار ستەمیان لێ کرا. جارێك کەئەمانە موسڵمانی بەحەق بوونو حوکمی کافریان بەســـەردا ســـەپاندن وجارێکی تریش کەهیـــچ تاوانێکیـــان نەبـــوو. تەنها ئـــەوە نەبێ کەکوردبونو لەســـەر ئەونیشتمانە نیشـــتەجێ بوون کەخوای پەروەردگار پێی بەخشیبونو خاکێکـــی موبارەکو پیرۆزو پڕبەرەکەتە. خوای گەورە بەڕەحمی خۆی ڕەحمیان پێ بکاتو جێگایان بەهەشـــتی بەرین بێو ئەجرو پاداشـــتی کەســـوکاری هەردەم دڵ بریـــندارو چاو بەفرمێســـکیان بداتەوەو زاڵم وســـتەمکاران هەردەم ئاوا خەجاڵەتباری دونیاو قیامەت بنو وڵاتمان پڕبێ لەدادگەریو عەدالەتو خۆشگوزەرانی. (اللّهُمَّ آمين)

سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز.

٢. گۆڤاری پزیشکی نوێ. ژمارە: ٨، شوباتی ٢٠١٠، ل١٥.

٣. "ماڵ" پاشکۆی ژمارە: (٤١٨)ی ڕۆژنامەی کۆمەڵ. ژمارە: ٢، ل٨، ل٣.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِينَ:

ئيمانــداران: ژيانــى دنيا تاقى كردنەوەيە. مرۆڤ لەم ســەرزەويەدا لەهۆڵــى تاقيكردنەوەدايــە. خۆگومانــى تێــدا نىيــە، لەهۆڵــى تاقى كردنــەوەدا مرۆڤ ئــازادە لەئەنجامدانى هەروەڵامێكو نوســينى هەر ووشــەو بابەتێك لەســەر لاپەڕەى تاقى كردنەوەكان. بەڵام ئەوە دواى تەواوبونى تاقى كردنەوەكانە، كەدەريدەخات كێ سەرفرازو سەركەوتوەو دەرچــوەو دڵخۆشــە، كێش وەڵامەكانــى هەڵەبوون ونمرەى بەدەســت نەهێنــاو دەرنەچــوو دڵ بەخەمو حەســرەت بوو. ئەمجا كەســەيرى هاوڕێكانى دەكات پەشيمانيەكى بێ سوود ڕووى تێ دەكات. دەى ئێمەى مرۆڤيش لەم سەرزەويەدا لەناوهۆڵى تاقى كردنەوەداين، هەموو ڕۆژێ. كەبەيانيمــان لێ دەبێتەوەو لەخەو هەڵدەســتين. دووڕێگامان لەبەرە. خــۆت ئازادى شــوێن كاميان دەكەوى. بەڵام لەســەرەنجامدا بەيەكيان بەختەوەرى وبەيەكيان بەدبەخت. پێغەمبەرى دڵسۆزو خۆشەويستمان دەفەرموێ: (مامِنْ خارجٍ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ، إلاّ ببابِهِ رايَتانِ، رايَةٌ بِيَدِ مَلَكٍ، ورايَةٌ بِيَدِ شَــيْطانٍ، فَإنْ خَرَجَ لِما يُحِبُّ اللهَ عَزَّوجَل، اتبَعَهُ المَلَك بِرايَتِهِ، فَلَمْ يَزَلْ تَحْتَ رايَةَ المَلَكِ حَتَّى يَرْجِعَ إلى بَيْتِهِ، وإنْ خَرَجَ لِما يَســخطُ اللهَ اتبعه الشَّــيْطان بِرايَتِهِ، فَلَمْ يَزل تَحْتَ رايَةَ الشَّيْطانِ حَتَّى يَرْجِعَ إلِي بَيْتِهِ) (رَواهُ أَحمد عَنْ أَبِي هُرَيْرَةً، والطَّبَراني في الَاَوْسَط، كَما في مجمع الزَوائِدِ. (١٣٢/١).

بەڵێ ڕۆژانە هەركەس لەماڵ دێتەدەرەوە، يان لەژێر ئاڵاى مەلائيكەتدا ئەو ڕۆژە دەگوزەرێنێ، يان بەپێچەوانەوە لەژێر ئاڵاى شەيطاندا ئەوڕۆژە تەواودەكات. ديارە شــوێن كەوتنى فريشتەو شوێن كەوتنى شەيطانيش چەند جياوازيان هەيەو سەرەنجاميان بۆكوێ دەچێ.

بەڵــێ ئيمانداران: خواى گــەورە لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ . المُلْك:٢.

سەرنج بدەن. (المَوْت- مردن)ی پێش (الحَياة- ژيان) خستوە. چونكە هەركەسێ مردنی لەيادنەبێ و وانەزانێ ئەم دنيايە كۆتايی دێ وپاشان زيندوبونەوەو حيساب وكتاب هەيە. ژيانيشی جوان نابێ و(أَحْسَنُ عَمَلاً) ئەنجام نادات..

(سُبْحانَ الله). خوای گەورە نەك هەركردەوەی جوان، بەڵكو (أَحْسَنُ عَمَلاً)مان داوا لێ دەكات، نەك هەرئەوەندەی دەرچين لەتاقيكردنەوەكە. بەڵكو بەپلەی زۆرباشەو ئيمتياز دەرچين. جائەم ئايەتە پێمان دەڵێ وبەئاگامان دێنێتەوەكە: تۆی ئيماندار، تۆی مرۆڤ. نەك هەرخراپە مەكە، بەڵكو مونافەسەبكەن لەسەرئەوەی كێ كردەوەی جوانتر پێشكەش دەكات. نافەرموێ داخۆ كێ شەڕ دەكاو كێ خێر. بەڵكو ئەصڵ وايە، مادام مرۆڤين. عەقڵو ژيريمان هەيە. مێژوی ڕابردووی مرۆڤەكانمان لەبەرچاوەو ڕۆژانەش دەيبينين كەئەوەی بەكەڵك دێو مرۆڤ سەرفراز دەكاو هيچ كات نەك هەر لێ ی پەشيمان نی يە. بەڵكو بەبيركەوتنەوەشی هەست بەبەختەوەری دەكات، تەنهاو تەنها چاكەكردنە. كەواتە هەمومان هەرچاكەبكەين. ئەمجا پێشبڕكێ بكەين لەسەر ئەوەی كەئەگەر چاكەيەك هەبوو. خێرێك هەبوو، هەريەكەمان پەلە بكات كەزوو ئەوخێرەی دەست بكەوێو لەدەستی نەچێ. چۆن ئەگەر پارەو سامانێك هەبێ وهەمووكەس مافی ئەوەی هەبێ دەستی بيگاتێ. بەڵام تەنها بۆ ئەوكەسە دەبێ، كەزووتر دەيگاتێو هەڵی دەگرێ، هەمومان پێشبڕكێ ی لەسەر دەكەين. دەی چاكەو خێرو مەردايەتيش كەڕەسيدی چاكەكانت پڕدەكات وتای تەرازوی قيامەتت قورس دەكات وزۆربەی كات، هەرلەم دنيايەشدا دێتەوە ڕێگات، ئاوا پێويستە پێشبڕكێی لەسەربكەين. چونكە لەژياندا، كۆمەڵێ هەلو دەرفەتو فرسەت دێنەڕێی مرۆڤ، ئەگەر لەدەستت نەدا پێی خەنی دەبی،

بەختەوەر دەبی، خەڵك خۆزگەت پێ دەخوازن خۆ ئەگەر لەدەستت دا، پەشیمانی، ئاخ هەڵدەكێشی بەبێ سود ، خۆزگە بەخەڵك دەخوازی. جا پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) ئاگادارمان دەكاتەوە لەوەی كەدەستو برد بكەین بۆئەوەی ئەوچاكەو خێرانەی كە دونیاو قیامەتمان ئاوەدان دەكەنەوە، وەدێنە بەردەســتمان وفرســەتێكەو ئەگەر لەدەستی بدەین ناگەڕێتەوە. كەپەلەبكەین لەئەنجامدانی ودوای نەخەین. چونكە چەند لەمپەرێك لەبــەردەم مرۆڤدایە. كەئەگەر مــرۆڤ فریانەكەوێ دواتر كەئەوانەی بەســەرداهاتن فریاناكەوی، ئەوەتــا لەچەندین فەرمودەدا باس لەپەلەكردن بۆچاكەو لەدەســت نەدانی هەلو فرسەتی زێڕینمان بۆدەكات. وەكو دەفەرموێ: (بادرُوا بالَاَعْمالِ فِتَناً....). (بادِرُوا بالَاَعْمالِ سَبْعاً....). یان بەیەك بەیەكمان دەفەرموێ: (إغْتَنِمْ خَمْسَــاً قَبْلَ خَمْسٍ). لەگەڵ تاك تاكمان قســە دەكات ودەفەرموێ: بەفرسەت وهەل ودەرفەتی بزانە ئەم پێنج شتە. پێش ئەوەی پێنج لەمپەری بەسەردابێت وئەوكات نەهێڵێ ئەوچاكەیــە بكەیــت. ئەوانیــش: گەنجیەتیت پێش هاتنــی لەمپەری پیریو بەساڵاچویی ولەرزۆكی وچاوكزی وكزۆڵی. كەپێویستیت بەوەیە كەخزمەت بكــرێی. كەجاران لەگەنجیــدا دەتتوانی خزمەتی خەڵكی بكەی.

ژیانــت هەلو دەرفەتــە بۆچاكەكاری. پێش ئــەوەی مردن یەخەت بگرێو دەرگاكانت لەســەر دابخرێن. لەش ســاغیو تەندروستیت هەل وفرســەتە، پێش ئەوەی لەمپەری ناســاغی ونەخۆشــیت بەســەردابێ وهەموو غەم وهەمت ببێ بەگەڕان بەشــوێن دكتۆرو دەرماندا. كاتی دەســت بەتاڵی وفەڕاغت. هەلو دەفەرتەو لەدەســتی مــەدەو چاكەی تێــدا تۆماربكە پێش ئەوەی كەســەرقاڵی ژیــان ڕووت تێ بكاو فریای هیچ نەكەوی، وە دەوڵەمەندی وهەبونی وپارەداری هەلو فرســەتێكی

گەلــێ گەورەیە. پێش ئەوەی لەمپەری هەژاری بێتە بەردەمتو ئەمجا نەتوانی هیچ خێرو چاکەیەك ئەنجام بدەی.

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: لەژیاندا زۆرجار هەل وفرســەتی زۆرباشت بۆڕێ دەکەوێ. کەزۆریش ئاسانەو بۆت دەکرێ وپارەو سامانی زۆریشی نــاوێ. تەنها هەندێ لێبڕانو کەمــێ خۆماندووکردنی دەوێ. کەئەگەر لەدەستی نەدەی بەهەشتی پێ مسۆگەر دەکەی. بەویستی خوا. فەرمون بابەیەکــەوە بچینــە خزمەت (رَسُــولُ الله) (ﷺ)، کەبەســەرهاتێکمان بۆدەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (بَيْنَما رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، وجَدَ غصنَ شــوكٍ عَلى الطَّرِيقِ، فَأَخَّرَه، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فغفَرَ لَهُ). رَواهُ البُخاري: (٦٥٢) ومُسْلِم (١٤١٩)..

واتــە: جارێك پیاوێك بەســەر جادەیەکدا دەڕۆیشــت. لەڕێگا چاوی بەلقەدارێکــی دڕکاوی وەکــو (دڕکەزی) کەوت. خێرا چوو هەڵی گرتو لەســەر جادەکە دوری خســتەوە، لەدڵی خۆی دا ووتی: باکەس بەهۆی ئەم دڕکەوە توشــی ئازار نەبێ، خوای گەورە لەسەر ئەم کارە جوانەی سوپاسی کردو لەگوناهەکانی خۆش بوو!..

(اللــهُ أكبر). لەو موژدەیــە. خوای گــەورە لەگوناهەکانی خۆش بوو. جــا کەمرۆڤ لەکۆڵی قورســی گونــاە ڕزگاری بوو. ئیتر باری شــانی سوك دەبێ، هەست بەلەش ســوکی دەکات. بەئاسانی عیبادەتەکانی بۆ ئەنجــام دەدرێ، دڵو دەرونــی شــاد دەبێ چونکە ئەو پەردە ڕەشــەی گوناهی لەســەر نەماوە. بەرچاوی ڕۆشن دەبێ چونکە تەم مژی گوناە لەبەرچاوی لاچوە. حەزدەکات خێربکاتو ڕقی لەشــەڕو خراپە دەبێ. ئەمە هەرلەدنیادا. لەقیامەتیشــدا، ئەگەر ئەو گوناهانەی بمانایە. تای تــەرازوی بەلای خراپەدا لاردەبوو. کەچی ئێســتا بەهۆی نەمانی ئەو گوناهانەوە، کەخوای گەورە لێ ی خۆش بوو وەلەنامەی کردەوەکانیدا لەســەری ڕەش کردەوە، تای تەرازوی چاکەکانی قورس بوو. وەڕزگاری

بووا ئای ڕۆژانە چەندجار ئەم فرسـەتە زێڕینەمان دەسـت دەکەوێ. کەچی بەشوێنیدا ناڕۆین، بەڵکو دێتە بەردەممان وخۆی لێ لادەدەین.

جابەڕێزان: ئەگەر ئەمە پاداشـتی کەسـێك بـێ، کەدارێك، دڕکێك لەسـەر ڕێگا لابات. ئەی ئەبێ پاداشـتی ئەوکەسە چۆن بێ، کەڕێگاکە دروست دەکات، کەڕێگاکە ناخۆشەو باریکەو مەترسیدارەو چاڵو چۆڵە، ئەم بەپارەی خـۆی، بەئامێری خۆی، لەبەررەزامەندی خواو بۆئەوەی موسـڵمانان توشـی ئازارو زەرەری ماددی نەبن وبەسەلامەتی سەفەرو هاتوچـۆی پێدابکـەن. دێ ڕێگا کەچـاك دەکاو فراوانی دەکاو تەختی دەکاو مەترسـی لێ لادەبات. ئەبێ پاداشـتی ئەوکەسە چۆن بێ؟! ئەوە پاداشتەکەی بەهەشتە (إنْشاءالله). وەلێرەدا ئەگەر سەرنجی فەرمودەکە بدەین، دەبینین ووشەی (فَشَكَرَ اللهُ لَهُ)ی تێدایە کەخوای گەورە سوپاسی ئەوکەسـەی کرد. خۆ خوای گەورە هیچ سودمەند نەبوو لەوەی کەئەو کەسـە ئەو دارە دڕکاویـەی لابرد. بەڵکو ئـەوە بەندەکانی خوا بوون کەسودمەند بوون لەوچاکەیە. بەڵام خوای گەورە سوپاسی کرد، دەست خۆشـی لێ کرد، کەئەمـە ئەوەمان فێردەکات، کەهەرکەسـێ، کارێکی جوانی کرد. دڵسـۆزی نواند بۆ خاكو خەڵك. دەبێ دەسـت خۆشی لێ بکەینو سوپاسـی بکەینو هانی بدەین. بۆئەوەی زیاتر سوربێ لەسەر چاکەکردن. جائەم دەسـت خۆشـی وسوپاسـە. لەلایـەن خەڵکی یەوە دەبێ، بەوەی ڕێزی لێ بگرن. دەزگاکانی ڕاگەیاندن. باسـی کاروکردەوە جوانەکانی خێرخوازان ودڵسۆزان بکەنو نیشانی خەڵکی بدەن. تاوەکو هاندەربێ بۆچاکەو خەڵکی چاوی لێ بکەن. پاشـان. حکومەت سوپاسی ئەوکەسانە بکات. کەچاکە دەکەن وهەڵوێستی مەردانە دەنوێننو وڵات ئاوەدان دەکەنەوەو خزمەتی خەڵکی دەکەن.

ئیمانداری بەڕێز: شـتێکی بەڵگەنەویسـتە، کەدنیا لەسەر یەك بار

بۆهیچ کەس تاسەر نابێ، ووتراوە: (دَوامُ الحالِ مِنَ المَحالِ). ئەبێ ئەوانەی دەوڵەمەندن ڕۆژێ هەژاربن. ئەوانەی هەژارن ڕۆژێ ببن بەسەرمایەدار. ئەوانەی دەسەڵاتدارن. ڕۆژێ بێ بێ دەسەڵات ببن. ئەوانەی ژێردەستەن ڕۆژێ ئازادببن. خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾. ال عمران: ١٤٠.

بەڵێ خوای گەورە خـۆی ڕۆژەکان بارودۆخەکان ئاڵوگۆڕ پێ دەکات لەنێوان خەڵکی دا. (سُبْحانَ الله) ئەمڕۆ لەسـەدەی بیست ویەکدا، تاکە شـتێکی زۆرگەورە کەهێزە دیموکراتەکان شـانازی پێوەدەکەنو داوای دەکـەن وبەدەسـتکەوتێکی گـەورەی دەزانـن بریتی یەلە: (دەسـتاو دەسـتکردن، ئاڵوگۆڕکردنی دەسەڵات بەئاشتیانە!). دەی قورئان (١٤٠٠) سـاڵ زیاتـر لەمەوپێش ووشـەی (نُداوِلُها)ی بەکارهێنـا. کەنابێ هیچ کەس هەتاسـەر هەردەسەڵاتداربێ، هەربالادەسـت بێ. دەبێ ئەوانەی خوارەوەش سـەربکەون، جائەمە بەمرۆڤ ناکـرێ. زۆر بەدڵنیاییەوە، لەسـایەی حوکمـی مرۆڤدا. هەرنیزامو یاسـایەکی ئەوپەڕی باش جێ بەجـێ بکرێ. هێشـتا بەهەزاران کـەس ئاڵوگۆڕی تەواوەتی بەسـەر ژیانیاندا نایەت. بەڵام ئەوە (رَبُّ العالَمینَ) کەزۆر بەجوانی، بەبێ دەنگە دەنگو دروشمو شیعارو بەرزکردنەوە. ئەوکارە دەکاتو ئاڵوگۆڕ بەسەر بارودۆخو دەسەڵاتو کەسەکاندا دێنێت. بەگەورەیی خوا، غەیری (الله) هیـچ کەس دەسـەڵاتی ئەوەی نەبوو. وەبیریشـی لەلای ئـەوە نەبوو کەئەو سـەرکردەو حکومەتە دیکتاتۆریە سەرکوتکەرانە، ئاوا بەئاسانی بڕوخێن. وەکو (بن عەلی لەتونسو حوسنی موبارەکی میصرو قەزافی لیبیـاو صەدامی عێراقو هەموو ئەوانەی پێش ئەوانیش لەفیرعەونو نەموردەوە، تاشای ئێران)..

ئـەو ئاڵوگۆڕە تەنها بە (الله) کـرا، بۆیە خۆی فەرمویەتی (نُداوِلُها)،

خۆمــان ئاڵوگۆڕی پێ دەکەین. بەندکراوی بێ تاوان بەردەبێ ودەبێتە سـەرکردە. سـەرۆکی زیندانو جەلادیـش دەخرێتە بەنـدی خانەوە لەشوێنەکەی ئەو بەندیە!..

بەڵێ بەڕێزان: دونیا دوو ڕۆژە: (يَوْمٌ لَكَ ويَوْمٌ عَلَيْكَ). ڕۆژێك ڕۆژی تۆیەو دۆستی تۆیەو لەقازانجی تۆیەو فرسەتی زێڕینە بۆتۆ، ڕۆژێکیش لەدژی تۆیە، پێچەوانەیە لەئاڕاسـتەداو ڕووبەڕووت دەبێتەوە. بەربەرەکانێت دەکات، لەمپـەرت لەبـەردەم دادەنێ. دەی ئینسـانی ژیر. ئەو ڕۆژەی کەهـی خۆیەتی، بەفرسـەتی دەزانێ کەچاکەی تێدابکات ولەدەسـتی نەدات. لەبەرئەوەی ئەوکەسەی کەئەمڕۆ تۆ یارمەتی دەدەی، زۆر زۆر دەگونجـێ، کەبەیانی ئەو فریات بکەوێتەوەو ئەو یارمەتی تۆ بداتەوە، ئەمـڕۆ تۆ ژیانی ئەو ڕزگار دەکەی، بەیانی ئەو ژیانی تۆ ڕزگار بکات. دونیـا پڕیەتی لەنمونـەی بەرچاوو واقیعی، ڕۆژانـە بەچاوی خۆمان دەیبینین.

فەرمون بابەیەکەوە سـەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەین: جووتیارێکی ئوسکوتلەندی هەژار، کەباخچەیەکی بچکۆلەی هەبوو. کوخە خانویەکی بچکۆلەی تێدادروسـت کردبوو. خۆی وخێزان ومناڵەکەی لەسـەر ئەو پارچە زەویە. ژیانێکی هەژارانەیان بەسـەردەبرد. لەنزیکی ئەو پارچە زەویـەی ئەم هەژارەوە، دەریاچەیەك هەبوو. کەگەنج ولاوەکان دەچون بۆمەلەکـردن تـێ ی دا، ڕۆژێکیان لەکاتی کارکردنـدا، ئەم جووتیارە هـەژارە گوێ ی لەدەنگی هاوارێك بـوو. کەداوای دەکرد فریای بکەون. جوتیارەکە خاکەنازەکەی فڕێداو بەڕاکردن بەرەولای دەنگەکە ڕۆیشت. بینـی وامناڵێـك، تەمەنی (٩ بۆ ١٠) سـاڵان لەقەراغی ئاوەکەوە چۆتە قولایـی وبەلەقـازێ دەکاو خەریکە دەخنکێ وئەوانـەش کەهاوڕێنی، چونکە مناڵن ومەلەنازانن ناتوانن یارمەتی بدەن. ئەم پیاوە جوتیارە،

کەمەلەوانیش بوو. چونکە لەنزیك دەریا ژیابوو. خێرا خۆی فڕێدایە ئاوەکــەوەو منالەکــەی ڕزگارکرد. ئاوی ناوســکی خالی کــردو ئارامی کردەوەو هەندێ خواردنی پێ بەخشــی وبەڕێ ی کردەوە بەرەوشوێنی خۆی، بەبێ ئەوەی لێی بپرسێ: تۆ کوڕی کێی‌و چی دەکەن. بۆبەیانی دەمەو نیوەڕۆ. ئوتومبیلێکی فاخیرو دوامۆدێل. لەبەردەم کوخەکەی ئەم مالە جوتیارە هەژارەدا وەستا. پیاوێکی ئەفەندی دەولەمەندی سپۆرت. دابەزی ومنالەکەشی لەگەلدابوو. منالەکە کەچاوی بەجوتیارەکە کەوت، ووتــی: باوکە ئەوپیاوە بــوو کەدوێنێ منی ڕزگارکــردو فریام کەوت، پیاوە دەولەمەندەکە چوە لای جوتیارەکەو زۆرسوپاسی کردو مالئاوایی لێ کردو پاشان پێ ی ووت: دەمەوێت پاداشتی ئەوچاکەو مەردایەتیەت بدەمــەوە کەتۆ کوڕەکەی منت ڕزگارکرد. ئــەم بڕە پارە (کەپارەیەکی زۆر بوو) لەلایەن منەوە پێشکەشــە بەتۆ، بەلام جوتیارەکە ووتی: من ئەوکارەم بۆپارە نەکردوەو پاداشــتیش وەرناگرم وهەرئەوەی تۆ هاتوی بۆلام وسوپاســت کردوم بەســەو پاداشــتی چاکەکردن هەرلای خوایە. هەرچــی دەولەمەندەکــە هەولی دا، هەژارەکە هیچــی لێ وەرنەگرت.. لەوکاتــەدا کوڕی ئەوپیــاوە جوتیــارە، لەخانوە بچکۆلــە نزمەکەیان هاتــەدەرەوەو بۆلای باوکی هــات، پیاوە دەولەمەندەکە پرســی: ئەوە کوڕتــە؟ جووتیارەکــە ووتی: بەلێ، ووتی: لەپۆلــی چەند دەخوێنێ؟! هەژارەکە ووتی: نەمتوانیوە بیخەمــە قوتابخانەوە، چونکە هەژارین‌و پارەی مەصرەفی قوتابخانەمان پێ نادرێ وڕۆژانە کارم لەگەل دەکات‌و هاوکاریم دەکات. پیاوە دەولەمەندەکە ووتی: دەی من تکایەکی ترم هەیە، وەکو ئەوەی هیچ پاداشتێکی ماددیت لێ قبول نەکردم. ئەبێ ئەمەم لێ قبــول بکەی. کەئەم کوڕەت وەکو کوڕەکەی خۆم دەخەمە بەرخوێندن وهەموو مەســرەفێکی لەســەرمن، وەتۆش کرێکار بگرە کەئیشــی ئەم

منالّەت بۆبکات وپارەی ئەویش لەسەرمن. چۆن تۆ منالّەکەی منت لەوە ڕزگارکــرد کەلەئاودا بخنکێ، منیش حەزدەکەم منالّەکەی تۆ لەخنکان لەناو نەخوێندەواری دا ڕزگار بکەم، تکایە ئەمەم بەقســەبکە. کابرای جوتیار ووتی: هەرچەندە کەدوێنێ من منالّەکەی تۆم ڕزگارکرد. چاوم لەهیچ پاداشتێکەوە نەبوو. بەلاّم بۆئەمەیان کەڕزگارکردنی کوڕەکەمی تێدایە لەنەخوێندەواری، ناتوانم بڕیار لەســەر داهاتوی ئەویش بدەم. لەبەرئەوە من سوپاست دەکەمو ڕازیم. بەلێ، ئەم کوڕە لەسەر حیسابو مەصرەفی ئەوپیاوە دەولّەمەندە خوێندی ولەباشترین زانکۆی لەندەن (کۆلێژی پزیشــکی) تەواوکردو زۆر زانایەکــی بلیمەت وداهێنەری لێ دەرچوو!.. ئەوەبوو ئەم دکتۆرە توانی دەرمانی (پەنســلین) بدۆزێتەوە، لەوسالّەدا کوڕی پیاوە دەولّەمەندەکە توشی (هەوکردنی سیەکان) بوو. کوڕی جوتیارە هەژارەکە بەودەرمانە چارەســەری کردو بەویستی خوا لەمــردن ڕزگاری بوو. نــەك تەنها هەرئەو، بەلّکــو بەملیۆنەها کەس سودی لەودەرمانە وەرگرت. ئایا دەزانن ئەوپیاوە دەولّەمەندە کێ بوو. کەئەو فرســەتو هەلەی لەدەســت نەداو منالّی ئەو جوتیارە هەژارەی خســتە بەرخوێندن؟! ئەوە (چەرچڵ)ی ســەرۆك وەزیرانی بەریطانیا بــوو. کەتوانی بەریطانیــا لەتیاچون ڕزگاربــکات لەجەنگی جیهانیدا. کوڕکەشــی کە خەریك بوو دەخنکا ناوی (ولینسۆن) بوو. پزیشکەکەش کەکوڕی جوتیارەکەیە ناوی (ئەلکسەندەر فلیمنج)ە. کەلەهەرە دکتۆرە بەناوبانگەکانی دونیایە..

بەلێ بەڕێزان: پێغەمبەری خۆشەویســتمان (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ أَحَبَّ الْأَعْمالِ إِلى اللهِ بَعْدَ الفَرائِضِ، إِدْخالُ السُرورِ عَلى المُسْلِمِ). خۆشەویستترین کــردەوە لەلای خوای گــەورە، دوای بەجێ هێنانی فەرزەکان، خۆشــی خســتە ناودڵی موســڵمانێکە. لەوکاتەدا کەدڵی تەنگەو ســەری دنیای

ڕوونــی لەبەرچاوتــا تاریــك بووە، نازانــێ بەرەو کوێ هەنــگاو بنێ، خەریکە سەرگەردان دەبێ. تۆ بەفرسەتی بزانی ودڵنەوایی بکەی، دڵی خۆش بکەی، فرمێســکی چاوی بسڕی، دەســتی بگری، هاوکاری بکەی. چونکە هەموو ڕۆژێ تۆ ئەمەت پێ ناکرێ وهەموو کاتێکیش ئەو ئاوا موحتاج نابێ.. خۆئەگەر ئەوفرسەتە زێڕینەت لەدەست داو بەدەمیەوە نەچوی. یان خوانەکردە، بەچاوی سوك تەماشات کرد. ئەوە زۆر نزیکە کەڕۆژێك ئەوبێتە جێگای تۆ، وەتۆبچیتە جێگای ئەو. (وتِلْكَ الْاَیّامُ نُداوِلُها بَیْنَ النّاسِ). نمونەو بەسەرهاتی واقیعی وبەرچاو ئەوەندە زۆرن لەژمارە نایەن. هەربەچاوی خۆمان چەندین کەســمان بینیوە ســی، چل ســاڵ لەمەوبەر شــاگردی وەستایەك بوە، ئێستا ئەوشاگردە وەستایەو خاوەن کارخانــەو کۆگایەو ئەو وەســتاو دەوڵەمەنــدەی ئەوزەمانە. کوڕەکانی شاگردو چاولەدەستی ئەو شاگردەی کاتی خۆی باوکیانن!

ســەرنجی ئــەم بەســەرهاتە بــدەن: دەگێڕنــەوە کەپیاوێکــی زۆر ســاماندارو دەوڵەمەنــد هەبوو. ڕۆژێکیان وەکو هەمــوو ڕۆژانی ژیانی لەگەڵ ژنەکەی دانیشــتبوو لەئەوپەڕی خۆشــحاڵو کەیف خۆشــی دا، نانیــان دەخوارد، ژەمــی ئەوکاتەیان، مریشــکێکی ســورەوەکراو بوو. دەســتیان برد بۆنانەکەو لەدەرگادرا. ژنی ئەم کابرا دەوڵەمەندە چوو دەرگا بکاتەوە، کاتێ دەرگاکەی کردەوە ســواڵکەرێکی هەژاربوو، وچاوی بەومریشــکە سورکراوەو ئەو سفرەو خوانە ڕازاوە کەوتو زۆری برسی بوو. هەموو لاشــەی هاتە هەژانو ووتــی: لەبەرخاتری خوا یارمەتیم بدەن، بەخوا زۆرم برســی یەو دەمێکە خواردنێکی باشــم نەخواردوە، کەمێك لەومریشکە ســورەوەکراوەم بدەنی، بەڵام پیاوە دەوڵەمەندەکە کەخەریکی خواردنی مریشــکەکە بوو. هەرئاوڕیشی نەدایەوەو سەیری حاڵــی ئەو هەژارەی نەکردو بەژنەکــەی گوت: دەرگاکە دابخە. تاقەتی

ئەوبرسیە سـوالکەرەم نی یە، هەرچەندە ژنەکە ووتی: ئاخر گوناهە، داماوە، قەیچیەکا ئەگەر کەمێکی بدەینێ. خۆبەخوا لێشمان زیاد دەبێ! بـەلام کابـرا ئەمەی نەبیسـت و ووتی: بابڕوا بۆخۆی کاسـپی بکات، من بەدەسـتی خـۆم وئازایەتی خۆم ئەم سـفرە ڕازاوەم ئامادەکردوە، ئـەو بۆنایکات، جارێکی تر گوێ لەهەژارو سـوالکەر مەگرە!! (سُـبْحانَ اللـه)، ئەبـێ فەرمودەی خـوا بێتەجـێ ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ﴾. ال عمران: ١٤٠.. ڕۆژو مانگـو سـاڵ تێپەڕین وئەم دەوڵەمەندە لەچەنـد بازرگانیەکـی گـەورەدا تێك شـکاو زەرەرێکـی زۆری کرد. سـەری لێشـوابوو. نەیدەزانی چی بکات، سەرەنجام لەتاو بێ دەرەتانی ونەمانی سەرمایەکەی ونەمانی ئەو خۆشگوزەرانیەی جارانی، ژنەکەی تەلاق داو هەریەکەیـان کەوتنە لایەك. ژنەکە لەبەرئەوەی ئافرەتێکی جـوان وبەڕێـز بوو، هەرزوو خوازبێنی هات وشـوی کـرد بەپیاوێکی دەوڵەمەنـد، بـەلام پیاوێکی دەوڵەمەنـدی بەویـژدان وبەڕێز، دوای ماوەیەك لەژیانی هاوسـەری بەوویستی خوای گەورە ڕۆژێکیان ژنەکە لەگـەڵ مێردە تازەکەی زۆر بەشـادمانی دانیشـتبون نانیان دەخوارد. مریشکی سورەوەکراویان هەبوو. لەکاتی نان خواردندا لەدەرگادرا. کاتێ ژنەکە چوو دەرگای کردەوە، سـوالکەرێکی هـەژار بوو. کەچاوی بەو خواردن وسـفرەیە کەوت، هاواری کرد: توخوا خێرتان دەگات. هەندێ لەوخۆراکەی خۆتان، بەتایبەت ئەو مریشکەم پێ ببەخشن. بەخوا زۆرم برسـیە! کابرای خاوەن ماڵ، بەڕوویەکی خۆشەوە ووتی: بەسەرچاو. ئەم خواردنە زۆرەو بەشـی تۆشـی تێدایەو ڕزقی خۆتە. بەشێکی باش لەمریشـکەکەی بۆخستە نانەوەو لەگەڵ هەندێ شتی تردا دایە دەست ژنەکـەی و ووتی: بڕۆ بیدەیـە. کاتێ ژنەکەی چوو نان وخواردنەکەی دایە دەسـت هەژارەکەو گەڕایەوە، فرمێسـك بەچاویـا هاتەخوارەوەو

گریا. مێردەکەی لێ ی پرســی: ئەوە بۆ دەگری؟! خۆمن هیچی خراپم نــەووت! ژنەکــە ووتی: نا، من سوپاســی ئەو خێرەومەنــدیو دەرون سەخیەتیەت دەکەم. بەڵام ئەوەی هەژاندمی وهێنامیە گریان ئەوەبوو، کەئەم پیاوە ســواڵکەرە مێردە پێشــوەکەم بوو. کەلەســەر ئەو هەموو سەروەتو سامانەوە، ئێستا سواڵ دەکات وئەو دیمەنەم هاتەوە بەرچاو کەچەند ســاڵێك لەمەوبەر، ئاوا مریشــکی ســورەوەکراومان دەخوارد. کەســواڵکەرێك لــەدەرگای داو داوای خواردنی کرد. بەڵام ئەم مێردەم، کەئێســتا ســواڵکەرە، زۆر بەتوندی لێ ی تورەبوو، وەدەری کرد، ئێستا هەمان دیمەن دەبینم بەڵام وا ئەو سواڵ دەکات! مێردی ژنەکە ووتی: دەی وەرە بالەمەش سەرســورهێنەرترت پێ بڵێم، ئەویش ئەوەیە: ئەو ســواڵکەرە من بوم ودوای ئەوەی کەمێردەکەت ئاوا بەناشیرینی دەری کردم. زۆر دڵم بەخۆم ماو داوام لەخوا کرد کەلەوهەژاری وموحتاجی یــە رزگارم بکات. ئەوەبوو خوای گەورە بەســەری کردمەوەو خۆشــم نەمدەزانی ئەو پارەو ســامانەم چۆن دەســت کەوت. بــەڵام برِیارمدا، هەرگیــز رابردوم لەیاد نەچێ ورێزی هەژار بگرم وئەو ماڵو ســامانە بەهی خوا بزانم، نەك هی خۆم!

بەڵێ ئیمانداران: ژیان چەندین هەل ودەرفەتی تێدایە بۆچاکەکردن، کەئەگەر لەدەستمان بچن جارێکی تر ناگەرێنەوە. جایەکێ لەورێگایانەی کەبەهۆیــەوە دەتوانی خوا لەخۆت رازی بکەی. ئەوەیە کەدڵی خەڵکی خــۆش بکەیت، پێغەمبــەری خوا (ﷺ) فەرمویەتــی: (إِنَّ أَحَبَّ الَأَعْمالِ إِلي اللــهِ تَعالــى بَعْدَ الفَرائِــضِ، إِدْخالُ السُّرُورِ عَلى المُسْــلِمِ). واتە: باشــترین وخۆشەویستترین کردەوە لای خوا، لەدوای فەرزەکان. بریتی یە لەدڵخۆش کردنی موسڵمانێك. لابردنی غەم وپەژارەیەك لەسەری. ئیمامی شافیعی لەهۆنراوەیەکدا، کەمامۆستا (ئالانی) وەریگێراوە دەڵێت:

دەست لەکـــــــــــرداری بەد بەردە، بەس ئەوەندە
بەدوای گونـــــــــــاهو تاوانا دەروون هەڵدە
لەبەندی ئـــــــارەزوو دەرچۆ، وەرزی ئازادی یە واهات
بازرگانیت پـــــــڕ لەخێرە، قازانجێك چاوەڕێت دەكات
هەڵمەشاخێو بەفـــــــــــــــیزەوە مەکەوە ڕێ
کەخـــــــــــــاکیت وتۆزێ خاکیشت پێ دەبڕێ
کێ یە تــــــــامەزرۆی دنیایە؟ من لێم چەشت وبڕایەوە
شـــــــــــــیرنایی ڕۆیی، ئەرکو تاڵیەکەی مایەوە
بۆم دەرکەوت کـــــــــــەئەم دونیایە، وەك کاوبایە
تراویلکەی بـــــــــــیابانە. لەدوورەوە وەك ئاو وایە
یا کـــــــــــەلاکێکی مردارە کەسەگەل بەکێشی دەکەن
وەلاکەوە، ئەگەر ڕووی تێ کەی، تەواو هەراسانت دەکەن
سەد خۆزگـــــــــەم بەو دەرونەبێ، کەدەرگاکەی داخراوە
پەنجەرەکانی تۆکمـــــــــــــەیەو، پەردەکانی دادراوە!

بەڕێزان: چەنــد جوانەو چ مەردایەتیەکــە، کەمرۆڤ دڵو دەرونی بگاتــە ئەوئاســتە بەرزە، کــەوای لێ بێ، فرســەت وهەلێك کەبۆخۆی ڕێکەوتوەو پێویســتی زۆری پێ یەتی، کەچی بیبەخشــێ بەکەســێکی تــرو بڵێ ئەو لەمن موحتاج وئاتاج تــرە. بائەو هەلە بۆئەو بێ وئەو ڕزگاری ببــێ. هەروەکو دکتۆر (محمد راتب النابُلُسي) بانگخوازی ســوری لەبەرنامــەی (أَفَلا تُبْـصِرُون)دا فەرمویەتی: دکتۆرێکی بــرادەرم ووتی: پیاوێکی هەژار منداڵەکەی پێویستی بەنەشتەرگەری هەبوو. کەنزیکەی (یەك دەفتەر دۆلار)ی تێ دەچوو. هەوڵم دا لای دەوڵەمەندێك کەپارەی نەشــتەرگەریەکەی بۆبدات. کاتێ بەتەلەفۆن بەوهەژارەم گوت: خەمی پارەی نەشــتەرگەریەکەت نەبێ وپیاوێکی دەوڵەمەندی خێرخواز بۆی

داوی. پیاوە هەژارەکە ووتی: ماڵی ئاوابێ وخوای گەورە هەزاران ئەوەندەی پێ ببەخشێ. بەڵام من وەرشەیەکم هەیەو کرێیارم هێناوەتەسەر، بایی ئەو پارەیەیە دەیفرۆشم ونەشتەرگەریەکەی بۆکورەکەم پێ دەکەم. بۆیە باپارەی ئەو دەوڵەمەندە خێرخوازە بۆکەسێك بێ، کەئاوا وەکو من منالی نەخۆشی هەیەو پێویستی بەنەشتەرگەری هەیەو، هەژارو نەدارەو هیچیشی نیە بیفرۆشێ. بائەو دەفتەر دۆلارە بۆئەوبێ!!

دکتۆر محمد النابلُسی دەفەرموێ: دکتۆرەکەی برادەرم ووتی: بەخوا بەهەموو تەمەنم لەبەردەم کەسدا ئاوا هەستم بەبچوکی خۆم نەکردووە. وەك ئەوەی کەلەبەرامبەر هیممەتی ئەو پیاوە هەژارەدا هەستم پێکرد..

ئیماندارانی بەرێز: بابەیەکەوە سەرنجی ئەم بەسەرهاتەش بدەین، کەچۆن کەسانێکی ئاوا هەن. هیچ هەل ودەرفەتێك لەدەست نادەن بۆچاکەکاری. ئەگەرچی لەسەر دڵی خۆشیان زۆر بەئازاربێ. رووداوەکەش ئەمەیە: رۆژی (٢٦ی رەمەزان) لەرێگای پەیامنێری هەواڵی إسینا لەخۆراسان. ئەو هەواڵە بلاوکرایەوە کە (دانیاڵ چاروسایی) لەگەڵ ئوتومبێلێك دووچاری پێکدادان بوونو بەو هۆیەشەوە سەری بەرشۆستەی شەقامەکە کەوتوەو دوای بردنی بۆنەخۆشخانە، پزیشکەکان بەخانەوادەی گەنجەکەیان راگەیاندوە. کورەکەیان توشی جەڵتەی مێشك بووە. ورەنگە گەرانەوەی ئاستەم بێت وپێدەچێت بۆدواجار مالاوایی بکات. دایکی دەڵێ: ئەو تاکەکوری من بوو، تاقانە بوو، دکتۆرەکان پێیان ووتم: رەنگە کورەکەت چاك نەبێتەوەو گەرانەوەی بۆژیان ئاستەمە. ئایا رەزامەندن کەبەشەکانی جەستەی ببەخشرێت؟! لەسەرەتادا رازی نەبوین، دەمانگوت: پێویستە ئومێدمان هەبێت. هەربۆیە گواستمانەوە بۆنەخۆشخانەی (گوڵستان

ئەهــواز). بەڵام لەوێــش دکتۆرەکان هەمان قســەیان کــردو ووتیان: مەحاڵــە بــژی. هەرلەوێدا زۆر لەخــوا پاڕامــەوە کەهەرچی چاکەیە بۆئەو کوڕە تاقانەمان ئەوەمان بۆبێنێتە پێش. هەرچەندە ڕەزامەندی نواندن بەبەخشــینی بەشەکانی جەســتەی کوڕەکەم زۆر سەخت بوو. بەڵام لەوساتەدا بیری ئەو دایکانەم دەکردەوە کەمناڵەکانیان نەخۆشن ونایانەوێت وەك من جەرگ ســوتاوبن. بۆیە لەبەرخاتری خواو پاشان دڵخۆشــکردنی ئەوکەسانەی کەلەمێژە چاوەڕوانن کەسێك ئەندامێکیان پێ ببەخشــێت ولەناڕەحەتی وناســۆر ڕزگاریان بێــت. لەبەرئەوە من وباوکی ڕەزامەندیمان نواند لەســەر بەخشــینی بەشــەکانی جەستەی جگەر گۆشــەکەم دوای ئەوەش تەنها ســوڕەتی (والعــصر)م خوێندەوە، لەوکاتەدا فرمێســکی چاوەکانم جۆگەلەیان بەستبوو، دایکی ئەو کوڕە دەڵــێ: کوڕەکەم لە (١٧) ســاڵی دا بەتەنها بەجێ ی هێشــتین‌و لەگەڵ ڕۆشتنەکەشــیدا ژیانی چەند نەخۆشــێکی ڕزگارکرد. ئێستا لەناخەوە دڵم ئارامە. هەرچەند دڵم بۆکۆچی کوڕەکەم تەنگە. بەڵام ئارام دەگرم وئیتر فرمێســك ناڕێژم. چونکە: کوڕەکەم لەپــاش مردنی بووە هۆی بەختەوەرکردنی هەشــت نەخۆش. کەلەخەونیشــیاندا نەبوو، ڕۆژێك لەڕۆژان چاك ببنەوە.

بەڵێ بەڕێزان: ئەم ژیانە ئاوا کۆمەڵێك فرسەت وهەلە کەلەدەستت چــوو. هەروا بەئاســانی ناگەڕێتەوە. دەی خۆش بەحاڵی ئەوکەســەی کەلەفرسەتە زێڕینەکانی چاکەکاریدا هەل ودەرفەتەکان لەدەست ناداو دونیــا وقیامەتی خۆی پێ ئــاوەدان دەکاتەوە. خوای گەورە ومیهرەبان بەڕەحمی خۆت، هەل ودەرفەتی چاکەکاریمان بۆبڕەخسێنەو کەهاتیشە بەردەممان، بتوانین بەکاری بێنین‌و ببینە مایەی خێروخۆشی بۆخۆمان ودەوروبەرمان.

اللّهُمَّ آمين.

**سەرچاوەکان:**

١. قورئانی پیرۆز.
٢. فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).
٣. ئەزموون. ئەندازیار عُثمان، ل٢٣.
٤. نوێبونەوە. ئەندازیار عُثمان، ل١١.
٥. نِداءاتُ الرَّحْمن، لأَهْلِ الإِيمان. محمد عبدالعاطي بحيري، ص٥٩١.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمَعِينَ:

ئيمانداران: بەپشــتيوانی خوای گەورە لەم ووتارەدا، باسی ڕەوشتێك دەكەین، كەئەم ڕەوشــتە لەناو ناخی دڵدا دروستدەبێ، ئەو ڕەوشتەش لەهەركەسێكدا هەبێ:

١. نیشانەی ئیمانی بەهێزیەتی بەخواو بەڕۆژی قیامەت.
٢. بەقسەی پێغەمبەری پێشەوای كردوە (ﷺ).
٣. خوای گەورە خۆشی دەوێو خەڵكیش خۆشیان دەوێ.
٤. بەردەوام دڵی شادەو دەم بەخەندەیەو ڕووی خۆشەو هیوابەخشە.
٥. بەم ڕەوشــتە كۆمەڵــگا دوردەبێ لەحەســودی وهەمووكەس ڕێز لەیەك دەگرێ وكۆمەڵگایەكی كارجوان دروست دەبێ. ئەویش ڕەوشتی: (قەناعەتە).

قەناعــەت بەمانــای: ڕازی بوونە بەوبەشــەی كەخــوای كاربەجێ پێی بەخشــیوی. هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبــەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو هاوەڵانی دانیشــتبوو. فەرموی: (مَــنْ يَأْخُذُ مِنِّي هذهِ الكَلِـماتِ، فَيَعْمَلُ بِهِنَّ أَوْ يُعْلَمَ مَنْ يَعْمَلُ بِهِنَّ؟!) فەرموی: كێ ئەم چەند ووشەیەم لێ وەردەگرێ وكاریان پێ دەكات، یان كەسێك فێردەكات، كەئەو كاریان پێ بكات؟! جاســەرنج بدەن نەیفەرموو: كێ گوێ لەم چەند ووشەیەم دەگرێ. بەڵكو فەرموی: كێ لێم وەردەگرێ!! چونكــە قســە ئەگەر هەربیســتن بێ زوو لەیاد دەكــرێ، بەڵام ئەگەر وەرگرتن بێ، ئەوا وەكو دەڵێن: دەكرێتە ئەڵقەو لەگوێ دەكرێ. وەپاشان فەرموی: كاریشــیان پێ بكات. نەك هەربەزانین بیانزانێ. كەبەداخەوە ئەمڕۆ زانین زۆربــووە، بەڵام كارپێكردن كەم بوە. صەحابی پایەبەرز (ئەبوهورەیــرە) دەفەرمــوێ، ووتم: من ئــەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (فَأَخَــذَ بِيَدي وعَدَّ خَمْسَــاً). پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەســتی گرتم وپێنج

شـــتی ژمارد. ئای چەندە خۆشـــە وەکـــو ئەبوهورەیرە، دەســـتت لەناو دەســـتی پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) دابنـــێی. دەی ئەگەر بـــەدڵ ئاوات دەخوازی کەدەستت بخەیتە ناو ئەو دەستە پڕبەرەکەتەی پێغەمبەری خـــواوە (ﷺ). ئـــەوا وەکو ئەبوهورەیرە، بەڵێن بـــدە، ئەم پێنج خاڵە وەربگرەو بەکـــردەوە لەژیانتدا جێ بەجێ ی بکە، دەبابچینە خزمەت پێنج خاڵەکە:

١. (إتَّقِ المَحارِم، تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ)، خۆت بپارێزە لەوشتانەی کەپەروەردگار قەدەغەو حەرامی کـــردون. لەهەمووکەس زیاتر خواناس دەبی. بەڵێ، خواناس ترین وچاکترین خواپەرســـت ئەوکەســـەیە کەخۆی لەحەرام خۆری دەپارێزێ.

٢. (وارْضَ بِمـــا قَسَـــمَ اللهُ لَـــكَ تَكُنْ أَغْنَى النّـــاسِ)، ڕازی بەبەوەی کەخوای گەورە بۆی دیاری کردوی، دەبی بەدەوڵەمەندترین کەس.

٣. (وأَحْسِـــنْ إلى جارِكَ تَكُنْ مُؤمِناً)، چاکە لەگەڵ دراوســـێیەکەتدا بکەو جیرانێکی ڕێکوپێك وئەمین وبەخێربەو لەشەڕ دووربە، ئەوە نیشانەی ئیمانداریتە.

٤. (وأَحِبْ لِلْنّاسِ ماتُحِبُّ لِنَفْسِـــكَ تَكُنْ مُسْـــلِماً) بۆخەڵکیت پێ خۆش بێ، کەدەســـتیان بکەوێو بێتەڕێیان. لەوەی کە بۆخۆتت پێخۆشە لەخێرو چاکە، ئەوە موسڵمان دەبی.

٥. (ولاتُكْـــثِرِ الضَّحِـــكِ، فَإِنَّ الضَّحِكَ تُميتُ القَلْـــبَ)، زۆر پێمەکەنەو قاقا لێ مەدە، چونکە پێکەنین دڵا دەمرێنێ، لێرەدا پێویستە ئەو ڕوون کردنەوە بدەیـــن کە: پێغەمبەری خۆشەویســـتمان (ﷺ) هانمان نادات بۆئەوەی ڕوگرژبیـــنو مۆنو دەموچاو تـــاڵ بین. بەپێچەوانەوە. ئەو ســـەروەرو ســـالارە. بەردەوام حەزی لەدڵخۆشـــی وڕووخۆشی بووە. وەصەحابەکان دەفەرمـــون: یەکێ لەصیفەتە هـــەرە دیارەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

ئەوەبوە کەهەمیشــە زەردەخەنەی لەســەر لێــوە موبارەکەکانی بووە، بــەڵام زەردەخەنەو دەموچاوگەشــی، جیاوازە لەگــەڵ پێکەنینی زۆرو قاقای بەرز، کەلێرەدا دەفەرموێ: قاقا لێ مەدەو بەردەوام وبەزۆری پێ مەکەنە، چونکە هەرکەســێ بەردەوام هەرپێبکەنێ، نیشانەی ئەوەیە چــاوی ئەو هەمــوو نەدارو غەمبارو نەخۆش وبــێ حاڵە نابینێ. ئەو هەموو چاوبەفرمێســك وبــێ باوك وبێ هاوســەرە نابینێ، دیارە دڵی بۆیان غەمبار نابێ. کەســێکیش ئاوا لەغەموهەمی کەســدا نەبوو. بەو هەموو دیمەنە هەژێنەرە، دڵتەزێنەی ڕۆژانە لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە دەیبینین‌و دەیبیســتین. لەپێکەنینی خۆی نەکەوت، نیشــانەی ئەوەیە دڵی مردووە!..

بەڵــێ ئیماندارانــی بەڕێز: دەوڵەمەندی خۆشــە، بــەڵام نەك ئەو دەوڵەمەندەی کەحەرەسی بانقە خۆ پۆلیسی واهەیە. پاسەوانی بانقێکە بەملیار دۆلاری تێدایە. بەڵام خۆدەســتی تێ ی ناچێ یەك دۆلاریشــی لــێ خەرج بــکات، چونکە موڵکی ئەونی یەو ئەم تەنها پاســەوانی لێ دەکات. بەداخەوە گەلێك دەوڵەمەندیش هەیە. هەرپارەکە کۆدەکاتەوەو هەرپارێــزگاری لێ دەکات ئەینا دەســتی بۆنابات. بــەڵام دەوڵەمەندی ڕاستەقینە ئەوەیە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَيْسَ الغِنَي عَنْ كَثْرَةِ العَرَضِ، ولكِنَّ الغِنَي غِنَى النَّفْسِ) رَواهُ البُخاري: (٦٤٤٦) ومُسْلِم: (١٠٥١).

واتــە: دەوڵەمەنــدی بەبونی ســەروەت وســامان وکەلوپەلی زۆرو شــەریکەو کۆمپانیاو دوکان وبازاڕ نــی یە. بەڵکو دەوڵەمەندی بەوەیە کەدڵ‌و دەرون دەوڵەمەندبێ‌و مرۆڤ بەرچاوتێربێ.

بەڕێــزان: بابەیەکــەوە گــوێ لــەم بەســەرهاتە بگریــن کەووتەی پێشینانمان دەخاتەوە یاد کەفەرمویانە: (قەناعەت گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووە).

دەگێڕنـــەوە: ڕۆژێك لەڕۆژان لەناوچەیەك كەپاشـــایەك لەپاشـــاكان سەرۆكایەتی ئەو ناوچەیەی دەكرد. ئەم پادشایە كەسێكی زۆر بەخشندە بـــوو. بەنەرمو نیانیو دادپەروەری مامەڵەی لەگەڵ خەڵكی شـــارەكەی دەكردو خەڵكی شـــار زۆریان خۆشدەویســـت. سەرەڕای هەموو ئەوكارە جوانانەی هێشـــتا لەخـــۆی ڕازی نەبوو، بەیانیەك پادشـــا بەدەنگێكی زۆرخۆشو ناســـكو خەم ڕەوێن بەخەبەرهات. دەنگەكە پادشـــای زۆر سەرســـام كرد. بۆیە زۆر بەخێرایی بەرەو ئەو شـــوێنە ڕۆیشت كەئەو دەنگـــەی لێـــوە دەهـــات. ڕوانی بـــۆ ســـەرچاوەی دەنگەكـــە، بینی ئەو خزمەت گوزارەیە كەلە باخچەكەیاندا كاردەكات. كەلەڕوخساریدا جگە لەبەختەوەریو ئاســـودەیی شـــتێكی دیكەی لێ بەدی نەدەكرا. پادشای بانگی كردو پرســـیاری لێكرد: چۆن ئەوەندە بەختەوەریت، لەكاتێكدا تۆ خزمەتگوزارێكی لەنێو باخچەكەی ئێمەداو داهاتێكی كەمت هەیە؟! بەڵام وادەردەكەوێت كەخاوەنی هەرشتێكی كەخۆت دەتەوێتو یەكجار دڵخۆش دیاری. خزمەت گوزارەكەش بەوپەڕی ئارامیەوە وەڵامی دایەوەو ووتی: لەبەرئەوەی لای پادشـــا كاردەكەمو ئەم شتانەم هەیە، ئەوپەڕی خۆم بەدەوڵەمەند دەزانم:

١. ســـوپاس بۆخوای گەورە، خوا ڕەحمی لەگەڵ كردوم كەهیدایەتی داومو ئاینی حەقو ڕاستم هەڵبژاردوە، كەئاینی پڕبەرەكەتی ئیسلامەو هەربـــەوەی كەلەڕیـــزی ئیماندارانـــدامو لەكاروانـــی پێغەمبەرانـــدام، كەحەزرەتـــی محمد (ﷺ) ســـەرقافڵەیەتی. وائەزانم هەرچی خەڵكی ســـەرزەویە كەسوكاری منەو لەهەمووكەس زیاتر خاوەن قەومو كەسم. چونكە شەهادەی: (أَشْهَدُ أن لا إِلهَ إِلاّ الله وأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله)م هەیە. وائەزانم هەڵگری گەورەترین بڕوانامەم هەرچەندە خوێندەواریشم نی یە. جائەی پاشـــا، ئەگەر مرۆڤ ئیمانداربێ وخواو پێغەمبەری بەحەق

ناســيبێ وبزانێ بەویســتی خوا جێگای بەهەشتە، ئیتر حەیف نی یە. خەم بخواو خۆی دڵتەنگ بکات بۆهەندێ کەم وکورتیو نەبونی کەلەم ژیانــی دنیایــەدا دێنەڕێ ی؟! غەمباری وداماوی بۆئەو کەســە باشــە کەوادەزانــێ ژیانــی دنیا هەرئەم چەند ڕۆژوو ســاڵەیەو کەمرد تەواو دەبێ، ئەوە حەق وایە غەمباربێ، دڵبەخەم بێ، چونکە ئەم ژیانەکەمەی پڕ لەکەم وکوڕیەو بەخۆشــیەکان ناگات. لەبەرئەوەمیە یەکەم هۆکاری بەختەوەریم ئیمان وبیروباوەڕەکەمە..

٢. سوپاســی خوای خۆم دەکــەم. کەڕەحم وبەزەیــی لەگەڵ کردوم بەوەی کەپادشــاو دەسەڵاتداریووڵاتەکەم کەسێکی دادگەرە. ڕاستگۆیە لەگەڵ میللەت، خەم خۆری گەل ونیشــتمانە، لەزانایانی ئیسلامیشــم بیســتوە، کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إذا كانَ أُمَرائَكُمْ خيارکم. وأَغْنيائُكُمْ سُــمَحائكُمْ، وأَمْرُكُمْ شُــورى نَكُمْ فَظَهْرُ الأَرْضِ خَــيْرٌ مِنْ بَطْنِها). واتە: هەرکاتێ کاربەدەســتانتان لەباشترین کەستان بونو دەوڵەمەندەکانتان سەخی تەبیعەتو لێبوردەو دەستکراوەبوون، وەکاروبارتان لەناو خۆتاندا بەڕاوێژ بوو. ئەوە سەرپشتی زەوی وژیانتان لەسەرزەوی باشترە بۆتان لەمــردن وچونەوە ناوســکی زەوی.. لەبەرئەوە من دڵشــادو کامەرانم کەپادشای ووڵاتم دادپەروەرەو لەسایەی عەدالەتی دا ستەمم لێ ناکرێ ومافم ناخورێ.

٣. لەووڵات وشــاری خۆمــدا کاردەکەم وبژێوی ژیانــی خۆموماڵو مناڵم لەشــارەکەی خۆمدا دابینەو بۆی ئاوارەی ووڵاتان نابمو غەریبی شارو ووڵاتان نیم. ئای چەند خۆشە لەشاری خۆتوناو هاونیشتمانیانی خۆتدا کارو کەسابەت بکەی..

٤. ســوپاس بۆخوا داهاتەکەم، بەشــی بژێوی خــۆمو ماڵو خێزانم دەکاتو سەروبەر پێی ڕادەگەمو قەرزاری کەس وهیچ دوکانو بازاڕێك

نیم.

٥. خانویەكــی بچكۆلەم هەیە، كەماڵی خۆمــەو كرێچی نیمو ماڵو منالْم بەئاسودەیی تێ ی دا دەژین.

٦. ژنێكم هەیە، كەبەڕاستی ژنەو ژیانی لەژان پاراستوم. هاوژینێكی دڵسۆزە بۆم. زۆر شوكرانە بژێرە بەوژیانەی كەهەمانە. خۆپێغەمبەری خــواش (ﷺ) فەرمویەتی: (الدُّنيا مَتــاع، وخَيْرُ مَتاعِ الدُّنيا المَــرأَةُ الصّالِحَة). دونیا خۆشــەو پڕە لەجوانی، چاكترین خۆشــی وجوانیەكانی دونیاش بریتی یە لەژنی باشو ڕێكوپێك.

٧. ســوپاس بۆخوا منالەكانم گوێڕایەڵــن وهەم خۆم ودایكیان. هەم دراوسێو خزمو ناسیاو لێیان ڕازین.

٨. ئەوەی زۆر بەختەوەرم دەكات ئەوەیە كەلەشــم ســاغەو دكتۆرو دەرمان ناناســم وهیچ خواردنێكم لێ قەدەغە نیەو چاوم لەهیچ كارێ ناترسێ.

٩. بەئارامــی دەژیم ودوژمنــی كەس نیم وكەس ناحەزم نی یە. بێ خەم بەبێ پشتێنو چەك دەخەوم.

جا پاشــای بەڕێــز: هەرچەندە ڕۆژانە مانــدومو بەڕواڵەت هەژارم، بەڵام بیر لەهیچی تر ناكەمەوە. لەكاتێكا من ئەو هەموو شتە بەنرخو گرانبەهایانەمــان هەیــە كەباســم كــردو بەپارەو ســامان ناكڕدرێنو دەســتناكەونو دەیان كەس هەیە لێیان بێ بەشــە. ئیتر حەیف نی‌یە ئەوپەڕی بەكامەرانیو شــادمانی ژیان بەســەر نەبەمو بیرلەهیچی تر بكەمــەوە لەماڵو ســامانو دەوڵەمەندبوونی دنیایی. لەكاتێكا لەســەر ســفرەكەمان نانێكو دۆیەك هەیە كەبەیەكەوە لەگەڵ ژنو منالەكانم بیخۆینو سوپاسی خوا بكەین.

بەڵی بەڕێزان: پادشــا بەم قەناعەت وبەختەوەری وئاسودەیی یەی

ئەم خزمەتگوزارە باخەوانە، کەبەڕاستی گەیشتۆتە لوتکەو چڵەپۆپەی بەختـــەوەری زۆر سەرســـام بـــوو ئیتر خواحافیزی لێکـــردو گەڕایەوە ناوکۆشـــك وبانگهێشـــتی ڕاوێژکارە تایبەتیەکەی خـــۆی کردو تەواوی بەسەرهاتەکەی کابرای کارگوزاری بۆ گێڕایەوە. ڕاوێژگار لەکاتێکدا زۆر بەپەرۆشەوە گوێی بۆ قسەکانی جەنابی پاشا ڕاگرتبوو. بەبیستنی ئەو چیرۆکە ئەویش وەکو پاشـــا گەلێك سەرسام بوو. بەڵام لەهەمان کاتدا پێشنیاری کرد کەکارێك ئەنجام بدەن، پادشا ووتی: چۆن کارێكو بەچ مەبەستێك؟! ڕاوێژکار ووتی: قوربان: بیرۆکەی (نەوەدو نۆ)!! پاشا بەم وەڵامە زۆر سەرسام بوو، بۆیە پرسی: مەبەستت لەمە چیە؟! ڕاوێژکار ووتی: (٩٩) ســـکەی زێڕ دەخەینە کیسەیەکەوەو لەشەودا بەبێ ئەوەی کەس هەستمان پێ بکات لەبەردەرگای ماڵی ئەو کرێکارە باخەوانەکەی جەنابـــت باســـت کرد، دایدەنێین، پاشـــان چاودێـــری دەرئەنجامەکەی دەکەیـــن. پادشـــا پێشـــنیارەکەی وەزیری لاپەســـەند بـــوو، لەبەرئەوە بڕیاری دا ئەو تاقی کردنەوەیە ئەنجام بدات. چاوەڕێ ی کرد تاشـــەو داهات. پاشان کیســـە زێڕەکەی لەبەردەم ماڵی کرێکارە هەژارەکە داناو لەپەنایەکدا خۆی حەشـــاردا، تابزانێـــت چی ڕوودەدات. دوای ماوەیەك کرێکارە هەژارەکە بۆداخســـتنی دەرگای ماڵەکەیـــان هاتەدەرەوە بینی وا کیســـەیەك لەبـــەردەرگا کەوتووە، کاتێك کیســـەکەی کردەوەو بینی ئـــەو هەموو زێـــڕەی تێدایە لەخۆشـــی دا خەریك بـــوو باڵی دەگرت. بانگی هاوســـەرو منداڵەکانی کردو پێ ی ڕاگەیاندن کەکیسەیەك زێڕی لەبـــەردەم دەرگا دۆزیوەتەوە!، ئەم هەواڵـــە هەموانی یەکجار دڵخۆش کـــرد. دەرگاکەی داخســـت وچونە ژورەوە، شـــەوگار درەنگی کرد. دنیا بەرەو خامۆشـــی دەڕۆیشـــت وئەندامانی خێزانەکەی نوستن. پادشاش لەکولاوڕۆژنـــەی ماڵەکەیانەوە چاودێری دەکـــردن. بینی واکرێکارەکە

دەستی بەژماردنی زێڕی ناوکیسەکە کردو کاتێك لەژماردنی بۆوەو زانی سکەکانی ناوکیسەکە (٩٩) دانەیە لەبەرخۆیەوە ووتی: گومانی تێدانی یە ئەم سکانە (١٠٠) دانەبوون. (وەکو ئەمڕۆ دەڵێن دەفتەرێك دۆلار (١٠٠) وەرەقەیە. ئەگەر (٩٩) بێ، ناتەواوە).

ووتی: بەخوا دیارە دانەیەکیان کەوتووە، ئەم پارەیە هی هەرخێرەومەندێك بێ بەتەواوی هێناویەتی وخۆمەعلومە لەکەس نەکەتووە، چونکە ئەگەر بکەوتایە لەسەر ڕێگا دەکەوت. بەڵام ئەم کیسەیە هەربەدەرگاکەمانەوە نرابوو. ڕەنگە لەوکاتەدا زێڕێکی لێ کەوتبێتە خوارەوە. بۆئەم مەبەستە هاتەدەرەوەو دەستی کردە گەڕان بەدوای ئەوتاکە زێڕەدا. تاژمارەی زێڕەکانی ناوکیسەکە ببێتە (١٠٠) دانەی تەواو!..

زۆرگەڕا، بەتەواوی ماندوو بوو. بەڵام بێ ئاکام بوو. پاشان بەخۆی گوت: کێشەنیە لەمەودوا زیاتر کاردەکەم تابتوانم سکەیەکی تر بکڕم وژمارەی زێڕەکانم بگەنە (١٠٠) سکەی تەواو. شەوگار بەتەواوی درەنگ بوو. بەوحاڵەوە گەڕایەوە ژورەوەو خەوت. بەڵام بۆبەیانی زۆر درەنگ بەخەبەرهات. کەزانی کاتی درەنگەو لەکارەکەی دواکەوتوە،- کەهیچ کاتێ ئاوا درەنگ خەبەری نەبۆتەوەو لەکاردوانەکەوتووە، لەژنەکەی توڕەبوو. وە زۆرقسەی ناخۆشی بەهاوسەرەکەی گوت. ئەو هاوسەرەی کەلەوەوپێش زۆر بەسۆزو بەزەیی ومیهرەبانی ونەرم ونیانیەوە، مامەڵەی لەگەڵ دەکرد. پاشان هاواری کرد بەسەر منداڵەکانیداو دەیگوت: هەستن ئەوە بۆدەبێ هەرمن خەبەرتان بکەمەوە، تاکەی بۆتان بمێنم، بەلێدان وقسەپێوتن لەناوجێگاکانیان هێنانیە دەرەوە!!

ئەومنالانەی کەتادوێنێ گۆنای یەك بەیەکیانی ماچ دەکردو دەستی دەهێنا بەسەریاندا، پاشان جێ ی دەهێشتن ودەرۆیشتە سەرکارەکەی.

کرێکارەکە سـەرەڕای ئەو هەمـوو گۆڕانکاریـە خێرایانەماڵی بەجێ هێشـت (بەبێ خواردنـی نانی بەیانی)و بەرەو شـوێنی کارەکەی ملی ڕێگەی گرتەبەر، بەڵام زۆر ماندوو بوو. چونکە شەو جگە لەماندوبوونی بۆگەڕان بەدوای سـکەزێڕەکەدا، وەکو پێویسـت نەخەوتبوو. هەروەها هەموو ئەو ڕەفتارانەی کردبووی بەرامبەر هاوسـەرەکەی ومناڵەکانی تەواو بێتاقەت ونائارامی کردبوو، کاتێك گەیشتە سەرکارەکەی هەستی کرد کەناتوانێت وەکو ڕۆژانـی ڕابردوو کاربکات. هەروەها ئەوگۆڕانیە خۆشـانەی ڕۆژانی پێشـوو دەوروبەری سەرسـام دەکرد، ئەمڕۆ نەك نەمابوو بەڵکو خەم وپەژارەو بێ تاقەتی وشـەکەتی جێگەی گرتبۆوە. لەگەڵ ئەوەشـدا بەنیازبوو لەڕۆژانی پێشـوو زیاتر کاربکات، تاداهاتی زیاتر دەست بخات بۆکڕینی سکەزێڕەکە!! پادشاکە بەدرێژایی ئەوشەوە ئاگاداری تەواوی سیناریۆکە بوو. زۆر سەرسام بوو ڕاوێژکارەکەی بانگ کـردو تـەواوی ڕوداوەکانی شـەوی ڕابردوی بۆگێڕایـەوە، لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکاریە خێرایانەدا... پادشـا هێشتا واگومانی دەبرد کەئەو کرێکارە دەتوانێ بەختەوەریەکەی جارانی بەدەسـت بهێنێتەوە، ئەگەر ببێتە خاوەنی ئەو پارچە زێڕەو سـکەکانی بگەنە (١٠٠) سکەی تەواو. ئـەوکات بەدڵنیاییەوە ئەم کرێکارە دەتوانێـت هەرچی خانەوادەکەی حـەزی لـێ بکات وپێیان خۆش بێـت، بۆیان دەسـتەبەر بکات، بەڵام بەداخـەوە ئەوە ڕووی نەدا. وەزیر زۆر بەباشـی گوێ ی بۆقسـەکانی پادشـا گرتبوو. پاشـان پێ ی ووت: جەنابی پاشـا. ئەم کرێکارە ئەو بارودۆخە پڕئارامـی و هێمنیەی کەتێیدابوو، هۆکارەکەی ئەوەبوو کە (قەناعەتیان) بەوداهاتە کەمەهەبوو، کەخاوەنی بوون. ئەوان بەختیار بوون. چونکە شتێك نەبوو لەژیاندا سەرقاڵیان بکات. ئەوان بەرهەمی ئەو قەناعەتەیان دەخوارد کەهەیان بوو. بەڵام ئەمڕۆ کەلەناکاو بەبێ

ماندوو بوون، بۆته خاوەنی (٩٩) ســکەی زێڕین، هەربۆیە قەناعەتیان پــێی نیــەو داوای زیاتر دەکــەن!!.. ئایا دەزانی کاتێ مــرۆڤ لەناکاو ســەروەتێکی زۆری دەســت دەکەوێت بەبێ ماندوو بــوون، قەناعەتی پێ ناکات وبەردەوام بەدوای زیاتردا دەگەڕێت. تەنانەت ئەگەر بەشــی هەموو پێداویستیەکانیشــی بکات، بەڵێ هــۆکاری بەختەوەری مرۆڤ قەناعەتە. نەك سەروەت وسامان..

ئیماندارانی بەڕێز: کاتێك کەباســی قەناعەت دەکەین، زۆر پێویستە ئەو ڕاســتیەش ڕوون بکەینەوە کەقەناعەت مانای کاسپی نەکردن نی یە. بەڵکو داواکردنی ســەروەت وســامانی زۆر بەحەڵاڵــی، کەگومڕات نەکات، شــەرعی یە. ئەوەتا خوای گەورە باســی حەزرەتی ســولەیمان پێغەمبەرمان بۆدەکات، کاتێ کەســولەیمان فەرموی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴾ ص:٣٥.

واتە: سولەیمان ووتی: پەروەردگارا لێم خۆش ببەو دەسەڵاتێکم پێ ببەخشــە کەدەست نەدات بۆکەســی تر لەدوای خۆم. چونکە بەڕاستی تەنها تۆ بەخشێنەری هەموو خەڵاتێکیت. جاتەماشاکەن، خوای گەورە نەیفەرمــوو ئــەی ســولەیمان. ڕازی بە بەوەندەی کەپێم بەخشــیوی وهیچــی تر هەوڵ مــەدە. داوای هیچی تر مەکــە. بەڵکو خوای گەورە هەرلەسوڕەتی (ص) دا، دەفەرمویَ: ئێمە داواکەمان گیرا کردو (با) مان بۆڕامهێنا، کەبەفەرمانی ئەو بەنەرمی هاتووچۆ بکات. بۆهەرشــوێنێك وویســتی، هەروەها شەیتانەکانیشــمان کردە خزمەتگــوزاری لەهەموو جۆرە بیناسازێك ومەلەوانێکی ژێر دەریا. هەندێکی تریش لەشەیاتینی بەکۆت وزنجیر بەســترابوونەوە، تانەتوانن خراپەکاری ئەنجام بدەن. جاخوا کەئەمانەی هەموو پێبەخشی فەرموی: ئەمە بەخششی ئێمەیە بۆتۆ ئەی سولەیمان. تۆش دەبەخشیت یان نابەخەشیت، لێپرسینەوەت

نی یەو خۆت سەربەســـتی.. ئەمجا لەکۆتایی دا، کەحەزرەتی سولەیمان ئەو هەموو دەسەڵات وسامانەی هەیە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴾ ص:٤٠.

واتـــە: بێگومان ســـولەیمان لـــەلای ئێمە، پلـــەی زۆر نزیکی هەیەو پاشەڕۆژو ئایندەیەکی جوانی هەیە لای ئێمە..

کەواتـــە: قەناعەتی شـــەرعیانە ئەوەیـــە: کەتادەتوانـــی هەوڵ بدە، بەرهەمی جوان بەدەســـت بێنە، خۆشگوزەران بە. بەڵام بەومەرجەی: بەهـــەوڵو تێکۆشـــانی خۆت دەســـتت بکەوێ، نـــەك حەزبکەی وئاوات بخوازی کەبەبەلاش دەستت بکەوێ ولەپڕێ ببی بەکوڕێ بەبێ هەوڵو مانـــدوو بوون!. وەهەروەهـــا دوای بەکارهێنانی هەموو هەوڵو ماندوو بونەکانت، ئەمجا ڕازی بیو ئاســـودەبی بـــەوەی کەخوای گەورە پێ ی بەخشـــیوێو دڵتەنگ نەبی بەوەی کەدەبینی کەســـانێك لەتۆ زیاتریان هەیە. بەڵکو ئەوە بەحیکمەتو کاربەجێ یی خوای پەروەردگار بزانی، کە ئەوپەڕی لەجێی خۆیەتی.

ئیمانداران: زانای پایەبەرزی ئیســـلام. بیرمەندی ئیســـلامی. شـــێخ (محمد الغَزالي) دەفەرموێ: (إذا أَبْطَأَ الإِنْسـانُ في تَوْسِـيعِ ثَرْوتِـهِ، لِتَرْبِيَةِ أَوْلادِهِ وصِيانَةِ حاضِرِهِمْ ومُسْتَقْبَلِهِمْ. فَرِضاهُ بالْمَقْسُومِ جَرِيمَةٌ إجْتِماعِيَةٌ).

واتـــە: هەرکاتـــێ مرۆڤ، سســـتی وتەمەڵی نواند لـــەوەدا کەهەوڵو تێکۆشـــانی زیاتر بخاتەکار بۆئەوەی سەروەت وسامان وپارەو پوڵەکەی زیاتـــر بـــکات، کەئەگەر زیاتـــر هەبوایەو دەشـــیتوانی پـــرۆژەو کاری زیاتـــر بکات وســـەرمایەکەی زۆرتر بکاتو بەوســـەرمایەیەی دەیتوانی منداڵەکانی باشـــتر پەروەردە بکات. وەلەئێســـتاو داهاتودا بیانپارێزێت لـــەلاڕێ بوون ولەدەســـت چـــوون. ئەگـــەر ســـەرمایەکەی زیاتربوایە، دەیتوانی منداڵەکانی لەزانکۆ ناودارەکانی جیهان بخوێنن چونکە زیرەك

وبەتوانـــان. بەڵام ئەمەی نەکــردو ووتی: ئەمەندە پارەی خوای گەورە پێی بەخشیوم بەسمەو قەناعەتم هەیەو پێویست ناکات هەوڵی زیاتر بــدەم. لەبەرئـــەوە لەجیاتی ئـــەوەی پرۆژەی جوان بــکاو هەم خۆیو هەم خەڵکی ســـودمەندبن، پارەکانی هێشتەوەو ووردە وردە، خواردیو ســـەرەنجام مناڵەکانی بەهۆی باری دارایی ونەبونـــی یەوە نەیانتوانی پلەکانی خوێندن بەســـەرکەوتویی ببڕنو ببنە خاوەن بڕوانامەی باڵ، ئەوە ئەو کەسە کەبەناوی قەناعەت وڕازی بونەوە ئەوکارەی کرد. ئەوە تاوانێکی کۆمەڵایەتی ئەنجامداوە. تاوانی کردوە دژی ماڵو مناڵی خۆی، وەتاوانـــی کـــردوە دژی کۆمەڵگاکەی کەدەیتوانی بەو پارەو ســـامانەی کەئەگەر بیخستایەگەڕ، هەمویان سودمەند بوون. ئەمەش لەفەرمودەی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) وەردەگیرێ کەفەرموی بە (ســـەعد): (لَأَنْ تَذَرَ ورَثَتَكَ أَغْنِياءَ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عالَةً يَتَكَفَّفُونَ النّاسَ). واتە: بەڕاستی ئەگەر نەوەکانت کەلەدوات بەجێ دەمێنن ودەبنە میرات گرت، بەدەوڵەمەندی بەجـــێ بهێڵی، ئەوە چاکتـــرە لەوەی کەبەهەژاری ونـــەداری بەجێیان بێڵیو ببنەبار بەسەرشانی خەڵکەوەو چاو لەدەستی خەڵکی بن.

تەماشـــاکەن: نەیفەرموو ئەی ســـەعد، ئافەریـــن بۆئیمانەکەت، وە هەموو ســـامانەکەت بکە بەخێـــرو خێراتو هیچ بـــۆ مناڵەکانت جێ مەهێڵە. بەهەژاری بژین باشـــترەو خوا پەکیان ناخات!. نەخێر، ئەوە پەیامی پێغەمبەری خوا نییە (ﷺ).

دوای ئەوە (شـــێخ محمد غەزالی) دەفەرموێ: (وإذا تَـرَكَ كِيانَ أُمَّتِهِ في المَيادِينِ العامَةِ، يَتَداعى بالخُمُولِ والطَّراوةِ، والقُنُوعِ بِأَدْنَى العَيْشِ فالرِّضا بالمَقْسُومِ جَرِيمَـــةٌ سِياسِـــيَةٌ). واتە: ئەگەر گەلو نیشـــتمانو ئومەتەکەی پشـــتگوێ خســـت لەمەیدانە گشـــتیەکانی ژیانـــداو هانی خەڵکـــی دا کەئەوەندە بەتەماح مەبنو ئاوا شـــەوو ڕۆژ مەخەنە سەریەکو بەکەمترین ژیانی

ئــەم دنیایە ڕازی بــن، کارەباتان بۆچیــە؟ تەلەفزیۆنتان بۆچی یە؟ پــارك وباخچــەی جوان وپڕلەگــوڵو گوڵزارتان بۆچیــە؟ ئەم چوار ڕۆژە ژیانــی دونیایە ئەوەی ناوێ، بەم قســانەو بــەم ووتارانە خەڵکی ســاردکردەوە لەهەوڵو هیمەت وکارکردن وتێکۆشان سەرەنجام میللەت وگەل وئوممەتێکی دواکەوتوی چاولەدەســتی خەڵك بوو بەرهەم هات، ئەوە تاوانێکی سیاســی کردوە. چونکە پێویستە مادام ئێمە موسڵمانین وخاوەنــی ئەو قورئان وفەرمودە زێڕینانــەی پێغەمبەرین (ﷺ) ئەوا دەبوایە پێشــەنگ وپێشــەوا بوینایــە لەهەموو بوارەکانــی داهێنانی شتەجوانو سودبەخشەکان. کەبەڕاســتی مرۆڤی موسڵمان، هەتا ژیانی دونیایی خۆشــترو جوانتربێ، زیاتر موشتاقی بەهەشت دەبێ، چونکە دەڵێ، ئەگە لێرە ژیان واخۆش بێ. ئەی دەبێ خۆشــی بەهەشــت چۆن بــێ وهــەوڵ دەدات پێی بــگات. وەبــەردەوام لەهەوڵی ئــەوەدا دەبێ کەئەم ژیانە خۆشــەی بــەردەوام بێ، ئەویش بــەوەی کەدوای مردنی جێگەی بەهەشــت بێ، بەڵام ژیانی نەبونیو نەداریو پیسو پەڵۆخی ودواکەوتوییو کوێرەوەرییو ستەم وچەوسانەوە، ئەوەندە ناخۆشە. کەوا لەمــرۆڤ دەکات، ئەم دنیایە بەدۆزەخ ببینێ، بۆیە هەوڵ دەدات خۆی لــەم دۆزەخە ڕزگار بکات. جایان بــەوەی کەتاوان ئەنجام دەدات وەکو دزی وڕێگری وکوشتن وماڵی خەڵك خواردن، جاسوسی کردن، دووڕویی کردن، هەر بۆئەوەی ژیانی خۆش بێ. یان پەنا دەباتە بەرخۆکوشــتن وخۆڕزگارکــردن لەم جەهەنەمەو گەیشــتنی بەجەهەنەمی قیامەت!..

کەواتە: هەموو ئەوانەی وادەزانن یان واتێ گەیەندراون کەئیسلام وەکو بەڕێوەبردنــی وولات ببێتە بەرنامــەی کاری حکومەتان وگەلان، ئەوا لەگەڵ ئەم پێشــکەوتنەی ئەمڕۆی جیهانــدا یەکناگرێ ودەبێتە هۆی بۆدواوەگەڕانەوە، چونکە لەئیسلامدا قەناعەت وبەکەم ڕازی یوون هەیە.

ئەوە بەڕاستی بەهەڵە لەئیسلام تێگەیشتون. یان ئیسلامیان لەدەمی کەسێکەوە بیستوە، کەلەخۆیەوە باسی ئیسلامی کردوە. نەك لەئیسلام خۆیەوە. کەوەکو ڕونمان کردەوە، قەناعەتی شەرعی یانی پێشکەوتن‌و هەوڵ دان تاچڵەپۆپەو لوتکە. بەڵام بەبێ ستەم کردن لەبەرامبەر، کەئەمەش ئەوپەڕی پێشکەوتنە. چونکە زۆر ووڵات هەیە لەجیهاندا، کەپێشکەوتوە لەبواری ماددی‌و تەکنەلۆجیای سەردەم‌و خۆشگوزەرانی ژیانی دا، ئەم پێشکەوتنەی لەسەرشانی‌وخوێن‌و خاکونەوتی میللەتانی چەوساوەو بێکەس دروستکردوەو پاشان بەها بەرزوباڵاکانی تێدا بوونە قوربانی. وەکو نەمانی ڕێزو حورمەت وبەزەیی‌و سۆزو پەیوەندی خێزانی وکۆمەڵایەتی.

بەڕێزان: مانایەکی فراوانی ووشەی (قەناعەت) ئەوەیە کەهەندێ لەزانایان فەرمویانە: قەناعەت بریتی یە لە: (الإِقْبالُ بالْوجْهِ عَلى الشَّئ).

بەکوردی خۆمان: بەدڵ‌و بەگیان بڕوات بەوکارەببێ کەدەیکەی، وەکارەکانت خۆش بوێ وپێشکەوتنی خۆتی بۆیەکلایی بکەیتەوە، بۆئەوەی پسپۆری بەدەست بهێنی.

پێشکەوتنی خۆرئاوا بە گشتی هی ئەوەیە، کە هەرکەسەو تەنها کارێکی تایبەت دەکات‌و پسپۆڕە تێیدا. نەك هەمەکارەبێ، کەسەرەنجام هیچیان نەبێ. بەڵام لێرە، هەرکەسەی چەند کارەیە. کەزۆرجار سەختی باری گوزەران وای کردوە کەکەسێك ناچاربێ دەست بەچەند کارێکەوە بگرێ، بۆئەوەی بتوانێ ژیان وگوزەرانی خۆی‌و ماڵ‌و منالی دابین بکات، چونکە بەتەنها بەهیچ کام لەپیشەو کارەکانی ژیانی دابین نابێت. بەهۆی دەسکەوتی کەم. وەمەصرەفی زۆرو گرانی بازاڕی ئازاد!..

خۆچەند پیشە بزانی خراپ نی یە. بەڵام قەناعەت ئەوەیەکە: خۆت ساغ بکەیتەوە بۆیەك کارو پیشەو مێشکت تەنها بەوەوە مەشغوڵ

بکەی. کەسەرەنجام پسپۆری بەدەست دێنی وبەرهەمی جوان پێشکەش دەکەی. زانایانی پایەبەرزی ئیسلام قەناعەتیان لەزانستدا بە (پسپۆڕی) جێ بەجێ کردوە. ئەوەتا زانایەکی گەورەی وەکو پێشـــەوا (شـــافیعی). خـــۆی تەرخان کردوە بۆ (فقه). خۆفەرمودە ناســـیش بوە، تەفســـیری قورئانیشـــی زۆرباش کردوەو زۆر جوان لەقورئان وفەرمودە گەیشـــتوە ئەمجا توانیویەتی حوکمە شـــەرعیەکان دەربێنێ. بەڵام خۆی تەرخان کردوە بۆبابەتی فیقهو شـــەرعەکەو هەتا قیامـــەت کەدەڵێ ی ئیمامی شـــافیعی. ناوی سەرمەزهەبێکی گەورەت دێتەبەرچاو. نەك موفەسیرو موحەدیس وئەدیب وشـــاعیرێك. کەهەرچەندە لەمانەشدا دەستی باڵاو بەرچاوی هەبووە!.. یاخود زانای پایەبەرز (محمدی کوڕی ســـیرین) تەنها خۆی تەرخان کردوە بۆ بواری خەون لێکدانەوەو لەگەڵ گوێ بیســـتی ناوی (إبنُ سیرین) دەبین لێکدانەوەی خەومان دێتەبەرچاو.

وەزانای گەورە (إبنُ کثیر) لەتەفسیرو مێژودا پسپۆڕبووە.

(إبنُ خلدُون) کۆمەڵناس بووە. (جابری کوڕی حەییان) خۆی بۆزانســـتی (کیمیا) تەرخان کردوە!..

بیرمەنـــدی ئیســـلامی مامۆســـتا (عبدالرحمـــن صدیـــق). لەکۆڕێکدا، قســـەیەکی زۆرجوانی کرد کەفەرموی: ئەمرۆ ڕۆژی خۆکۆکردنەوەیە. ڕۆژی پسپۆریەتیە، ئەوزەمەنە بەسەرچوو کەدەیانگوت: دکتۆری (قوڕگ ولوت وگوێ). نەخێر، ئێســـتا دەبێ پیســـپۆریەکەی هەرلەیەکیاندابێ. لەگەڵ ئەوەی لەوانی تریش شارەزایی هەبێ،. یان پزیشکی چاو. بەڵام ئێستا دەبێ پسپۆریەکەی دیاربێ، لەکام بەشەی چاودا پسپۆڕە!..

هەروەها لەبواری سیاســـەتدا، حیزب دەبێ قەناعەتی بۆدروست ببێ کەفلان ئامانجی هەیە. بۆنمونـــە لەووڵاتانی ڕۆژئاوادا حیزبی واهەیە تەنها کار بۆبواری (ژینگە) دەکات. نەك وەکو ئێرە. حیزبێك. هەرچی

پرۆژە هەیە کاری بۆدەکات وهیچیشیانی پێناکرێت وحیزب بۆتە دوکان وبازاڕو کاسپی وخۆژیاندن!..

وهەروەها قەناعەت بۆکاربەدەســت ئەوەیــە: خۆی بۆخزمەتکاری میللــەت و وولات یەکلایــی بکاتەوە. نەك بەرپــرس بێ لەحکومەتداو بازرگانیش بێ!، لێپرسراوی سەربازی بێو مقاوەلات وبەڵێندەرایەتیش بکات!، کەســەرەنجام لەهەردوکیاندا فەشــەل دێنــێو لەوەوە گەندەڵی دروست دەبێ.

زانای بەڕێزی ئاینی ئیســلامیو پێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوت، قەناعەتی شەرعی بۆئەو ئەوەیە کەخۆی یەکلایی بکاتەوە بۆپیشەکەی وپسپۆڕی تێدا بەدەست بێنێ. ئەگەر فەتوا دەدات، بەڕاستی فاڵ ببێتەوە بۆبواری شــەریعەت ولێکۆڵینەوە لەوبوارەدا بــکات. ئەگەر ووتاربێژە، خۆی یەکلایــی بکاتەوە بۆپســپۆڕی لەبواری ووتاربێژیداو بەدەســت هێنانی زانســتی ســەردەم وبەئاگابون لەڕوداوەکانی ڕۆژو قســەکردن لەســەر مەســەلە گەورەو گرنگەکان. نەك مامۆســتایەکی هەمەکارەو لەهەرشتە شــتێك زانین!.. بەڵکو دەبێ لەشــتێك هەمووشتێك زانین. کەپێ ی دەوترێ، پسپۆڕی.

دەگێڕنەوە دەڵێن: (ئەلبێرت ئەنیشتاین) بەئەسڵ ئەڵمانی وفیزیاناسی ئەمریکی کەلەمــاوەی ژیانی دا، بەزیرەکترین کەس قبوڵکرا لەمێژوی مرۆڤایەتیــدا. لەپێناو ئــەوەی کەیەك چرکەش بــێ لەبەرهەمەکانی دانەبــڕێ وبەردەوام بــەوردەکاری وبەئاگاییەوە لەســەرکارەکەی بێت، لەهەموو ئەوشتانە دووره پەرێزبێت کەبیروهۆشی دەشێوێنێت.

جارێکیــان: لێ ی دەپرســن، بۆچی صابونی حەمامــی بەکارهێناوە بۆڕیشتاشــین. (نــەك مەعجونــی ڕیــش تاشــین). ئەنیشــتاین، ئەم وولامە هەســت بزوێنەرە دەداتەوەو دەڵێ: (دوو صابون بیرو هۆشــم

سەرقاڵدەکات!!).

کەواتە: بنەمای سەرەکی وڕازو نهێنی سەرکەوتن، تەنها یەك پەیامی یە لەژیاندا. ئەوەی ئەتەوێت بۆی بژی، ڕەنجی بۆبدەو مێشکت سەرقاڵ مەکە بەشــتی تــرەوە، دڵنیابە کەئەگەر وویســتی خوای لەســەربێت هەرپێی دەگەیت..

کۆتا ووشەم لەسەر ئەم بابەتە ئەوەیە: ئەمڕۆ لەووڵاتی کوردستانی خۆماندا، فرەکاری وهەرڕۆژە ئیشێك کردن، بەرهەمی جوانی نەهێشتوە. ئەوەتا لەزۆر جێگا دەبینی، دوکاندارێك بەتانی ودۆشــەك دەفرۆشــێ. کەچی پاقلاوەشــی لەگەڵ دەفرۆشــێ!! بینیومانە دۆندرمەو محەلەبی وشــێلم وپاقلەی کوڵیوی لەیەك دوکاندا فرۆشتوە!!. لەوپەڕی ساردەوە، بۆئەوپــەڕی گەرم، بەیەکەوە لەدوکانێکدا دەفرۆشــرێن!.. یان کەســی واهەیە، فەرمانبەری فەرمانگەیەکە، کەچی دوای دەوام. کارەباچیشــە. ئاویش دەبەســتێ، کاشــیش دادەنێ، تەلەفیزیۆن و سەتەلایتیش چاك دەکات. جاکامیانی هاتە بەردەســتو بازاڕی گەرم بوو. ئەوەیان دەکات! کەسەرەنجام هەموو کارەکان سەقەت دەبن و ڕێکوپێك جێبەجێ ناکرێن..

سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز لەگەڵ تەفسیری ئاسان.

٢. گۆڤاری بڕیار. ژمارە: ٢٣، نیسانی (٢٠١٠) لاپەڕە: ٣٢.

٣. مَوْسُوعَة الأَخْلاق الإِسْلامِيَّة. سَعْد يوسف أَبوعَزيز ج٢ ص٢١.

٤. مَوْسُوعَة نَظْرَةُ النَّعيم. ج٨ ص٣١٦٧.

٥. نهێنی خۆشبەختی. عادل شاسواری. ل٧٨.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمَعِينَ:

ئیمانداران: هەروەکو لەبەرامبەر تاریکی دا ڕوناکی هەیە. لەبەرامبەر جوانی دا، ناشیرینی هەیە. لەبەرامبەر چاکەدا، خراپە هەیە. بەهەمان شێوەش بەردەوام ململانێ هەبوەو بەردەوامیش هەردەبێ لەنێوان خێرو شــەڕدا.. جائەگــەر بەجوانی وبەووردی لێکۆڵینەوەیەکی زانســتیانەی بەویژدانانەوە لەقورئــان وفەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکرێ، ئەوە بەڕونــی وئاشــکرایی دیــارە، کەهەرچی خێرو چاکــەو جوانی وپاکی وڕوناکی وزانســت وئەدەب وڕەوشتی جوان وبەها بەرزوباڵاکانە. لەلای ئەم دوو سەرچاوە سازگارەی ئیسلامن ودینی ئیسلام بریتی یە لەم شتە جوانانە. جاکەسانێکیش هەرهەن وهەردەشبن، هەروەکو لەڕابردووشدا بوون کەئەم پاکیەتی وچاکیەتی وپوختی وڕێزو حورمەتە کەلەئیسلامدا هەیــە. ئەگەر بکەوێتە بواری جێ بەجــێ کردنەوە دەبێتە لەمپەرێك لەبەردەم بەدی هاتنی حەزە ڕەشــەکانیان. کەئەوانە حەزیان لەســتەم وچەوساندنەوەی خەڵکی وخۆیان ئاغاو خەڵکی کۆیلەو خواردنی مافی خەڵکی بەناحەق وخوێن ڕشــتن وتاڵانی وداوێن پیســی یە. کەئەمانە ئیســلام نەهیان لێ دەکاو هەوڵی ئــەوەدەدا. مرۆڤیان لێ دوربخاتەوەو دەرگاکانی ئەم شوێنە خراپانە دابخرێن یان لانی کەم لەبەرچاودانەبن. جالەوپێناوەدا ئەهلی خراپەو تاریکی دژایەتی ئیســلام وبڵاوبونەوەی وخزمەتکارانی وجێ بەجێ کارانــی دەکەن. ئەوەتا بەدرێژایی مێژوو، هێزی کوفرو تاریکی خەریکی دژایەتی وبەرهەڵستی ئەهلی ئیمان بوە. بەهەموو شــێوەو بۆکرانێك هەوڵی لابردنــی داوە. لەڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا. زۆرێك لەموسڵمانان، لەتاوی ئیسلام وپێغەمبەری خوا (ﷺ) نازانن چــی بکەن کاتێ دەبینــن لەبەرنامەیەکــی تەلەفیزیۆنیدا، دژ بەئیسلامێك، تانەوتەشەر لەئیسلام دەدات، ڕاستیەکان هەڵدەگێڕێتەوە.

ســوكايەتی بەپێغەمبەران بەگشتی وبەحەزرەتی محمد (ﷺ) دەکەن. یان بەنوســین وبەناوی خوازراوەوە بەکتێــب وگۆڤارو ڕۆژنامە بڵاوی دەکەنەوە. ئالەم کاتەدا موسڵمانان دەوروژێن و وادەزانن ئەم بێ ئەدەبی کردنــە هەرهی ئەمــڕۆو ئەم ڕۆژەیانە، بەڵام کاتــێ دەچینە خزمەت قورئان تێ دەگەین. کەئەم ململانێ ودژایەتی کردنە زۆرکۆنە، هی پێش هاتنی حەزرەتی محمدیشە. ئەوەتا خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا ﴾

الفُرقان: ٣١.

بەڵــێ هەرچــی پێغەمبەرێك هەیــە، کەخوای گــەورە بۆڕێنمایی‌و گەیاندنــی پەیامی خوایی ناردویەتیە نــاو ئەم مرۆڤایەتی یەوە، ئەوا کۆمەڵێــك لەتاوانبــاران. دوژمنایەتیان کــردون‌و لەمپەریان لەبەردەم خۆیــان وپەیامەکەیــان دانــاوە. جاســەیرکەن: قورئــان دەفەرموێ: (المُجْرمين). لەتاوانباران. واتە ئەمانە تاوانباربون، حەزیان بەتاوان بوو. میکرۆب ونەخۆشــی بوون. بۆیە حەزیان لەشــیفاو دەرمان‌و میکرۆب کوژ نەبوو. حەزیان لەتیشــکی خۆر نەبوو. بۆئەوەی لەشوێنە تاریك‌و شێدارەکان نەداو گەرای پیسی لێ نەفەوتێ!. وەرن مێژوو بخوێننەوەو ســەرنج بــدەن: لەگەڵ ئــادەم، ئیبلیــس دەکەوێتە دژایەتــی. لەگەڵ (إبراهیمــی خَلیــلُ الله) دا، نەمــرود ڕوبەڕوی دەبێتــەوە. لەگەڵ هاتنی دەســتی سپی ڕزگارکەری موسادا، فیرعەون هەوڵی لەناوبردنی دەدات!. لەگــەڵ نوحی خاوەنی کەشــتی ڕزگاری دا. گەلێکی نەفام‌و نەزان‌و بێ ڕەوشــت بەرەوڕوو دەبێتەوە. هەموو پێغەمبەران ئاوا دژایەتیان کراوە، تادەگاتــە حەزرەتی محمــد (ﷺ). بۆڕوبەڕوبونەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). ئەبوجەهل وئەبولەهــەب‌و عوقبەو عاصی کوڕی وائیل‌و....هتد لەســەنگەری دژایەتی پێغەمبەری خوادابــوون. جاپێغەمبەران خۆیان

لەژیانـــدا بوون کەئازار دەدران. دەربەدەرکران. ســـەردەبڕانو بەمشـــار لەت دەکران وەکو (حەزرەتی زەکەریاو حەزرەتی یەحیا) فڕێ دەدرانە ئاگـــرەوە. ڕاودەنـــرانو ئاوارە دەکـــران. ئەوەتا ئەمـــڕۆش دوای چەند هەزار ســـاڵ، بەچکەو نەوەی فیرعەونو نەمرودو ئەبوجەهل، لەســـەر پێغەمبەران دەنوســـن. چونکە وەکو چـــۆن پێغەمبەران نەوەیان هەیە. کەصاڵحـــانو چاکانو باشـــانو ئەهلی عیلمن، ســـەرانی کوفریش دوای خۆیان نەوەیان هەیە. بەڵام ســـەرداری پێغەمبەران، خاتەمی ئەنبیاو مورســـەلین، حەزرەتی محمدی ئەمیـــن (ﷺ) لەهەموویان زیاتر، لەبرا پێغەمبەرەکانی ئـــازار دراوە. ئەوەتا لەمەککەدا: تاتەمەنی دەگاتە چل ساڵی بە (صادِقٌ أمين). ڕاستگۆی ئەمانەت پارێز، ناودەبرا. کەچی کاتێ کەقورئانی بۆخوێندنەوە، پێیان ووت: (ســـاحِر، كاهِن، مَجْنُون).. ئای چی لەوە ناخۆشـــترە لەیەکەم ســـاتی گەیاندنی پەیامی خوادا، مامی خۆی، برای باوکی. لەجیاتی پشـــتی بگرێ وپشتیوانی بێ، پێ ی بڵێ: (تَبّاً لَكَ أَلِهذا جَمَعْتَنا). کەئەبولەهەبی مامی بوو. لەگەڵ ژنەکەیدا، (وامْرَأَتُهُ حَمّالَةَ الحَطَبَ)..

دواتر شەهیدکردنی هاوەڵانی وەکو سومەییەو یاسر. دواتر بەردباران کردنی لەلایەن هەرزەکارانی طائیفەوە، کەئەمە بەڕاســـتی لەمەیدانی کـــردەوەدا. نـــەك گێڕانەوەدا ئازارەکـــەی بەدەردەکـــەوێ! دوای چونی بۆمەدینـــەش، لەئازاردان ڕزگاری نەبـــوو. لەبەدرو ئوحودو لەخەندەق و...هتـــد. چی ئازارچێشـــت بەشـــەهید بونـــی هاوەڵانـــی پایەبەرزی. بەبرســـیەتی ونەبونی وســـەرماو ســـۆڵەو بێ تفاقی. دواتر لەهەموان بەئازارتر، بوختان بۆعائیشەی داوێن پاکی هاوسەری کرا!! باشە بۆچی دەبێ ئەمـــە ڕوودات؟! بۆئەوەی ئەگەر مولحیـــدو موناڤیقەکانی ئەم ســـەردەمە، بێ ئەدەبیـــان بەرامبەر خێزانە بەڕێـــزو گران قەدرەکانی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد. بوختانیان بۆکردن ولەسەریان نوسین، بەلامانەوە زۆر سەیرنەبێ. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی وخێزانەکانی لەژیاندابوون. ئیسلام حوکمی دەکرد. دەسەلاتداری یەکەم بوو. کەچی ئاوا بوختان بۆعائیشەی هاوسەری دەکرا، کەچی ئەو پێغەمبەرە بەرێزە، ئاشتیخوازە، دەست بەخێرە، داخەری دەرگای شەڕو فیتنەو خراپە، کەسێکی لەوبوختان چیانە، لەوناپاکە دڵ پڕلەژەهرانە نەکوشت ودوری نەخستنەوەو ماڵی لێ نەسەندن..

ئیمانداران: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێکیان لەمزگەوتدا لەگەڵ صەحابەکاندا دانیشتبوو، باسی قیامەت وبەهەشتی بۆدەکردن. صەحابەکان ئەوەندە بەجوانی گوێیان گرتبوو. هەروەکو ئەوەی لەناو ئەو باخچەی بەهەشتەدابن ولەمیوەکانی بخۆن وسەیری کۆشك وباڵەخانەکانی بکەن. گەنجێکی تازەپێگەیشتوی تازەلاوی پڕدڵ لەئیمان، هاتەوە بۆماڵەوە بۆلای مامی. کەئەم لاوە لەمناڵیدا باوکی مردبوو. وەمامی بەخێوی کردبوو. مامەکەی تەمەنی (٦٠) ساڵ بوو. ئەم گەنجە بەرێزە ڕوی کردە مامی وفەرمووی: (ياعَمّاه، سَمِعْتُ الرَّسُول (ﷺ) يُخْبِرُنا عَنِ السّاعَةِ، حَتَّى كَأَنِّي أَراها رَأْيَ العَيْنِ). مامەگیان، ئەمڕۆ لەخزمەت پێغەمبەردا بوین (ﷺ) باسی هاتنی قیامەت وڕۆژی دوایی بۆدەکردین. منیش گوێم بۆگرتبوو. باوەڕبکە ئەی مامەگیان دەتوت بەچاوی خۆمان یەك بەیەکی مەشهەدەکانی قیامەت دەبینین و والەناویا دەژین. ئای خۆزگە مامەگیان تۆش لەوێ بویتایەو ئەو تام وچێژو خۆشیەت وەربگرتایە!، مامیشی کەناوی (جەلاسی کوڕی سوەید) بوو، لەوەلامدا ووتی: (ياعُمَير، واللهِ إنْ كانَ مُحَمَّدُ صادِقاً فَنَحْنُ شَرٌّ مِنَ الحَمير). واتە: ئەی عومەیر، برازاکەم. سوێندبێ ئەگەر محمد ڕاست بکا لەوەی کەدەیڵێ. ئەوە ئێمە لەگوێدرێژ خراپترین وگەمژەترین!!

ڕۆڵــه چۆن مرۆڤ بەوهەموو عەقڵەی هەیەتــی بڕوا بەو خوڕافیاتو شــتە خەیاڵیانە دەکات؟! کەعومەیری تازەلاو گوێی لەم قسە کاڵە بێ تامە بەتاڵە، تاڵە بوو. هەموو لەشــی هەژا. فەرموی: مامە تائێســتا تۆ لەجێگای باوکم بووی. لەهەموو کەسم خۆشتر دەویستی. کەچی ئێستا لەهەمــوو کەس زیاتر ڕقم لێتە. من ئێســتا لەنێوان دوو ڕێگادام. یان خیانــەت بەپێغەمبەری خــوا (ﷺ) بکەم وئەو قســەیەت نەگەیەنم، یان بیگەیەنمە پێغەمبەری خواو ئەو دڵەڕەشــەو زمانە پیســەی تۆی بۆبــاس بکەم. ئیتر چــی دەبێ باببێ!!. مامی ووتی: کەس بڕوا بەتۆی گەنج ناکات، من کەســێکم پێنج فــەڕزە لەمزگەوتم!!! بەڵام عومەیر چوە خزمــەت پێغەمبەری خواو باســەکەی وەکو خــۆی بۆگێڕایەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: نازانم بڵێم چی. بابنێرین بەشــوێن مامتــا. کاتێ (جــەلاس) هات، ئینکاری کردو ووتــی: ئەی پێغەمبەری خــوا (ﷺ) چۆن بڕوا بەقســەی هەرزەکارێکی ئــاوا دەکەی، تۆ خۆت دەزانــی من بەردەوام لەخزمەتتدام ونوێژ بێ جەماعەت ناکەم! ئەگەر بڕوام بەوەنەبێ کەئەوەی جەنابت دەیفەرموی ڕاســتەو وەحی خوایە، چۆن موســڵمان دەبــم؟! زۆر بەزمانی لوس بەرگــری لەخۆی دەکردو تەنانەت صەحابەکان هاتنە ســەرئەوەی کەبڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (جــەلاس) ڕاســتدەکاتو عومەیر منداڵەو ڕەنگــە دلگران بوبێ لەڕەفتارێکــی مامیو وویســتبێتی لەم ڕێگەیەوە تۆڵــەی لێ بکاتەوە!. عومەیری تازە لاوی نەونەمام. بەڵام دڵ پڕلەئیمان وخۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ). کەئەمەی بیست وزانی واخەریکە تۆمەتباریش دەکرێ ومامی والێزانانە قســەدەکات کەقەناعەتی بەپێغەمبەری خواو صەحابەکان هێناوە کەعومەیر درۆدەکات، بۆیە دڵی پڕبوو. فرمێســک بەچاویا هاتەخوارەوەو گریا. هەرلەوێدا دەستی بەرزکردەوە بۆئاسمانو

فەرمـــووی: (اللّهُـمَّ إنْ كُنْتُ صادِقـاً فَصَدِّقني). خوایەگیـــان ئەگەر ئەوەی بۆپێغەمبەری خوام گێڕایەوە ڕاســـتو ڕەوانەو من کەســـێکی ڕاستگۆم. ئەوا خوای پەروەردگار، ڕاستگۆییەکەم دەرخەیو پشتیوانیم لێ بکەی. هێشـــتا عومەیر دەستەکانی دانەگرتبوو. لەشـــوێنی خۆی نەجوڵابوو. کەجوبریل هاتو ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێنایەخوارەوە: ﴿ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَـٰمِهِمْ ﴾ التوبَة: ٧٤.

واتـــە: دوڕووەکان ســـوێند بەخوا دەخـــۆن کەقســـەیەکی نابەجێیان نەکردوە، کەچی ســـوێند بەخوا. بەڕاســـتی ئەوانـــە درۆدەکەن. بەڵکو گوفتـــاری کوفرو بێ بـــاوەڕی هات بەدەمیاندا ئەوانە دوای موســـڵمان بونیـــان بێ بـــاوەڕ بوونەوە... پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) کەئەم ئایەتەی بۆهات، کەهێشـــتا هەر لەومەجلیســـەدا بوون وبڵاوەیان لێ نەکردبوو. ڕووی کـــردە (جەللاس) وفەرمووی: ئەی جەللاس خوای گەورە ڕاســـت گۆیی عومەیری برازاتی ڕاگەیاندو تۆ بەوقســـەیەت کافر بووی. بەڵام ئەگـــەر بەخۆتـــدا بچیتەوەو تەوبەیەکی ڕاســـتەقینە بکـــەی. مەجالی تەوبـــەت هەیە، چونکە خوا دەفەرمـــوێ: ﴿ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ﴾ التوبَة: ٧٤.

واتە: جائەگەر ئەو دوو ڕوانە تەوبەبکەنو لەڕەفتاری نادروســـتیان پاشـــگەزببنەوە، ئەوە چاکترە بۆیان.. (سُـبْحانَ الله)، لەئاشـــتی خوازی ئەم ئیســـلامە. لەســـۆزو ڕەحمی ئەوخوای پەروەردگارە. لەدڵپاکی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ). کەسێك دووڕووە. پێنج فەڕزە لەمزگەوتایەو کەچی ئیسلام بەدرۆ دەزانێ، خوای گەورە ئەوهەموو سوڕەتو ئایەتەی قورئانی ناردۆتە خوارەوە لەباسی قیامەتو بەهەشتو دۆزەخ دا. ئەو پێغەمبەرە ئەمینـــە گەیاندویەتی. کەچـــی ئەو دوڕوە ئەو بـــێ ئەدەبیە گەورەی

بەرامبــەر کردوەو بەدرۆی زانیوە، کەتاوانەکەی زۆر لەکافر گەورەترە، چونکە ئەم بەدەم ووتویەتی بڕوام پێ یەتی، بەڵام لەپشتەوە وویستویەتی گەنجێکــی دڵ پڕلەئیمانی وەکو (عومەیر) لەئیســلام هەڵبگێڕێتەوەو ئیسلامی لەبەرچاو بخاتوبڵێ هەرکەس بڕوا بەمانەبکات عەقڵی نیەو گوێدرێژەو لەگوێدرێژ گەمژەترە! بەپێ ی یاسای هەموو وولاتان، ئەمە گەورەترین ناپاکییەو سزای هەرەتوندی بۆدانراوە. بەڵام خوای گەورەو بەبەزەیی، هێشــتا ڕێــگای تەوبەی نیشــان دەدات. پێغەمبەری خواش (ﷺ)، ئایەتەکەی بۆ دەخوێنێتەوەو ناشفەرموێ: ئەگەر تەوبەنەکەیو لەبەرچاوی خەڵکا نەڵێی پەشیمانمو هەڵەم کرد. دەتگرمو سزات دەدەمو دەتکوژم!. نەخێر، یەك ووشەی ناخۆشیشی پێ نەووتو فەرمووی: ئەی (جەللاس) بڕۆ بەلای کارتەوەو خوای گەورە ڕێی تەوبەی نیشانداوی.
دەڵێن: دوایی جەللاس کەئەم هەموو ڕاستیەی بینی، کەبەڕاستی ئەگەر پێغەمبــەری خوا (ﷺ) پاشــایەکی دونیایی بوایــەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبوایە. ئەوا لەسەر ئەم قسەیەی دەیکوشت یان لانی کەم سزای دەداو قســەی پێ دەووت. بەڵام تەنها ڕاستیەکانی خستەڕوو، ومڕێگەی تەوبــەی نیشــان داو تەواو. ئەمیش تەوبەیەکــی مەردانەی کردو بوو بەموسڵمانێکی ڕاست ودروست!
جــادوای ئــەم ڕوداوە، هەمووجــارێ کەپێغەمبــەری خــوا (ﷺ) (عومەیــری کوڕی ســەعد)ی دەبینــی زەردەخەنەی بــەڕودا دەکردو دەیفەرموو: (مَرْحَباً بالَّذي صَدَّقَهُ رَبُّهُ مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَماوات). سلاو لەکەسێك بێ، کەپەروەردگاری لەســەرو حەوت ئاســمانەکانەوە ڕاستگۆیی ئەوی ڕاگەیاندو پشتیوانی لێ کرد..
(ئەم بەسەرهاتە: ذَكَرَهُ السُّيُوطِيُّ في- الدُرِ المَنْثُور.(٣/٤٦٣،٤٦٤)
بەڵێ ئیمانداران: ئەم پێغەمبەرە خۆشەویســتە (ﷺ) بەمردوویش

وازی لــێ ناهێنــرێ. ئەوەتا لەدوای وەفاتی یەوە (چــوار) جار هەوڵی دزینی لاشــەی موبارەکی دراوە. لەلایەن خوانەناســان ودوژمنانی ئەو خۆشەویســتەوە، هەروەکو (محمــد إلياس عَبْدُالغَنــي) لەکتێبی (مێژووی مزگەوتی پێغەمبەر)دا (ﷺ) ئاماژەی پێ کردوە، بەم شێوەیە:

هەوڵی یەکەم: لەسەردەمی دەسەڵاتداریەتی: (الحاكم بِأَمْرِاللهِ العبيدي) کەیەکێك لەزەندەقیەکان ئیشارەت بۆئەوە دەکات کەجەستەی موبارەکی پێغەمبــەر (ﷺ) بهێنرێت بۆ (میصر). بۆراکێشــانی خەڵك بۆئەوێ، لەجیاتــی ئەوەی بــڕۆن بۆمەدینە! بەڵام لــەڕۆژی دوای ئەوپیلانەدا، خوای گەورە بایەکی نارد بۆمەدینە کەزۆر نزیك بوو زەوی بلەرێتەوە لەبەهێــزی (بــا) کەدا. ئــەوەش بوەهۆی ڕێگری کردن لەسەرکەشــان لەمەبەســتەکەیان وسەریان لێشێواو بەپەلە خۆیان ڕزگارکرد!! (سُبْحانَ اللــە)، ئەمــە چ وانەیەکی گــەورەکان فێردەکات وپێمــان دەڵێ: ئەگەر هیــچ کەس نەبێ دیفاع لەپێغەمبــەری خوابکات لەوکاتەدا کەکافرانو خوانەناســان پیلانــی ژەهــراوی بۆدادەنێن. ئەوە خــوای گەورە خۆی بەســەربازە بچکۆلەکانی خۆی دیفاعی لــێ دەکات ودەیپارێزێ. ئەوەتا لێرەدا بە (با) پاراســتی ودوژمنانــی ڕاونا، هەروەکو لەکاتی هیجرەتدا لەهاتنــە دەرەوەی دا لەماڵە گەمارۆدراوەکەی دا، مشــتێ خۆڵی بەدەم وچــاودا پرژانــدن وبەناویانــدا هاتنــە دەرەوەو کەســیان نەیانبینی. لەئەشــکەوتی (ثور)یشــدا. بەجاڵجاڵۆکــەو کۆتــر ســەری لەوکافــرو خوانەناســانە تێك داو لەبەردەرگای ئەشکەوتەکە بەیەکتریان دەووت: هیــچ کەس نەچۆتە ئەم ئەشــکەوتەوە. بەڵێ خــوا خۆی فەرمویەتی: (إِلاَّ تَنْـصُرُوُه فَقَــدْ نَصَرَه اللهُ). ئەمە هەتــا قیامەت هەروادەبێ. خوا خۆی بەرگری لەپێغەمبەرە خۆشەویســتەکەی دەکات وئەگەر ئیماندارانیش هەڵوێســتێك بنوێنن، قسەیەك وەکو بەرگری لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)

بکەن، ئەوە قازانجەکەی بۆخۆیانەو خۆیان پێ ی سەرفراز دەبن..

هەوڵی دوەمی کافران بۆدەســتکاری کردنی گۆڕی پێغەمبەرو (ﷺ) بردنی لاشەی موبارەکی، لەسەردەمی هەمان خەلیفەدا بوو. ئەوخانوەی لەپاڵ گۆڕی پێغەمبەردا بوو (ﷺ)، لەوێوە چاڵیان کردو وەکو نەفەق کشــان بەرەو گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ). لەوکاتەدا هەموو خەڵکی مەدینە گوێیان لەدەنگێك بوو کەهــاواری دەکرد. ئاگاداربن واپێغەمبەرەکەتان لەگۆڕەکــەی دەردەهێنرێت، ئیتر خەڵکــی مەدینە بەپەلە ڕایان کردو ئەوکەسانەیان دەستگیرکردو پلانەکەیان پوچەڵ کرایەوە.

هەوڵی ســێ یــەم: نەخشــەکەی لەلایەن ســەرانی نەصرانیەکانەوە کێشــرابوو. کەلەلایەن دوونەســڕانی مەغریبیەوە بوو. خوای گەورەش جەســتەی پێغەمبەرەکەی پاراســت بەوەی کەســەرکردەی بەناوبانگ (نورەدیــن زەنگــی) خەونــی بەپێغەمبــەرەوە بینی، کــەدوو پیاوی قــژ زەردی باڵابەرزبــوون. کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) هــاواری دەکرد، بگەنەفریام، ڕزگارم کەن لەدەســت ئەم دوو پیاوە!! سەرکردە نورەدین لەخــەو ڕاپــەڕی. چواردەورەکەی کۆکــردەوەو ڕاوێــژی لەگەڵکردن‌و ســەرەنجام هاتەســەرئەوەی کەبچێت بۆمەدینە. کاتێك گەیشتە شاری مەدینە، دیاری لەگەڵ خۆی بردبوو بۆخەڵکەکەی، کاتێ گەیشتە ئەوێ، خەڵکەکەی کۆکردەوەو شــتەکانی پێدان. دوای ئــەوەی کەناوەکانیانی دەنوســین، دوو پیاوەکــەی لەناویاندا نەبینی، کاتێك پرســیاری کرد: ئایا کەســی تر ماوە لەشاری مەدینە هیچی وەرنەگرتبێ؟! وەمن چاوم پــێ ی نەکەوتبێ؟! ووتیان: نەخێر. ســەرکردە نورەدین فەرموی: باش بیربکەنەوە!! ووتیــان: هیچ کەس نەماوە جگە لەدووپیاوی مەغریبی نەبــێ، کەدووپیاوی چــاکو دەوڵەمەندن‌و پێویســتیان بەخێرپێکردن نی‌یە. ســەرکردە فەرمانی دا کەبیان هێنن. کەهێنایانن تەماشــای کرد

کەهەمـــان ئەو دووپیـــاوەن کەلەخەونەکەیدا بینیبونی. پرســیاری لێ کــردن ئێوە خەڵکی کوێــن؟! ووتیان: حاجیــن ولەووڵاتی مەغریبەوە هاتویــن. فەرمووی: ڕاســتیم پێ بڵێن چی دەکــەن ونیازتان چی یە؟! لەســەر قسەی خۆیان سوور بوون. سەرکردە نورەدین فەرموی: شوێنی مانەوەتان کوێ یە؟! ووتیان: لەفلاّن شوێن. کاتێك چوون بۆماڵەکەیان لەوێ هیچ شتێکیان نەبینی جگە لەچەند کەل وپەل وکتێبێك وەلەسەر زەویەکە حەســیرێك ڕاخرابــوو. کاتێك حەســیرەکەیان بەرزکردەوە، چاڵێکیان دۆزییەوە. کەدەگەیشتە لای قەبرەکەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا پیلانەکەیان ئاشکرابوو. وەدانیان نا بەنەخشە گڵاوەکەی سەرکردەکانی نەصرانــی دا. دەســتگیرکران وســەرکردە نورەدیــن زەنگــی بڕیاریدا کەدیوارێکــی پارێزەری بەهێز بەدەوری قەبــری پیرۆز وپڕبەرەکەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دروست بکرێ، تاوەکو هیچ کەسێك نەتوانێت ئەم شێوازە بەکاربێنێ بۆنزیك بونەوە لەگۆڕی پێغەمبەر (ﷺ).

هەوڵی چوارەم: کۆمەڵێك لەنەصرانیەکان هەڵیان کوتایە سەرقافڵەی حاجیــەکان وتالاّنیان کردن. بۆیە ویســتیان قەبــری پێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەنــەوە، قســەیان لەوبارەیــەوە کردو نیازی خۆیان ئاشــکرا کرد، بەناو دەریادا ڕۆیشــتن بەرەو مەدینە، بەنیازی دەرهێنانەوەی لاشــەی پێغەمبەرو بردنی. بەڵام خوای گەورە ئەم جارەش وەکو هەموو جارەکانی تر پێغەمبەرە خۆشەویســتەکەی خۆی پاراســت وئەو کەشــتیەی ئەم پیلان گێڕانەی تیادابوون. لەگەڵ کەشــتیەکی میصرو ئەسکەندەریەدا بەیەکیاندا کێشاو هەمویان بەدیل گیرانو پیلانەکەیان پوچەڵ بۆوە.

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەو ئەو پەیامە شــیرینەی هەتا قیامەت هەردژایەتی دەکرێ وهەرسەردەمی بەشێوازی ئەوســەردەمە دژایەتیەکــە دەردەبڕدرێ. لەڕۆژگارێکــی وەکو ئەمڕۆدا

لەڕێگەی هەندێ کەناڵی ڕاگەیاندنی ژەهراویەوە. وەکو گۆڤارو ڕۆژنامەو تەلەفیزیـۆنو ڕادیـۆوە. بێ ئەدەبی بەرامبەر خـواو پێغەمبەرەکەیو ئیسلامو هەموو پاکیو چاکی وجوانیەکان دەکرێ. باشە ئەمە بۆ؟!

١. لەبەرئەوەی هەتا هەنگ هەبێ وهەنگوین پێشکەش بکات وببێتە شـیفاو ڕەحمەت وچارەسـەری دەردو زامەکانو ئازارەکان. دەبێ ژەنگە سـورەو مشـکو جرجو مرووو هەبـێ. کەهەوڵی لەناوبردن وکوشـتن وتێکدانی شـانەی هەنگوینەکە بدات. بەهەمان شـێوەش. هەتا ئەهلی ڕەحمەت هەبن، ئەهلی زەحمەت دژایەتیان دەکەن.

٢. خـوای گەورە لەقورئاندا باسـی ئەم هەوڵـە نەزۆکە، لەرزۆکەی دوژمنانـی ئیسـلام وپێغەمبەرەکـەی دەکات، کەبەڕاگەیاندنەکانیـان دژایەتـی ئەم نـورو ڕەحمەتو شـیفایە دەکەن، وەهەتـا قیامەتیش هەردەبن. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴾الصّف: ٨ - ٩.

واتە: ئەوانە دەیانەوێت بەفوو، بەقاڵەی دەم. نوری خوا بکوژێننەوە، خەیاڵیـان خـاوە. خـوا نـووری خـۆی. ئاینی خـۆی. تـەواو دەکات ودەیچەسپێنێت، هەرچەند کافرو بێ بڕواکان پێ ی سەغڵەت بنو پێیان ناخۆش بێت.. هەرئەو خوایە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانەکردوە. هاوڕێ لەگەڵا هیدایەتو ڕێنموویی وئاینی حەقو ڕاسـتی دا. تاسـەری بخات بەسـەر هەموو ئاین وبەرنامەکاندا. هەرچەندە موشـریك وهاوەڵگران پێیان ناخۆش بێت.

٣. ئەوکەسـانەی کەدژایەتـی خۆیـان بەرامبـەر پێغەمبەری خواو ئیسـلام ڕادەگەیەنن، ئەوانە جەهلی خۆیـان، نەفامیو نەزانی خۆیان دەردەخەن. ئایا کێ لەوکەسە نەزانترە کەخالیقی خۆی ناناسێ. هەوڵو

ماندوبوونی پێغەمبەران بەگشــتیو حەزرەتی محمد (ﷺ) بەتایبەتی بەرز نەنرخێنێ.

٤. ئــەم زمـــان درێژی وبــێ ئەدەبــی کردنانەیان بەرامبــەر خواو پێغەمبەرو قورئان، موسڵمانان بەئاگادێنێتەوەو لەخەوی غەفڵەت ڕایان دەپەڕێنــێ، بەخۆیاندا دەچنەوەو زیاتــر لەجاران دەخوێننەوەو زیاتر شــارەزا دەبن لەئیســلام وژیاننامەو ڕێبازی پێغەمبــەری خوا (ﷺ). چونکــە هەرشــتێ، دژایەتی نەبــێ، ئەوە بەرەو مــردن ئەچێ، ئەگەر میکرۆب نەبێ لەشــی منالْ گەشــەناکات. ئەو میکرۆبــە بەئازاردەرە، وادەکات هەموو خڕۆکە سپی یەکان دەست بکەن بەجموجۆڵو لاشەش گەورەدەبێ وگەشە دەکات. (إنْشاءالله)، لەگەڵ هەموو دژایەتی کردنێکی ئەم ئیســلامەدا، زیاتر ڕەگی درەختی ئەم ئیسلامە، بەدڵو دەروونماندا، بەناو خاك وخەڵکماندا دەچێتە خوارەوەو بەرهەمی جوانترو تازەترو بەتامتر لەجاران پێشکەش دەکات.

بەڕێزان: ئایا هەڵوێستی موسڵمان لەبەرامبەر ئەو ناحەزو ناکەسانەدا دەبێ چی بێ؟!

١. دڵنیابــوون بەبەڵێنی خوا، کەخوا خۆی بەڵێنــی داوە. (إنّا كَفَيْناكَ المُسْتَهْزِئِين). هەرکەسێ سوکایەتی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بکات، ئازاری بدات، ئازاری خێزانە بەڕێزەکانی بدات، خوای گەورە خۆی بۆی دەچێتە مەیدان و وای ڕیســوا دەکات، کەتاماوە بەســی بێت.. ســوێند بەخوا، چەند ئافرەتی ڕۆژنامەنوس وشاعیرو ئەدیب هەبووە، کەساڵانێکی زۆر بەقەڵەمەکانیان لەســەر ئیسلام وفرمژنی پێغەمبەری خوا نوسیویانەو ووتویانە چۆن دەبێ پیاوێك لەژنێك زیاتری هەبێ (مەبەستیان دژایەتی شــەریعەتی ئیســلام بووە) کەچی لەئەنجامدا شویان کردوە بەپیاوێك کەنەك دووژن، بەڵکو ســێ ژنیشــی هەبــووە!! هەربەم هەڵوێســتەی

خۆیان ئەوەی چەند ساڵ نوسیبویان، لەناویان بردو بێ کەڵکیان کرد. تازەکەس لەهاوبیرانو هاوڕێیانو هاوبەشە فیکریەکانیان. پێیان عەیبە نوســینەکانیان بەبەڵگەبهێننەوە، یان هەرناوی خۆشــیان بێنن. ئەمە بەبێ ئەوەی موسڵمانان ووشەیەکی لەسەر بنوسن!.. بەڵێ خوای گەورە خۆی بەرگری لەپێغەمبەرەکەی دەکات (إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ).

٢. پێویســت ناکات موســڵمان لەبەرامبەر ئەو ناحەزو ناکەســانەی کەدوژمنایەتــی ئیســلامو پێغەمبــەری خوا (ﷺ) دەکەن دابنیشــێو موناقەشــەیان لەگــەڵ بــکات، چونکــە کەســێك بەنوێــژی نیــوەڕۆ چاویلکەیەکی ڕەشی لەچاوکردبێو دونیا بەتاریك ببینێو بڕیاریشیدابێ کەئەو چاویلکە ڕەشــە لەســەر چاوی لانەبات. ئایا موناقەشەو گفتوگۆ چ ســودێکی هەیە لەگەڵ ئەوکەسە کەتۆ بتەوێ پێی بسەلمێنی ئێستا ڕۆژەو شــەونیەو دونیا ڕوناکەو تاریك نیيە؟! بێگومان هیچ ســوودی نیيــە. چونکە ئەو بڕیاری پێش وەختــی داوە کەدونیا هەربەتاریکی ببینێ. هەربەهەمان شــێوە کەسێك کەبڕیاری داوە تامردن لەدژایەتی ئیســلامدابێو بلــێ بەچاوی ســەر قیامــەتو زیندووبونــەوە ببینم بڕواناکەم، ئایا حەیف نيیە موسڵمان کاتی خۆی لەگەڵ خەرج بکات؟! لەبەرئــەوە لەگەڵ ئەو جۆرە خوانەناســانە کات بەفیــڕۆدان خراپە. چونکــە تۆ وەکو ئــەو دەمت پیس نی یە. ڕابــردوت پیس نی یە، تۆ ئاڵتونــت پێیە، ئەو تەنەکەو زەرتکە. تۆ کاتی خۆت بەبەلاش بەفیڕۆ دەدەی ئەگەر بتەوێ موناقەشــە لەگەڵ کەسێك بکەی، کەبتەوێ پێ ی بســەلمێنی، ئەوەی تۆ پێتە ئاڵتونە. چونکە ئەمە موناقەشــەی ناوێ. خۆ ئەگەر کەســێکی دڵســۆز بەئیســلام بڵێ: ئاخر مــن بۆیە لەگەڵی دادەنیشم بۆئەوەی نەتوانێ موسڵمانان بخەڵەتێنێ وچەواشەیان بکات. ئەوە لەوەلامدا دەڵێین: موســڵمان، ئەگەر موسڵمانێکی ڕاستەقینەبێت،

ئەوە بەڕاستی ئیمانەکەی ئەوەندە پتەوە، کەوەکو عومەیری کوڕی سەعد دەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی قیامەتی بۆدەکردین، وەکو بەچاوی سەر چاوم لێبووبێ وابوو.. وەدڵنیاشبن. ئەوکەسانەی کەلەسەر ئیسلام وپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەنوسن، بۆیە وادەکەن تاوەکو باسبکرێن. هەرکەماوەیەك ناویان نەما، باویان نەما، نانیان بڕا، دێن لەگۆڤارێکدا، لەڕۆژنامەیەکدا شتێك لەسەر ئیسلام دەنوسن، یان نامیلکەو کتێبێکی پڕلەبوختان وپڕلەهەڵەو چەواشەکاری بڵاودەکەنەوە، کەزۆرجار هی خۆیان نی یە. زۆر کۆنەو زۆر دەمێکە نوسراوە، بەعەرەبی یان بەفارسی. ئەمانە هاتون تەنها کردویانە بەکوردی وناوی خۆیان لەسەر نوسیوەو لەوێشدا جارێکی تر خیانەت وغەشیان لەئەمانەتی زانستی کردوە. کەنوسینی خەڵکیان کردوە بەهی خۆیان!! جائەم فێڵ بازو ستۆك بوانە، دێن باسی ئیسلام‌و پێغەمبەری خواو قورئان دەکەن، بۆئەوەی موسڵمانان مەشغوڵ بکەن‌و پاشان باسیان بکەن ولەلای ئاغاکانیان قیمەت پەیدابکەنەوەو کولێرەیەکی چەور فڕێ بدەنە بەردەمیان!.. ئەمانە وەکو ئەوکەسە وان کەدەچوو شەوانە پیسایی دەکردە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی گوندەوە، یان لەسەر ڕێگای هاتوچۆی خەڵك پیسی دەکرد. کەپێیان دەوت: باشە بۆچی ئەم کارە قێزەونە دەکەی؟! دەیگوت: حەزدەکەم خەڵکی باسم بکەن‌و ناوم بهێنن. خۆ هیچ کردەوەی چاکەشم نیەو پێ ناکرێ، کەببێتە مایەی ستایش کردنم، بۆیە ئەم کارە دەکەم، تاوەکو خەڵك ئەگەر بەتفو نەفرەت لێکردنیش بێ، ناوم بێنن، هەرپێم خۆشە!!.. لەبەرئەوە ئەو کۆلکە نوسەرە قەڵەم کۆڵانە. بەباس کردنی ناویان وگۆڤارو کتێبیان، ئاواتیان دێتەدی وفرۆشیارو خوێنەر بۆبابەتە فڕێدراوەکانیان پەیدا دەبێ.. کتێب وگۆڤاری واهەیە کەس نایخوێنێتەوە، بەڵام

کەمامۆستایەکی ئاینی لەمینبەرەوە وەکو دڵسۆزیەك بۆئیسلام، ڕەدی دایەوەو ناوی هێنا. کەفلان کەس لەفلان گۆڤارو فلان کتێبی دا. ئەو بێ ئەدەبیەی کردوە، ئەوە خوێنەر بۆبابەتەکەی پەیدادەکات وخەڵکی بەدوایدا دەگەڕێن ودەیانەوێ بزانن چی تێدا نوسراوە!، لەبەرئەوە تۆی موسڵمانی دڵسۆز، هەرکتێبێکی ئاوا، گۆڤارێك، ڕۆژنامەیەك، سایتێکت بینی کەدژایەتی وسوکایەتی بەئیسلام وپێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) تێدا دەکرێ، لای کەس باسی مەکە. بەڵکو بەبێدەنگی بیدڕێنەو بیمرێنە، وەلەجیاتی ئەوە وەکو بەرەنگاربونەوەیەك هەوڵبدە ئەگەر توانای نوسینت هەیە. کتێبێك، نامیلکەیەك دابنێ، وەئیسلامی حەقی تێدا باس بکەو گومانەکان بڕەوێنەوە. بەبێ ناوهێنانی ئەو نوسەرە بێ دینەو کتێبو بابەتەکەی. ئەگەر توانای نوسینیشت نی یە، ئەوا بەڵێن وپەیمان بدە کە: کەکتێبێك لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بخوێنەوە، لەدینەکەت باشتر تێ بگە. سوڕەتێکی قورئان لەبەرکە. ئەمە بەرەنگاربونەوەی دوژمنانی ئیسلامەو بائەوەیان پێ بڵێین کەقورئان فێرمان دەکات. (مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ) بمرن بەوداخەوە، بەورق وقین وتوڕەیی ناودڵتانەوە لەئیسلام وپێغەمبەری خوا (ﷺ) کەڕۆژ بەڕۆژ. ئیسلام نورو ڕوناکیەکەی زیاد دەکات وتاریکیەکان ڕادەماڵێ. بۆیە بۆخۆتان بمرن بەوداخەوە!

(رَبَّنا لاتُزِغْ قُلوُبَنا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَكَ أَنْتَ الوَهّاب) اللَهُمَّ آمين..

سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز.

٢. المِسْكُ وَالعَنْبَر في خُطَب المِنْبَر، د.عائِض القَرَني، ص٥٤.

٣. ڕۆژنامەی کۆمەڵ. ژمارە: ٤١٥، لە ٢٠/٣/٢٠١٠.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمَعِينَ:

ئیمانداران: مرۆڤ لەژیانی دونیادا، زۆر بەڵاو ناخۆشــی ونەخۆشی دێتە ڕێگای، جابۆ ڕوبەڕوبونەوەیان. مرۆڤ بەگشتی ومرۆڤی موسڵمان بەتایبەتی، وەســیلەو هۆکارەکان بەکاردێنێ ولەگەڵیشیا خێرو خێرات وصەدەقەو بەخشــین بەڵا دەگێڕێتەوەو مردنی ناخۆش لەسەر مرۆڤ لادەدات. جاهەندێ جار ئەوکەســەی خێرو صەدەقەکە دەکات. (نەزر) دەکات، دەڵێ: فلان شتم لەسەر نەزربێ. ئاژەڵێکم نەزربێ بۆخوا سەری ببڕم ئەگەر فلان کارم بۆبکرێ.... هتد..

جا بۆ بەرچاو ڕۆشنی موسڵمانان لەبابەتی نەزرەوە، (إنْشاءالله)، لەم ووتارەدا باسی (نەزر) کردن وجۆرەکانی دەکەین. بەڵام سەرەتا پێویستە پێناســەی نەزر بکەیــن. زانای پایەبــەرز (راغب) لە المُفْـرَدات ص٤٨٩ دا فەرمویەتــی: (النَّذْرُ أَنْ تُوجِبَ عَلى نَفْسِــكَ مالَيْسَ بِواجِــبٍ لِحُدوُثِ أَمْرٍ... الخ). واتە: نەزر ئەوەیە کەشــتێك لەسەرخۆت واجب بکەی وبیخەیتە گەردنــی خۆتــەوە، کەخۆی واجــب نی یە لەســەرت. ئەمەش بەهۆی ڕودانی کارێکەوە.. پێشهاتێکت هاتۆتە بەردەم. بەهۆی ئەوەوە خێرێکت لەســەر خۆت واجب کردوە. وەپێناســەیەکی جوانی تــر کەزانایان بۆ نــەزر کردویانە ئەمەیە: (النَّذْرُ هُو إلْتِزامُ الإنْســانِ نَفْسَــهُ شَــيْئاً مِنَ الاَمْوالِ أَوِ الاَعْــمالِ مُقابِــلَ طَلَبِ نِعْمَةٍ أَوْ زَوالِ نِقْمَةٍ، فَهُــو وعْدٌ عَلى شَرْطٍ). واتە: نەزر ئەوەیــە مرۆڤ خۆی بخاتە ژێر ئەوەی کەکارێك لەســەر خۆی واجب بکات. بەبەخشــینی ماڵێــك، پارەیەك، یان ئەنجامدانــی کردەوەیەك، ئەمــەش بۆئەوەی کەئــەو خێرو خۆشــیەی داوای دەکات وچاوەڕێ ی دەکات بێتەڕێ ی، یان ئەو ناخۆشــی ونەخۆشــی یــەی لێ‌ی ڕادەکات. لێ‌ی دورکەوێتەوە، کەواتە نەزر: بەڵێنە لەبەرامبەر مەرج وشــەرتێکی بــەدی هاتوودا، وەکو ئەوەی کەســێك دەڵێ: خوایە ئەو کارەم بۆبکرێ

وبەو ئاواتەم بگەم، بەسەرم نەزربێ ئەوخێرە بکەم. یان خوایە ئەگەر ئەوخراپەو بەڵاو نەخۆشـــیەم لەســـەرلاچێ ولابدرێ، لەسەرم نەزربێ ئەوکارە بکەم.

ئیمانداران: نەزرکردن بەم شـــێوەیە. ســـوننەت نی یەو پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) ستایشـــی نەکردوە، بەڵکو هانی موســـڵمانانی داوە کەنەزر نەکەن. وەفەرمویەتی: (إِنَّهُ لايَأْتِي بِخَيْرٍ، وإِنَّمَا يُسْـــتَخْرَجُ بِهِ مِنَ البَخيلِ). مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ (بُخاري: ٦٦٠٨) و(مُسْلِمْ: ٢٥٣٥).

واتـــە: نەزر مەکـــەن. چونکە خێرێـــك ناهێنێتە ڕێگەتـــان، مەگەر ئەوەی خوای گەورە بڕیاری داوە بۆتان. وەنەزرکردن لەکەســـی ڕەزیل وچـــروك وبەخیلەوە دەکرێـــت و وانەبێ هیچ لەگیرفانـــی دەرناچێ.. چونکە پێناســـەی بەخیل وچروك ئەوەیە: (البَخيلُ لايَدْفَعُ شَـيْئاً مِنْ مالِهِ إلاّ بِمُقابِـلٍ) یـــان ووتراوە: (البَخيلُ لايَخْـرُجُ مِنْ مالِهِ شَـيْئاً، إلاّ بِعِوَضٍ عاجِلٍ). بەخیل ئەوکەسەیە کەهیچ شتێ لەدەستی دەرناچێ، مەگەر چاوەڕێی ئەوەبێ کەلەبەرامبەردا شتێکی دەست بکەوێتەوە لەداهاتودا. جالەسەر ئەم پێناســـەیە بۆ بەخیل دەتوانین بڵێین: ئەگەرچی کەســـی واهەیە بـــەردەوام خێرو خێـــرات دەکات ویارمەتی هەژارو نـــەدار ئەدات. یان زۆربـــەی کات میوانـــی هەیەو خەڵکـــی لەماڵی نان دەخـــوات. کەچی هەرلەڕیزی (بەخیل)و چروکەکان حیسابە، بۆچی؟! چونکە لەناو ناخی دڵی دا بۆیە دەبەخشـــێ، بۆئەوەی لەبەرامبەردا بەســـەخی وپیاوچاك ونـــان بدەو خاوەن قۆناغ، ناووناوبانـــگ دەربکات. یان بۆیە نان ئەدات بەفـــلان کـــەس. ئومێدی ئەوەی هەیـــە کەلـــەدواڕۆژدا، ڕۆژێ لەڕۆژان ئیشـــێکی بەوکەســـەبێ وئەم نانەی لەبەرچاوبێ وئیشـــەکەی بۆبکات. ئەینا ئەگەر کەســـێك لەبرســـان بمرێ، ئەم ئامادەنـــی یە یارمەتیەکی بدات. ئەمە بەخیلە. ئەوکەســـەی کەنەزریش دەکات، بەخیلە. چونکە:

دەڵــێ: خوایە تۆ ئەوکارەم بۆبکە. ئەو بەڵایەم لەســەرلابە ئەمجا من ئەوخێرە لەپێناوی ڕەزامەندی تــۆدا ئەنجام دەدەم! هەربۆیە زۆرجار خەڵکی لەمامۆســتایانی بەڕێزی مزگەوت دەپرســن: ئایا من نەزرێکم کردوە، کەئەگەر فلان نەخۆشــەمان چاك ببێتەوە. ئەوەندە پارە، یان ئەوحەیوانە بکەم بەخێر. بەڵام نەخۆشەکەمان چاك نەبۆوە مرد. ئایا خێرەکەم دەکەوێتەسەر؟! تەماشــاکەن ئەم جۆرە خێرکردنە، کەدەڵێ خوایە تۆ ئەوەم بۆبکە. ئەمجا من ئەوەت بۆدەکەم. چەند ناپەسەندە، چونکە پەنابەخوا (سُــوء الظّن)بەرامبەر بەخوای گەورە دروست دەکات. وادەزانــێ خوا نەیتوانیوە شــیفای بدات. ئەینا دەبــوو لەبەرخێرەکە شــیفای بدایە. یان هەبــوە وتویەتی: خێریشــم لەخۆگرتوەو چاکیش نەبوم. لەبەرئەوە تۆی موسڵمان، یەکسەر خێرەکە ئەنجام بدەو پارەکە ببەخشەو حەیوانەکە سەرببڕەو بیدە بەفەقیرو هەژارو موستەحەقان وئەمجــاش لەخــوا بپاڕێوە کەخوای گەورە کارئاســانیت بۆبکات وچی چاکە ئەوەت بۆفەراهەم بێنێ. چونکە خوا خۆی دەزانێ چی بۆ ئێستاو داهاتوی تۆباشــە. لەبەرئەوە هەرکاتێ نەزرت کرد. چاوەڕێ ی ئەنجام مەبەو یەکســەر بیکــەو جێ بەجێ ی بکە. خوای گــەورە دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾ البَقَرة: ٢٧٠.

واتە: هەرشــتێکتان بەخشی بێت، یان هەرنەزرو بڕیارێکتان دابێت، ئەوە خوا پێ ی دەزانێت وبۆســتەمکاران هیچ جۆرە پشتیوانیەك نیە کەبیانپارێــزێ لەتۆڵەی خودا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەفەرمودەیەکی دا، باســی ئەوەی کردوە، کەیەکێ لەنیشانە بچوکەکانی هاتنی قیامەت. ئەوەیە کەخەڵکی نەزر لەســەرخۆیان دادەنێن. کەچی دوایی ئەنجامی نــادەن ولەبیرخۆیانــی دەبەنــەوەو خــۆی لــێ دەدزنــەوە. ئەمەش

فەرمودەکەیــە. کەدەفەرمــویّ: (خَيْرُكُمْ قَرْنِي. ثُــمَّ الَّذينَ يَلُونَهُــمْ. ثُمَّ الَّذينَ يَلُونَهُــمْ، ثُمَّ الَّذينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِئُ قَوْمٌ، يَنْذُرُونَ وَلايَوْفُونَ. وَيَخونُونَ، وَلايُؤْتَمَنُونَ، وَيَشْهَدُونَ وَلايَسْتَشْهَدُونَ، وَيَظْهُر فيِهِمُ السِّمَنُ) رَواهُ البُخاري: ٢٦٥١.

بەڵــیّ ئیماندارانی بەڕێــز: هەرکاتێك نەزرت کردو دەســت بەجیّ ئەنجامت داو دوات نەخســت ئەوە نیشانەی ئیمان وبڕوای باشە. خوای گەورە لەوەصفی مرۆڤە چاکەکاندا، کەجێگایان بەهەشــتە. دەفەرمویّ: ﴿ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ ﴾الإنسان: ٧.

وەدڵنیاشبن. هەرنەزرێك لەسەرخۆتان پێویست بکەن وپاشان لیّ ی پەشــیمان ببنەوە، ئەوە ئەومالّەتان هەرلەدەست دەچیّ، سەرنجی ئەم روداوە ڕاســتەقینە بدەن: ئافرەتێکی بەڕێز دەڵیّ: برایەکم سەربازبوو، لەکاتی جەنگی ناڕەوای (عێراق- ئێران) دا، دایکم زۆر پەرێشــان بوو بۆبراکەم. بەتایبەت کەلەوشــوێنەی براکەم لیّ ی سەربازبوو. شەڕ زۆر گــەرم بوو. ڕۆژانە بەدەیان کەس دەکوژراو دیل دەکرا. لەبەرئەوە دوو گوێرەکەمــان هەبــوو. یەکێکیان زۆر قەڵەوو چاك بــوو. ئەوی تریان بچــوكو لەڕبــوو. دایکم قــەراری دا گوێرەکە قەڵــەوە گەورەکە بکات بەخێر. بۆئەوەی براکەم بەسەلامەتی بێتەوە. بەڵیّ براکەم بەسەلامەتی هاتەوەو منیش بەدایکمم ووت: دایکە گوێرەکەکە دەکەی بەخێر، خۆتۆ بەڵێنــت دابوو ئەگەر براکەم بەســەلامەتی بێتەوە، گوێرەکە گەورەکە بکــەی بەخێــر. بەڵام دایکم پەشــیمان بۆوە لەگەورەکەیــان و ووتی: بچکۆلەکەیــان دەکەم بەخێر. ماوەیەکی تری پێچوو ئەویشــی نەکرد. دیســان پێم ووتەوە، کــەی خێرەکە دەکەی؟! دایکــم ووتی: ڕۆڵەگیان خۆبراکەت بەســەلامەتی هاتەوە، ئیتر پێویســت ناکات. منیش ووتم: دایە تۆ بەڵێنت دا. ئاخر هیچ وەك بەڵێن نی یە. بەڵام دایکم هەرخۆی لیّ دزیەوەو هیچیانی نەکرد بەخێرو دەســتی تیّ نەچوو. هەتا ڕۆژیّ

هەردوو گوێرەکەکە چوون بۆلای مەعەسکەرەکەی تانجەڕۆ، هەردوکیان سەگ خواردی!! نەکرا بەخێر، نەخۆمان سودمان لێ بینی..

بەڕێزان: هەندێ لەحوکمی نەزرتان لەڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە بۆ ڕوون دەکەینەوە:

یەکەم: ئایا ئەوکەسـەی کەحەیوانێکی کرد بەنەزر، دروسـتە کاتێ سەری بڕی لێ‌ی بخوات؟!

وەڵام: ئەو حەیوانەی کەناوی نەزری لێ دێو ئەو کەسەی کەنەزری دەکات بەجوانی لەماناو مەبەستی (نەزر) حاڵی ببوو، کەچۆنەو حوکمی چی‌یە. وەتێگەیشتبوو کەنەزر یانی لەخۆحەرامکردن ولێ نەخواردنی‌و بەخشـینی بەهەژارانو فەقیـران لەپێناوی ڕەزامەنـدی خوادا. ئەوە ئەوکەسـە کەئاوا بەجوانی‌و ووردی لەمانای نەزر حاڵی بووە، دروست نی یە کەبۆخۆی لەگۆشتی ئەوئاژەڵە بخوات. وەهەروەها دروست نی‌یە کەدایـكو بـاوكو ژنو مناڵەکانی لێ‌ی بخۆن. چونکە: دروسـت نی‌یە زەکاتی خۆی بۆخۆی بێ، یان بۆدایکو باوکی بێ، یان بۆژنو مناڵەکانی خۆی خەرج بکات. دەی بەهەمان شێوە ئەوئاژەڵەی کەنەزرکراوە، دەبێ گۆشتەکەی بدرێ بەوکەسانەی کەموستەحەقی زەکاتن. جاچۆن خۆی‌و هەموو ئەوانەی کەبژێوی (نەفەقە) یان لەسەری واجبە، نابێ لەزەکاتی مـاڵـی خۆیان بخۆن. ئـاواش نابێ لەماڵی نەزرکراو بخۆن. بەڵام ئەگەر کەسـێك هەر ووشـەی نەزری بەدەمداهات. بۆنمونە ووتی: ئەم مەڕە نەزربێ لەسـەرم بیکەم بەخێر ئەگەر مناڵەکەم لەونەخۆشی یە چاك ببێتەوەو خوا شیفای بدات، ئەم قسەیەی کرد، بەڵام نەیدەزانی مانای نـەزر چی یە، وەلەدڵی خۆیـداو نیەتی خۆی دا، نیەتی ئەوەی هەبوو کەخۆی‌و ماڵو مناڵی وەکو ئەوخەڵکە لێ ی بخۆن، ئەوە دروستە لێ‌ی بخۆنو خوا سەیری نیەتی ناودڵی ئەوکەسە دەکات، وەبۆئەوەی مرۆڤ

لەكێشـــەی نەزربونو لێ نەخـــواردن ڕزگاری ببـــێ، واچاكە، هەركاتێ بڕیاری خێرو صەدەقەیەكی دا، جابۆ هەرمەبەســـتێك بێت، ئەوا بڵێ: (إنْشــاءالله) ئەو خێرە دەكەم. چونكە بە (إنْشاءالله) لەنەزر دەردەچێ وزۆر ئاسایی دەبێ كەخۆیو ماڵو منالی لێی بخۆن وبیدەن بەدراوسێو ناســیاویان، بەدەوڵەمەندو هەژارەوە، هەروەكو لەكتێبی (الفِقْهُ الإِسْلامي وأَدِلَّتُهُ) دانراوی. (د.وهْبَة الزُّحَيلي) دا، باسی كردوە..

دووەم: ئەگەر كەسێك لەكاتی ترس وتەنگانەیەكی گەورەدا، بڕیاری دا كەئەگــەر خــوا لەومەترســیە گــەورە ڕزگاری بكات، ئـــەوا هەموو ماڵو ســـامانەكەی دەكات بەخێرو نەزربێ هەموی ببەخشێ لەپێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا. خوای گەورەش ئەوكەســـەی لەومەترســـیە گەورە، كەژیانی خســـتبوە مەترســـیەكی تەواوەوە، ڕزگار كرد. ئایا چی لەســـەر پێویســـتە بیكات؟! لەم بارەیەوە ســـێ بۆچوون هەیە لەلایەن زانایانەوە:

١. پێویستە هەموو ماڵەكەی، كەكردویەتی بەنەزر بیبەخشێ، ئەمەش قســەی ئیمامی شافیعی یە. وەئیمامی حەنەفیش دەفەرموێ: پێویستە هەموو ماڵەكـــەی بكات بەخێر. بەلام هەرئەوەی كەماڵی زەكاتە، وەكو پارەی دانراوو دەغڵو دانو دانەوێڵەو مێوژو ئەوەی زەكاتی لێ دەدرێ، بـــەلام خانوەكەی كەتـــێ ی دا دەژی، یان نوێـــنو كەلوپەلی ماڵ وەكو ســـەلاجەو تەلەفیزیۆن وئەمانە، بەرئەو نـــەزرە ناكەون، چونكە ماڵی زەكات نین!...

٢. ئەم كەســـە كەماڵەكەی هەموو نەزركردوە، ماڵەكەی بكات بەسێ بەشەوەو بەشێكی ببەخشێ، هەروەكو لەبەسەرهاتی كەعبی كوڕی مالیك دا هاتوە، كەكاتێ خوای گەورە لێی خۆشـــبوو، لەوەی كەبەئەنقەســـت خـــۆی لەچونە غەزا دواخســـتبوو. كاتێ كەموژدەیـــان دایە، خوا لێ ی

خۆشبوەو قورئانی لەوبارەیەوە ناردۆتە خوارەوە. کەعب هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی کرد: (يارَسُــولَ اللهِ، إنَّ مِــنْ تَوْبَتي، أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مــالي صَدَقَةً إلــى اللهِ ورَسُــولِهِ) واتە: ئەی پێغەمبــەری خوا (ﷺ) وەکو بەشــێك لەڕاســتی تەوبەکەم ئەوا بڕیارمدا کەهەرچی ماڵو سامانمە لەپێناوی خوادا بیکەم بەخێرو بیبەخشــم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضُ مالِكَ فَهُو خَيْرٌ لَكَ). البُخاري: (٢٧٥٨) ومُسْلِم: (٢٧٦٩).

واتــە: هەندێ لەماڵو ســامانەکەت بۆخۆت هەڵگرە، ئەوە باشــترە بۆتۆ، لەڕیوایەتێکیشــدا کەســەنەدەکەی حەسەنەو پێشــەوا (أبوداود: ٣٣٣١) ڕیوایەتــی کــردوە، پێغەمبەری خــوا (ﷺ) بەکەعبی فەرموو: ناوامەکــەو هەموو ماڵەکەت مەبەخشــە. کەعب فەرموی: دەی باشــە دەیکەم بەدووبەشەوە، بەشێکی بۆخۆم وبەشێکی دەبەخشم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمــوی: ناوامەکە نیوەش زۆرە. کەعب فەرموی: دەی ماڵەکەم دەکەم بەسێ بەشەوەو دووبەشی بۆخۆم دەگێڕمەوەو بەشێکیش دەکەم بەخێــر. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەمەیان باشــە. ئەمەش بۆچونی ئیمامــی مالیك وئیمامــی ئەحمەدە، کەتەنهــا (٣/١)ی ماڵەکەی دەکات بەخێر.

٣. بۆچونی ســێ یەم دەڵێن: ئەوکەســەی ئــاوا لەتەنگانەیەکدا، یان تەنانــەت لەکاتی ئارامیــش دا بڕیاری دا هەموو ماڵەکەی بکاتە نەزرو بیبەخشــێ بەهەژاران، ئەوە هیچی لەســەرنی یــەو تەنها بەئەندازەی کەفارەتی ســوێند لەماڵەکەی دەبەخشێ وتەواو. ئەمەش بۆچونی (ابنُ حَــزم). بەبەڵگــەی ئەوەی کەبەخشــینی هەموو ماڵو ســامان لەلایەن کەســێکەوە شتێکی شەرعی وپەســەند نی یە. چونکە ئەوماڵە هەموی هی خۆی نی‌یەو بەشــی ژن ومناڵیشــی پێوەیە. خۆئەگەر ژن ومناڵی نەبــوو. ئەوە بەشــی دایك وبــاوك ومیراتگرانی پێوەیــەو ئەم مافی

نییە بەشـی ئەوانیـش ببەخشـێ، وەهەروەها بەڵگـە دێنێتەوە بەو فەرمودەیـەی کەپێشـەوا (ئەبـوداود: ١٦٧٣) هێناویەتـی ودەفەرموێ: جابـری کوڕی عبدالله فەرمویەتی: ئێمـە لەخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشـتبوین. لەوکاتەدا پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو بەئەنـدازەی هێلکەیـەك ئاڵتونی پێ بـوو. ووتی: ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئاڵتونەم لەشـوێنێکدا کەپاشـماوەی گەلانی پێشوو بوە دۆزیەوە. وابڕیارمدا هەموی دەکەم بەخێرو لەپێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا دەیبەخشم. بەخوا غەیری ئەمە هیچی ترم نیە. ئەینا ئەویشم دەبەخشی. پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەڵامی نەدایەوەو ڕووی لێ وەردەگێڕا چەنـد جارێك، بەڵام کابرا هـەروازی نەدەهێناو هەرقسـەکەی خۆی دووبارە دەکردەوە، تاپێغەمبەری خـوا (ﷺ) ناچاربوو کەئاڵتونەکەی لێ وەربگـرێو لەکابرای گرتو ئەگەر بەری بکەوتایە ئازاری دەدا یان برینـداری دەکـرد. وەفەرموی: (يَأْتِي أحدكم بِمـا يَمْلِكُ فَيَقُـولُ: هذهِ صَدَقة، ثُـمَّ يَقْعُـدُ فَيَتَكَفَّفُ النّاس!!، خَـيْرُ الصَّدَقَةِ ماكانَ عَلى ظَهْـرِ غِنَيّ). واتە: یەکێ لەئێوە دێتو ئەوەی ماڵو سـامانی هەیە لەدەستیایەتیو لەگەڵ خۆی هێناویەتیو دەڵێ: ئەوە هەمویم کرد بەخێر. پاشان دادەنیشێو هیچی نەماوە ناچار دەسـت لەخەڵکی پان دەکاتەوە. باشترین خێرو صەدەقە ئەوەیـە کەلەسـەر تێری ودەوڵەمەندی بکرێ. نـەك خۆت موحتاجی دەستی خەڵك بی وخێریش بکەی وهەموو ماڵەکەت ببەخشی!.. هەزاران هەزار درودو سـڵاوی خوات لەسـەر ئەی پێغەمبەری خۆشەویستمان. ئەی سەرکردەو خەمخۆری ڕاستەقینەی ئومەتەکەت، چەندە لەخەمی دوارۆژی خەڵکـی دابووی. ئەوەتا ناهێڵی کەسـەکە خێربکات. چونکە دواتر خۆی موحتاجی زەلیلی بەرقاپی خەڵکی دەکات. خۆزگە سەرکردەو لێپرسراوانی میللەت، لەهەموو جیهاندا بهاتنایەو دەرسی سەرکردایەتی

ودڵسۆزی وخەمخۆریان بۆمیللەت، لەخزمەتتا بخوێندایەو لەسەرچۆك لەخزمەتتا دابنیشتنایەو بیانوتایە: (یارَسُولَ اللهِ عَلِّمْنا) ئەی پێغەمبەری خــوا (ﷺ) فێرمان بکە، چۆن خەمخۆری ڕاســتەقینەی میللەت بین. چــۆن لەتیاچــون وزەلیل بوون بیانپارێزین. چونکە بەڕاســتی هەرتۆ ڕابەری. هەرتۆ سەرمەشــقی، هەرتۆ ســەرکردەی وشــایەنی چاوساغی خەڵکی.

سێ یەم: نەزر دەبێ لەماڵی ئەوکەسە بێ کەنەزرەکەی کردوە، نەك لەماڵی غەیری خۆی نەزر بکات. هەروەکو لەم بەسەرهاتەدا دەردەکەوێ، کەلەزەمانی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕووی داوە. ئەویش ئەوەیە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووشترێکی هەبوو ناوی (عضباء) بوو. کۆمەڵێك لەبێ باوەڕان هەندێك لەووشتری موسڵمانەکانیان برد. کەلەدەوروبەری شاری مەدینە بوون. ووشــترەکەی پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەناو ئەو ووشــترانەدا بوو. لەگەڵو وشــترەکاندا ئافرەتێکی موسڵمانیشــیان دەســتگیر کردو لەگەڵ خۆیان بردیان. کاتێك لەمەترسی دوورکەوتنەوە. ووشترەکانیان بەڕەڵاکرد بۆئەوەی خواردن بخۆن وخۆشیان پشوویەك بدەن وبخەون. لەم کاتەدا ئافرەتەکە هەڵدەستێت بۆئەوەی ڕابکات، بۆئەم مەبەستەش دەیەوێت ســواری یەکێك لەووشــترەکان بێــت. لەهەریەکێکیان نزیك دەبێتەوە، دەنگێکی بەرزی لێ بەرزدەبێتەوە، ئەمیش لەترســی ئەوەی پیــاوەکان بەخەبەر نەیەن، وازیان لێ دێنێت. هەتا دەگاتە لای ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەرئەوەی ئەم ووشترەیان زۆر بێدەنگ دەبێت، ئافرەتەکە ســواری دەبێتو بەرەو شــاری مەدینە دەکەوێتەڕێ، کاتێك ئافرەتەکە هەست دەکات لەمەترســی دوور کەوتۆتەوەو ڕزگاری بووە، دەڵێت: خودایە نەزربێت ئەگەر ڕزگارم ببێت، ئەم ووشــترە سەرببڕم. ئافرەتەکە گەیشــتەوە مەدینــەو خەڵکەکە ووشــترەکەی پێغەمبەری

خوایان ناسیەوە. بەڵێ ئافرەتەکە بەووشترەکەوە بەرەولای پێغەمبەری خـوا (ﷺ) کەوتـەڕێ وداوای لەپێغەمبەری خواکرد کەووشـترەکەی بداتێ، بۆئەوەی سەری ببڕێ ونەزرەکەی جێ بەجێ بکات، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموی: (سُبْحَانَ اللَّهِ بِئْسَمَا جَزَتْهَا , إِنْ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنْجَاهَا لَتَنْحَرَنَّهَـا ! لَا وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ ، وَلَا نَذْرَ فِيمَا لَا يَمْلِكُ الْعَبْدُ). رَواهُ مُسْـلِم (١٦٤١).

واتە: پاکی وبێگەردی بۆخوا، بەشـێوەیەکی خراپ دەتەوێ پاداشتی ووشترەکە بدەیتەوە، پەروەردگار بەهۆی ئەو ووشترەوە ڕزگاری کردی، تۆش دەتەوێ سەری ببڕی؟! پاشان فەرموی: پێویست نی یە نەزرێك جێ بەجێ بکرێت کەسـەرپێچی پەروەردگاری تێدابێت، هەروەها پێویست ناکات نەزر لەسەر شتێك جێ بەجێ بکرێت کەموڵکی ئەوکەسە نەبێت..
وەلەفەرمودەیەکـی تردا، خۆشەویسـتمان (ﷺ) فەرمویەتی: (لانَذْرَ لابْنِ ادَمَ فیما لایَمْلِكُ). حَدْیثٌ حَسَن. رَواهُ الترمذي: (١١٨١).

جائەگەر هاتوو کەسـێك ماڵی کەسێکی تری کرد بەنەزر، ئایا وەکو دروسـت نی یە نەزرەکەی جێ بەجێ بکاو بچێ ماڵی ئەوکەسـە بکات بەخێر. ئایا بەهۆی ئەم قسەشـەوە کەنەزری ووتوە، هیچی دەکەوێتە سـەر؟! هەندێ لەزانایان فەرمویانە: پێویستە کەفارەتی سوێند بدات، دە هەژار تێربکات، یان جل وبەرگیان بۆبکات، یاخود سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت. زۆریش لەزانایان فەرمویانە: هیچی لەسەر پێویست نی‌یە.

ئیمانداران: پێویستە ئەوەش ڕوون بکەینەوە، ئەگەر کەسێك نەزری کرد لەسەر خۆی کەتاماوە فلأن خواردنە نەخوات، لەکاتێکا ئەوخواردنە خوای گەورە حەڵاڵی کردوەو لەش پێویستی پێ یەتی. یان نەزری کرد کەقسە لەگەڵ فلأن کەس نەکات، نەچێتە ماڵی، ئەوە کارێکی خراپەو لەم حاڵەتانەدا نابێ نەزرەکەی جێ بەجێ بکات. هەروەکو پێغەمبەری

خــوا (ﷺ) فەرمویەتی: (مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطيعَ اللــهَ فَلْيُطِعْهُ، ومَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللهَ فَلايَعْصِهِ). رَواهُ البُخاري: (٦٦٩٦).

هەرلەنەزری حەرامەو نابێ جێ بەجێ بکرێ، ئەگەر کەسـێك نەزر بکات، کەهەمووکات کچەکانی لەمیرات بێ بەش بکات، یان بەشی کوڕە گەورەکەی زیاتربێ لەوانی تر، یان بڵێ: نەزربێ لەسەرم ئەو خێزانەم لەمیراتی من بێ بەش بێ، یان نەزربێ لەسەرم لەفلان مزگەوتا نوێژێك بکەم. ئەومزگەوتەش یەکێك نەبێ لەم سێ مزگەوتە، مزگەوتی حەرام، مزگەوتــی پێغەمبــەر (ﷺ) مزگەوتی ئەقصا. ئــەوە نابێ نەزرەکەی لەم حاڵەتانەدا جێ بەجــێ بکات. بەڵکو وەکو بەئاگاهێنانەوەو دەرس دادانێــك بۆداهاتــوی، کەهەرقســە دەرنەپەڕێنێ پێویســتە کەفارەتی سوێندێك بدات، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لانَذْرَ في مَعْصِيَةٍ، وكَفارَتُهُ كَفارَةُ يَمينٍ). رَواهُ أَبُوداود: (٣٢٩٠). وصَحَّحَهُ الأَلْباني.

بەڕێزان: بابەتێکی تر لەباســی نەزردا: نەزرێك کەکەســێك لەسەر خــۆی پێویســت کردبێ، بەڵام فریــا نەکەوتبێ بیــکات ومردبێ. ئایا کەســەکانی، منداڵەکانی لەدوای خــۆی دەتوانن بۆی جێ بەجێ بکەن؟! لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ پێویستە لەدوای مردنی کەسێك، هەرنەزرێکی کردبــێ وفریانەکەوتبێ ئەنجامی بــدات، دەبێ میراتگرانی بۆی بکەن. هەروەکــو لەفەرمــودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتــوە. (ئیبن عەبباس – دەفەرمــوێ: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبــەری خواو عەرزی کرد: (إِنَّ أُمِّي ماتَتْ وعَلَيْها صَوْمٌ مِنْ نَذْرٍ، أَفَأَصُومُ عَنْها؟ فَقالَ لَها النَبِيُّ (ﷺ): (أَرَأَيْتَ لَوْكانَ عَلي أُمِّكِ دَيْنٌ فَقَضَيْتَهُ، أَكانَ يُؤدي ذلِكَ عَنْها؟ قالَتْ: نَعَمْ، قالَ: فَصُومي عَنْ أُمِّكِ). البُخاري: (١٩٥٣) ومُسْلِم: (١١٤٨).

واتــە: ئەی پێغەمبەری خــوا (ﷺ) دایکم مــردوەو ڕۆژوی نەزری لەسەرەو فریانەکەوت ڕۆژوە نەزرەکانی بگرێ مرد. ئایا من بۆم هەیە

لەجیاتــی ئــەو بەڕۆژووبم؟ پێغەمبەر (ﷺ) لەوەڵامــی ئەوئافرەتەدا فەرموی: ئایا ئەگەر دایکت قەرزی لەســەربێت وبۆی بدەیتەوە، دایکت قەرزەکەی لەســەرلادەچێت؟! ئافرەتەکە ووتی: بەڵێ. خوای دابێتیەوەو من بۆی بدەمەوە لەوقەرزە ڕزگاری دەبێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: دەی لەجیاتــی دایکت بۆئــەو ڕۆژوە نەزرانــەی بەڕۆژووبە. هەروەها صەحابی پایەبەرز (ســەعدی کوڕی عوبادە) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرســیاری لێکرد دەربارەی ئەوەی کەدایکی مردووەو نەزری لەسەربووەو جێ بەجێی نەکردوەو مردوە، ئایا ئەم بۆی هەیە لەجیاتی دایکــی نەزرەکە بۆدایکــی بکات؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەســەعدی فەرمــوو: (إِقْضِهِ عَنْها) لەجیاتی دایکت جــێ بەجێ ی بکە. رَواهُ البُخاريُّ: (٢٧٦١) ومُسْلِم: (١٦٣٨).

وەهەروەها ئەگەر کەسێك نەزرێکی لەسەرخۆی پێویست کرد. وەکو ئەنجامدانــی عیبادەتێك بۆنمونــە: ڕۆژوو. بەڵام لەگــەڵ ڕۆژوەکەدا. مەرجیشــی کرد کەکارێك بــکات، کەپەیوەنــدی بەڕۆژوەکەوە نەبێت. ئەوە زانایان دەفەرمون: نەزرەکە تەنها عیبادەتەکە دەگرێتەوەو ئەوەی پەیوەنــدی بەعیبادەتەکەوە نىیە پێویســت نــاکات جێ بەجێ بکات. بۆزیاتر ڕوون کردنەوە، سەرنجی ئەم فەرمودەیە بدەن. (عَبْدُالله ی کوڕی عَبّاس) دەفەرموێ: لەکاتێکا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتاری دەدا. چاوی لەپیاوێك بوو کەبەپێوە ڕاوەســتابوو. دانەدەنیشــت. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی پرسی وفەرموی: ئەرێ ئەوە کێ یە وادانانیشێ وهەربەپێوە وەســتاوە. صەحابەکان فەرمویان: ئەوە ناوی (ئەبو ئیسڕائیلە). نەزری کردوە لەسەرخۆی کەهەر بەپێوەبێ ودانەنیشێ. وە بەڕۆژبێ وەنەچێتە بەرســێبەر، وەقســەش لەگەڵ کەس نەکات.. پێغەمبــەری خوا (ﷺ) فەرموی: (مُــرْهُ. فَلْيَتَكَلَّمْ، ولْيَسْــتَظِلَّ، ولْيَقْعُــدْ، ولْيُتِمَّ صَوْمَــهُ) رَواهُ البُخاري:

(٦٧٠٤).

واتـــه: برۆ پێ ی بڵێ: باقســـەبکاتو بچێته بەرســـێبەرو دابنیشـێ ورۆژووەکەشی تەواو بکات. لێرەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆئەوکارانەی کەپەیوەندیـــان بەعیبادەتەکـــەوە نەبـــوو، فەرمـــوی: بائەوانە نەکات وئەمەی لەسەر نەبۆتە نەزرو تەنها ڕۆژووەکە نەزرەو باتەواوی بکات..

ئیمانداران: نەزر عیبادەتەو عیبادەتیش نابێ غەیری خوای گەورەو پەروەردگار هیچ شتێکی تری تێکەڵاو بکرێ. نابێ بۆڕەزامەندی وخاتری هیچ کەس بێ جگە لە (الله - سُبْحانَهُ وتَعالى). جارێکیان کەسـێك هاتە خزمــەت پێغەمبەری خواو عەرزی کرد: (إِنِّي نَـذَرْتُ أَنْ أَنْحُرَ إِبِلاً بِبَوانَةَ). واتـــه: ئەی پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) من لەســـەر خۆمـــم نەزرکردوە، کەووشـــترێك لە (بەوانە) کەشـــوێنێکە سەببرم. ئایا بچم لەوی سەری ببرم؟! پێغەمبـــەر (ﷺ) فەرموی: (هَلْ كانَ فيها وَثَنٌ مِـنْ أَوْثانِ الجاهِلِيَّةِ يُعْبَـدُ؟). ئایا بت وصەنەمێکــی لێیە لەوبتانەی کەلەزەمانی نەفامی دا دەپەرســـتران؟! کابـــرا ووتی: نەخێر. بتی لــێ نــیە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (هَلْ كانَ فيها عيدٌ مِنْ أَعْيادِهِمْ؟!) ئایا جەژنێك لەجەژنی ئەو بت پەرســـتانە لەوشوێنانە بەڕێوەدەچێت وخەڵکی لێ ی کۆدەبنەوە بۆئەو مەبەســـتە؟ پرسیارکار ووتی: نەخێر شتی وای لێ ناکرێ، پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) فەرمـــوی: (أُوفِ بِنَذْرِكَ، فَإِنَّهُ لاوفاءَ لِنَـذْرٍ في مَعْصِيَةِ اللهِ، ولافيما لايَمْلِكُ ابنُ آدَم). واتە: برۆ وەفا بەنەزرەکەت بکەو ووشترەکە لەوشوێنەی کەناوت لێ هێناوە کە (بەوانە) یە، سەرببڕە، چونکە هیچ شتێکی بت پەرستی وجەژنی بت پەرستانی لێ ناکرێ. لەبەرئەوەی وەفا بەنەزرێك ناکرێ کەلەســـەرپێچی خوادابـــێ. وەوەفا بەنەزرێـــك ناکرێ کەمرۆڤ خاوەنی نەبـــێ ومولکی خەڵکی بێ... ئەم فەرمودەیـــە: (صَحيحٌ: أَخْرَجَهُ أَبُوداود: ٣٣١٣)

بەڕێزان: پێویستە ئەوە بۆموسڵمانان ڕون بکرێتەوە کە: لەبەرئەوەی

نەزرکـــردن عیبادەتەو تەنهـــا دەبێ بۆڕەزامەندی خوابێ وپێشـــکەش بەخوا بکری، نابێ نەزر بۆهیچ شـــتێکی تر بکرێ. (شَـيْخُ الإِسْـلام - إبنُ تيمِيَّه) لەکتێبە بەنرخەکەیدا: (مَجْمُوع الفَتاوى ج١ ص٢٨٦)دا دەفەرموێ: (وقَـدْ إتَّفَقَ العُلَـماء عَلى أَنَّهُ لايَجُوزُ لَاَحَدٍ أَنْ يَنذر لِغَيْرِ اللهِ لا لِنَبِيٍّ، و لا لِغَيْرِ نَبيٍّ وأَنَّ هذا شِرْكٌ لايوفِي بِهِ)..

واتە: زانایان هەموویان هاوڕابن لەســـەرئەوەی کە: دروســـت نی یە بۆهیچ کەســـێك کەنەزر بکات بۆغەیری خوا. نەبۆ پێغەمبەرێك، نەبۆ غەیری پێغەمبەرێك لەصالحان وخواناسان. چونکە نەزرکردن بۆغەیری خوا شیرکەو جێ بەجێ ناکرێ..).

ئیمانداران: هەندێ جار دەبینین ودەبیســـتین کەکەســـێك نەخۆش بوە، وتویەتی: خوایە ئەگەر چاك ببمەوە ئەومەڕە، بزنە، لەسەرگۆڕی فـــلان کەس بکەم بەخێر. ناوی یەکێ لەپیاوچاکانی هێناوە. یان چۆتە سەردانی گۆڕەکەو لەسەر قەبرو مەزاری ئەو پیاوچاکە لەخوا پاڕاوەتەوەو داوای شیفای کردوە، وەوتویەتی پیاوچاکەکە، فلان کەس، واحەیوانێکم نەزربێ ئەگەر خوا شیفام بدات لەسەر ئەم قەبرەی تۆ، یان دەڵێ: بۆتۆ سەری ببڕم. وەپاشان کەخوا شیفای بۆنارد، کە (الشّافِي) تەنها الله یە.. مەڕەکە یان بزنەکە دەبات لەســـەر قەبری ئەو پیاوچاکە سەردەبڕێو ئەگـــەر بڵـــێی بۆوادەکەی؟ دەڵێ: نـــەزرم بۆلەخۆ گرتبـــوو!!. جائێمە لێـــرەدا لەگەڵ ئەوپەڕی حورمەت وڕێزو دوعای خێرمان بۆپیاوچاکان و وەلی ودۆســـتانی خوا، کەژیانی خۆیان بەپاکی ومەردانەو خواناسانە بردەسەرو خزمەتی دینی خوایان کردو خەڵکیان بانگ کرد بۆلای خواو پەیامی خوا. وە بەهۆی ئیخلاص ودڵسۆزیانەوە خوای گەورە (إنشاءالله) خۆشـــی وویستونو لێیان ڕازی بوە، بۆیە موســـڵمانانیش لەبەرخاتری خوا خۆشیان دەون وکەس لاری لەحورمەت وڕێزگرتنیان نی یە. بەڵام

ئەمـــە نابێتە هۆكارى ئـــەوەى كەزيادەڕەويان دەرحەق بكرێ كەئەگەر خۆيـــان لەژياندا بونايـــە قبوڵى ئەوەيان نەدەكردو خەڵكيان ووشـــيار دەكردەوە كەخۆيان لەوبێ شەرعيانە بپارێزن. يەكێ لەوبێ شەرعيانە، ئەو نەزرو خێرو خێراتەيە كەبۆئەو پياوچاكە لەخۆدەگيرێ وپاشـــان لەسەر مەرقەدو مەزارەكانيان سەردەبڕدرێ!! فەرمون بابچينە خزمەت يەكێ لەكتێبەكانى شەرع. كەناوى (سُبُلُ السَّلامَ) كة الآَمير الصَّنْعاني دايناوە. لـــەج٤ ص١٤٤٨ دا ئاوا دەفەرموێ: (وأَمّـــا النُذُورُ المَعرُوفَةُ في هذهِ الآَزمِنَة عَلى القُبُورِ والمَشـــاهِدِ والآَمْواتِ فَلا كَلامَ - أَي لاخِلافَ في تَحْرِمِها، لَاَنَّ النّاذِرَ يَعْتَقِدُ في صاحِـــبِ القَبْرِ أَنَّهُ يَنْفَعُ وَيَضُرُّ، ويَجْلِبُ الخَيْرَ، ويَدْفَعُ الشَرَّ، ويُعافِي الآَليم، ويَشْـــفي السقيم، وهذا هُو الَّذي كانَ يَفْعَلُهُ عبادُ الآَوْثانِ بِعَيْنِهِ....الخ).

واتە: ئەو نەزرانەى كەئەمڕۆ دەيانبينين لەم سەردەمەدا، كەلەسەر گۆڕو نەزرگاو مردوان دەكرێن وپێشكەشـــيان دەكرێت، هيچ قســـەيەك نى يە لەوەدا كەبەڕاســـتى حەرامەو ناشـــەرعيە. چونكە ئەوكەســـەى نەزرەكـــە دەكات، بيروبڕواى وايە كەخاوەنـــى گۆڕەكە، ئەو پياوچاكە تواناى سودپێ گەياندن ولابردنى زەرەرو زيانى لەسەر ئەوكەسە هەيە. وەخێرى دێنێتەڕێ وشـــەڕى لـــێ لادەدات. ئارامى بەدەردەدارو شـــيفا بەنەخۆش دەبەخشـــێ. دەى ئەمە هەر ڕێك ئەوەيە كەبت پەرستەكان كاتـــى خـــۆى دەيانكـــردو نەزريـــان پێشـــكەش بەبتەكانيـــان دەكردو لەبەردەمياندا ســـەردەبڕين. چونكە بيـــرو باوەڕيان وابوو كەئەوبتانە دەنگيـــان دەگەيەنـــن بەخواو دەتوانن شـــيفا بـــدەن وخراپە لەمرۆڤ لابدەن وچاكەى توش بكەن.. جا (إنشـــاءالله) باموســـڵمانان (بەتايبەت خوشـــكانمان) باش لەوە ئاگاداربن ونەزرو خێرو خێرات جگە لە (الله) ناوى كەســـى ترو بۆخاترى كەســـى تر نەكرێ. وەحورمەتى پياوچاكان ئەولياو خواناسان بەوەبگرين، كەلەسەر ڕێبازى ئەوان كەئيسلامە بژين

وبمریــن و وەکو ئەوان خزمەتکاری ئیســلام بیــن. وەئازاریان نەدەین بەوەی کەلەســەر گۆڕەکانیان داوای شــیفاو دەفعــی بەلایان لێ بکەین ونەزریان بۆلەخۆبگرین. کەبەڕاســتی ئەگەر بۆیــان بکرایە، لەداخان لەگۆڕەکانیــان دەهاتنە دەرەوەو هاواریان دەکــرد: ئێمە تەنها بەندەی خوایــن وئەوەی ئێوە دەیکەن بۆ (الله) دەکــرێ وتەنها وتەنها لەوداوا دەکرێ نەك لەبەندەیەکی خوا، کەچاوەڕێ ی لوتف ورەحمی خوایە..

بەڕێزان: وەفاکردن بەنەزرو جێ بەجێ کردنی، ئەگەر بۆ گوێڕایەڵی خــوای گەورەبوو. تاعــەت بوو مەعصیەت نەبــوو. وەمرۆڤ دەیتوانی جێ بەجێ ی بکات، ئەوە لەڕەوشــتی مرۆڤی ئیماندارەو خوای گەورە ئەوکەســانەی خۆش دەوێ کەوەفا بەنــەزرو عەهدو پەیمانێك دەکەن، کەلەگەڵ خوای خۆیان بەســتویانە. هەروەکو لەســوڕەتی (الإنســان)دا، لەستایشــی کەســە چاك وئیماندارەکاندا کەدەچنە بەهەشتەوە، باسی ئەوکەســانە دەکات کەوەفــا بەنــەزر دەکەن وجێ بەجــێ ی دەکەن. هەروەکــو دەفەرمــوێ: بێگومــان چــاکان وپاکانیــش لەپەرداخێکــی پڕشــەرابدا دەخۆنــەوە، کەئاوێتەکــەی لەســەرچاوەی کافورەوەیــە. کەکانیەکە بەندەکانی خوا لێ ی دەخۆنەوە، لەهەرشوێنێکدا بیانەوێت هەڵــی دەقوڵێنن وفوارە دەکات. ئەو بەختەوەرانە یەکێك لەســیفاتیان ئەوەیە: ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ﴾. الإنسان:٧.

واتــە: وەفا بەنەزر دەکــەن یاخود ئەگەر بەڵێنێکیــان دا وەفادارن وئەنجامی دەدەن وترس وبیمیان هەیە لەڕۆژێك کەشەڕی لێ دەبارێتو پرش‌و بڵاوە..

بەڵــێ ئیمانــداران: نەزرکردن هەرئەوە نی یــە کەمرۆڤ پارەیەك، ماڵ‌و سامانێك، ئاژەڵێك نەزر بکات وبیکات بەخێر. بەڵکو هەموو ئەو وەعدو بەڵێنانەش دەگرێتــەوە کەمرۆڤ لەنێوان خۆی وپەروەردگاری

دا بڕیـــاری داون و وەعدو بەڵێنی داوە کەبیانکات. وەکو ئەم نمونانەی لای خوارەوە کەهەمووی وەکو نەزر لەسەر مرۆڤ حیسابن.

١. کەســێك نەخۆشــی یەکی ســەختی گرتوەو خەریــك بوە لەژیان نائومێدبێ، لەوکاتەدا هاوار دەکات بۆلای خواو دەڵێ: خوایەگیان شەرتبێ ئەم جارە چاك ببمەوە لەم نەخۆشــی یەونەمرم. دەســت بەنوێژکردن بکەم ونوێژ تەرك نەکەم. دەی کەخوای گەورە شــیفای بۆنارد، حەیف نــی یە وەفا بەنەزرو بەڵێنەکەی نەکات وبەتــەواوی ڕوونەکاتە خواو نوێژەکانی نەکات؟!

٢. یــان گەنجێکــە لەنێــوان خــۆی وپەروەردگاریدا دەڵــێ: خوای پەروەردگارم، ئەگەر هاوســەرم دەســت بکەوی مەرجە داوێن پاك بم وئیتــر نەزەریش نەکەم. دەی کەخوای گەورە هاوســەرو هاوژیانی پێ بەخشی تۆش وەفاداربەو لەهەموو خراپەیەکی چاوو داوێن بەدووربە.

٣. خوێنــدکارەو دەڵێ: خوایەگیان ئەگەر دەرچم، بەڵێن بێ دیندارو خواناس بم. ئەهلی مزگەوت بم. دەی کەســوپاس بۆخوا دەرچوی وەفا بەوەعدو بەڵێنەکەت بکە.

٤. کەسێك خۆی هەڵدەبژێرێ بۆپۆستێك، تائەنجامی هەڵبژاردنەکان ڕادەگەیەنــدرێ چەند قەلەق وڕاڕا دەبــێ، چۆن لەنێوان خۆی وخوادا دەڵێ: شەرتە دەربچم وبگەمە ئەوپلەوپایە خزمەتی میللەتی بکەم.

یاخــود ئەو وەعــدو بەڵێنانــەی کەلەکاتی هەڵمەتــی هەڵبژاردندا بەخەڵکی دەدرێ لەلایەن ئەوکەســانەوە کەکاندیدن بۆئەو پۆســتانە، ئەوە لەئیســلامدا هەمــووی بەنەزرو وەعدو بەڵێن حیســابنو کەئەو کاندیــدە دەرچــوو دەبــێ هەوڵ بــدات چەنــدی بۆی دەکــرێ، وەفا بەوەعــدو بەڵێنەکەی بکات وئەوەی دروشــمی بوە بیــکات بەکردەوە، نــەك بەداخــەوە وەکو ئەمڕۆ کەلەکاتی پڕوپاگەنــدەی هەڵبژاردن دا.

دروشمی وادەخوێنیتەوە کەبەحیســاب دنیا دەکرێ بەبەهەشت. کەس هیچ کــەم وکوڕی وگرفتی نامێنێ. کەچی لــەدوای هەڵبژاردن (٢٪)ی ئەوبەڵێنانەش جێ بەجێ ناکرێن. کەبەڕاستی ئەمە لەدیدی ئیسلامەوە تاوانێکی گەورەیە. هەربۆیە ئیســلام پێویستە بچێتە هەموو کایەیەکی ژیانەوە، چونکە ئەگەر ئەوکاندیدە پابەندی ئاینی ئیســلام بێ وبزانێ ئــەم وەعدو بەڵێنانــەی بەخەڵکیان دەدا، ئەگەر جــێ بەجێیان بکات پاداشــتی هەیە لای خواو خوای گەورە لەڕیزی چاکەکاراندا حیســابی دەکات وڕووســوری بەردەم میللەتەکەشــی دەبێت. بەڵام ئەگەر پابەند نەبێ پێوەی، ئەوە بەڕاســتی خیانەتی لەوەعــدو بەڵێنەکەی کردوەو هەروەکو ڕیســوای بەردەم ئەوکەسانە دەبێ کەدەنگیان پێداوە. (ئەگەر زانیبێتیان مانای دەنگدان بەکەســێك چی یەو لەســەر چ بنەمایەکە). هەروەها سزای خوای گەورەشی توش دەبێت.

٥. چەندین ســاڵ ئەم گەلی کوردە، بەئومێدی ئازادی وسەربەســتی یــەوە بووە، ژیانی ئەمن وئەمان بووە لەکوردســتانی خۆیداو لەســەر زێــدی باوك وباپیرانی. دەی لەئازادیدا ســەرپێچی ئەمری خوا مەکە، وولاتت ئاوەدان بکەوە. . پێت عەیب نەبێ بڵێ ی خەڵکی لادێم. حەیف نی یە لەم کوردستانە ئازادەدا. ڕوولەخوا نەبین وشوکری خوا نەکەین.

٦. چەند کەســمان (يُوفُونَ بالنَّــذر)ی ئایەتەکەمان جێ بەجێ کردوە، کەلەکاتــی گرانیەکەدا ووتومانە: خوایــە تۆ بڵێ ی جارێکی تر فەردە ئارد لەماڵی خۆما ببینم، وەعدو بەڵێن بێ ناشکوری نەکەمەوە. بەڵام کوا لەبیرمانە؟!

ئیمانــداران: ئێمــە لەکوردســتانی شــیرینماندا. ئــاوات وخۆزگەی دووشتمان دەخواست: دڵنیایی ونەمانی ترس لەدوژمن، لەگەڵ هەرزانی وفەرەحی. دەی ســوپاس بۆ خوای گەورە. هەردوکیانی پێ بەخشــین،

هەم ئازادی وسەربەستی. هەم هەرزانی دوای ئەوگرانیە گەورەیە پێ بەخشینەوە. بەلاّم کە: (الَّذي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وامَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ) خوا پێی بەخشین. ئەی ئێمە (فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هذا البَيْت) مان کردوە؟!

یان بەپێچەوانەوە: لەکاتی ترس وتۆقاندنی سەردەمی ڕژێمی لەناوچودا، کەکەس لەخوێنو ماڵو ئەمانەتی خۆی ئەمین نەبوو. چەند کەس ڕوولەخوا بوو. بەردەوام نوێژو دوعای دەکرد کەخوا لەوستەمکارانە بیپارێزێ. یان لەکاتی گرانی وبێ نانیەکەدا چەند کەس، بەردەوام جەماعەتی لەمزگەوت نەفەوتاوە. کەچی ئێستا مەگەر جومعەو جومعە مزگەوت ببینێ. چونکە دەوڵەمەند بووە!! کەبەڕاستی ئەمە بەخۆداچونەوەی ئەوێ. چونکە دوارۆژی خراپی لەدوایە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ۝ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ۝ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ۝ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴾ التوبة: ٧٥ - ٧٨.

واتە: کەسانێك هەن کەپەیمان وبەڵێنی بەخوا داوەو وتویەتی: سوێند بەخوا ئەگەر خوا ماڵو سامانو داراییمان پێببەخشێت، بەڕاستی زەکات وخێری لێ دەکەینو بێگومان لەڕیزی کەسانی چاكو خواناسیشدا دەبین. جاکاتێك خوا لەفەزڵو بەرەکەتی خۆی پێدانو بەهرەوەری کردن. ئەوان ڕەزیلیان تێداکردو پشتیان لەبەڵێنەکەیان کرد. لەکاتێکدا کەئەوان هەمیشە لەبەڵێنو پەیمان پشت هەڵکەرن، ئەوسا ئیتر بەهۆی ئەو بەڵێن شکاندنەیانەوە خوا نەخۆشی دوو ڕوویی لەدڵو دەرونیاندا چەسپاندو دامەزراند تائەو ڕۆژەی ئامادە دەبن لەبەردەم دادگای خوایدا بۆ لێپرسینەوە، چونکە نافەرمانی وسەرپێچیان کردووە لەو بەڵێنەی

کەدایان بەخواو بەهۆی ئەوەشەوە کەدرۆیان دەکرد.. مەگەر ئایا ئەوانە نەیاندەزانی بەڕاستی خوای گەورە ئاگادارە بەنهێنیو چپەو سرتەیان؟! ئایا نەشـــیاندەزانی کەبەڕاســـتی خوا بەتەواوی زاناو ئاگایە بەهەموو نهێنیو شاراوەکان؟!..

خوای پەروەردگار ڕەحممان پێ بکەی لەو کەسانەبین کەهەر وەعدو بەڵێنێکمان دا، جێ بەجێی بکەینو سەرفرازی دونیاو قیامەت بین. اللّهُمَّ آمین.


سەرچاوەکان:

١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.

٢. إسْـتِئْناسُ الخَطيبِ وَالواعِظ بالخُطَبِ وَالمَواعِظ. (محمد بن علي بن سليمان السَّعدي) ج٣ ص١٦٧.

٣. يَسْأَلُونَكَ. د.حسام الدِّين عَفَانَة. ج١ ص٢٢٢، ج١ ص٣٦٧.

٤. صَحيح فِقْهُ السُّنَة، أَبومالِك. كَمال بن سالِم، ج٢ ص٣١٥، ص٣٢٥، ص٣٣١.

٥. ڕوداوەکانی ڕۆژگار. عَبْدُاللَّطيف، ل١٠٣.

٦. شَرْح الأُصُول الثَّلاثَة. محمد حَسّان، ص٣٢٠.

# ووتاری دووەم
# بۆ مانگی جمادي الثاني
# جۆرەکانی مرۆڤ

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبهِ أجمَعينَ:

ئیمانداران وخواناسانی بەڕێز: بەپشتیوانی خوای گەورەو بەویستی ئەو پەروەردگارە بێ هاوتاو بێ شـەریکە لەووتاری ئەمڕۆماندا باسـی جۆرەکانـی مرۆڤ دەکەیـن. خۆڕەنگە هەندێ لەبەڕێزان بەبیسـتنی ناونیشانی ووتارەکە ئەوەیان بەمێشـکدابێ وئەوپرسیارەیان لادروست ببێ، کەئایا: مرۆڤ چەند جۆری هەیە؟! بۆمرۆڤ هەرئەوە نیە کەئێمە بینیومانـەو خۆمان هەموو هەرمـرۆڤ نین؟! لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ ڕاسـتە مرۆڤ لەشکڵو شێوەدا. لەئەندامانی لاشەدا، هەموی هەریەکەو هەرلەسـەر یەك شێوە پەروەردگار دروستی کردوە. هەمووشی بەجوان دروسـت کردوە. (لَقَدْ خَلَقْنا الإنْسـانَ في أَحْسَـنِ تَقويم). وەڕێزی لەهەموو نەوەی ئادەم گرتوە. (ولَقَدْ كَرَّمْنا بَني ادَمَ).. جائەم مرۆڤە ئەگەر لەشێوەی دەرەوەیـدا هەریەکـەو مرۆڤێك لەگەڵ ئاژەڵێکـدا هەتا قیامەت وەکو یەك نابن ومرۆڤ مەیمون نەبوە پاشان کلکی نەمابێ وبوبێ بەمرۆڤ. وەلەمەودواش مرۆڤ نابێ بەشـتێکی تـر، بەڵکو مرۆڤ هەرئەوە بوە کەهەیـەو هەرواش دەمێنێتەوە. وەخـوای گەورە ڕێزی ئەوەندە زۆری لەئوممەتی حەزرەتی محمـد (ﷺ) گرتوە، کەهەرچەند گوناهباریش بن. شێوەی لاشـەیان ناگۆڕێ ومەسـخیان ناکات ونایانکات بەمەیمون وبەراز. بەڵکو هەرلەسـەر شـێوەی مرۆڤی خۆیـان دەمێننەوە. بەڵام ئێمە کەووتمان باسـی جۆرەکانی مرۆڤ دەکەین. ئەوەیەکە: مرۆڤەکان هەرچەنـدە لەڕواڵـەت وشـێوەی لاشـەدا یەکسـانن، بـەڵام لەناخدا لەسەرەنجامی کردەوەکانیاندا جیاوازن. جالەئیسلامدا کەحەزو ئاواتی هەمووکـەس ڕوون کراوەتـەوە کەحـەزی لەچـی یەو بـەدوای چیدا عەوداڵـە. لەوڕووەوە (سـێ) جۆر مـرۆڤ هەیە. جاتـۆی بەڕێز بزانە لەکامیانی وهەویەو ناسنامەی کامیانت پێ یە. چونکە مرۆڤ کۆمەڵێ

قابیلیەت وئامادەباشــی وای تێدایە کەدەتوانــێ بەرزببێتەوە بۆ (أَعْلى عِلِّيِّن) گەورەتر لەپلەی فریشــتە. یان نزم بێتەوە، بۆ ئەوپەڕی نزمی. (ثُمَّ رَدَدْناهُ أَسْفَلَ).

یەکەم جۆر لەجۆرەکانی مرۆڤ: شــەهوانی وئارەزوو پەرســتە، ئەم جۆرە لەمــرۆڤ لەناخو حەزو عەودالی دا لەژیاندا، وەکو ئاژەڵ دەژی. چونکە ئــاژەڵ هەرئەمە دەزانێ وئەمــە کارو حەزیەتی. وە ئەوپەڕی ئاواتیەتی. کەبریتی یە لە: (خواردن، خەو، زۆربوون، کۆکردنەوە). دەی لەمرۆڤیشــدا ئەم جۆرە لەشەهوانیو ئارەزوو پەرستانە. هەموو هیواو ئاواتو هەوڵو خەباتیان هەربۆئەوەیە: وورگیان تێربکەن وپاروی چەور بخــۆن، زۆربخەون، کاری جنســی بکەن ونەوە بخەنەوە.ماڵو ســامان کۆکەنــەوەو هەرلەســەر یەکی دانێن. جالەپێناوی ئــەم خۆتێرکردنو دەوڵەمەندبونەدا، دین، ووڵات، ڕێز، کەســوکار، هاوڕێ، ڕەوشــتی بەرز، هەموی دەدۆڕێنێ. هەموی دەفرۆشێ، لەپێناوی چەند دینارێکا ئامادەیە خۆی بفرۆشێ، دەنگی بفرۆشێ، ڕەنگی بفرۆشێ، خیانەت لەنزیکترین کەســی بکات، ڕۆژانە بەهەزاران ســوێندی درۆ دەخورێ، دەست بڕینی ئــەمو ئەو. ئــەو هەموو کێشــەی دادگاو مەحکەمە. کوشــتنی خەڵك، ڕفاندنــی منالی خەڵك بۆپــارە، دزی کردن، ئەمانــە هەمووی هەربۆ شەهوەت پەرستیو پارە پەرستی نی یە؟! ئەم جۆرە لەمرۆڤ هەرگیز تێرنابــێ، کەمــی بوو داوای زۆر ئەکا، زۆری بوو داوای زیاتر ئەکا. خۆ دونیــاش وەکو ئاوی ســوێر وایە، بــەردەوام تینویەتیــت زیاد دەکات. قورئــان دەفەرموێ: (جَمَعَ مالاً وعَدَّدَهُ يَحْسَــبُ أَنَّ مالَهُ أَخْلَدَه). سُــبْحانَ الله قورئان چۆن لەیەك ئایەتدا شــتەکان بەجوانــی لەیەك جیادەکاتەوە، ئەوەتــا: (جَمَعَ مالاً وعَــدَّدَه) ئەمەیان خراپ نی یە. بەڵام ئەوەی مرۆڤ دەکات بەشــەهوانیو ئارەزوو پەرست ئەوەیەکە: (يَحْسَبُ أَنَّ مالَهُ أَخْلَدَه).

وابزانێ کەئەم هەموو پارەو کۆمپانیاو شـــەریکاتەی بوو. ئیتر هەرگیز نامرێو چۆن حەزبکات ئەبێ ئاوا بژی وخەڵکی لەژێر قاچی ئەودا دەبێ نان دەربێنن، (پەنابەخوا). جائایا کەســـی واهەیە؟ بەڵێ هەیەو خوای گەورەش زۆرجـــار لەدنیادا تەمێ ی ئەوجۆرە کەســـانە دەکات. باگوێ بگرین بۆ (د.محمد راتب النابُلسی)، کەئەم بەسەرهاتەمان بۆدەگێڕێتەوەو دەفەرمـــوێ: کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند لەلوبنان، شـــیرینی خانەیەکی زۆرگـــەورەو بەناوبانگی هەبوو. ئەم پیاوە بەرهەمی کارگەکەی دەنارد بۆزۆربەی وولاتانو جۆرەها شیرینی وئیشی هەویری دەکردو لەناوخۆی وولاتیشـــدا پرفرۆشـــترین بەرهەمـــی هەبوە، داهاتێکی زۆری دەســـت دەکـــەوت. ڕۆژێکیان ئەم خاوەن کارگەیە، کەدەچێتە کارگەی شـــیرینی دروست کردنەکەی، تەماشادەکات یەکێ لەهەویرەکان باش نەشێلدراوەو کەم وکوڕی هەیە. ئەویش زۆر بەتوڕەیی یەوە بانگی وەستاو کرێکارەکان دەکات ودەڵـــێ: ئەوە هەویر چۆن ئاوا دەشـــێلرێ؟! ئێـــوە بەم کارەتان دەتانەوێ لەنرخی کارگەکەم کەم بکەنەوە؟! لەداخانا ئەنگوتکێ هەویر دێنێ و بەهەردوو قاچی دەچێتە ســـەری ولەسەری هەڵدەپەڕێ ودەڵێ، ئاوا هەویر دەشێلرێ. یەکێ لەکرێکارەکان دەڵێ: قوربان تکایە وامەکە. هەڵەیـــەك بوو ڕوی دا. لەمەودوا (إنْشـــاءالله) هەڵەی واڕوونادات. بەلام ئەوە ناشکوریەکی گەورەیە کەتۆ بەقۆندەرەوە چویتەسەر ئەو هەویرەو ئەونـــان ونمەکە. کابرای شـــەهوانی وموتەکەبیـــر لەجیاتی بەخۆی دا بچێتەوەو بڵێ: کوڕم ڕاست دەکەی ودابێتەوەو هەویرەکە هەڵگرێتەوەو ماچی بـــکاو داوای لێبوردن لەخوای گەورە بـــکات. زۆر بەبێ منەتانە دەڵێ: جائەو خەڵکە خۆهەمووی نانی ژێر قۆندەرەکانی من دەخوات!! ئـــەو خەڵکە من بەخێوی دەکەم وهەزارانی وەکو ئێوە دەبێ نانی ژێر قۆندەرەی من بخوات!! پەنابەخوا. وای زانی مادام پارەی هەیەو کارگەی

بەناوبانگــی هەیە. (يحْسِــبُ أَنَّ مالهُ أَخْلَدَهُ). بــەڵام پەروەردگار مۆڵەتی نــەداو هەفتەیەکــی نەبرد هــەردوو قاچی لەخوار ئەژنۆیەوە توشــی ئازارێکی ئەوەندە بەهێزبوون. کەهیچ دەرزی وحەب وئازارشــکێنێك چاری نەدەکرد، باشــترین دکتۆری پسپۆڕ هاتنەسەری وبەبەهێزترین تیشك ئەشعەیان بۆگرت وچەندەها پشکنیان بۆکرد بەڵام هیچ نەخۆشی یەکیــان نــەدۆزی یەوە. ڕۆژ بــەڕۆژ ئازارەکەی زیاتــر دەبوو. بەهیچ دەرمانێك ئازار نەدەشــکا. بۆیە بۆڕزگاربوون لەوئازارە بەهێزە لەسەر داوای خۆی و وەکو دواڕێگە چارەی پزیشــکەکان. بڕیاریاندا کەهەردوو قاچــی لەئەژنۆیــەوە ببڕنەوە!! بەڵێ هەردوو قاچیــان بڕیەوە ئەمجا تۆزێ هەســتی بەئارامی کرد. پاشــان کەئەم دەنگ وباسەی بڵاوبۆوە. کەچــۆن بەقاچ چۆتە ســەر هەویرو ئاوا فەخرو شــانازی بەخۆیەوە کردوەو ئێســتا بێ قاچ بوە. هەســتی بەشــەرمەزاری دەکردو لوبنانی بەجێ هێشــت وئێســتا لەئەمریکا دەژی!!. بەڵێ ئەمەیە ســەرەنجامی مرۆڤی شەهوانی، کەهەموو هیواو ئاواتی پارەو سامان وووڕگ وداوێنەو کەپێی گەیشت وادەزانێ هی خۆیەتی وئیتر ئەم چۆنی پێ خۆش بێ هەروا دەبێو وائەزانێ ئەوخەڵکە بەم دەژین ونانی ئەم دەخۆن!!.

بەڵێ ئیمانداران: مرۆڤ ئەگەر بوو بەشــەهوانیو ئارەزوو پەرســت ئەوە لەپلەوپایەی خــۆی کەمرۆڤ بوونە دێتەخوارەوە. ئیمامی عەلی فەرمویەتی: خوای گەورە فریشتەی دروست کردوە عەقڵی هەیە. بەڵام شــەهوەت وئارەزوی نی یە. وە ئاژەڵانیشی دروست کردوە، کەئارەزویان هەیەو عەقڵو ئاوەزیان نی یە. وەمرۆڤیشی دروست کردوە کەعەقڵیشی هەیــەو ئارەزوو شەهوەتیشــی هەیە. جائەگەر مــرۆڤ عەقڵو ئاوەزی بەســەر شــەهوەت وئارەزویدا زاڵ بوو. ئەوە لەفریشــتە پلەی باڵاترە. خۆئەگەر هاتوو شــەهوەت وئارەزوی بەســەر عەقڵی دا زاڵ بوو، ئەوە

نزمتره لەئــاژەڵ. چونکە ئاژەڵ کەعەوداڵی تێرکردنی ئارەزوەکانیەتی لەخــواردنو خواردنەوەو جنس، ئەوە عەقڵی نــی یە. (عەقڵی ئەوەی کەدواڕۆژ لێك بداتەوەو چارەنوسی ئەوئارەزوو پەرستیە بزانێ چیيە).

جامرۆڤیش بەچی دەبێ بەشــەهوانی؟ بەوەی کەلە ڕێبازی ئیسلام دورکەوێتەوەو شــوێن هــەواو ئارەزووی خۆی بکەوێ. شــاعیر جوانی فەرموە کەدەڵێ:

(والقَلْبُ إنْ لَمْ يَكُنْ باللهِ مُرْتَبِطاً..... فَإِنَّها هُو بالَاهْواء جَوَّابُ).

دڵ ئەگــەر پەیوەســت نەبــوو بەپەروەردگاریەوە، ئەوە بەڕاســتی وەلامــدەرەوەی ئارەزوەکانی دەبێت. هەربۆیە: (أَفْضَــلُ الجِهادِ، أَنْ يُجاهِدَ الرَّجُلُ نَفْسَهُ وهَواهُ). گەورەترین پلەی تێکۆشان وجیهاد ئەوەیە کەمرۆڤ لەگــەڵ نەفسو هەوای خۆیدا جیهادو بەرەنگاری بکات وهەرچی داوای کردو ئاواتی بۆخواست بەگوێ ی نەکات. ئەینا ئەگەر نەفس وئارەزوی مرۆڤ حەزی بەچی کرد، مرۆڤ وەلامی دایەوەو بەشوێنی کەوت. ئەوە بەهیلاکی دەباو سەرەنجامی فەوتانە.

بەڕێزان: هەموو ئەوکەســانەی کەئارەزوو پەرستن وسنوری حەلاڵو حەرامی شــەرعی ناناســن، هەرچەند لەڕواڵەتدا بەختەوەرنو ڕەنگە کەســانێکیش ئــاوات بەژیانیــان بخــوازن. بەلام کاتــێ کەناخی خۆی هەڵدەڕێژێ ســەیردەکەی زۆر ناڕازی یە لەوژیانــەی خۆی. لەگۆڤاری (هۆنیا)دا جارێکیان بابەتێکــم خوێندەوە، کەچاوپێکەوتن بوو لەگەڵ گۆرانــی بێــژو هونەرمەندێکی ناودارو ناســراوی جیهانــی کەتورکەو لەکوردســتانی خۆشــمان گەنجانێــك هەوادارانی، بەنــاوی (أ، ط). ئەم گۆرانیبێژە، لەســەروەت وســاماندا، بێ ئەنداز دەوڵەمەند وپارەدارەو چەندین کۆمپانیاو شــەریکاتی هەیــە، زۆربەی وولاتانی دونیا گەڕاوە. خزمەت کاری تایبەتی هەیە، خۆشترین خواردن دەخوات. لەگەڵ سەدان

ئافرەتــدا وێنەی گرتوەو گۆرانی لەناویاندا ووتوە!، لەژیانی خێزانی دا (ســێ) جار ژیانی هاوســەری پێك هێناوەو هەرسێکیانی تەڵاق داوە، چوار منالی هەیە، لەکۆتایــی چاوپێکەوتنەکەداو تاوتوێکردنی ژیانی، ووتی: بەڕاســتی من ئاسوودەنیم وخۆشــی لەژیاندا نابینم!! بۆچی؟! چونکە شوێنێکی بۆشەو برسیەو موحتاجەو پێویستی بەپڕکردنەوەو تێرکردنە کەئەویش ناخو دڵو دەرونە، کەبەپارە تێرناکرێ، بەئافرەت تێرناکرێ، بەخواردن تێرناکرێ، بەڵکو بەخواناســی وپەیوەندی لەگەڵ پــەروەردگاردا تێردەکرێ، کەمرۆڤی ئارەزوو پەرســت لەیادی کردوەو وازی لێ هێناوە.

بەڕاستی مایەی بەدبەختی کەسێکە، خێزانێکە، میللەت و وڵاتێکە کەمرۆڤەکانــی لــەم جۆرەبن. بەداخەوە مرۆڤی ئەم ســەردەمە زۆری لەم جۆری شــەهوانیو ئارەزوو پەرســتی یەیە، هەربۆیە هەموو هیواو ئاواتی بۆتە دەوڵەمەندبوون. دۆســتایەتیو دڵســۆزی نەماو باری کرد. مەبدەئو بیرو باوەڕ بوو بەپارە. جاران کابرا لەسەر هاوڕێیەکی خۆی بەکوشت دەدا. ئێستا لەگەڵیا نان دەخواو لەبەردەمیا چاڵ هەڵئەکەنێ، تاملی بشکێنێ. چەند کەس کوژراو لاشەی فڕێدرا، کەس نەیدەزانی کێ یە، کەچــی دواتر دەرکەوت برادەری گیانی بەگیانی خۆی بوە، بۆپارە کوشــتویەتی!! لەوماوەیــەدا کوڕێکی گەنج لەســلێمانی کەخوێندکاری زانکۆی (صَلاح الدین) بوو لەهەولێر. بەکوژراوی لەبناری شاخی ئەزمەڕ دۆزرایــەوە، کەس وکاری ئەم کوڕە گومانیــان بۆهیچ کەس نەدەچوو. چونکــە ناحەزی کەس نەبوون. بەڵام پۆلیــس لەلێکۆڵینەوەدا ئەوەی لێ پرســیبوون کەئەم کوڕەی ئەوان بەزۆری لەگەڵ کێ هاودەم بووە؟! وتبویــان لەگەڵ کوڕێکی برادەری کەچوار ســاڵە لەزانکۆی صَلاح الدین بەیەکــەوە دەخوێنــنو هەموجــارێ ئەم کــوڕەی ئێمــە لەگەڵ خۆی

دەیباتەوە بۆ هەولێرو لەوسەریش دەیهێنێتەوە بۆئەوەی کرێی سەیارە نەدات چونکە سـەیارەی نی یەو ماڵێکی هەژارن. وەئەو کوڕە خەریکە لەتاوان شێت دەبێ، ئەوەندە یەکتریان خۆش وویستوە. بەڵام پۆلیسی لێکۆڵینەوە، زۆرژیرانە بۆمەسـەلەکە دەچێ ولەسـەر بڕیاری دادوەر، دەچنە ماڵی برادەرەکەی ودەستگیری دەکەن ودەمانچەیەك دەدۆزنەوە کەتەقەی پێ کراوەو هێشـتا خاوێـن نەکراوەتەوەو بۆیان دەرئەکەوێ ئەم گەنجە بەم دەمانچەیە کوژراوەو پاشان لەلێکۆڵینەوەدا دان بەوەدا دەنـێ کەئەم برادەرەکەی خۆی کوشـتوەو تەلەفۆنی بۆکردوە کەبچن پیاسەیەك بکەن ودواتر بۆسەیارەکەی وئەو پارەی پێ ی بوە، کوشتوێتی وئوتومبێلەکەی لەفلان شـوێن شـاردۆتەوەو بەنیازبوە هەڵیوەشـێنێ وپارچە پارچە بیفرۆشـێ!! بەڵێ ئەمە هەمـووی لەئەنجامی ئارەزوو پەرستی دا، بۆیە ئەم جۆرە کەسانە هاوڕێیەتیان دروست نی یە. ڕۆژانە چەندین کچ دەبنە قوربانی ئەو کوڕە شەهوانیانەی کەبەناوی پیرۆزی (خۆشەویسـتی) یەوە، دەیانخەڵەتێنن وپاشان وێنەیان بلاودەکەنەوەو بەدبەختیان دەکەن.

جـۆری دووەم لەمـرۆڤ: شـەیطانی‌یە، کەبەلاشـە مرۆڤـە، بەڵام لەناخـەوە شـەیطانە. جیاوازی مرۆڤی شـەهوانی لەگەڵ شـەیطانی ئەوەیە. کەمرۆڤی شەهوانی وئارەزوو پەرست حەزدەکات، هەوڵ بۆئەوە دەدات کەبۆخۆی لەخۆشـترین ژیاندابێ. ئەگەر ئەو خۆشگوزەرانیەشی لەسەرحیسابی خەڵکیش بێ. بەڵام مرۆڤی شەیگانی پارەو پوڵو ژیانی خۆشی بۆخۆشـی ناوێ. کەچی حەزدەکات ژیانی خەڵکی ناخۆش بێ.. کەدەبینـێ ئاژاوەو فیتنە هەیە، خەڵك دەکوژێ، خەڵکی زەرەر دەکات، نەخۆش دەکەوێ، غەمبار دەبێ، ئەم شـەیطانی یە، دڵی ئیسـراحەت دەکات. هەمـوو ئوتومبێلی دنیای بدەیـە نایەوێو کاری پێ ی نی یە.

کەچی حەزدەکات کەس خاوەن ئوتومبێل نەبێ‌و هەموی بەپێ بڕوات!، ئەگەر ببینێ کەسێك خراپەیەکی کردوە دەست خۆشی لێ دەکات. جاسوسی بەسەر خەڵکی پاك وچاکەوە دەکات. بەکورتی ئەم مرۆڤە شەیطانی یە ئەوکەسەیەکە: (باعَ اخِرَتَهُ بِدُنيا غَيْرِه). قیامەتی خۆی کردوە بەقوربانی دونیای خەڵکی تر... ئەم مرۆڤە شەیطانی یە، ئیشی ئەوەیە بەزمانی فیتنە بازی نێوانی ژن ومێرد تێك دەدات، ڕێز لەنێوان باوکو دایكو ئەولاددا ناهێڵێ، زیناو داوێن پیسی وخیانەت لەبەرچاوی گەنجو لاوان شیرین دەکات، ڕەشیان لێ دەکات بەسپی، بۆگەنیان لێ دەکات بەگوڵاو. جائەمە ئەگەر جاران کەسێکی دەرون نەخۆشی نەفس پیسی شەیطانی ئەم کارەی دەکردو ماڵی چەند کەسێکی وێران دەکرد. ئەمڕۆ لەسەدەی بیستو یەکدا، ئەم مرۆڤە شەیطانی‌یە، بەدام ودەزگا کراوە، دەیان ڕێکخراوو سەدان کەناڵی ئاسمانی‌و گۆڤارو سایتی هەیە، کەئیشی شەیطان دەکات، بەڵام نەك بەوەسوەسە بەڵکو بەکردەوە نیشانت دەدات، دەچێتە هەموو ماڵێکەوە، هەموو دەرگاکانت دابخەی، کورو کچەکانت لەژورەوە نەچنە دەرەوە، ئەودێتە ژورەوەو زیناو فاحیشەگەری و خیانەتی هاوسەری نیشانی خەڵکی دەداتو چەندین کورو کچ سەرگەردان دەکەن. چەندین ژن ومێرد کەئەوانە دەبینن وائەزانن ئەمانە ڕاستین وئەی چۆن ئەمان ئەمەیان نەکردوە، زۆرجار دەبێتەهۆی جیابونەوەی نێوان ژن ومێرد دوای چەند مناڵ!!. ئێستا بەڕاستی شەیطان حەساوەتەوەو بۆخۆی هەردانیشتوەو تەماشا دەکات. چونکە مرۆڤی شەیطانی زۆرباشتر لەشەیگان دەورەکە دەگێڕێ. یەکێك لەو مرۆڤە شەیطانیانە، کاتی خۆی لەباسی خۆی دا ووتویەتی:

(وكُنْتُ أرى مِنْ جُنْدِ إبْليسَ.... فَلَمّا طالَ بِي عُمْرٌ، صارَ إبْليسُ مِنْ جُنْدي).

واتە: سەرەتا من شاگردو بەردەستی شەیطان بوم، بەڵام ئێستا

کەماوەیەکم بەسەردا تێپەڕیوە. شەیطان بۆتە سەربازو شاگردی من ومن بومەتە سەرکردەو مامۆستای ئەو. بەردەوام دەبێ لەخوای گەورە بپاڕێینەوە کەخوای گەورە لەمرۆڤی شەیطانی بمانپارێزێ چونکە زۆرمەترسیدارن... لەدوای ڕاپەڕینەوە کەسێك لەلایەن ئاسایشەوە دەستگیرکرابوو لەیەکێ لەشارەکانی کوردستاندا. کەدانی نابوو بەچەندین تاواندا، وەکو ئەوەی کەقومبەلەی تەوقیت کراوی لەناوکتێب ونامەو خواردندا بۆچەند ماڵێك ناردبوو. هۆکاری ئەوە چی بوو کەتۆ ئەم کارە بکەی؟! وتبوی: دوژمنایەتیم لەگەڵ کەس نیەو ئەوانە زۆریان زۆر برادەرو تێکەڵم بوون. بەڵام کاتێ کەدەمبینی ژن ومێردێکی بەختەوەرن، ڕێز لەیەکتری دەگرن، ژیانیان خۆشە، یان ماڵی فلان کەس معامەلەیەکی باش دەکەن وپارەی باشیان دەست دەکەوێ ولەناوخەڵکا جێ ی ڕێزن. بەڕاستی ئارامم لێ دەبڕاو هەموو هەوڵی خۆم دەخستەگەڕ تاژیانیان لێ بکەم بەژان ولەیەکیان داببڕم. بەبێ ئەوەی هیچ زەرەریان بۆمن هەبێ، یان کەئەوان لەناوچون، من هیچ قازانجێکم پێ بگات!!. ئائەمەیە مرۆڤی شەیطانی. بەڵێ زۆر پێویستە ئاگاداربین لەوەی کەتوشی هاوڕێیەتی ئەم جۆرە مرۆڤانەببین. وەبێنە ماڵمان چونکە چەندین ژنو مێرد لەیەکتر جیابونەوە، هەرلەئەنجامی قسەی ئەم جۆرە کەسانەوە بوو، کەوەکو شەیطان قسەی بۆ ژنەکە کردو دڵی کرمێ کرد بەرامبەر مێردەکەی، یان قسەی بۆ مێردەکەی کردو دڵی کرمێ کرد بەرامبەر ژنەکەیو هانی دا بۆ ژن هێنان وسەرەنجام ژنی پێ هێناو منداڵی سەرگەردان کرد. خۆ ئەم پیاوە، یان ئەم ژنەی ئەم کارەی کرد، هیچ سودو قازانجی پێ نەگەیشت، ئەی بۆ وای کرد؟ چونکە ئەم جۆرە مرۆڤە شەیطانین وئەوە کارو کردەومیانە. تەنانەت جاری واهەیە ئەم مرۆڤانە ئیشی وادەکەن کەشەیطانیش

شــتی وای نەکردوەو بەبیردا نەهاتووە، لەکاتی نوسینی ئەم ووتارەدا، ڕوداوێکی دڵتەزێن لەیەکێك لەشارۆچکەکانی پارێزگای (سلێمانی) ڕوی دا. وەهەمــوو ڕاگەیاندنەکان باســیان کرد، ئەویــش ئەوەبوو پیاوێکی موالیــد (١٩٧٥) کەژنەکەشــی هاوتەمەنی خۆی بــوەو موالیدی (١٩٧٥) بووە. خاوەنی چوار منالی کچ بوون، شــەوێکیان لەئەنجامی دەمەقاڵی خێزانــی وناکۆکیدا (پەنابەخــوا) ئەم پیاوە دەســت دەکات بەلێدانی ژنەکــەی بەدارێکی گەورە، ئەوەنــدەی لێ دەدات هەتا دەمرێ!.. (ئەمە تائیێــرە دەتوانی بڵێ ی شــەیطان هانی داو کارەکــەی پێ کرد!) بەڵام ئەمجار ڕۆڵی مێردی ئەم ژنە دێتەپێشــەوە کەشــەیطانی بونی خۆی دەســەلمێنێ ولەجیاتی پەشیمانیو پەنابردن بۆ پۆلیسو خەستەخانە وەکو دواتر لەدان پیاهێنانەکەیدا (لەبەردەم پۆلیسی لێکۆڵینەوە) باسی کــردوە، ووتویەتــی: هەرچوار کچەکەم بردوە بــۆ ماڵی براکەمو خۆم گەڕاومەتەوە بۆماڵەوە بۆئەوەی لاشەی ژنەکەم بخەمە سەیارەکەمەوەو فڕێ ی بدەم. بەڵام لەبەرئەوەی کەمئەندام بوە، نەیتوانیوە لاشــەکەی هەڵبگرێ وبیخاتە ســەیارەکەیەوە، هەربۆیە لەمــاڵ دەچێتە دەرەوەو دەچــێ چەنــد بتڵێك بیرە دەکــڕێو دەســتدەکات بەبیرەخواردنەوە، بۆئــەوەی هیچ ئازاری ویژدانی بۆدروســت نەبێ کاتێ ئەم کارە دەکات کەنەخشەی بۆکێشاوە، کەنەخشەکەی ئەوە بوە: چەند عەلاگەی ڕەشی گەورە دەکڕێ، لەوانەی کەخۆڵو خاشاکی ماڵانیان تێ دەکرێت. ئەمجا مشــارێکی ئاسن بڕی گەورەیان دەبێ دەیهێنێو ئەندازەی ئەوە دەگرێ، کەئــەم عەلاگانــە جێی چەندی لاشــەکەیان دەبێتەوە. بەم شــێوەیە لەخــوار ئەژنۆیەوە هەردوو قاچی ژنە مردوەکەی دەبڕێتەوەو پاشــان هەردوو دەســت لەبن باڵیــەوە لێ دەکاتەوەو هەروەها ســەری دەبڕێ وبەم شــێوەیە لاشــەکەی دەکات بەسێ بەشــەوەو دەیخاتە سێ زەرفی

گەورەوەو پاشان لەئوتومبێلەکەیدا دایان دەنێ ودەڕوات ولەسێ شوێنی جیــاوازی لەیەك دوور هەرپارچەیان لەشــوێنێك فڕێ دەدات وئەمجا دەچێت بۆبنکەیەکی پۆلیس‌و خۆی تەســلیمی یاســا دەکات وهێشتاش هەرزۆر سوور دەبێت لەسەر کارەکەی‌و دەڵێ هیچ پەشیمان نیم! ئەمە مرۆڤی شەیطانی‌یە کەئەو جەریمە گەورەیە بکات کەچی هێشتا لەسەر تاوانەکەی ســوربێت. هەروەکو شەیطان بێ ئەمری خوای کرد. کەچی هەرسور بوو لەسەر تاوانەکەی‌و پەشیمان نەبۆوە!.. بەڵێ ئەمجا پۆلیس دەگەڕێ بەدوای لاشەی ئافرەتەکەداو لەسێ جێگاکە دەیدۆزێتەوە. بەڵام دەســتێکی هەرنەدۆزراوەتەوە، چونکە ســەگ بردویەتــی‌و وەهەروەها ســەگ دەم وچاوی ئافرەتەکەشــی خواردوە!.. خــوای گەورە بەڕەحمی خۆی لەبەڵای ئاوا لامان بدات..

بەڕێزان: جۆری ســێ یەم لەمرۆڤ ئەوانەن کە (ڕەببانی) ین. تەنها خوا ئەناســن، لەهەموو چرکەیەکی ژیانیاندا خوایان لەبیرەو هەرچی دەکــەن هەر بۆڕەزامەندی خوا دەیکەن ودروشــمیان ئەمەیە: (إنَّ صَلاتي ونُسُكي ومَحْيايَ ومَماتي لِلّهِ رَبِّ العالَمين). هەرچی دەیکەن لەنوێژو قوربانی وخێرو خێرات وهەنگاوو هەڵوێســت، تەنهــا (لِلّهِ) دەیکەن. بەبێ درۆو نیفــاق. بەبێ ڕیاو چــاوەڕێ ی مەدحی خەڵکی. ئــەم جۆرە مرۆڤانە کەلەســێیەم چیندا باســمان کردن. زۆرنین کەمــن، چونکە بەنرخن، چۆن کانــزا بەنرخەکان کەمن‌و گرانن ئەم مرۆڤــە ڕەببانیانەش ئاوا بەنرخن‌و کەمن لەچاو ئەو هەموو خەڵکە شەهوانی‌و شەیطانی‌یە. ئەم مرۆڤە پاکانە، دنیا لەدەستیاندایەو لەدڵیاندا نی‌یە. دنیا بەکاردەهێنن بۆدەســت خستنی قیامەت. دروشمیان ئەوەیە: (وابْتَغِ في ما آتاكَ اللهُ الدّارَ الآخِرَة، ولاتَنْسَ نَصيبَكَ مِنَ الدُّنيا، وأَحْسِنْ كَما أَحْسَنَ اللهُ إلَيْكَ)..

ئەم جۆرە کەسانە هەر خزمەتێك بەکۆمەڵگا دەکەن، تەنها لەپێناوی

ڕەزامەندی خوادایەو داوای هیچ لەکەس ناکەن. دروشـــمیان، دروشـــمی پێغەمبەرانەکە دەیانفەرموو بەگەلەکانیان: (ماأَســأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ، إِنْ أَجْرِيَ إلاّ عَلى رَبِّ العالَمِينَ).

ئـــەم مرۆڤە ڕەبانیانـــە، بەبونی خەڵکی دڵخۆش دەبن، هەوڵ دەدەن بەرژەوەندی خۆیان بەقوربانی بەرژەوەندی گشتی بکەن.

دەگێڕنەوە: پیاوێك بەســـەر ئەســـپێکەوە دەبێت، لەڕێگەیەکی دورو چۆڵدا پیاوێکی زۆر شەکەتو پەککەوتەی بینی، لەدوای خۆیەوە سواری کرد، دوای ماوەیەك کابرا حەسایەوە. خەنجەرەکەی دەرهێناو بەکابرای خاوەن ئەســـپی ووت: دابەزە هەتا نەمکوشتوی. زینی ئەسپەکەم بەرە دەســـت، دوای پاڕانـــەوەو تکاو ڕجای زۆر، کوڕە مـــن پیاوەتیو چاکەم لەگـــەڵ کـــردی، چۆن تۆ ئاوا دەتـــەوێ چاکەم بدەیتەوە. ســـودی نابێ وخاوەن ئەســـپ دادەبـــەزێ وکابرای خراپەکار ڕۆیشـــت. بەڵام خاوەن ئەســـپ بەکابرای چەتەی گوت: مەڕۆو ئەم قســـەم لێ وەرگرە: (توخوا ئەم بەســـەرهاتە بۆ کەس باس مەکە، باخەڵکی لەپیاوەتیو خێرکردن خەمســـاردی نەکـــەنو واز لەخێرکردن نەهێنن!).. سُـبْحانَ الله ووڵاخی ســـواریەکەی کە لەئۆتومبێلێکی گران بەهای ئەم سەردەمە بەرنرخ تر بووە، لەدەســـتی داوەو فڕاندویانە. کەچی لەم کاتەدا، خەمی ئەوەیەتی بەهۆی ئەم ڕوداوەی بەســـەر ئەم هاتوە، بـــێ متمانەیی بڵاوببێتەوەو کەس لەســـەرجادە ئوتومبێل بۆداماوێك، هەژارێك، ڕێبوارێك ڕانەگرێ. لەترســـی ئەوەی نەوەکو وەکو ئەوچەتـــەو خراپەکارە پەلاماری بداتو ئوتومبێلەکەی لێ بفڕێنێت!... بەڵێ ئەم جۆرە مرۆڤە ڕەببانەیە هەرکارو پیشەیەك دەکەن، غەش وخیانەتی تێداناکەن. وەهەرشتێکی خەڵکیش بکەوێتە لایان بەئەمانەتەوە ڕادەستی خاوەنەکەی دەکەنەوە، هەرچەندە خۆشـــیان زۆر ئاتاج وموحتاج بن پێی. کەئەمەش تەنها هەست کردن

بەچاودێـــری خوایی والەو مرۆڤە دەكات، ئـــاوا ماڵی بزر بوو بخاتەوە گیرفانی خاوەنەكەی. نەك لەگیرفانی خەڵك دەری بێنیێو بیدزێ، ڕۆژانە چەندین نمونەی بەرچاو لەوهەڵوێستە مەردانەو جوامێرانە، دەبینین، لەم ماوەیەدا، گەنجێكی تازەپێگەیشـــتوو، لەهاوینەهەواری (مێرگەپان) لەناحیـــەی سورداشـــی دوكان، لەكاتێكدا تەبەدۆرێكـــی گەورەی پێیەو خەریكی فرۆشـــتنی چلـــورەو مۆتایە. وەزۆر ماڵێكی هـــەژارو نەدارن، لەدوای دەمەو عەســـردا. كاتێ چلـــورەو مۆتاكانی تەواو دەبن ودەیەوێ بەرەو ماڵ بگەڕێتەوە لەلای دارێكەوە كەپێشـــتر ماڵێكی لێ دانیشـــتوە كەبۆسەیران هاتونو تازە ئەوشوێنەیان بەجێ هێشتوەو هێشتا پشكۆی ئاگرەكەیـــان گەرمە. ئـــەم كوڕە گەنجـــە تەماشـــا دەكات واجانتایەك بەلقی دارێكەوە هەڵواســـراوە. ئەویش دەچێ بەرەولای جانتاكەو لێی دەكاتەوەو كەدەیكاتەوە تەماشـــا دەكات چوار دەفتەر دۆلارو ئاڵتونێكی زۆر لەناوجانتاكەدایە. وەمۆبایلێكیشـــی تێدایە. بەڵێ ئالەم كاتەدا هیچ كەس ئاگای لەمە نیە خوا نەبێ. زۆر بەئاسانی دەیتوانی پارەو ئاڵتونەكە بباتو هیچ كەســـیش پێی نەزانـــێ، بەتایبەتی كەئەم كوڕێكی گەنجی ناوماڵێكـــی هەژارەو ڕۆژانـــە لەبەیانی هەتائێوارە، لەجیاتی ســـەیران وگەشت وەكو هاوەڵەكانی دەبێ بۆچەند هەزارێك لەپارەی چاپ، هاوار بكات بۆ فرۆشـــتنی چلورەو مۆتا. بـــەڵام ئەگەر كەس ئاگای لێ نیـیە، ئـــەی خوای پـــەروەردگار ئاگای لێ یەتی وئەم پـــارەو ئاڵتونە خاوەنی هەیەو ئەبێ ئێستا ئەوئافرەتە توشی چ كێشەیەكی دەورونی وتەنانەت خێزانیش ببێتەوەو لۆمەو سەركۆنە بكرێ كەچۆن ئەوەندە إهمال بوە، ئەو هەموو پارەو ئاڵتونەی كەلەترســـی دز لەماڵەوە جێ نەهێشـــت. وا لەو چۆڵەوانیەدا جێی هێشـــت!! هەربۆیە ئەم كوڕە گەنجە خواناســـە، لەخواترســـە، موبایلەكـــە لەجانتاكە دەردێنـــێو ژمارەیەك لەوناوانەی

کەلەمۆبایلەکەدا بەناوخەزنەو کەسـێکی نزیکـی خاوەنی جانتاکەیە. هەڵدەبژێرێ وتەلەفۆنی بۆ دەکات. یەکسـەر وەڵام دەدرێتەوەو ئەویش بـەووردی بۆیان باس دەکات چۆن جانتاکەی دۆزیوەتەوەو ناونیشـانی ماڵی خۆیان پێ دەڵێ وئەوانیش بۆشەو دەگەنە ماڵی کوڕە گەنجەکەو پارەکـەی لێ وەردەگرنەوەو بەتەواوی بـێ کەم وکوڕی لەگەڵ تەواوی ئـەو هەموو ئاڵتونـە زۆرە. وەوەکو دەستخۆشـی وڕێزلێنان پارەیەکی زۆری دەدەنێ، بەڵام وەری ناگرێ ودەڵێ: من تەنها بۆڕەزامەندی خوای گەورە ئەوەم کردوەو پاداشتی من لای خوایەو ئەرکی سەرشانی خۆمم جـێ بەجـێ کردوە.. بەڵێ ئەمـە بەرهەمی ئیمان بونـە بەچاودێری خوا، ئەمە مرۆڤی خواناسـە. جائەمە لەکوێو ئەو مرۆڤە شـەهوانیو شـەیطانییە لەکوێ، کەپارەو سـامانی خەڵك لەهیچ جێگایەك ئەمین نی یە لەترسـی دەسـتی پیس ودزی ئەو یان بۆناخۆش کردنی ژیانی خەڵك، پارەی خۆی خەرج دەکات تاخەڵك سەرگەردان بکات.

بەڵـێ ئیمانـداران: ئەم جـۆرە لەمـرۆڤ، کەڕەببانیو خواناسـی ڕاسـتەقینەن، لەدەست چونی پاداشـت وکردەوە چاکەکان. کەباڵانسی حیسـابی قیامەتیان بـەرز دەکاتەوە. زۆر بەلایانـەوە گرانترە لەوەی کەماڵو سـامانی دونیایی وقازانجی معامەلەیەکیان لەدەسـت چوبێ.. پیاوچاکێ دەفەرموێ: نوێژێکی بەیانیم بەجەماعەت فەوتا (نوێژەکەی کردوە، بەڵام فریای جەماعەتی مزگەوت نەکەوتوە). زۆر خەمبار بوم. سێ کەس لەهاوڕێ ودۆستانم کەئەو بەیانی یە لەمزگەوت نەیانبینیم، هاتـن بۆماڵـەوە بۆلام وسەرەخۆشـیان لێ کـردم. لەبەرفەوتانی ئەو جەماعەتـی بەیانیەم! بەڵام ئەگەر کوڕێکـم بمردایە زیاتر لە (١٠٠٠) کـەس دەهاتن بۆپرسـەو تەعزیەکەی. بەڵام بەخوا ئەسـەف وخەمی لەدەست چونی جەماعەتی ئەو بەیانیەم کەکەلێن لەنوێژی جەماعەتمدا

پەیدابوو، لەمردنی کوڕێکی جگەرگۆشەو خۆشەویستم بەلامەوە زیاتر بوو!!..

جاموسـڵمانی بەڕێـز: هەوڵبدە لەم جۆرەی مـرۆڤ بی، کەڕەببانی ولەخواترسان وخواناسی سـیمایانە. وەهاوڕێیەتیان بکە. وەبهێڵە بێنە ماڵتو نان بخۆن. وەبچۆ ماڵی ونانی بخۆ، چونکە خیانەتت لێ ناکات، ناتفرۆشێ، خیانەتت لێ ناکات، نانت ناخواو سفرەت بدڕێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (لاتُصاحِبْ إلاّ مُؤْمِناً ولايَأْكُلْ طَعامَكَ إلاّ تَقِيٌّ). هاوڕێیەتی ئیماندار نەبێ مەیکە، وە باکەسـیش نەیەتە ناوماڵت ونانت نەخوات، تەنها موتتەقی نەبێت.

بەڵـێ ئیمانداران: ئەم خواویسـتانە هەندێ جـار مافیان دەخورێ، حەقی خۆیان پێ نادرێ، وەکو خەڵکی ماستاوچی ئیشی ناڕوات. چونکە دزو دەسـت پیس نی یە، لەپرێ نابێ بەکوڕێ. بەڵام سـوێند بەخوا. براوەو سەرفراز تەنها هەرئەم جۆرە مرۆڤە ڕەببانیانەن. چونکە نێوانی خۆیـان وپەروەردگاریـان ئاوەدان کردۆتەوە، خالیقی خۆیان دەناسـن وتەنها سـەر بۆئـەو دائەنەوێنن‌و ڕکـوع وسـوجدەی بۆدەبەن. بۆیە بەرامبەر هەموو مەخلوقات سەریان بەرزە، پاشان ژیانیان بەختەوەری یە، چونکە دڵیان خۆشـەو ئومێـدەوارن بەڕەحمی خـوا، هەرچەندە لەماڵ‌و دارایشدا کەم وکوڕیان هەبێ، وەپاشانیش کەچونە بەهەشتەوە، بەویسـتی خوا، هەرچـی خەم‌و مەراقی ئەم دونیایـە هەیە لەبیریان دەچێتـەوەو تەنانەت بیریـان نامێنێت کەناخۆشـی وناڕەحەتیەکانی ژیانـی دونیـا چۆن بون. پاشـان هاوڕێیەتی پێغەمبـەری خوا (ﷺ)، هاوەڵیەتی ئەو هەمـوو صەحابە. دەی بابەخۆماندا بچینەوەو خۆمان بخەینە ناوکاروانی (ڕەببانی‌و خواناسـانەوە). ئەوکاروانە دورودرێژەی کەئالاکەی بەدەست ئادەم‌و نوح وإبراهیم‌و عیسی‌و موساو پێغەمبەرانی

ترەوە بوەو دواجار تەســلیم بەحەزرەتــی محمد (ﷺ) کراوەو کاروان هەربەردەوام لەســەر (ڕێگای ڕاست) دەڕواتو تانەچێتە ناوبەهەشتەوە پشــوو نادات. بەختەوەری وسەرفرازی دونیاو قیامەت بۆ ئەو کەسەی کەلەو کاروانەدا، خۆی دەبینێتەوە. ئای هاوارو قوڕبەسەریوماڵوێرانیو خەســارەتمەندی بۆئەو کەسەش کەلەوکاروانە داببڕێ وببێتە خۆراکی گورگی هار (إنَّما يَأْكُلُ الذِّئْبُ مِنَ الغَنَمِ القاصِيَة). هەرلەکاروانی خواناســانو دابڕایو بەجیٚمای، کۆمەڵێ شــەیطانیو شــەهوانی چاوەڕێت دەکەنو بەلاڕێو شــیوو دۆڵدا دەتبەنو ئەوەی قەلەڕەش مامۆستاو ڕابەری بێ، شوێنی هەر بەهیلاك چونی ناو شیوو دۆڵو هەڵدێرەکانە.

خــوای گەورە لەســەر ڕێبازی ڕاســتی ئیســلام دامەزراومان بکات، وەبەڕەحمی خــۆی یارمەتیمان بدات، کەدوربیــن لەکاروانی بەهیلاك چوو لادراوی گورگ خواردوی خوانەناسانو بێ بڕوایان.

(رَبَّنا لاتُزِغْ قُلُوبَنا بَعْدَ إِذْهَدَيْتَنا، وَهبْ لَنا مِنْ لَدُنْك رَحْمَة، إِنَّكَ أَنْتَ الوَهّاب).. اللّهُمَّ آمين.


سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز.

٢. فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

٣. گۆڤاری (فەیس بووك) ژ: ٤.

٤. پایزەبرا، مەلا أحمدی شەریعە.

٥. عِنْدَما يَحْلُوا المَساء، الدكتور حَسّان شمي باشا، ص٨٠.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّـــلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِينَ:

ئیماندارانی بەڕێز: مرۆڤ كاتێ كەلەسەر زەوی دەژی وئەم قۆناغەی ژیانی تێ دەپەڕێنێ. جیاوازە لەگەڵ ئەوەی كەلەناو بەهەشت بژی. چونكە ئێرە دنیایە. شوێن وهۆڵی تاقی كردنەوەیە، نەك ئەنجام. تەنانەت كاتێ مرۆڤ لەژیانی دنیادا، خراپەیەك، زوڵمێك ستەمێك دەكاتو خوای گەورە توشی بەڵاو ناخۆشی وناڕەحەتی یەكی دەكات. ئەوە سزای حیسابو لێپرسینەوەی لەگەڵ نەكردوە، چونكە ئەوە بۆقیامەتە، بەڵكو ئەو ناڕەحەتیو ناخۆشی‌یەی بەهۆی ئەوخراپەوە توشی بوە، ئەوە ئاگاداركردنەوەی خوایی بووە بۆی، بۆئەوەی بەئاگابێتەوەو تەوبەبكاتو واز لەوخراپە بێنێ وهەم خۆی ڕزگاركاو هەم خەڵكی لەدەستی ڕزگاربن. هەربۆیە ئەوكەسانەی زۆر خراپەكارن، ومقابیلی هیدایەت نین وڕەش بون لەناوخراپەو تاواندا. ناخیان ڕەش بوەو دڵیان لەئاستی بیستنی حەقدا مردوە، ئەمانە زۆركات لەدنیادا خوای گەورە هیچ ناخۆشی یەك ناهێنێتە ڕێگەیان لەدنیادا، بەڵكو هەمویان بۆ هەڵدەگرێ بۆ قیامەتو سزاكەیان والەوێیە. جائەو كەسەی خراپەی كردوو توشی هیچ خراپەیەكو دڵناڕەحەتیەك نەبووە. ئەوا بالەخۆی بترسێ، كەقیامەتی پڕە لەسزاو ئەشكەنجە، بۆیە خوا لەدنیادا، بەبونی بەڵاو ناخۆشیو نەخۆشی ئاگاداری نەكردۆتەوە.

بەڵێ ئیمانداران: لەژیانی دنیادا كۆمەڵێك صیفەت هەیە لەمرۆڤدا. كەخوای گەورە لەناو مرۆڤدا دروستی كردوە. بۆ ئەوەی ئەم سەرزەوی‌یە ئاوەدان بێو مرۆڤ لەگەشەكردنو پێشكەوتنو هەوڵداندابێ، خۆ ئەگەر ئەم صیفەتانە نەبوایە، ئەوا ئەم سەرزەوی یە ئاوا ئاوەدان نەدەبوو، وەمرۆڤ ئاوا هەوڵو هیممەتی نەدەبوو.. جاكەئەم غەریزانە لەناوناخی مرۆڤدا هەن، مرۆڤیش لەهەوڵی بەدەست هێنانیاندایە. جائەگەر

بەپێ ی شەرعی خوا بەدەستیان بێنێ ئەوە مافی خۆیەتیو پێ ی بەختەوەر دەبێ وخەڵکیش لێ ی سودمەند دەبێ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ بۆدەسکەوتنی ئەم شتانەی کەلەلای خۆشەویستنو جێگای بایەخن، لەرێگەی شەرع لایدا، لەو مەنهەجە لایدا کەخوای گەورە بۆی دیاری کردوە. کەدەبێ لەم رێگەیەوەو بەم شێوەیە ئەم شتە بەدەست بێنی. ئەگەر وای نەکرد، ئەوە توشی ناحەقی کردن دەبێ وستەم لەخەڵکی دەکات ومافی خەڵکی دەخوات وژیان لەخۆی ولەخەڵکی دەکات بەژان، ژیانی خۆی بەوە دەبێ بەژان کەبەردەوام ویژدان وناخی نائارام دەبێ وهەست بەئۆقرەیی‌و ئاسودەیی‌و ئەڤین ناکات، وەژیانی خەڵکیش دەکات بەژان بەوەی کەستەمیان لێ دەکاتو ئازاریان دەدات ولەجیاتی گوڵ پێشکەش بەمرۆڤ بکات. درکی لەرێگادا دەچێنیو لەجیاتی فریای کەوێ، لێ ی دەبێتە گورگی هار. جالەو غەریزانە کەخوای گەورە بەحیکمەت وکاربەجێ ی خۆی لەناو ناخی مرۆڤدا دایناون ئەمەنانەن:

١. خۆشویستنی ئەم شتانە، کەلەم ئایەتەی قورئاندا هاتوون، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴾ال عمران: ١٤.

واتە: ئارەزووی ئافرەت وبوونی نەوەی نێرینەو خاوەنیەتی ئاڵتون زێرو زیووی زۆرو زەبەندەو ئەسپی چاکان ورەسەن (ئەمرۆ ئوتومبێلو هۆکانی هاتوچۆ) وهەروەها ماڵات وزەوی وزاری کشتوکاڵ بۆخەڵکی رازێندراوەتەوە. ئەوانە هەموو نازو نیعمەتی ژیانی دونیان. خوایش بۆچاکان شوێنی گەرانەوەی رازاوەو خۆشی لای خۆی ئامادەکردووە، کەبەهەشتە.

بەڵێ خوای گەورە ئەم شتانەی کەلەئایەتەکەدا هاتبون، لای مرۆڤ خۆشەویستی کردون. وەمرۆڤ تەواوی هەوڵی خۆی دەخاتەگەڕ بۆبەدەست هێنانیان. وەخوای گەورە هەمووشی بەمرۆڤ بەخشیوەو لێی قەدەغە نەکردوە، بەڵکو بەمەتاعو خۆشیو مایەی لەزەت وەرگرتن، ناوی بردوە، بەڵێ خوای گەورە هەموو ئەمانەی بۆمرۆڤ لەسەرزەوی دروستکردوە. بەڵام دەبێ مرۆڤ خۆی هەوڵی بەدەست هێنانیان بدات. وەلەو چوارچێوەیەش دەرنەچێت کەخوای گەورە بۆی داناوە، کەلەورێگەیەوە دەتوانێ ئەم شتانە بەدەست بێنێ، چونکە ئەگەر لەوسنورە دەرچوو. یەکسەر زیان بەبەرژەوەندی خەڵکی تر دەگەیەنێ. خۆئەگەر یەکێ بپرسێ: باشە بۆچی خوای گەورە ئەم شتانەی کەلەئایەتەکەدا خوای گەورە باسی کردن لە (ئافرەت، هاوسەری ژیان، منالْو نەوەو کوڕو کچ، بونی پارەو پوڵو دینارو دۆلارو ئاڵتونی زۆر، ئەسپی ڕەسەنو ئوتومبێلی جوان، مەڕو ماڵاتو باخو باخاتو زەوی کشتوکاڵی). بۆچی ئەمانەی یەکسەر بەمرۆڤ نەبەخشیو ئەو هەموو هەوڵو ماندوبونی مرۆڤەی بۆچی بوو. کەجاری واهەیە لەسنور دەردەچێ ودەبێتە زاڵم وستەمکارو خراپەکار لەپێناو بەدی هێنانیدا. زۆرجار خوێنی خەڵك لەپێناوی ئەمانەدا دەڕێژێ.. دەی خۆ خوای گەورە هیچ لەدەسەڵات وتواناو بەخشینی کەم نەدەبۆوە، ئەگەر ئەمانەی بۆهەموو مرۆڤێك بخستایە ماڵەوەو بەبێ ڕەنج وماندوبون وهەوڵدان، هەمووکەس هەیبوایەو ئەوکات ژیان ئەم ناخۆشیانەی تێدانەدەبوو، کەس کەسی نەدەکوشت، کەس ماڵی کەسی نەدەخوارد، هەموو بەختەوەر دەبوین. ئەی بۆچی خوای گەورە لەدنیادا ئەمەی بۆنەکردین؟! لەوەڵامدا دەڵێین: خوای گەورە هەموو کارەکانی پڕحیکمەت وکاربەجێ ییەو ناوی (الحَكيمَ) بەڵام (واللهُ أَعْلَم).

هەربۆ وەلامی ئەو پرسیارە کەڕەنگە بەمێشکی هەندێ کەسدابێ، یان هەندێ کەسی بێ دین، بۆگومان خستنە ناودڵی ئیماندارانەوە بەرامبەر بەخوای گەورە، بیوروژێنێ، دەڵێن:

أ) ئێرە ژیانی دونیایەو ئەگەر خوای گەورە ئەم شتانەی هەموو بەبێ جوڵەو هیچ عەزیەتو هەوڵێك بەهەمووکەس ببەخشیایە، کەواتە ئێرە بەهەشت ئەبوو نەك دونیا. چونکە لەبەهەشتدا ئەوەهەیە کە: دڵت بۆهەرچی چوو، هەر بەخەیاڵتا هات، لەبەردەمتا ئامادەیە.. مرۆڤ هاوسەری ژیانی لەگەڵی ئامادەیە. بەدەیان خزمەتکارەوە، هەروەها کەسێ حەزی لەمناڵە. بێ حەمل وزانو لەدایك بوون. یەکسەر چەند کوڕو کچ دڵت داوای دەکات، لەبەردەمت ئامادەیە.. جارێکیان کەسێك کەلەدنیادا پیشەی هەرکشتوکاڵو فەلاحەت وباخداری بوو، ئالوودەی کشتوکاڵو زەوی وزار بوو، لەپێغەمبەری خوای پرسی: ئایا لەبەهەشتدا کشتوکاڵو فەلاحەت هەیە. چونکە من زۆر حەزم لێ یەتی وحەزدەکەم لەوێش هەرئەم کارەبکەم!! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: مادام حەزت لەکشتوکاڵو فەلاحەتە، لەوێش بەدڵی خۆت زەوی وزار لەبەردەستا ئامادەیەو بەبێ ئەوەی هیچ ماندوبونێك بچێژی دای دەچێنی ویەکسەر شین دەبێو پێدەگاو دێتە بەرهەمو ووشك دەبێو دروێنەی دەکەی!. ئەمە وەکو لەزەت وخۆشی بینین دەکەی نەك وەکو دونیا ماندوبوونو بەدەستهێنانی نان وبژێوی ژیان ئەم کارەت پێ بکات!. لەبەهەشتا پارەو دینارو دۆلار نی‌یە. چونکە ئەمانە لەدنیادا بۆ کڕینی پێویستی بوون، ئەگەر پارە هیچی پێ نەکڕدرێ، ئیتر بایەخی چی‌یە؟ وەچ خۆشیەکی تێدایە هەت بێ؟! بەپێچەوانەوە پارەو دینارو دۆلار ئەگەر ڕەسیدی نەماو هیچی پێ نەکڕدرا، نەك نابێتە مایەی دڵخۆشی بۆخاوەنەکەی بەڵکو بۆی دەبێتە سزای دەرونی. چەند کەس

لەوکاتەدا کە (٢٥) دیناری سویسری ڕەفزکراو ئیلغاکرایەوەو نرخی نەما، لەتاوی ئەو هەموو (٢٥) دینارەی داینابوو جەڵدە لیَی داو مرد، یان شەلەل بووا! دەی کەواتە بۆیە لەبەهەشتا پارەو پوڵ نیـیە چونکە شت کڕین نیـیە. حەزت لەهەرچی بوو، بەس تەنها مەیلت بۆی چوو. لەبەردەمت ئامادەیە. ئیتر پارەت بۆچی یە. وەئاڵتون وخشڵیش ئەوە ئەوەندە زۆرە، کەئەو خانوو کۆشکانەی کەهەتن هەرخشتێکی زێڕەو خشتێکی لەزبوە. بەهەزاران طەن ئاڵتونت دەبیَ. وەئەسپ و ووڵاخی سواریو ئوتومبێلو فڕۆکەو ژێردەریایی وپاپۆڕو کەشتی. هەرچی دڵت بیخوازیَ لەبەردەستتا ئامادەیە. بەڵام لەویَ ئەم ئامێرانە هەمووی بەختەوەرین ودوورن لەڕودانی هەرکارەساتێك، یان تێکچونێك، ئەگەر بڵیَ ی ئەمە چۆن دەبیَ؟! دەڵێین: ئەمە دەستکردی خالیقە، نەك مەخلوق. ئێمە دەستکردی مرۆڤمان بینیوە کەتێك دەچیَو بەیەکا دەدریَ وکارەسات ڕودەدات، بەڵام هەرلەدنیادا سەرهەڵبڕە بۆئاسمان وبزانە ئەم هەموو ملیارەها ئەستێرەیە. هەمووی دیَ ودەچیَ ودەڕواو لەجوڵەدایەو (كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ) دەی بزانە ئەو ملیۆنەها ساڵە هەن ونەلەجوڵە دەکەون ونەتێك دەچن ونەبەریەك دەکەون ونەبەنزین وڕۆنیشیان پێویستە! دەی هەرئەو خوایە لەبەهەشتا، ئەو ئامێرانەت پێشکەش دەکات وئاوا سەلامەت دەبن وهەرگیز تێك ناچن، وەهەرچی دڵت بیخوازیَ وڕۆژیَ لەڕۆژان بەخەیاڵتا هاتبیَ. لەئاژەڵ ج ماڵی وج کێوی ئامادەیە بۆت وبەهەزارانت دەبیَ، بەڵکو شتی وا بۆئیمانداران ئامادەکراوە لەبەهەشتا. کەنەهیچ چاوێك لەدنیادا بینیویەتی، نەهیچ گویَ یەك بیستویەتی، نەبەخەتەرەو خەیاڵی هیچ کەسێکیشدا هاتوە! (خوای گەورە بەنسیبمانی بکات. امین)..

جابەڕێزان، ئەگەر مرۆڤ لەدنیاشدا، هەموو ئەمانەی بەبیَ ماندوبون

وزەحمەت وهەوڵ دان ببوایە، کەواتە فەرق وجیاوازی نێوان دونیاو بەهەشت چی دەبوو؟!

ب) وەپاشان ئەگەر مرۆڤ هەموو ئەم شتانەی لەدنیادا هەبوایە بێ ڕەنج وماندوبون لەبەردەستی دا بوایە. ئەوکاتە چ مانایەك بۆژیانو هەوڵو هیمەت وجیاوازی مرۆڤی ئیش کەرو بەرهەم هێنو دەستی بەرزو باڵاو خێر، لەگەڵ تەمەڵو حازرخۆرو سواڵکەر چی دەبوو؟! ئەی خۆڕاگری وئارامگریو چاکیوپاکی مرۆڤ لەکوێدا دەردەکەوت، کەئەمانەش نیيەو حەزیشی پێ یەتی ودەشتوانێ بیدزێو داگیری کاو فێڵ بکات، بەڵام نایکاتو نایەوێو هەوڵ دەدات بەحەڵاڵی بەدەستی بێنێ!..

ئەمجا لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابن، ئەگەر مرۆڤ لەژیانی دنیادا، هەموو ئەمانەشی هەبێ، هەموو مرۆڤێك بەبێ جیاوازی ئەمانەی هەموو هەبێ، کەس موحتاج نەبێ. هێشتا ئەم مرۆڤە هەردەست درێژی دەکاتە سەرماڵی یەکتر. دەڵێ: هی خۆم بۆخۆم. هی تۆش دەخۆم. هێشتا هەرچاوی تەماح دەبڕێتە ماڵی کەسانی ترو حەزدەکات ئەوان هیچیان نەبێ وهەموی هی ئەم بێ. چونکە مرۆڤ سیفەتی حەسودی تێدایە. لەبەرئەوە خوای کاربەجێ لەبەهەشتدا. مرۆڤەکان لەم سیفەتە خراپە، کەحەسودی وبەخیلی وڕق وقین وچاوپیسی یە پاك دەکاتەوە. (ونَزَعْنا مافِي صُدُرِهِمْ مِنْ غِلّ). ئەوسینەیان پاك دەکرێتەوە لەغیلو حەسوودیو تەماح بازی. هەربۆیە ژیانی بەهەشت ئاوا خۆش وئارام وبێ کێشەیە، چونکە مرۆڤ سینەی پاکە..

بەڵێ ئیمانداران ئەمە غەریزەی یەکەم لەمرۆڤدا کەبریتی بوو لەخۆشویستنو هەوڵ دان بۆبەدەست هێنانی ئەم شتانە..

٢. غەریـــزەی دووەم: غەریزەی حەزکـــردن بەژیانی نەمری، زۆرتر

مانەوە لەســەر دونیا. (سُبْحانَ الله) مرۆڤ هەتا بەتەمنتر دەبێ زیاتر حــەزی بەژیانە، وەتموحــی زۆرترە، ئەمــەش هەرکابەجێ یی خوای گەورەمــان بۆدەردەخــات، چونکە ئەگەر وانەبوایە ئەم ســەرزەوی یە ئــاوەدان نەدەبــۆوە، خانویەکی جوان وپتەو دروســتکراوت نەدەبینی. ئەوەتا هی واهەیە تەمەنی (٦٠) ســاڵ بەرەوژوورە. خانویەك دروســت دەکات، حــەزردەکات (٣٠٠) ســاڵی تــر هەرنۆژەنکردنەوەشــی نەوێت ئەوەندە پتەو دروســت کرابێت. کەچی بیرلەوە ناکاتەوە خۆئەوپەڕی (١٠ تا ٢٠) ســاڵی تر بژی. نەخێر، وائەزانــێ هەرتیا دەمێنێتەوە، یان کەسێك باخێك دەڕوێنێ، خۆشی ئەزانێ تائەم باخە دێتە بەرهەم، ئەم دەمرێ. یان تواناى خواردنی نامێنێ، کەچی زۆر بەهیمەتو هەڵمەتتر لەگەنجێك خەریکی کارکردنە تێ ی داو بەئومێدە زۆر بژی، کەئەمەش ڕەحمی خوایە لەگەڵ مرۆڤدا کەئەو غەریزەی تێدا دروست کردوە. وە ئاوا زەوی ئاوەدان وڕازاوە دەکات.

٣. غەریــزەی خۆشویســتنی پــارە، دینــارو دۆلار، کەخــوای گەورە دەفەرمــوێ: (وإنَّــهُ لِحُبِّ الخَيْرِ لَشَــديد). کەموفەســیرینی قورئان تێکڕا دەفەرمون، مەبەست پێ ی خۆشەویستی پارەو سامانە. (وتُحِبُّونَ المالَ حُبّاً جَمّاً) مرۆڤ زۆر حەزی لەپارەیە. کەئەگەر ئەم غەریزەیە نەگاتە پلەی پەرســتن، کەسەکە نەبێتە پارە پەرست، کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (تَعِــسَ عَبْــدُ الدينار). چونکە چــۆن (عَبْدُالله) هەیە، ئــاواش (عبدالدینار) هەیــەو بەئەندازەی ئەوەی ئیمانداری بەحەق خوای خۆش دەوێ، ئەم پارە پەرستە ئاوا پارەی خۆش دەوێ!! (پەنابەخوا)، بەڵێ ئەگەر مرۆڤ پارە لەدەســتو لەگیرفانیدابێ ونەچوبێتە ناودڵی یەوە، ئەو غەریزەی خۆشویســتنی پارەو ســامانە، نەك خراپ نی یە، بەڵکو زۆریش باشە، چونکە ئەگەر مرۆڤ ئاوا پارەی خۆش نەویســتایە. بڕوابکەن زۆربەی

ئیشــی ئەم ســەرزەویە کەس نەیدەکــرد. کەچی دەبینــی کرێکارێك لەخانویەکی چەند قاتی زۆر بەرزدا، لەســەر ئەسکەلەیەك کاردەکات، کەمرۆڤ لەخوارەوە تەماشای دەکات، دەترسێ. وەئەو کرێکارە زۆربەی کات ژیانــی لەمەترســی دایە، کەچی کاتێ بیــر لەپارەکەی دەکاتەوە، کەکرێیەکی باش وەردەگرێ، نەك هەر بەکارەکەی ناڕەحەت نابێ، بەڵکو لەزەتیشی لێ وەردەگرێ. هەموو جۆرە پیشەیەك لەشۆفێری، دارتاشی، ئاســنگەری، بەرگ دوری...هتــد، هەموی ناڕەحەتــی ومەینەتی زۆری هەیە. کەچی مرۆڤ بەعەشقەوە دەیکات، چونکە چاوی لەپارەکەیەتی کەلەوکارە وەری دەگرێ. ئەمە تائیرە هیچ گرفتێك نی یە وەکو باسمان کــرد، مــرۆڤ لەڕێگەی ئــەم غەریزانەوە کەخوای گــەورە لەناخی دا دروســتی کــردوە، هەم خۆی باش دەژی وهەم دەبێتەهۆی باشــکردنی ژیانــی خەلکانی تریــش. بەڵام: هەندێ جار مــرۆڤ ئەم غەریزەیەی ئەوەندە تێدا زاڵە، کەلەســنوری خۆی دەچێتە دەرەوە، دەڵێ: هی خۆم بۆخــۆم هی تۆش دەخۆم!، ئەوکاتە بەریەك کەوتن ڕوودەدات. ئالێرەدا (ســتەمکاری، حەرامخۆری، غەش وخیانــەت، ناعەدالەتی) پەیدادەبێ. ئەی باشــە چــارە چییەو مرۆڤ بەچــی لەم (لەســنوور دەرچون)ە، ڕزگاری دەبــێو نابــێ بەهارو مــارو بەقاچو گەردنــی خەڵکەوە نادات وزەوی ئاوەدان دەکاتەوەو کاولی ناکاتو گوڵ دەچێنێو بەخوێن سوری ناکات؟! چونکە مرۆڤ زوو لەســنوری خۆی دەردەچێ کاتێ دەسەڵاتی دەبێ، یان کاتێ دەوڵەمەند دەبێ، ( إن الإنسان ليطغى أن رآه استغنى). بۆیە لەووڵاتانی ئەوروپیو ئەمریکیو زۆربەی ووڵاتانی تردا، مرۆڤ بەردەوام لەژێر چاودێری کامێرادایە. لەســەرجادە کاتێ ئوتومبێل لێ دەخوڕێ، کاتێ لەبازاڕدایەو شــت دەکڕێو دەفرۆشــێ، کاتێ دەچێتە بانقێکەوە، کاتێ لەفەرمانگەیەکی حکومیدایــە، هەمووکات والەژێر چاودێریدایە

وەهەر سەرپێچیەك بكات، غەرامەی ماڵی دەكرێ وبڕێكی زۆر پارەی لێ دەسەندرێ. هەرئەمەشە كەئەو وولاتانە سەرپێچی یاسایی كەمە، بەلاّم باشە ئەی ئەگەر مرۆڤ لەشوێنێكدابوو، كەكامێرای چاودێری ئاگای لێ نەبوو. ئەی ئەگەر ئەوكارە نەشیاوە لەیاسای ئەو وولاتەدا قەدەغەنەبوو (وەكو زینا، كاتێ هەردوولا ڕازین بەیەكەوە ئەوكارە بكەن) ئایا چی مرۆڤ دەگێڕێتەوە لەخراپە. لەوەی لەسنوری خۆی دەرچێ وبچێتە سنوری خەڵكیەوەو پێشێلی مافی گیانو ماڵی خەڵكی بكات؟! ئەوە تەنهاو تەنها بریتی یە لەبڕوابوون بەچاودێری خوایی بەسەریەوە، كەقورئان دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ ﴾الحديد:٤. یان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ النساء: ١.

بەڵێ لەهەرجێگایەكدابی، پەروەردگار ئاگای لێتە. چاوی لێتە، لەگەڵتایە، ئەتبینێ چاودێرە بەسەرتەوە. لەهەرجێگایەكدابی، شەوبێ یان ڕۆژ، بەتەنهابی یان لەناوخەڵكی دا، خوای گەورە ئاگادارە پێت.. بەڵێ سوێند بەخوا مرۆڤ تەنها بەم ئیمانە، كەبەڕاستی دروست بونی ئەم یەقینە كەخوا چاودێرە بەسەرتەوەو تەنها لەشەرمی خوا، مرۆڤ لەخراپە گەڕایەوە، بەبێ ئەوەی شەرم لەكەس بكا، لەكەس بترسێ، كەس چاوی لێ ی بێ، ئەوە ئەم بڕوایە جەوهەرو كاكڵەی ئیمانداری وموسڵمانیەتیە. سەیرێكی خۆت بكە ئەگەر نەگەیشتبویە ئەوئاستە، ئەوە بەخۆتدا بچۆرەوەو ئیمانەكەت تازەبكەوەو وانەی عەقیدە بخوێنەوە. بەڵێ مرۆڤ تەنها بەم ئیمانە دەبێ بەمرۆڤی ڕاستەقینەو لەدڕندایەتی وچنگ بەخوێنی وحەرام خۆری ڕزگاری دەبێ.. جائەم بڕوایە پەیوەندی بەخوێندەواری ونەخوێندەواری یەوە نی یە. پەیوەندی

بەوەوە نی یە کەسێکی ناوداره یان نەناسراوە، پەیوەندی بەوەوە نی یە شارنشـینه یان بیابان نشین، لەناو زانکۆو ناوەندی زانستی ومەعریفی دایە، یان لەناودەشـتو دەری چۆڵو لای ئاژەڵ ومەڕو ماڵاتە. هەروەکو ئەم بەسـەرهاتە: جارێکیان (عَبْدُالله) ی کوڕی ئیمامی عومەر، ڕۆیشت بەلای کوڕێکی گەنجدا کەشـوانی کۆمەڵێ مەڕو بزن بوو. وویستی ئەم شـوانه بدوێنێ وهەندێ قسـەی لەگەڵ بکاو هەم دڵی خۆش بکاو هەم هەڵیشی بسەنگێنێ، سەلامی لێ کردو دوعای بەخێری بۆکردو فەرمووی: کـوڕی گەنج وباش. ئەتوانـی بەرخۆڵەیەك، کاوڕێکـم لەومەڕانه پێ بفرۆشـێ. بۆخۆم وهاوەڵەکانم لەم دەشت ودەرەدا دەیخۆین ودەیکەین بەسـەیران؟! شوانه ووتی: نەخێر ناتوانم پێت بفرۆشم. ئیبن عومەر فەرمـوی: بۆچـی؟! ووتی: چونکە من تەنها شـوانم وبەکرێ شـوانی بۆخاوەنـی ئەم ڕانه مەڕە دەکەم ومافی ئەوەم نی‌یە، لێی بفرۆشـم! ئیبـن عومەر فەرمووی: دەی هەر زۆرچاکتر، خۆتۆ پێویسـتیت بەپارە هەیـە، جلوبەرگێ، جوتە پێلاوێ، پێداویسـتی یەکی خۆتی پێ دابین بکەی. وەرە پێمان بفرۆشەو پارەکەی بۆخۆت هەڵگرە! شوانەکە ووتی: ئەی باشـە چی بەخاوەنەکـەی بڵێم؟! ئیبن عومـەر فەرمووی: پێ ی بڵێ، گورگ خواردی، یان بزر بوو نەم دۆزیەوە، بەفێڵێك پەردە پۆشی بکە. شـوانەکە ووتی: خۆبەخوا ئەگەر بڵێـم گورگ خواردویەتی، یان لێـم بزر بـووە، بڕوام پـێ دەکات ودڵنیایە لێم، بەخوا پێویستیشـم بەپارەکە هەیە. بەڵام باشە ئەگەر خاوەنەکەشی ئاگای لێ نەبێ وترسی ئەویشـم لەسـەرنەبێ. ئەی: (فَأَيْنَ الله) ئەی خوا. ئایا خواش ئاگای لێ نی‌یـە؟! نەخێر من ئەمینداری خاوەنی ئەم ڕانه مەڕەم وخوای گەورە چاودێرە بەسـەرمەوە، ئیتر چۆن بتوانم خیانەتی لێ بکەم؟!! ئەمجا (عَبْدُالله) ی کوڕی ئیمامی عومەر، باوەشـی بەشـوانەکەدا کردو ماچی

کــردو خۆی پێ ناســاندو ئافەرینی لێ کــردو داوای دوعای بەخێری لێ کــرد. وەبۆ خاوەنی مەڕو ماڵاتەکەشــی گێڕایــەوەو ئەوەندەی تر ئــەم گەنجە شــوانە، بوە جێگای متمانەو ڕێز، لــەلای هەموو خەڵکی. بەڵێ ئەم شــوانە جەوهەری دینی ئیســلامی ناسی بوو، کەبریتی بوو لەیەقیــن بەچاودێری خوا بەســەر مرۆڤــەوە، هەرچەندە ئەم گەنجە شوانە خوێندەواریش نەبوو. لەناو ئاوەدانیشدا، لەناوشاریشدا نەدەژیا. جائەمە شــوانێکە کە بەبەرهەمی ئەم ئیســلام وئیمانە مرۆڤێکی ئاوا پــاکو ئەمینی لێ دەردەچێ، کەکۆمەڵگا لەدەســتی ئەمینەو دەســتی خێری هەیە. ئای ئەمڕۆ مرۆڤایەتی وکۆمەڵگای بەشــەری خوا چەندە پێویســتیان بەخەڵکانێك هەیە کە وەکو ئەم شــوانە وابن، ئاوا ئیمان بەچاودێری لەکردەوەکانیاندا ڕەنگ بداتەوە! بۆیە ئەوەی ئیمان بەخوا لەناومرۆڤدا دروســتی دەکات بەهیچ دام ودەزگایەك ناکرێ. نەزانستی ومەعریفی، نەئاســایش وپۆلیس، هۆ هی واهەیــە لەوژورەدا کەتێ ی دانیشتوە، کتێبخانەکەی هەرچوار دیواری ژورەکەی داپۆشیوە. کەچاوت پــێ ی دەکــەوێ، دەڵێ ی ئەمە چ گــەورە زانایەکە، کەچی لەگەڵ ئەو هەموو زانستەدا، لەگەڵ ئەو هەموو بڕوانامە باڵایەدا، هەندێ جار ئەم کەســانە کاری وادەکەن مرۆڤ شــەرم دەکات باسی بکات. هی واهەبوە لەگەڵ ڕێزمدا بۆئەهلی ئەو پیشەیە. کۆلێجی پزیشکی بەشی دەرمانسازی (صەیدەلانی) تەواوکردوە. سوێندی خواردوە لەکاتی تەخەڕوجەکەیدا، کەهەرگیز غەش وخیانەت لەپیشــەکەیدا نەکات، کەچی کاتێ کەسێکی بەسیما هەژارو لەخەڵکی لادێ چوو. چۆتە دەرمانخانەکەی مەڵحەمێك کەبایەی (١٠٠٠) دیناری چاپەو هیچ نرخێکی وای نی یە. بەسەرچوەو (EXP)یــەر بوە. ئەم دکتۆرە صەیدەلانیــە داویەتی بەم داماوەو پێ ی فرۆشــتوە، وای زانیــوە هیــچ نازانێ ونازانــێ بەرواری بەســەرچون

بخوێنێتەوە! دەی بەخوا ئەو هەموو زانستەو پسپۆریە، چونکە ئیمانی بەچاودێــری خوایی لەگەڵدا نــی یە. نەك نەبــوە بەخێرو بەرەکەت ورەحمەت بۆمیللەت، بوو بەمایەی شەڕو نەگبەتیو زەحمەت بۆخۆی، بۆ گەل ومیللەت، بۆ هاوپیشــەکانی، کەبەهۆی کاری نەشــیاوی ئەوەوە دەبنە جێگای سەرنج ورەخنە لێگرتن وبەچاوی خراپ تێڕوانین.

بەڵێ ئیمانداران تەنها ئەم دەرمانەیە، کەشــیفای گرفتو نەخۆشی وناخۆشی یەکانی ســەرزەوی دەکات. کەدەرمانی (بڕوابون بەچاودێری خوا بەســەر مرۆڤەوە). (إِنَّ اللهَ كانَ عَلَيْكُــمْ رَقيباً) ئەگەر ئەم چاودێریە نەبێ، کێ هەیە بتوانێ هەموو ساتو کاتێك چاودێری ئەو هەویرشێلەو نانەوایە بکات کەخەڵکی نانی دەستی دەخۆن. خۆ ئەگەر ووتت حکومەت وچاودێری تەندروستی. دەڵێین: باشە واچاودێریان کرد لەوەدا کەئاردی کــۆن وخراپ بــوو بەکارنەهێنێ. وەنانەواکەی پاك بــێ، بەڵام توخوا هیــچ دەزگایەکی حکومی وچاودێری تەندروســتی دەتوانێ چاودێربێ بەسەر ئەو نانەوایەوە، کەئەگەر چوو بۆسەرئاو ودەستی بەئاوگەیاندن وهاتەوە بۆســەر ئیشەکەی ودەستی خستەوە هەویرەکەوە دەستی پاك وخاوێن بەسابون شتبێ. ئەمجا دەست لەهەویرو نانەکە بدات؟! چونکە ئەگەر لەســەرئاوەوە هاتەوە ناوهەویرەکەو دەستی نەشۆرد، بەهەزاران ڤایرۆس ومیکرۆبــی ئەوەندە وورد کەبەچاونابینرێن، دەچنە هەویرو نانەکەوەو ئەو خەڵکە دەیخواو کەتوشــی نەخۆشی دەبێ، هەست بەوە ناکاو گومانی بۆئەوە ناچێ کەلەنانی ئەو نانەوایەوە توشی بوبێ! ئایا غەیری ئیمــان بوون بەچاودێری ولێپرســینەوەی خوایی کەس هەیە بتوانــێ ئەم نانەوایە والــێ بکات کەبەپاکوخاوێنی دەســت لەهەویرو نانەکە بــدات؟! بێگومان نەخێر، خۆئەوەتا بەچاوی خۆمان دەیبینین کەحکومــەت وچاودێری تەندروســتی شــەوو ڕۆژ خەریکی چاودێری

چێشتخانەو دوکانو سـوپەرمارکێت وشوێنی خواردن فرۆشتن دەکەن. ئـەو هەمـوو غەرامەیە دەکـەن، مەطعـەم ودوکان دادەخەن. کەچی لەگەڵ ئەوەشـدا ڕۆژانە ئەو هەموو چێشـتخانەو کەبابخانەو دوکانی خواردەمەنی وسوپەرمارکێتە لەتەلەفیزیۆنەوە نیشان دەدرێن، کەچۆن بەوپیـس وپۆخڵی یەوە، بەخواردنی بەسـەرچووەوە، شـتیان بەکرێیار فرۆشتوەو بەوهەموو پیسی یەوە خواردنیان داوەتە خەڵکی، کەمرۆڤ وای لێ دێ نانی بازاڕی بەرچاودەکەوێ! تەنها لەساڵی (٢٠١١)دا، لەشاری سـلێمانی لەمـاوەی تەنها (١٠) مانگـدا، (٥٠) دوکان وسـوپەرمارکێت لەسەرفرۆشـتنی شـتی بەسـەرچوو (EXP)یەر داخراون، (٩٠) ملیۆن دینـاری چاپ غەرامەکـراون. (٢٥) کەس دراون بەدادگا. کەبەڕاسـتی شـتی کۆن وبەسـەرچوو فرۆشـتن، یانی ژەهر خواردنی خەڵك. بەڵام ترسناکتر لەوەی کەکەسێك بەئاشکرا ژەهر خواردوو کرابێ، لەبەرئەوەی ئەوکەسـەی کەزانی ژەهری خواردوە. بەپەلە هەوڵی چارەسەری خۆی دەداتوفریای خۆی دەکەوێ، بەڵام ئەوکەسـەی کەشـتی بەسـەرچووی خواردوە، لاشـەی پڕبـووە لەژەهرو هەرهەستیشـی بەخۆی نەکردوە. ئائەمەیە هۆکاری ئەوەی کەنەخۆشـی شێرپەنجە کەلەکوردستاندا زۆر دەگمەن بوو، ئاوا زۆربوەو یەکێ لەپزیشکەکانی پسپۆڕی ئەو نەخۆشی یە سـامناکە ووتی: ڕۆژ نیـیە کەکەسێك توشی سەرەطان (شێرپەنجە) نەبێ، خوای گەورە بمانپارێزێ. ئەمە هەمووی لەئەنجامی ئەو هەموو خواردنە بەسـەرچووەوە، کەدێتە لاشـەی ئەوخەڵکـەوە، کەبەداخەوە هەرچی کۆنەو گەندەوشتی بەسەرچووی ووڵاتانە دێتە ئەم کوردستانەی ئێمەوە لەڕێگەی بازرگانی بێ دین وخوانەناسەوە، کەبڕوای بەچاودێری خوا نیـیەو حکومەتیش ناتوانێ هەمووکات هەرچاودێربێ بەسەریەوە. تەنها لەساڵی (٢٠١١)دا. (٨٧٧) تەن خۆراکی بەسەرچوو، تەنها لەگومرگی

برایم خەلیلەوە، دەستی بەسەردا گیراوەو سوتێنراوە! ئەی باشە ئەوەی کەنەگیراوەو پێ ی نەزانراوەو بەفرتو فێڵ هێنراوەتە کوردســـتانەوە، دەبێ چەند بووبێ؟!!!

بەڵام بەخوا ئەوکەسەی ئیمانی بەچاودێری پەروەردگاری هەبوو، بەبێ چاودێری مرۆڤو کامێرای چاودێری، خۆی پابەند دەبێ بەوەی کەهیچ غەشو خیانەتێك نەکات. ئەم ئیمانە موعجیزە لەمرۆڤدا دروستدەکات.. دکتۆر (محمد راتب النابُلُسی) دەفەرموێ: کەسێکی موسڵمان لەفەرمانگەیەکدا، وەکو پیشەیەك دادەمەزرێ، پیشەی پاککردنەوەی فەرمانگەکە، یان باخەوانیو ئەو کارانە، ئەم پیاوە موسڵمانە، فەرمانگەکەیان لەتەنیش مزگەوتێکەوە دەبێت. پرس بەلێپرسراوەکەی دەکات کەبچێ بۆنوێژی نیوەڕۆ بۆجەماعەت بۆئەو مزگەوتە، ئەویش دەڵێ: زۆر ئاسایی یە، بچۆ نوێژەکەت لەمزگەوت بەجەماعەت بکە، چونکە کارەکەی تۆ لەوکاتەدا پەکی ناکەوێ ودواتریش دەکرێ. ئەم پیاوە کەدەچێتە مزگەوتەکە تەماشا دەکات لەدوای نوێژی نیوەڕۆ، ماوەی چەند دەقیقەیەك ئیمامی مزگەوتەکە هەندێ ئامۆژگاری موسڵمانان دەکات وقورئان وحەدیسی پێغەمبەریان بۆدەگێڕێتەوە. ئەمیش زۆری پێ خۆش دەبێ وئەو چەند دەقیقەیەش دەمێنێتەوە، ئەمجا دێتەوە بۆسەر کارەکەی. پاش ماوەیەك، چەند مانگێك، ڕۆژێك بەڕێوەبەری ئەو دائیرەو فەرمانگەیە بانگی ئەوکرێکارە دەکات وپێ ی دەڵێ، وەکو یاسای فەرمانگەکەمان، لەبەرئەوەی کەتۆ لەوهەموو ماوەی کارکردنەدا هیچ غیاب ونەهاتن ودیارنەبونت نەبوە، وەداوای مۆڵەت (إجازە)ت، نەکردوە، ماوەی (٦) ڕۆژ مۆڵەتت بۆنوسراوەو برۆ بۆخۆت ئەم پشووە وەرگرە. ئەویش زۆر سوپاسی دەکات ودوای دەوامی ئەو ڕۆژە دەڕواتەوە بۆماڵەوە. بەڵام بۆبەیانی دێتەوە بۆدائیرە، سەرۆکی

فەرمانگەکە دەڵێ: ئەوە چۆنە هاتویتەوە، خۆتۆ تاشەش ڕۆژی تر مۆڵەتت دراوەتێ؟! کرێکارەکە لەوەڵامدا دەڵێ: بەڵێ من تێگەیشتبوم لەمۆڵەتەکەم. بەڵام ئاخر من ماوەیەکی زۆرە بۆنوێژی نیوەڕۆ دەچمە ئەو مزگەوتە! سەرۆکی فەرمانگەکە دەڵێ: بەڵام ئەوە خۆمان ڕێگەمان پێداوی وپاشان هیچ کارەکەت کەم وکوڕی پێوە نەبوە بەهۆی ئەو نوێژەوە، وەئیشی خۆتت کردوە. کرێکارەکە دەڵێ: بەڵام بەڕێز جەنابت تەنها بۆ نوێژی جەماعەتەکە مۆڵەتت دام، بەڵام من لەدوای نوێژەکە ماوەی چەند دەقیقەیەك لەمزگەوت دەمامەوەو گوێم لەئیمامی مزگەوتەکە دەگرت کەحەدیسی بۆخەڵکی دەخوێندەوە، زۆر تامەزرۆی بیستنی بوم وئەو چەند دەقیقەیە لەوەی تۆ مۆڵەتت پێ دابوم، مامەوە، کەبەڕاستی ئەوە هەرگیز بوو لەدڵما. ئێستا باشترین هەلم دەست کەوتوە، کەئەم شەش ڕۆژە مۆڵەتە ڕەسمیەی پێم دراوە، بێمەوە لەدائیرە کاربکەم وتۆڵەی ئەو هەموو دەقیقانە بکەمەوە کەلەمزگەوت بۆگوێ گرتن لەحەدیس ماومەتەوەو کاتی دەوامی ڕەسمیم بەجێ هێشتوە!!. سەرۆکی فەرمانگەکە کەئەوە دەبیستێ، سەرسام دەبێ، ئەم مرۆڤە کرێکارە. بەموچەیەکی کەم وکارێکی زۆر، بەبێ ئەوەی کەس ئاگای لێ بوبێ، لەمەجلیسی خێردا دانیشتوە، کاریگەری بۆسەر کارەکەشی نەبوە، کەچی هێشتا خۆی بەتاوانبار دەزانێ ودەیەوێ قەرەبوی بکاتەوە!! تەنهاو تەنها لەبەرئەوەی دەزانێ و یەقینی هەیە کەخوا چاوی لێ یەتی ولێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات!! بۆیە بەکرێکارەکە دەڵێ: من تائێستا کەسێکی دوورلەخوا بوم وڕوم نەکردۆتە مزگەوت وزۆر بڕوام بەئاین نەبوەو تەنها وامزانیوە کەدین شتێکی تایبەتی نێوان مرۆڤ وپەروەردگاریەتی وهەندێ دروشمەو ئیتر کاری نیە بەسەر ژیانی ڕۆژانەو ناوفەرمانگەو ئەمانەوە، بەڵام ئێستا دەزانم

کەدین چەند گرنگەو چۆن مرۆڤی صالّح دروستدەکات. خۆتۆی بەڕێز هیچ کەس ئاگای لێت نەبوە، هیچ کەسیش لیَ ی نەدەپرسیەوە، کەچی خۆت لێپرسینەوە لەگەڵ خۆت دەکەی، چونکە دەزانی کەخوا لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکات وئەو شەش ڕۆژ مۆڵەتەی خۆت، لەجیاتی بڕۆی بۆسەفەرو سەیران وسەردان، دێیتەوە بۆ دائیرەو لەجیاتی ئەو چەند دەقیقەیەی مزگەوت دای دەنێیتەوە، بەڕاستی ئەو دینە حەقەو وامنیش بڕیارمدا لەم ساتەوە پابەندبم بەئیسلامەوەو نوێژ بکەمو ئەگەر هەموو ڕۆژێکیش بۆم نەکرێ بێم بۆمزگەوت بۆگوێ گرتن لەدەرسی ئەو مامۆستایە، ئەوا (إنْشاءالله) هەموو ڕۆژانی هەینی لەگەڵ تۆ دێمە ئەو مزگەوتەو بالەوخێرو بەرەکەتە بێ بەش نەبم!!

دەی توخوا ئیمانداران، ئەهلی مزگەوت وجومعەو جەماعەت، باناوا خواپەرستی بکەین وئاوا ببین بەبانگخواز بۆئەم دینە. بەڵێ هەرچەندە نەخوێندەواربی، هیچ شارەزاییت لەدیندا نەبێ هیچ قسەیەکت پێ نەکرێ، دەتوانی باشترینو گەورەترین بانگخوازبیتو خەڵکی بانگ بکەی بۆلای خوای گەورەو پەیامە پڕ ڕەحمەتەکەی ئیسلام. ئەویش بەڕەفتاری جوانت. ئەمانەت پارێزیت. کاری پاکوخاوێنت. ڕاستگۆییت. ئای چەندە پێویستیمان بەم جۆرە کەسە پاك وبەڕێزو دیندارانە هەیە.

بەڵێ بڕوابون بەچاودێری خوا مرۆڤ والێ دەکات کەلەخۆی بپرسێتەوە، بێ ئەوەی کەس لیَ ی بپرسێتەوە، خۆی لەخۆی دەپرسێتەوە. حەزرەتی عومەر دەیفەرموو: (حاسِبُوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُحاسَبُوا). هەزاران ڕەحمەت لەفەقیهو فاروقی ئیسلام عومەری کوڕی خەطاب، کەبەڕاستی جوانی فەرمووە، هەرکەسێ خۆی لەخۆی نەپرسێتەوەو موحاسەبەی خۆی نەکات، ڕۆژێك دادێ کەلیَ ی دەپرسرێتەوە. جاری واهەیە لەدنیادا پێش قیامەت توشی لێپرسینەوە دەبێت. جاری واش هەیە خوای گەورە بۆی

هەڵدەگرێت بۆقیامەت، بەڵێ هەرکەسێ خۆی لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی نەکات وچاودێری خوا بەسەریەوە نەبینێ، دڵنیابن هەرگیز نابێتە مرۆڤێکی صاڵح ورێکوپێك، چونکە مرۆڤ ئەگەر بڕوای بەچاودێری خوا بەسەریەوە نەبوو. وەخۆی موحاسەبەو لێپرسینەوەی لەگەڵ خۆی نەکرد، ئەوە هەرئەوەندە کەزانی چاودێری حکومەتو پۆلیسو ئاسایشو کامێرای چاودێری بەسەرەوە نىیەو کەس ئاگای لێ نیە. یەکسەر لەپەت ئەترازێو دەبێتەوە بەدڕندەکەی جاران، جابەڕاستی مرۆڤی ڕاستەقینە کەشایەنی ئاوەدان کردنەوەی سەرزەوىو جێنشینی خوای پەروەردگاربێ لەسەر زەوی، ئەو کەسەیە کەکاتێ کەس چاوی لێ نیە. خراپە ناکات، تاوان ئەنجام نادات، دەست بۆ ماڵی کەس نابات، داوێن پیسی ناکات، چونکە شەرم لەخوا دەکات، شەرم لەو فریشتانە دەکات کەهاوەڵنىو لێی جیانابنەوە. ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ كِرَامًا كَٰتِبِينَ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴾الإنفطار: ١٠ - ١٢، شەرم لەخۆی دەکات، چونکە خۆی لەلا بەڕێزە، شەرم لەویژدانی زیندووی دەکات، کەلەناخەوە هاوارىو لێدەکاتو دەڵێ، نەکەی ئەوکارە ناشەرعىو حەرامو نابەجێیە بکەی. بەڵێ ئەمە مرۆڤی ڕاستەقینەیە، ئەینا مرۆڤێك. هەرترسی موحاسەبەی حکومەتو بەرپرسی دائیرەو غەرامەو چاوی خەڵكو شەرم لەخەڵك، لەخراپە بیگێڕێتەوە، ئەوە هەردڕندەیە، هەرچنگ بەخوێنە هەرحەرام خۆرە. بەڵام بەستراوەتەوەو مەجالی نیە پەلامار بدات. خۆکەئەمانەی لەسەر نەماوە وەکو جاران دەست پێ دەکاتەوەو ئەوەی ناخی بۆگەنی دەکات بەواقیع. مرۆڤی گەورەو ڕێزدار ئەوکەسەیە کەئەوەندە کردەوەی جوانی کردوە، لەناوخەڵکا لەدنیادا بەڕێزە، لەلای فریشتەکان بەڕێزە، لەلای ئیمانداران بەڕێزە، لەڕۆژی قیامەتیشدا هەربەڕێزە کاتێ کەخەڵکی لەئەوپەڕی نارەحەتیدان، ئەم کەسانە لەژێرسێبەری عەرشی

خوادان. لەورۆژەدا کەهیچ سایەو سێبەرێك نییە، سایەو سێبەرو پەنای پەروەردگاری نەبێ، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی پێ کردوە لەفەرمودەیەکی گەوهەرینی دا، (سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمْ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لا ظل إلاّ ظِلُّهُ). سرو نهێنی گەورەیی وڕێزداری ئەم مرۆڤانە لەدنیاو قیامەتدا، لەلای خواو لەلای خەڵك ئەوەیە کە: ئەمانە لەوکاتەدا کەکەس چاوی لێیان نەبوە، وەدەسەڵاتیان هەبوە، توانایان هەبوە، لەبەرخوا وازیان لەخراپە هێناوە، تەنها ئیمان بەچاودێری خوا کردونی بەمرۆڤی چاك وپاك. نەك ترسی هیچ شتێکی تری دونیایی. جالەو کەسانە (إمامٌ عادِلٌ) سەرکردەو پێشەوای دادگەرو دادپەروەر، کەهێزی هەبوو، دەسەڵاتی هەبوو، پارەی هەبوو، سەدان چەکداری تێڵاوەشێنی لەبەردەستدابوو. بەئارەزووی خۆی دەیتوانی زوڵم بکات. بەڵام نەیکرد. نەك هەرزوڵمی نەکرد، بەڵکو دادگەریو دادپەروەری بڵاوکردەوەو ڕەگی زوڵم وستەمی هەڵکەند. بەڵێ ئەوە گەورەیی یە کەستەمت پێ بکرێ، بەڵام تۆ عەدالەت بەرپابکەی. نەك لەبێ دەسەڵاتیو لاوازیو بێ کەسیدا پیاوی چاك بی.. یاخود (وشابٌ نَشَأَ فِي عِبادَةِ اللهِ).. کەبەڕاستی تەمەنی لاویەتی وگەنجیەتی هەمووی پڕە لەئارەزوو، لەهەڵپە. بڕێك لەشێتی تێدایە. لەکۆندا ووتراوە، تەمەنی گەنجیەتی بەشێکە لەشێتی، کەچی ئەم گەنجە لەگەڵ ئەو هەموو ئارەزوەی هەیەتی، ئەو هەموو چوست وچالاکی یەی هەیەتی، ئەو هەموو پێویستیەی هەیەتی. (سُبْحانَ الله)، تەنها بەهۆی ئیمان بەچاودێری خواوە. واز لەوخراپەیە دێنێ کەدێتە بەردەستیو یەخەی پێ دەگرێ، ئەو گەنجەی تەنها لەبەرخۆشەویستی خوا. نەك ناچێ بۆ نادیأو ڕێگای عارەق خانەو قورمارخانە پێ نازانێ، بەڵکو ڕێگای مزگەوتی گرتوەو خەڵکی بۆمزگەوت بانگ دەکات.. (نَشَأَ فِي عِبادَةِ اللهِ). نافەرموێ: (عَلى عِبادَهِ اللهِ). هەربە ڕواڵەت موسڵمان بێو

نوێژو ڕۆژوو بکات. نەخێر، لەناوەوەی، لەناخیدا بەندایەتی بۆخوا دەکات. (فِي عِبادَة اللهِ). کەتەماشای ئەوە ناکات کەس چاوی لێیەتی یان نا. چونکە دەزانێ (الله) چاودێرە بەسەریەوە..

وەپاشان یەکێکی تر لەوکەسانەی ڕێزداری دونیاو قیامەتن. وەلەژێر سێبەری خوای پەروەردگاران لەقیامەتدا. ئەوەندە لەخوا نزیکن، چونکە (لەژێرسێبەردا بوون) تەعبیرە لەئەوپەڕی نزیك بوون.. یەکێ لەوکەسانە. (ورَجُلٌ دَعَتْهُ إمْرَأَةٌ ذاتُ حُسْنٍ وجَمال، فَقالَ إنِّي أَخافُ الله). پیاوێکە، کوڕێکە، ئافرەتێك بانگی دەکات وداوای دەست تێکەڵ کردنی لێ دەکات. کەچی دەڵێ، من لەخوا دەترسم. جابەوردی سەرنجی ووشەکانی فەرمودەکە بدەن: دەفەرموێ: (دَعَتْهُ إمْرَأَةٌ) ئافرەتێك بانگی بکات!، کەئەمە ئەوپەڕی هەست جوڵانی تێدایە. چونکە پیاو زۆربەی کات بەدوای ئافرەتدا عەوداڵ دەبێت وداوای لێ دەکات. بەڵام ئافرەت خۆڕاگرترەو هەستی خۆی کەمتر دەردەبڕێ، کەچی لێرەدا ئافرەتەکە داوا لەپیاوەکە دەکات. کەبێت ناشەرعی لەگەڵ بکات. وەپاشان دەفەرموێ: (ذاتُ حُسْنٍ وجَمال) ئافرەتەکە لەئەوپەڕی شۆخ وشەنگی وجوانی دابوو. تەماشاکەن بەتەنها (حُسن) یان (جَمال)ی بەکارنەهێنا، بەڵکو بەیەکەوە (ذاتُ حُسْنٍ وجَمالٍ). لوتکەی جوانی لەوئافرەتەدا هەبوو. چونکە ڕەنگە هەبوبێ ئافرەتێك داوای ناشەرعی لەپیاوێك کردبێ، بەڵام چونکە ئافرەتەکە سیماو شێوەی ناشیرین بوەو سەرنج ڕاکێش نەبووە، پیاوەکە وەڵامی نەدابێتەوە. بەڵام لێرەدا وانی یە. ئافرەتەکە لەلوتکەی جوانی دایە.. ئالەم کاتەدا ئافرەتەکە بەوهەموو جوانی یەیەوە. خۆی داوای دەست تێکەڵی وپەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ ئەوپیاوە، ئەوکوڕە دەکات. ئەم پیاوە لەوەڵامدا دەڵێ: (إنِّي أَخافُ الله). من بەڕاستی لەخوا دەترسم. واتە لەوکاتەدا هیچ مانیعو ڕێگرێك لەئارادا نەبوە، نەترسی چاوی

کەس، نەترسی حکومەت وياسا، نەترسی کەسوکار، نەترسی تووش بون بەئایدز (چونکە هەبوە چۆتە دەرەوەی وولآت. بەڵام زینای نەکردووە، ئەگەرچی هاتۆتە بەردەستیشی، بەڵام بۆنەیکردوە؟! لەترسی توش بوون بەئایدز، وتویەتی نەوەکو ئەو ئافرەتە ئایدزاوی بێ)!! بەڵام ئەم مەردو قارەمانەی پێغەمبەر (ﷺ) باسی دەکات، ترسی هیچ شتێکی لەمانە نەبوە، تەنها (إِنِّي أَخافُ الله) ڕێگربوە لەبەردەم خراپەکاریەکەداو دەستی بەدەستی ئەو ئافرەتە نەکەوتوەو وازی لێ هێناوەو بەجێ هێشتوەو ئاوڕی لێ نەداوەتەوە!.. کەسوپاس بۆخوا لەم سەردەمەدا، لەم سەدەی بیست ویەك جیهان گیریەدا. کەبەڕاستی فەسادو خراپەکاری سەدان ڕێگای بۆکراوەتەوە، گەنجی خواناسی وامان هەیە لەکوڕانأو کچان، لەزانکۆکان وپەیمانگاو ئامادەییەکان، لەناو دوکان وبازاڕەکان، لەناو تەکسیو پاصەکان، کەڕۆژانە ئەگەر مەیل بکەن خراپەکاری وفەسادو بێ ڕەوشتی، لەزیناو پێشەکیەکان یەخەیان پێ دەگرێ. لەکەسیش ناترسن، بەڵام ئەوەندە گەورەن ئاوڕیشی لێ نادەنەوە، پاڵی پێوەدەنێن. دەستیان بەدەستی نامەحرەم ناکەوێ، لەکاتێکا ترسیان لەکەس نی‌یە، چاوی کەسیان لەسەر نی‌یە، شەرم لەکەس ناکەن. تەنها دەڵێن: (إِنِّي أَخافُ الله).. ئەوئەنتەرنێتەی لەبەردەستایە، کەچی شتێکی ناشەرعی تەماشا ناکات، ئەوکەناڵە سەتەلایتەی لەبەردەستەو ئەوژورەی تێدایە دەرگای داخراوە، پەردەی پەنجەرەی داداوەتەوە، کەس ئاگای لێ ی نی یە، ئارەزووشی لەلوتکەدایە، کەچی ئیمانی بەچاودێری خواو شەرم لەخواو شەرم لەفریشتەکان ولەنەفسی عەزیزی خۆی، ڕێگەی پێنادات، بیخاتە سەرکەناڵێکی ناشەرعی بەڕاستی ئەوانە مرۆڤی گەورەو ڕێزدارن و وولآت ومیللەت بەئەوانەوە جوانەو سەربەرزە.

بەڵێ ئیمانداران: مرۆڤ بەبڕوابوون بەم چاودێریە خوایی‌یە، دەبێت

بەكەسێكی چاكو پاك وخێرخواز. بەبێ ئەوەی چەند دام ودەزگا پێوەی خەریك بن. ئەوەتا ئەو هەموو دەزگای پۆلیسو ئاسایشە هەربۆ بەرەو ڕووبونەوەی كەسانی خراپەكارە. ئەینا خۆمرۆڤی ئیماندار پێویستی بەچاودێری ئەوانە نیە، چونكە ئیمانی بەچاودێری خوا هەیە. یان هەڵە ناكات. یان ئەگەر هەڵەی كرد، سنوور نابەزێنێ وناگاتە گوناهە گەورەكان، لەسەر دەمەقاڵێك، مرۆڤێك ناكوژێ، ئەوپەڕی دووقسەی ناشیرین دەكات، دوایی هەرخۆی پەشیمان دەبێتەوەو خۆی بەخۆی دەڵێ ئەوە لەمن نەدەوەشایەوە كەزمانم جوێنی پێ بوترێ. وەبۆلابردنی تاوانەكەی تانەیگەیەنێتە قیامەت، دەچێ داوای گەردن ئازایی لەبەرامبەرەكەی دەكات وكێشەكە كۆتایی پێ دێت. بەڵام دوور لەدینەكە لەسەر ڕاگرتنی سەیارەیەك لەبەردەم دوكانێكداو دروست بوونی دەمەقاڵێەكی بچوكدا، چەند كەس دەكوژێ وكوێرانە دەستڕێژی گوللە بەناوخەڵكا دەكات، یان مرۆڤی دوور لەدینو پەیامی خوا، ئەگەر بۆی هەڵكەوێ هەموو سامانی ئەو خەڵكە دەخوات، بەڵام با بۆ بەرەكەتی دڵو دەرونمان بۆڕۆشنتربونی بەرچاومان بابچینە خزمەت ئەم چەند پیاوباش وزانایەی ئیسلام.

یەكەم: مامۆستا سەعیدی نورسی دەفەرموێ: كەسێكی گوناهباری وەكو من، بەوەلیەكی پیاوچاك دەزانن‌و دیاریم بۆدێنن. جائەگەر پەنابەخوا من لەوباوەڕەدابم كەوەلی خودام. ئەوا نیشانەی لەخۆبایی بوونە، خۆئەگەر باوەڕیشم بەوە نەبێت وەلی خوام، وەرگرتنی ئەوماڵە بۆمن دروست نی یە. چونكە خەڵك لەبەرخوا بۆم دێنن!!.

دووەم: لەشێخ حەسەنی بەصریان پرسی: بۆچی پێش ئەوەی قسەبكەیت تۆزێ دەوەستیت؟ فەرموی: چونكە یەكەم جار قسەكە لەمێشكمدا وەزن دەكەم بزانم ئەخرێتە لای كام تەرازووم (خێر یان

شەڕ) ئینجا ئەگەر قسەکە خێربوو دەیکەم. ئەینا وازی لێ دێنم وزمانم دەپارێزم.

سێ یەم: ڕۆژێك کەسێك هات بۆخزمەتی ئیمام (ئەبوحەنیفە) ووتی: من تەنها (پێنج) دیرهەم وەردەگرم لەوکەسەی کەئیشی بۆ دەکەمو وەکو کرێ دەمداتێ. بەڵام ئەی ئیمام هەرچەند دەکەم بەشم ناکاتو لەسەری قەرزار دەبمەوە! هاتومە خزمەت جەنابت بزانم چی بکەم. ئیمام ئەبوحەنیفە فەرموی: هەرلەسەر ئەو ئیشەی خۆت بەردەوام بە. بەڵام بەخاوەن کارەکەت بڵێ: باکرێیەکەت بۆبکات بە (چوار) دیرهەم!! کابرای کرێکار ئەوەندە متمانەی بەقسەی ئیمام ئەبوحەنیفە هەبوو. نەیووت: ئاخر قوربان خۆتۆ لێت کەم کردەوە. من پێنج دیرهەم بەشم ناکات. ئیتر چۆن چوار دیرهەم بەشم دەکات! بۆیە بێ دوودڵی یەکسەر ڕۆیشت بۆلای خاوەن کارەکەیو ووتی: پرسێکی ئاوام بەئیمام ئەبوحەنیفە کردوەو ئەویش فەرمویەتی، باکرێیەکەت بۆ بکات بە (چوار) دیرهەم. لەمەودوا چوار دیرهەمم بدەیە. کابرای خاوەن کار ووتی: بۆمن قازانجەو کەیفی خۆتە، ئیتر بۆی کرد بەچوار دیرهەم!، پاش ماوەیەك جارێکی تر کابرا هاتەوە لای ئیمامو ووتی: قوربان بەخوا هەربەشم ناکات وبەڵکو بفەرموی بۆم زیادبکات. ئیمام ئەبوحەنیفە فەرموی: ئەمجارەیان برۆ بەخاوەن کارەکەت بڵێ بابۆت بکات بە (سێ) دیرهەم. ئەویش بۆی کرد بەسێ دیرهەم. پاش ماوەیەك کابرای کرێکار هاتەوە خزمەت ئیمام ئەبوحەنیفەو، ئیمام فەرموی: ئێستا وەزعت چۆنەو گوزەرانی ژیانت چۆنە؟! کابرا ووتی: سوپاس بۆخوا حەساومەتەوەو ئێستا بۆخۆشم نازانم چۆن وابەباشی دەژیم. چەند خەرج دەکەم پارەکەم هەربەرەکەتی تێدایەو نابڕێ، جاران جاروبار نەخۆشی ودکتۆرو دەرمانمان دەبوو. ئێستا لەخوا بەزیادبێ ئەوەشم

لەکۆڵ بۆتەوە. بەڵام بەخوا ئەی پێشەوای موسڵمانان، من لەنهێنی ئەوە لە (پێنج) دیرهەمەوە بۆبکات بە (حەوت) دیرهەم. کەچی تۆ کەمت کردەوەو ئێستا بەو (سێ) دیرهەمە ژیان وگوزەرانم باش بووە!!
ئیمام ئەبوحەنیفە فەرموی: چونکە وادیاربوو ئەو ئیشەی تۆ بۆئەو خاوەن کارەت دەکرد، حەقەکەت تەنها بایی (سێ) دیرهەم دەبوو. ئەو دوو دیرهەمە حەقی تۆ نەبوو، بەزیادەوە وەرت دەگرت. جائەو (دوو) دیرهەمە حەرامە بەرەکەتی ئەو (سێ) دیرهەمە حەڵاڵەی بردبوو، بۆیە ئاوا گوزەرانت ناڕەحەت بوو!!.

خوای گەورەو میهرەبان لێت دەپاڕێینەوەو دەڵێین:

(اللّهُمَّ اغْنِنا بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ وَبِطاعَتِكَ عَنْ مَعْصِيَتِكَ، وَبِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِــواكَ) اللّهُمَّ آمين.

سەرچاوەکان:
١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.
٢. مَوْسُوعَة أَسْماءَ اللهُ الحُسْنَى. د.محمد راتب النابُلْسي ج٢ ص٨٠٥، ص٨٠٣.
٣. گۆڤاری چرای ڕوناکی، ژمارە: ٤١، لاپەڕە: ٦.

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِينَ:

بەڕێزان: ئیمان بەلێکدانەوەو تێگەیشــتنی سەلەفی صاڵح بریتیـیە لە:

١. بڕوای ناودڵ. کەئەو مرۆڤە لەناخیدا ئەو باوەڕو ئیمانە چەسپابێ‌و جێگیربووبــێ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: (أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيمانَ)..

٢. دوای ئــەوەی لەدڵــدا چەســپا. ئەمجــا زمانیــش دەری ببــڕێ، وەبەشــانازیەوە ئەوەی لەناودڵیایەتی بیڵێ. هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (مَنْ قالَ لا إِلهَ إلاّ الله دَخَلَ الجَنَّةَ). تەماشاکەن دەفەرموێ: (مَنْ قالَ) کەسێ بڵێ، واتە بەزمان دەری بڕیبێ.

٣. ئەوئیمانەی ناو دڵ‌و بەزمان ووتنە لەکردەوەکانیدا ڕەنگ بداتەوە. (ومِصْداقُــهُ العَمَــل). هەروەکو پێغەمبەری خــوا (ﷺ) لەفەرمودەیەکدا فەرمویەتــی: (إذا رَأَيْتُمُ الرَجُلَ يَعْتادُ المَسْــجِدَ فَاشْــهَدُوا لَــهُ بالإيمانِ). ئەگەر کەســێکتان بینــی زۆر هاتوچــۆی مزگەوتی دەکردو دڵی وابەســتەی مزگەوت‌و نوێژی جەماعەت بوو. ئەوە ئێوە شــایەتی ئیمانی بۆ بدەن. واتە: ئەم هاتوچۆکردنەی بەسەرماو بەگەرما، بەوتاریکی شەوە، بەوەی کەلەو جێگا گەرمەی بەوبەیانیە زووە، لەوکاتی خەو خۆشــیەدا دێتە دەرەوەو دەڕوات بۆمزگــەوت، ئەوە بەرهەمــی ئەوئیمانەی ناودڵیەتی وئەو شایەتمانەیە کەبەزمان دەری بڕیوە.

لێــرەوە تێ دەگەین کەئەگەر کەســێك لەناخی دڵەوە بڕوای بەتاکو تەنهایــی خــوا هەبــوو. وەیەقینی هەبــوو کەمحمــد (ﷺ) خاتەمی پێغەمبەرانەو پێغەمبەری تری لەدوانایەت. وەبڕوای بەقورئان هەبوو کەکەلامــی خوایە. وەبەهەشــتو دۆزەخ هەیە. بــڕوای تەواوی هەبوو کەنابێ ژیان هەرئەم چەند ڕۆژەی دونیابێ‌و حیسابو پاداشتو سزایەك

لەگۆڕێــدا نەبــێ، بەڵام ئامادە نەبــوو. ئەمــەی لەناخیایەتی بەزمان تەعبیــری لێ بکاو بەئاشــکرا شــایەتمان بێنێ، جایــان پێ ی عەیب بوو. وای زانی ئەوانەی دەوروبەری بەکۆنەپەرســتی دەزانن!! یان خۆی تەکەبوری هەبوو پێی عەیبە بوو لەبیروباوەڕی خۆی پاشگەزبێتەوەو بەئاشــکرا بڵــێ: خەڵکینە ئەوەی من چەندین ســاڵە لەســەری ژیاوم وخەڵکم بــۆ بانگ کــردوە، ڕێبازێکی هەڵەیەو گەیشــتومە قەناعەت ودڵنیایی تەواو کەخوا هەیە. پێغەمبەر هەیە. ئیســلام هەیە. قیامەت حەقــە.. ئەم هەموو حەقەی لەدڵدا چەســپابوو. بــەڵام بەزمان دەری نەبڕی. ئەوە بەئیماندار حساب ناکرێ. هەروەکو نمونەی (ئەبوطالب)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ). کەهیچ شــك وگومانــی لەتاك وتەنهایی خواو ڕاســتی پەیامی حەزرەتی محمد نەبوو. تەنانەت لەوپێناوەدا قوربانی گەورەشــی دا، لەگەمارۆی موسڵمانانیدا ئەویش لەشیوی (ئەبوطالب)دا، وەکو موســڵمانان ئازاری چەشت. وە باشــترین پشتیوان بۆپێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرلەمناڵیەوە، هەتابونە پێغەمبەری وپاشــان لەدوای بونە پێغەمبەریشی، ڕۆژێ لەڕۆژان نەك هەرقسەیەکی ڕەق وتاڵی بەرامبەر بەپێغەمبەری خوا نەووت، بەڵکو بەتەواوی مانا بەرگری وپشــتیوانی لێ کرد. کەچی کاتێ لەسەرەمەرگدابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر پێ ی فەرموو: مامەگیان بەزمانت بڵێ: (لا إلهَ إلاالله). بەڵکو بێیتە ناوڕیزی ئیماندارانەوەو بتوانم بەویســتی خوا لەقیامەتدا شــەفاعەتت بۆبکەم. بەڵام لەولاوە ســەرانی قوڕەیشــی بت پەرســتی مەککە لەدەوری بوون وپێیان ووت: ئەی ئەبوطالب نەکەی لەکۆتایی تەمەنتدا دەستبەرداری دینــی باوك وباپیرانتبی وبەقســەی محمدی بــرازات بکەی!. ئەوەبوو أبوطالب ووتی: لەسەردینی باوك وباپیرانم مامەوەو مردو ئیمانەکەی ناودڵی بەزمان دەرنەبڕی. لەبەرئەوە (پەنابەخوا) بەبێ ئیمانی مرد!..

وەئەگەر کەسێك بەزمان شایەتمان بێنێ وزیکرو تەسبیحاتیش بکات، نوێژیش بکات، جومعەو جەماعەتیش لەمزگەوت بکات، بەڵام لەناخەوە بڕوای بەڕاســتی ودروســتی ئەم پەیامی ئیســلامە نەبێت، هەرلەبەر بەرژەوەنــدی بەشــوێنی کەوتبێ، یان لەبەرئــەوەی لەدایك وباوکێکی موسڵمان لەدایکبوەو لەکۆمەڵگەیەکی موسڵماندا دەژی وئەگەر بەزمان بڵێ: من لەدڵەوە بڕوام بەڕاستی ئەم دینە نیەو بەڕاستی نازانم. ئەوە کێشــەی گەورەی بۆدروســت دەبێ ودەکەوێتە بەرقسەو دەنگ وباسی خەڵك. لەبەرئەوە تەنها بەزمان موســڵمان بوو. ئەوە ئەوکەسە لەکافر خراپترەو پێی دەوترێ (مُنافِق) دووڕوو. کەئەگەر لەناو موسڵماناندابێ، نوێــژ دەکات، زیکــر دەکات، دەڵێ ئیســلام چاکە، کەچــی ئەگەر بۆی ڕێبکــەوێ، لەگەڵ هاوبیرانی خۆیدا، لەماڵێك، لەجێگایەك کۆببێتەوەو ئەوانیــش وەکو ئەم وابن. ئەمجا دەکەوێتە ســەر هەڵڕشــتنی ئەوەی لەناخیایەتی لەپیســیو بۆگەنی. ئەم کەسانە پیسترین کەسن. چونکە بەدرێژایی مێژوو پێغەمبەرانو صالّحانو خواناســان، ئازاریان چەشتوە بەدەســتی ئەم جۆرە کەسانەوە، کەبەڕواڵەت لەگەڵ موسڵمانانە، بەڵام لەپشتەوە لەگەڵ بێ باوەڕانە. لەهەرجێگایەکی ئەم دنیایە موسڵمانێك ســەربکەوێ، کەسێکی کافر موســڵمان ببێ، ئەم لێرەوە پێی ناخۆشەو دەیــان ناووناتۆرەی بۆدروســت دەکات. نمونەی ئەو جۆرە کەســانەش وەکــو (عَبْدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی ســەلول) وای دەردەبڕی کەلەهەموو کەس زیاتر ئیماندارەو دڵســۆزی پێغەمبەری ئیسلامە. کەچی کەپشتی هەڵدەکــردو یەك دوو کەســی هاوبیری خۆی بۆهەڵدەکەوت، دەســتی دەکرد بەقســەوتن بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنانەت قورئان. لەچەند شوێنێکدا ئەو هەڵوێســتە نابەجێیانەی، ژەهراویانەی ئەو مونافیقەی تۆمــار کردوە، وەبەکافری مــردوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرچەندە

لەبەردڵی کوڕەکەی کەبەڕاســتی ئیمانداریکی ڕاســتەقینە بوو. جبەی موبارەکی خۆی بەخشــی کەبۆی بکەن بەکفن. وەنوێژیشی لەسەرکرد. کەچــی خوا فەرمــوی: ئەوە بەکافری مردوەو ئەگــەر حەفتا جاریش نوێژی لەســەربکەی ئەی محمد (ﷺ) خــوای گەورە هەرلێ ی خۆش نابــێ، لەبەرئــەوەی ئــەوەی بەزمان دەیگــوت، پێچەوانــەی ئەوەبوو کەلەدڵیــا بوو.. هەربۆیە ئیســلام نەك لەگەڵ بەزۆر موســڵمانکردنی کەسدا نی یە، بەڵکو ئەوپەڕی دژایەتی بەزۆر موسڵمان کردنی خەڵکی دەکات وبەئاشــکرا دەفەرموێ: (لا إِكْرَاهَ فِي الدِّين). وە ئیسلام بۆیە هاتوە کەلەزەلــکاوی کوفــرو بێ باوەڕیەوە، خەڵکی دەســت بگرێو دەربێنێ، نەك بەزۆرو زەبری شمشــێر خەڵکی موسڵمان بکاو ئەمجا ئەوکەسانە چونکــە بــەزۆر موســڵمان بونو لەناخــەوە بڕوایان پــێ نیە. ببنە موونافیــقو لەزەلــکاوی کوفرەوە بچنــە ناو زێرابــو پیســی نیفاقەوە! لەبەرئەوە لەئیســلامدا تەنها ئەو ئیمانداریو موســڵمانیەتیە بەکەڵك دێ، کەمرۆڤ لەناخی دڵەوە بڕوای پێ هێنابێو بەزمان دەری بڕیبێو بەکــردەوەش وەکــو ئەنجامدانــی عیبادەتەکانی وەکو نوێــژو ڕۆژوو زەکاتو حــەجو فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەو خۆپارێزی لەحەرام خۆریو خوێن ڕشــتنی خەڵکی، لەکردەوەکانــی دا ڕەنگبداتەوە. ئەینا تەنها بەنوسینی سەرناسنامە، کەدەنوسرێ، دینو بیرو باوەڕ: موسڵمان. بەڵام هیچ کردەوەیەکی ئەوکەسە موسڵمانانە نەبێ، ئەوە پێ ی ناوترێ ئیمانداری، مەگەر کەسێك لەناخی دڵەوە بڕوای بەدینی حەق وڕاستی ئیسلام هەیە. وەبەزمانیش وتویەتیو شایەتمانی هێناوە. بەڵام ناتوانێ بەکردەوە ئیســلامەتی ئەنجام بدات، چونکە لەناو کۆمەڵێ دژ بەدینی توندڕەودایــەو ئەگەر بزانن موســڵمان بووە، دەیکوژنو ماڵو ســامانی لەناودەبەنو ژنو منالی ســەرگەردان دەکەن. وەشــوێنێکیش نەبوو کە

کۆچــی بۆ بــکاتو لەپەنای دەســەڵاتدارێکدا بحەوێتــەوەو ئەمین بێ لەژینی خۆی. ئەوە هەتا خوای گەورە دەرگای ڕەحمەتی لێ دەکاتەوە، دەتوانــێ کردەوەکان ئەنجام نەداتو (إنْشـاءالله) ئەو ئیمانەی ناودڵیو ئەو شایەتمانەی سەرزمانی بۆقیامەتی سودی پێ دەگەیەنێ. هەروەکو بەســەرهاتی (نەجاشــی) پاشــای حەبەشــە کەلەدڵەوە ئیمانی هێناو بەزمانیش لەبەرخۆیەوە وتویەتی، بەڵام لەترسی دەستو پێوەندەکەی کەئەگەر بیانزانیایە موســڵمانە دەیانکوشــتو موســڵمانانیش کەلەوێ پەنادرا بوون، دەکەوتنە مەترســی یەوە. لەبەرئەوە هیچ کردەوەیەکی موســڵمانانەی لەعیبادەتەکان بۆئەنجام نەدرا. کەچی کەمردو هەواڵی گەیشــتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆشەویســت (ﷺ) فەرموی: هەڵسن بانوێــژی مردوو لەســەر براکەمان بکەین(نەجاشــی) کەلەحەبەشــە مردووە. دیارە نوێژی مردوش هەرلەسەر ئیماندار دەکرێ..

بەڵێ ئیمانداران: کاتێ دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆزو پڕبەرەکەتو ڕەحمەت، وەئەو ئایەتانە دەخوێنینەوە کەباســی ئیمان دەکەن. ئەوەی سەرنجمان ڕادەکێشێ ئەوەیەکە: لەقورئاندا خوای گەورە بەچەند کارو کردەوەی جیاواز باسی ئیمانداری بەحەق وڕاستەقینە دەکات، وەهەموو جارێ لەســەرەتای ئایەتەکەوە ووشەی (إنَّما) بەکاردێنێ کەبۆ (حەصر)ە. واتە لەمە دەرناچێ، جا لەنمونەی ئەوئایەتانە وەکو:

١. ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾ الحُجُرات: ١٥.

واتــە: بێگومــان ئیماندارانی ڕاســت ئەوانەن کەباوەڕیــان بەخواو پێغەمبــەری خــوا هێنــاوەو پاشــان نەکەوتونەتە هیــچ گومان ودوو دڵیەکــەوە، بەخۆیانو سەروماڵیشــیانەوە تێکۆشــاون لەپێناوی ئاینی خوادا، تەنها ئائەوانە ڕاستن وهەرئەوانە ڕاستگۆن لەئیمانداریدا.

بەڵام: کاتێ لەسـورەتی (الآنفال) دا. باسـی ئیمانو ڕەوشتی ئیماندار دەخوێنیتـەوە، دەبینـی حەصـری دەکات لەکۆمەڵـێ کارو کردەوەی تردا، کەلەسـورەتی (الحُجُرات)جیاوازن، دەبا بچینە خزمەت ئایەتەکەو سەرنجی بدەین. دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ الأنفال: ٢ - ٤.

واتە: بێگومان ئیماندارانی ڕاسـتەقینە ئەوانەن: (یەکەم): کەکاتێك ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت ودەهەژێت. (دووەم): کاتێکیش ئایـەت وفەرمانەکانی ئێمەیان بەسـەردا بخوێندرێتـەوە، ئەوە ئیمان وباوەڕیان زیاد دەکات. (سێ هەم): لەهەموو کارو بارێکیشیاندا، هەرپشت بەپەروەردگاری خۆیان دەبەسـتن. (چوارەم): ئەوانەن کەنوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن. (پێنجەم): هەندێك لەورزق وڕۆزیەی پێمانداون دەبەخشن وسەرفی دەکەن.. ئائەوانە هەرخۆیان ئیمانداری ڕاستەقینەن، چەندەها پلەوپایەی بەرزیان بۆهەیە لای پەروەردگاریانو لێخۆشبونو ڕزقو ڕۆزی هەمیشەیی لەگەڵ ڕێزدا..

ئیمانـداران: تەماشـاکەن ولەئایەتـەکان ووردببنەوە، لەسـورەتی (الحُجُرات)دا فەرموی: (أُولئِكَ هُمُ الصّادِقُون). لەسـورەتی (الآنفال) یشـدا دەفەرمـوێ: (أُولئِكَ هُمُ المُؤمِنُونَ حَقّاً). کەئەوەمان بۆدەردەخات، ئیماندار هەمـوی لەیەك ئاسـتدا نی یەو ئەگەر ئەم ڕەوشـت وئـاکارو کردارو گوفتارانـەی کەباسـکراون، تـێی دا نەیەتـەدی. ئەوە پـێی ناوترێ ئیمانداری ڕاستگۆ، یان ئیمانداری بەحەق.. وەلێرەدا پرسیارێك دروست دەبـێ، ئەویـش ئەوەیە: باشـە بۆچی هەرجـارەی بەهەندێ صیفات، ئیمانداری ڕاستگۆو بەحەق دیاری دەکات؟! لەوەڵامدا دەڵێین: ئەوەمان

تــێ دەگەیەنێ کەئیمــان بریتی یە لەهەڵوێســت نوانــدن. واتە، ئەو ئیمانەی کەلەدڵدا جێگیربوەو بەزمان ووتراوە، لەکردەوەی ئەو مرۆڤە ئیمانــدارەدا ڕەنگی داوەتــەوەو تێیدا بۆتە کردار، بــەڵام ئەوکردارانە لەوشــوێنەداو لەوکاتەدا کە پێویستە ئەنجام دەدات، کەپێویستن وکاتی ئەوکارەن. ئەوەتا:

١. لەکاتی هێرشــی کافراندا، جیهادی نەفس بکەی، نەك لەگۆشــەی مزگەوتــدا تەســبیحات بکەی. چونکــە لەوکاتەدا ئیمانــداری بەحەق ئەوەیە کەدیفاع وبەرگری لەئیسلام وموسڵمانان بکات.

٢. لەکاتــی هەرزانــی وخۆشــگوزەرانی دا، یادی خــواو جولانی دڵ لەخۆشەویستی خوادا (وجِلَتْ قُلُوبُهُمْ) نیشانەی ڕاستی ئیمانە. لەوکاتەدا کەهەمووشتێ لەبەردەستتە یادی خوابکەی.

٣. لەوکاتانەدا کەکێشەیەکی دنیایی هەیە، کەدەتوانی لەشەرع لادەی. کەچی واز لەتەماعو ماڵو ســامانە حەرامەکە دێنیو بەقســەی شەرع دەکەی. بەهەڵوێســتو مەوقیف دەیســەلمێنی کەئیمانداری بەحەقی. هەروەکــو دەفەرمــوێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾. النساء: ٦٥.

واتە: نەخێر ســوێند بەپەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێدەدەن) بــڕوا ناهێنن هەتا لەهەموو کێشــەیەکدا کــەڕوودەدا لەنێوانیاندا تۆ نەکــەن بــەدادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن. دوای ئــەوەش نابێت لەدڵو دەرونیاندا هیچ نارەزاییەك دروســتببێت بەرامبەر ئەوەی کەداوەریت لەسەرکردوەو دەبێت بەتەواوی تەسلیم بن وڕازی بن.

کەواتــە ئیماندارانی بەڕێــز: دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کەلەشــوێنی پێویســتدا، ڕەنگ دانەوەی ئیمان وەکو پێویســت لەسەرکردەوەکانمان

هەبێ. موسڵمانی بەحەق وژیر ئەوکەسەیە دەزانێ کام زەمان وزەمین، کام هەڵوێست وکردەوەی دەوێ. بۆنمونە: بۆ (کاربەدەست): لەسەرۆکی وولاتـــەوە تامۆزەفێکـــی پلـــەی هەرەخـــوار لەحکومەتدا، هەڵوێســـتی ئیماندارانـــەی ئـــەم کاربەدەســـتە لـــەوەدا دەرناکەوێ کەشـــەو نوێژی زۆری هەیـــە. یان لەکاتـــی دەوامدا نوێژی چێشـــتەنگاو دەکات. بەڵکو هەڵوێســـتی ئیماندارانەی ئەم کاربەدەستە لەوەدا دەردەکەوێ کەزیاتر دادپەروەری بچەســـپێنێ وهەوڵی ئەوە بـــدات زیاتر گەل ومیللەتەکەی بپارێـــزێ وپێویســـتیەکانیان دابین بـــکات. لێرەوە مانـــای فەرمودەی: (يَوْمٌ مِنْ إمامٍ عادِلٍ تَعْدِلُ عِبادَةَ سِـتينَ سَـنَةً). جـــوان تێدەگەین. کەوەختی هەڵوێســـتی دادگەریە بۆکاربەدەســـت لەکاتی فەرمانڕەواییداو ئەوەش ســـود بەمیللـــەت دەگەیەنێ، نـــەك عیبادەتی کاربەدەســـتەکە. چونکە عیبادەتەکە تەنها بۆخۆیەتیو ئەگەر دادپەروەری نەچەســـپاند لەگەڵ عابیدێکی دوورەپەرێز لەخەڵك چ فەرقێکی دەبێ؟! بگرە زەرەری دەبێ وپێویستە لابدرێ لەسەرکار، چونکە نەیتوانیوە دادپەروەری بچەسپێنێ وجێگای کەسێکیشی گرتەوە، کەبتوانێ دادپەروەری بچەسپێنێ.

فەرمانبەرێك لەدائیرەکەیدا. ئیمانەکەی لەوەدا دەرناکەوێ، کەلەکاتی دەوامدا خەریکی تەســـبیحاتو زیکرکردن بێ، بەڵکو ئیمانەکەی لەوەدا دەردەکەوێ کەئیشی هاوولاتیەکە بەرێکوپێکیو بێ غەشو بێ بەرتیل جێبەجێ بکات، وەرێنمایی کەسێکی نەشارەزا بکات..

هەروەهـــا ئیمانـــی زانایەکی ســـەرمینبەرو نـــاو میحـــراب، لەوەدا دەردەکەوێ کەکار بەزانســـتەکەی بکات، نەك بەقسەی گەورەو ووتاری حەماسی، بەلام خۆی جێ بەجێ ی نەکات، ووتراوە:

(وعالِمٌ بِعِلْمِهِ لَمْ يَعْمَلَنْ..... مُعَذبٌ مِنْ قبل عُبّادِ الوثَنِ)..

ئیمانـــداری ئەندازیارێـــك لەوەدا دەرناکەوێ، کەلەســـەر کار ڕۆژوی

ســوننەت بگرێ، بەڵکو لــەوەدا دەردەکەوێ کەپرۆژەکــە بەڕێکوپێکی جــێ بەجێ بکاو نەهێڵێ غەشــی تێدابکرێ، وەقبوڵــی بەرتیل نەکات لەبەڵێندەر (مقاول) بۆئەوەی شتی خراپ لەجێگای شتی باش بەکاربێنێ. ئیمانداری دکتۆرێك لەوەدا دەرناکەوێ کەڕیشــی هێشتبێتەوەو سیواك بــکات، بەڵکــو لەوەدا ڕەنگ دەداتــەوە کەئەگەر نەخۆشــێکی هەژاری داماو، چوە بەردەســتی وپێویســتی بەنەشــتەرگەری هەبوو، وەئەگەر دەســت بەجێ بۆی نەکرایە، ژیانی دەکەوتە مەترســی یەوە. وەپارەی نەشــتەرگەریەکەی نەبوو، لەخەســتەخانەی حکومیش وەختێ نۆرەی بەردەکەوت، کەتازە ســودی بۆی نەدەبوو. ئەم دکتۆرە ئەگەر ئامادەیی تێدابوو، لەخەســتەخانەی ئەهلی، تایبەت بەخۆی لەســەر حیســابی خۆی نەشتەرگەریەکی دڵسۆزانەی بۆئەم نەخۆشە کرد. ئەوە بەڕاستی ئیمانداری حەقەو ڕاســتگۆیە لەئیمانەکەیــدا. ئەوکاتە بەرفەرمودەی (خَيْرُ النّاس أَنْفَعُهُمْ لِلْناسِ) دەکەوێ. هەروەکو لەقورئاندا بەردەوام ئیمانو عەمەلــی صالح بەیەکــەوە هاتوون. چونکە ئیمانەکــە نێوانی خۆتو پەروەردگارت خــۆش دەکاتو بۆ خۆتە، عەمەلی صالحو کاروکردەوەی جوانیــش نێوانــی تۆو خەڵکی خــۆش دەکاتو خەڵکی ســود لەمەیان وەردەگرن.

بەڵێ ئیمانداران: ئەم ئیســلامەو ئیمانە، ئەوکاتە وەکو تیشکی خۆر پڕشنگی دەدا، کەموســڵمانان دەیانزانی، کام کردەوە لەم کاتو شوێندا بکەن. بۆنمونە: (ئێســتا کەنــاوی حاجیەکان دەنوســرێ، هی واهەیە هەوڵدەدات حەجی دوەمو سێیەم بکات. یان هی واهەیە عەمرە دەکات. کەچی سێ چوار جار عەمرەی تری کردوە.. جالێرەدا دەبێ موسڵمانان ووشیارانە سەرنج بدەن، ئەگەر هاتوو حاجی کەم بوو، عەمرەکار کەم بوو، ئەوە واچاکترە کەموســڵمان هەوڵبدات حەجی دووەم وســێ یەم

وعەمرەی دووەمو سێیەمو چوارەم بکات، بۆئەوەی قیبلەی موسڵمانانو کەعبەی ماڵی خوا، بەردەوام دەوری قەرەباڵغ بێ، وەهێزی موســڵمانان دەرکەوێ، وەموســڵمانان لەکاتی حەجدا لەیەك نزیك بنو لەبارودۆخو ژیان وگوزەرانی یەکتر شارەزابن.

بــەڵام ئەگەر هاتوو حەج بــەر نەدەکەوت وهیــچ جێگایەك هەڵی نەدەگرتو خەڵکی بۆچەند ســاڵی تر نۆرەیان نوســیبوو. وەعەمرەکار زۆربــوو. وەکو کاتی حەج قەرەباڵغ بوو. ئەوا لەم کاتەنەدا، ئەگەر ئەو پارەی حەجی دووەم وعەمرەی دووەمو سێیەمە بدرێ بەهەژارێکی بێ ئەنوا، کەهەژاری پشــتی چەماندۆتەوە. بدرێ بەبێ خانوی کرێ چی. کەبەڕاســتی کرێچێتیو ئەم ماڵو ئەوماڵ خەریکــە ژیانی تێك دەداو منالی بەهۆی ئەوەی هەرڕۆژەی لەقوتابخانەیەکدا خەریکە ســەری لێ تێکدەچــێو لەخوێندن بێزار دەبێــت. دەی پارەی چەند عەمرەکارێك بــدرێ بەخانویەك بۆئەم دەســتکورتە. کرێ چیە. زۆرباشــتر نیـیە؟! یاخود پارەی چەند حەجو عەمرەیەکی دووبارە بدرێ بەکوڕو کچێکی گەنج. کەدەیانەوێ بەحەڵاڵی بەیەك بگەنو خێزانێکی پاکی دیندارانە پێك بهێنن. بەڵام هەژاری ڕێگرە لەبەردەمیاندا. ئایا ئەگەر ئەوپارەیە بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوســەری بۆ ئەو کوڕو کچە بدرێ باشتر نیـیە؟! بەڵێ بەبێ گومان لەم بارودۆخەی ئێســتادا. کەسوپاس بۆ خوا، دەوری کەعبەی قیبلەی موســڵمانان ئەوەندە قەرەباڵغە کەکاتی عەمرەو حەج وەکویەکــی لــێ هاتوە. لەلایەکی تریشــەوە، ئەو شــەپۆلە لەناوبەرەی کەهەڵمەت بۆ گەنجو لاوەکانمان دێنێ بۆ ئەوەی توشــی بەدڕەوشــتی وداوێن پیســیان بــکات ولەهەموو ڕێگاکانەوە وەکــو ڕاگەیاندن، فیلمو (CD)، کەناڵــی ئاســمانی، ئەنتەرنێت، لەهەوڵی ئــەوەدان گەنجانمان بخزێنــن، دەی باشــترین پارێــزەر بریتیـیــە لــەوەی کەپێغەمبەری

خۆشەویستمان (ﷺ) بۆی داناوین کەزەواجی شەرعی یە. (یا معشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج فإنە أغض للبصر وأحصن للفرج ، ومن لم یستطع فعلیە بالصوم).

دەی ئەگەر چەند موسڵمانێك کەبەتەمان عەمرەی دووەم وسێیەم بکەن، ئەگەر بێتو پارەکەیان خەرج بکەن بۆ کوڕوکچێك کە هەردووکیان کوڕوکچی هەژارو نەدارو کرێچیەکن و واخەریکە کاتی ژن هێنانو شوکردنیان بەسەر دەچێ لەبەر بێ ئیمکاناتی و دەست کورتیو بێ خانوییو ئاڵتوون گرانیو مەصرەفی زۆر، ناتوانن بیریش لە (زەواج) بکەنەوە، ئەم خەونە پیرۆزەیان زیندوو بکرێتەوەو لەفەوتان بپارێزرێ، ئایا باشتر نی یە؟! ئایا چ خێرێکی گەورەیە؟! یاخود ئەو هەموو هەژارەی کەبەڕاستی هەر ئەوەیە زیندووە. نەك دەژی. کەزیندوو بون و ژیان، ژیانێك کەلایەق بێ بەمرۆڤ زۆر جیاوازە. هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین زیندون بەڵام هەمویان ناژینو زۆریان خۆزگە بەمردوو دەخوازن. کەبەڕاستی هەژاری ئەوەندە تاڵە. کە (لوقمانی حەکیم)دەفەرموێ: گوژاڵکم خواردووە. زۆرتاڵ بوو. بەڵام بەخوا نەگەیشت بەتاڵی هەژاری:: دەی ئەگەر ئەو هەژارانە تێر بکرێنو پۆشتە بکرێن، چ خێرێکی گەورەیە بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: ئایا نرخ و قیمەتو بەرزیو بڵندی ئیمانو بیرو باوەڕو خواناسی کەسێك لەکوێدا دەردەکەوێ. کەخۆی تێرو تەسەلو پۆشتەو پەرداخە، کەچی دراوسێ یەکی والەبرسان دەمرێو برسیو بێ ئاو، بێ نان، بێ ناو، نەخۆش، غەمبار، ژیان بەسەر دەباتو ئەو دراوسێ دەوڵەمەندە هەبوەی ئاوڕێکی لێ ناداتەوە؟! مەگەر حەزرەتی (رَسُـول الله) (ﷺ) نەیفەرمووە: (ما آمَنَ بِي مَنْ باتَ شَـبْعانَ وجارُه جائِعٌ إلِي جَنْبِهِ، وهُو يَعْلَمُ بِهِ). بۆچی؟! چونکە ئیمانەکەی نەیکردوە بەخاوەن هەڵوێست.

بەڕێزان: لەمێژوی پرشنگداری ئیسلامدا نوسراوە کە: یەکێ لەپیاوچاکان لەسەرمای زستاندا لەبەر باران هەڵدەلەرزی. ووتیان: ئەوە بۆ وادەکەی بۆناچیتە ژورەوەو لەبەر سۆپای گەرم دانیشیو جلێکی گەرم لەبەربکەی؟! فەرموی: چونکە پارەم نی‌یە جلوبەرگ بۆ هەژاران بکڕمو پۆشتەیان بکەم بەجلوبەرگی گەرم ونەرم. وەسۆپایان بۆدابین بکەم. وەدەشزانم کەحاڵی سەدان کەس ئێستا لەبەربێ جێگاییو بێ سۆپاییو بێ جلوبەرگو پێڵاوی وەکو ئەم حاڵەی من وایە لەم سەرماو بەربارانە. لەبەرئەوە ئەگەر نەشتوانم جل وبەرگیان بۆبکڕم. خۆدەتوانم بەشداری ئازارەکانیان بکەم. وەبەکردەوە بیسەلمێنم کەهەژارم خۆش دەوێ. نەك هەربە قسەو دروشم و ووتار.

لەم سەردەمەشدا، یەکێ لەپیاوانی بەڕێزی دانیشتوی شاری سلێمانی، کەساڵەهایە لەخزمەت شەریعەتی ئیسلامی وفەرمودەکانی پێغەمبەردایە (ﷺ). چەند ساڵ دوای گرانیەکەی نەوەتەکانی کوردستان، کەخەڵکی کەوتنە تۆوی گەسك لێکردن لەئاش وپاقلە خواردن لەجیاتی نانی گەنم، چونکە سن گەنمی هەموی خواردو گەماروێ ئابوری سەرعێراقیش خەڵکی ووشك کرد، ئەم پیاوە زاناو بەڕێزە، کاتێ بەچاوی خۆی دەبینێ، واکەسێك بەفرسەتەوە، ئەملاولای خۆی تەماشا دەکات ودەبینێ کەس دیارنیەو ئاگای لەم مامۆستا بەڕێزە نی یە، والەپەنجەرەی ماڵەوەیان چاوی لێ یەتی. دەچێتە سەرتەنەکەی خۆڵی بەردەم ماڵێکی دەوڵەمەندو هەندێ ئێسقانی حەیوان دەردێنێ، کەلەوماڵەدا گۆشتەکەی خوراوەو ئێسقانەکەی فڕێ دراوە، ئەم کەسە دەست دەکات بەمژینی ئێسقانەکانو زۆر تامەزرۆیانە دەیانخاتە دەمیەوەو دەیانمژێ وتامیان دەکات!! مامۆستای دینداریش هەرچی سەیری سەروشێوەی دەکات، ئەمە لەشێت ناچێ وپاشان شێتیش ئاوا ناڕوانێ بەملاولای خۆیدا بزانێ

کـــەس دیارە یان نا. بۆیە خـــۆی بۆناگیرێ ولەماڵ دێتەدەرو بەرەولای ئەوکەسە دەچێ وئەویش کەهەستی پێ دەکات دەیەوێت بڕوات، بەڵام مامۆســـتا بانگی دەکات وتکای لێ دەکات کەنەڕوات وئیشـــی گرنگی پێ یەتی.. بەڵێ کابرا دەوەســـتێ ومامۆستاکە سەلامی لێ دەکات وتەوقەی لەگەڵ دەکاتو لێی دەپرســـێ: هەرچەندە تۆ وویستت کەس نەتبینێ، بـــەڵام مـــن چاوم لێبوو تۆ چیـــت کرد، ئایا بۆچی ئـــەم کارەت کرد؟! ئەویش لەوەڵامدا هەناسەیەکی قوڵ هەڵدەمژێ ودەڵێ: بەڕێزەکەم تازە ناچارم بۆت باس بکەم. بەخوا من ماوەی چەند مانگە حەزم لەگۆشتە. چونکە لەهەرزانیەکەدا، ئەوکات هەبو بوم و وەکو ئێستام لێ نەهاتبوو. زۆربەی ڕۆژ گۆشتم خواردوەو زۆر حەزم لێ یەتی، بەڵام کەئەم گرانی یە بەسەرداهات وهەرچی هەمانبوو ڕۆژانە فرۆشتمان وهەڕاجمان کرد بۆئەوەی عەلاگەیەك ئاردی پێ بکڕین وئێستا کەلوپەلێك کەپارە بکات لەماڵماندا نەماوە. وەماوەی چەند مانگە گۆشتمان نەخواردوەو ئەوەندە تامەزرۆ بوم بۆگۆشـــت خواردن. چومـــە بەردەم دوکانی قەصابێك لەم نزیکانە، ویســـتم بڵێم نیوکیلۆ گۆشتم بەقەرز بدەرێ، بەڵام جورئەتم نەکرد. چونکە خۆم بڕوام بەوە نەبوو کەبتوانم پارەکەی بۆپەیدا بکەم. وەدەشترسام. قەصابەکەش نەمداتێ. چونکە لەچەندلای دوکانەکەیەوە نوســـی بووی: تکایە قەرز نی یە، تەنانەت بۆتۆش. لەوفکرو خەیاڵەدا بوم. کەپیاوێك هات وچەند کیلۆ گۆشـــتی حەیوانی کڕی ومنیش دورو نزیك شوێنی کەوتم بزانم ماڵەکەی کامەیە، ئەوەبوو. چوە ئەوماڵەوەو زانیم لەوێدا ئەوگۆشتە دەخورێ، ئەوەبوو بۆچونەکەم ڕاست دەرچوو، لەوماڵەدا گۆشتەکەیان خواردبوو. وەئێسقانەکانیان فڕێ دابوو. منیش لەتاوی گۆشـــت هاتم ئەو ئێسقانانەم مژی وتام کردو هەندێ سوکنایی بەدڵمـــا هات وحەزەکانـــم دامرکانەوە! ئەوە حاڵو بەســـەرهاتی منە.

مامۆستاکە کەئەوە دەبیستێ، دڵی پڕدەبێ لەگریان وفرمێسك بەهێمنی بەچاوەکانــی دا دێتەخــوارەوەو ئەوەی پێی دەبــێ دەیداتێ کەبیدات بەگۆشــت وبۆخۆیو ماڵو منداڵی: کابراش زۆر دوعای خێری بۆدەکات، پاشــان ئەم مامۆستا بەڕێزە. بیردەکاتەوە کەئایا دەبێ چەندین کەسی تــر ئاوا حەزیان لەگۆشــت بــێ وبۆیان نەکــڕدرێ، خۆئەمیش توانای ئەوەی نیە بەشــی هەمویان بکڕێ، وە هەموویان ناناســێ، ئەی چۆن ئەرکــی ئیمانداری بەرامبەر ئــەم هەزارانە جێ بەجێ بکات. ئایا هەر بەقســە شــەریکیان بێت؟ نەخێر، بەڵکو بەکردەوە بەشداریان لەگەڵ دەکات وبڕیــار دەدات لەوســاتەوە گۆشــت نەخوات، ئیتــر هەرچەندە ســفرە گۆشــتی جوانی لەســەر دەبوو. ماڵو منداڵ داوایــان لێ دەکرد بخــوات، دەیفەرموو: وازم لێ بێنن بابەشــداری بەکردەوە بکەم لەگەڵ ئەوکەســانەی کەمن بەچاوی خۆم یەکێکیانم لێ بینین وبەهەزارانن.
بەڵکو لەئاســتی جیهاندا، بەملیۆن کەس هەیە ئاوا دەژی! لەووڵاتێکی وەکو (هیندســتان)دا، ئەوانەی کەچوونەتە ئەو ووڵاتە بەچاوی خۆیان بینیویانە کەئەگەر لەمەطعەمێك دابنیشیو گۆشت بخۆی، چەند منداڵو گەنــج لەودیوو جامخانەکەوە تەماشــات دەکەنو چاوەڕێ ئەوە دەکەن لێ ببیتەوەو پەلاماری ئێســقانەکان بدەنو بزانن تۆزە گۆشتێکی پێوە نەمــاوە، بیخۆن یان تامی ئێســقانەکە بکەن!! یــان لەووڵاتێکی وەکو میصردا، بەهەمان شــێوە، زۆرکەس کەچۆتە ئــەوێ، بینیویەتی چۆن هەزاران چاوەڕێی ئەوەن کەسێك لەفەیەك بخواو قەراغی سەمونەکەی نەخواردبــێو ئەمان بیخۆن!! ئەو میصرە دەوڵەمەندەی کە (حوســنی موبارەك)ی ناموبارەك، کەخوانەناسو دژبە ئیسلام بوو. ئاوا کاولی کرد. چونکە هەموو سەروەت وسامانی ووڵاتەکەی بۆ خۆی وکوڕو بنەماڵەکەی بەکارهێنا. لەومیصرەدا کەخەڵکی ئاوا برسی هەیە. حوسنی موبارەکی

ســەرکردە بڕیاریــدا کەقاتێکی تایبەتی بۆ دروســتبکرێ، کە پێشــتر کەس لەبەری نەکردبێ. ئەوەبوو، قوماشــێکیان بۆدروست کرد کەمیلی قوماشەکەی (دوو) مللیمەتر دەبوو. بەئینگلیزی (HUSNY MOBARAK) ی تێدا نوسرابوو. کەبەسێ مانگ قوماشەکەی چندراوەو (سەدو شەست ویەك) گەڵای تێچووە، پێش تڕۆکردنی ئەوقاتەی لەبەردەکرد!! یاخود دوو کوڕەکــەی (جَـمال وعَلاء)، لەبانکی سویســرا (٣٤٠) ملیۆن دۆلاریان هەبــوو!!! ئەوەش حاڵــی خەڵکەکەیەتی.. بەڵێ ئەم مامۆســتا بەڕێزە کوردزمانەی خۆشــمان. بەکردەوە بەژداری لەمەینەتیەکانی هەژاراندا کردو تاوەکو ئەم یەك دوو ساڵە. گۆشتی نەخواردەوە. کەسوپاس بۆخوا بــاری ئابوری خەڵکی کوردســتان هەندێ بوژاوەتــەوەو خواری گەورە زیاتر دەرگای ڕەحمەتمان لێ بکاتەوە..

بەڵــێ ئیمانــداران: جــاری واهەیــە گەورەیی ئەوئیمانــە لەنیەتی خاوێنــی ئەوکەســەدا دەردەکــەوێ. ئەوەنــدە ئیمانەکــەی بەهێــزو پتــەوە، کردەوەیەکی کــەم بەلام بەنیەتێکی خاوێــن وخالیص بۆخوا پلــەی بــەرز دەکاتەوە لای خوای گەورە. بەڵێ نیەت ســەرەتاو کۆتایی هەموو عیبادەتێکــە. هەرکردەوەیەکی چاك کەمرۆڤ ئەنجامی دەدات. بەئەندازەی نیەتەکەی ناودڵی پاداشتی لەسەر وەردەگرێت. بابەیەکەوە ســەرنجی ئەم ڕووداوە مێژوییە بدەین: ئەگێڕنەوە جارێکیان پاشایەك لەپاشاکانی ســەردەمی ڕابردوو، مزگەوتێك دروست دەکات لەشارەکەی خۆی. ئەم پاشــایە فەرمانی دا، هیچ کەس بەشــداری نەکات وهاوکاری ماددیو پارە نــەکات وکەس بەخۆڕایــیو بەبێ کرێ ڕۆژێك ئیشــی تێــدا نەکات. بۆئــەوەی مزگەوتەکە تەنها بەپارەی ئەوبێتو دەســتو یارمەتی کەســی تری تێدانەبێت، وەهەڕەشــەی کرد کەیارمەتی کەسی تری ناوێت چونکە ئەومزگەوتە تەنها بەناوی خۆیەوە دروســتدەکرێو

دەبێ خەڵکی بڵێن مزگەوتی پاشا فلان کەس. بەڵێ مزگەوتەکە دەست پێکراو ناوی پاشـــای لەسەر نوســـرا. جارۆژێك لەڕۆژان پاشای شارەکە لەخەویدا بینی فریشتەیەك لەفریشتەکان لەئاسمانەوە دێتەخوارەوەو ناوی پاشای لەســـەر مزگەوتەکە لابردو ناوی ئافرەتێکی لەسەر نوسی لەســـەر مزگەوتەکە!! پاشا لەخەو هەســـتاو بەترسەوە بانگی پاسەوان وســـەربازەکانی کردو ووتی: بـــڕۆن بۆمزگەوتەکـــەم بزانن ناوی منی هەرلەسەر نوسراوەو نەسڕاوەتەوە؟! سەربازو پاسەوان چون وهاتنەوەو ووتیان: بەڵێ جەنابی پاشـــا ناوەکەت هەرلەشـــوێنی خۆی نوســـراوە. لەبەرخۆیەوە ووتی: کەواتە خەونێکی پڕوپوچەو هیچ نیە. لەشـــەوی دووەمدا، پاشـــا هەمان خەوی شـــەوی پێشـــوی بینیەوە، دیســـان پاشا کەبەخەبەرهات پاســـەوانەکانی ناردنەوە بۆســـەیری ناوەکەی لەســـەر مزگەوتەکەو ئەوانیش دڵنیایان کردەوە کەناوەکەی دەستکاری نەکراوە. پاشـــا سەری سوڕما لەوخەونە سەیرە، لەشەوی سێ یەمدا پاشا هەمان خەوی دووشـــەوی ڕابردوی بینیەوە کەچۆن فریشـــتەکە لەئاسمانەوە هات وناوی پاشای لەسەرسڕیەوەو ناوی ئافرەتێکی لەسەر نوسی بەڵام ئەمجارەیان کاتێ پاشـــا لەخەو خەبەری بۆوە. ناوی ئافرەتەکەی ڕەوان کردبـــوو. هاتـــەوە یادی. یەکســـەر بەوبەیانیە زووە پاشـــا فەرمانی دا بەســـەربازەکانی کەئەو ئافرەتەی فریشـــتەکە ناوی لەسەر مزگەوتەکە دەنوسی، فلان ئافرەتەو بڕۆن دەستگیری بکەن وبیهێنن. بەڵێ ماڵەکەیان دۆزیەوەو گرتیان وهێنایان بۆکۆشـــکی پاشـــا. جاکـــە ئافرەتەکە هات، بینیان ئافرەتێکی هەژاری بەتەمەنەو لەبەرپیری پشتی چەماوەتەوەو لەترســـاندا لەشی ئەلەرزێ. پاشا بەئافرەتەکەی ووت: پیرەژن تۆ هیچ یارمەتیەکی دروست کردنی مزگەوتەکەی منت داوە؟! ووتی: گەورەم من ئافرەتێکی بەتەمەنم وبیستوشـــمە کەتۆ فەرمانت داوە کەس یارمەتی

پێشـــکەش نەکات بۆبیناکردنی مزگەوتەکـــە، جامنی هەژارو بەتەمەن وپەککەوتە، چۆن ئەودەسەڵاتەم هەیە کەسەرپێچیت بکەم!. من نەپارەم هەیە بیخەمە مزگەوتەکەوە، نەبەدەســـتیش کارم بۆتێدا دەکرێ وەکو دەمبینی! پاشا ووتی: سوێندت دەدەم بەخوای تاك وتەنها، ئەوخوایەی کەئـــاگای لەهەموو کردەوەیەکی ئاشـــکراو نهێنی یە. ڕاســـتم پێ بڵێ، بزانـــم تۆچیت کـــردوە بۆئەم مزگەوتەی مـــن؟! ئافرەتە بەتەمەنەکە ووتی: منیش ســـوێندت بۆدەخۆم بەخـــوای گەورە کەهیچ یارمەتیەکم نەکـــردوە بۆمزگەوتەکـــەی تۆ، بەڵام تەنها.. پاشـــا ووتـــی: بڵێ بزانم، تەنهـــا چی!... ئافرەتەکە ووتی: ڕۆژێك بەلای مزگەوتەکەدا تێدەپەڕیم کەخەریکی دروست کردنی بوون. بینیم یەکێك لەوئاژەڵانەی هەڵگری کەلوپەلی بیناکردنەو شتی پێ گواستراوەتەوە بۆ مزگەوتەکە بەپەتێك، گوریسێك بەســـتراوە لەدارێك لەنزیکیەوە سەتڵێك ئاو دانراوە. جائەو ئاژەڵـــە زۆر تینوو بـــوو. خەریکی ئەوەبوو خـــۆی بگەیەنێتە ئاوەکە، بەڵام گوریســـەکەی کورت بوو، دەمی نەدەگەیشـــتە ئاوەکە، وە دیاربوو تینۆتیەکەی لەڕادەبەدەر بوو. جاســـوێند بەخوا تەنها سەتڵەکەم نزیك کـــردەوە لەدەمی ئاژەڵەکەو تێرئاوم کرد. وەئەم کارەشـــم تەنها لەبەر ڕەزامەنـــدی خوای گـــەورە کردو زیاتـــر حەزم کـــرد یارمەتی ئەوبێ زمانەبدەم، چونکە خزمەتی ئەومزگەوتەی پێ کرابوو. وەلەسەرپشتی ئەو کەلوپەل بۆئەو مزگەوتە هێنرابوو، دەی بەخوا جگە لەمە هیچی ترم نەکردوەو لەوکارەشمدا تەنها مەبەستم ڕەزامەندی خوای گەورە بوو. نەك سەرپێچی جەنابت. پاشا ووتی: ڕاست دەکەی ودڵنیام تۆ ئەوکارەت ئەوەندە بەپاکی لەبەرخوا کردوە، بۆیەش ئاوا خوای گەورە لێی قبوڵ کردوی وپاداشـــتی بۆنوسیوی. بەڵام بەخوا من کەئەم مزگەوتەم کرد، نیەتـــی ناودڵم بۆئەوە بوو کەخەڵکی ناوم بێنن‌و بڵێن مزگەوتی فلان

پاشا. من نیەتەکەم  بۆڕەزامەندی خوا نەبوو. خوای گەورەش کارەکەی منـــی قبوڵ نەکرد.. هەرلەوێدا دەســـت بەجێ پاشـــا فەرمانی دەرکرد ناوی پاشـــا لەســـەر مزگەوتەکە بســـڕنەوەو ناوی ئەوئافرەتە هەژارە، نەناســـراوەی لێ بنووســـن. هەرچەندە ئافرەتەکە ووتـــی: من نامەوێ شـــتی وابکرێ وناوی پاشـــا لاببرێ وناوی من بخرێتە شـــوێنی. بەڵام پاشـــا هەرسور بوو لەســـەر بڕیارەکەی‌و ووتی: جابەچی دەچێ ئەگەر لەبەرچاوی خەڵکی ناوی پاشای لەسەربێ، بەڵام لای (رَبُّ العالَمين) ناوی تۆی لەسەربێ! من دەستی مرۆڤ ناوەکەمی لەسەر مزگەوتەکە نوسی، بەڵام تۆ فریشـــتەی پاکی خوای پەروەردگار ناوی لەســـەر مزگەوتەکە نوســـی. دەی بالەســـەرزەوی وبەرچاوی خەڵکیش ئەوەی حەق ورەوایە ئەوە ببینرێ‌و فێڵ لەخوای گەورە ناکرێ.

بەڵـــێ ئیمانـــداران: دەبێ ئیمـــان‌و بیروباوەڕ لـــەکارو کردەوەماندا دەربکەوێ‌و خاوەن هەڵوێســـت بین لەشـــوێنی خۆی دا، چونکە خەڵکی ســـەیری کارو کردەوەکانمان دەکەن، نـــەك نوێژو ڕۆژوەکەمان. ئەوەتا: چەند ســـاڵێك لەمەوبەر مامۆســـتای مزگەوتێك لە (بریطانیا) سواری پاص دەبێت‌و پارەی کرێیەکە دەدات. شـــۆفێرەکە (٢٠ بەنســـی) زیاتر دەداتـــەوە لەحەقی خۆی! مامۆســـتاکە بیری کـــردەوە کەپارە زیادەکە بگێڕێتـــەوە چونکە حەقی ئەو نی‌یە. ئینجا هات بەخەیاڵیدا: خۆ بڕە پارەکە ئەوەندە نیە بۆی بیگێڕمەوەو قســـەو باســـێك لەسەر ئەو بڕە پارە کەنرخێکی وای نی‌یە بێنمە گۆڕێ، وەکو لێرە لای خۆمان کەسێك (٥٠) دینـــاری طەبعت زیاد بداتێ. کەهیچ نرخێکی نی‌یە! مامۆســـتاکە لەدڵی خۆیدا بەخێرایی ئەمە تاوتوێ دەکاتو بەخۆی دەڵێ: باشە ئەو بـــڕە پارە کەمە کێ گـــوێ دەداتە ئەوە، دوای ئـــەوەش کۆمپانیای ئەو پاصانە پارەی باشـــیان دەستدەکەوێت. خۆپەکیان بەوە نەکەوتووە، بۆ

بیاندەمەوە، وائەزانم ڕزقێکەو خوا ناردویەتی، بەڵێ پاصەکە وەستاو لەوشــوێنەدا کەماموٚســتا دەیویســت دابەزێ، لەدەم دەرگاکە نەفرەتی لەشەیطان کردو پارەکەی دایەوە، شوٚفێرەکە ووتی: توٚ ماموٚستای تازەی ئەم ناوچەیە نیت؟!

ووتی: بەڵێ.

ووتی: من ماوەیەکە دەمەوێت بێم بوٚ مزگەوتەکەتان تا لەئیســلام شارەزاببم‌و ئەوە ئەمڕوٚ پێشەوای ئەو دینەم تاقیکردەوە، من بەئەنقەست زیادم دایتەوە، تاوەکو تاقیتبکەمەوە، بەلاّم لەتاقیکردنەوەکە دەرچوویتو بیروباوەڕو ئاینەکەت حەقــە، چونکە ماڵی خەڵك هەرچەند کەمیش بــێ تــوٚ بەحەقی خوٚتــی نازانی‌و بەبــێ ئەوەی کەس چــاوی لێ بێ دەیگێڕیتەوە بوٚ خاوەنەکەی، بەم نزیکانە سەردانتان دەکەم.

ماموٚستای مزگەوتەکە دەڵێ کەدابەزیم قاچم دەلەرزی‌و نەمدەتوانی خوٚم لەســەر قاچەکانم بگرم! بوٚیە دەستمگرت بەعەمودێکەوەو سەرم هەڵبڕی بوٚ ئاسمان‌و بەگریانەوە ووتم: خوایەگیان خەریك بوو ئیسلام بە (٢٠بەنس) بفروٚشم!!! خوٚ ئەو شوٚفێرە هەتا ماوە ئیسلامی بەهوٚی منــەوە لەبەرچاو دەکەوتو ئەو نیــازو نیەتە پاکەی هەیبوو کەبێتو لای من لەئیســلام شــارەزابێ‌و موســڵمان ببێ، لێی پەشیمان دەبوٚوەو ســەرەنجام تاوانی موســڵمان نەبوونی ئەو لەپێناوی (٢٠ بەنســی) بێ نرخدا دەهاتە گەردنی من‌و بەدبەختی دەکردم!..

خوای پەروەردگار ئیمان لەدڵەکانماندا شیرین‌و خوٚشەویست بکە.

(اللّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنا الإِيْمانَ وَزَيِّنْهُ في قُلُوبِنا، وَكَرِّه إِلَيْنا الكُفْرَ وَالفُسُوقَ وَالعِصيانَ. وَاجْعَلْنا مِنَ الرَّاشِدين.) اللّهُمَّ آمين..

سەرچاوەکان:

١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.

٢. گۆڤاری چرای ڕوناکی، ژمارە: ٢١، ل٣٨.

٣. بەرەو ئیسلام. ئاسودەیی، ئەندازیار عُثمان، ل٨٣.

# ووتاری یەکەم
# بۆ مانگی ڕەجەب
# هۆکارەکانی
# پەیوەندیکردن لەنێوان
# مرۆڤەکانداو مۆبایل

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجمَعِينَ:

ئيمانداران وخواناســانى بەڕێز: يەكــێ لەتايبەتمەنديەكانى مرۆڤ ئەوەيــە كەناتوانێ بەتەنها بژى. چونكە هيچ كەس نى يە پێويســتى بەكەس نەبێ وكەســانێك پێويســتيان بەم نەبێ، خۆئاشــكراو ڕوونە، مرۆڤيش ناتوانێ هەركات كارێك وپێويســتيەكى بەكەسێكى تر هەبوو. هەميشــە ئەوكەســەى لەبەردەســتدا بێــت. بۆيە پێويســتى بەبوارى پەيوەندى بەســتن هەيە. جاخواى گــەورەو كاربەجێ هۆكارەكانى ئەم پەيوەنــدى بەســتنەى بۆمرۆڤ فەراهــەم هێنــاوە. بەدوورێگا. ڕێگاى يەكەم هيچ دەســتى مرۆڤى تێدانى يەو ڕێگاى دووەم مرۆڤ دەســتى هەيە لەئەنجامدانيدا.

ڕێگاى يەكــەم: پێى دەوترێ، پەيوەندى فكــرى (التَخاطُر): كەچەند بەشى هەيە:

١. پەيوەندى نێوان دايك وكۆرپەكەى: كەئەم دوانە بێ هيچ ئامێرێكى پەيوەنــدى، بەبــى ئەوەى خۆشــيان بيانــەوێ، پەيوەندى بــەردەوام لەنێوانياندا هەيە، بازۆريش لەيەكتر دوربن. زاناى ســيكۆلۆجى (بافل ناموف) لەنەخۆشخانەى منالْ بوونى (مۆسكۆ) كەتوێژينەوەى دەرونى ئەنجام دەدات، دەڵێت: هيچ گومانى تێدانى يە كەپەيوەندى (بيۆلۆجى) هەيــە لەنێــوان دايــكو كۆرپەكەيــدا لەنەخۆشــخانەكەماندا. ئەوەتا دايكەكان لەبەشــێكى تايبەتى نەخۆشــخانەكەدان وجيايە لەوبەشــەى كەمناڵەكانيانــى لێ يەو بەهيچ شــێوەيەك گوێيــان لەيەكتر نى يەو ئاگادارى يەكترنين، لەگەڵ ئەوەشدا كاتێك مناڵێك دەگرى لەڕوخسارى دايكيدا گرژى هەست پێ دەكرێ. بەبێ ئەوەى ئەم دايكە نەگوێى لەدەنگى مناڵەكــەى بێ، نەئاگادارى ئەوەبێ مناڵەكەى دەگرى. كەچى يەكســەر دايكى ئەومناڵە ڕوخسارى تێك دەچێ!! هەروەها كاتێك پزيشكێك تۆزێ

خوێن لەمناڵێك دەردەهێنێ بۆپشـــكنین ومناڵەكە بەهۆی دەرزیەكەوە ئـــازاری پێ دەگات. لەهۆڵەكەی تـــرەوە كەدایكەكە ماوەیەكی زۆر لێ‌ی دوورە، نیشـــانەكانی دڵەڕاوكێ لای دایكەكـــە دەردەكەوێ، بەبێ ئەوەی دایكەكـــە هیـــچ لەوەئاگاداربێت واپزیشـــكێك لای مناڵەكەیەتی. وەئەو پەیوەندیـــە فكریە لەهـــەردوولاوە ڕوودەدات. بۆنمونە: ئەگەر دایكێك ئازارێكی زۆری پێ بگات، ئەوە یەكســـەر مناڵەكەی هەرچەندە زۆریش لێ‌ی دووربێت هەســـتی پێـــدەكات ودەگری!! خۆئاشـــكرایە ئەودایكەی كەگوێ‌ی نابیســـتێ‌و زمانی قسەی بۆناكرێ (كەڕولاڵە) یان جوانترەوایە بڵێین: (نابیســـتو ناگۆیە). كاتێ مناڵی ســـاوای هەیە و شـــەوانە یان ڕۆژانـــە ئەم مناڵە برســـیەتی، یـــان بەهەر هۆكارێكی تـــرەوە دەگری، كەسیشـــی لێ نی یە ئەم دایكـــە ئاگادار بكاتـــەوە لەحاڵی كۆرپەكەی، ئەوە یەكســـەر لەڕێگەی ئـــەم پەیوەندیە بەهێـــزەوە كەخوای گەورەو میهرەبـــان لەنێوان دایك و كۆرپەكەیدا دروســـتی كـــردووە، ئەو دایكە نابیست وناگۆیە دڵی دەكەوێتە لێدانی زۆرترو دڵەخورپەی پێ دەكەوێ ویەكســـەر دەزانێ كەمناڵەكەی پێویستی پێ یەتی ودەڕوات بەلایەوە!! خۆئەگەر ئەم پەیوەندیە بەهێزە نەبوایە ئەوا هەرگیز ئەوئافرەتانەی كەنابیســـتن وناگۆن نەیاندەتوانی ببنە دایك، هەرلەبەر پاراستنی ئەم پەیوەندیە بەهێزەیە، كەبەشێوەیەكی تەندروست بمێنێتەوە، دەبینین لەشـــەریعەتی ئیســـلامی دا بەواجب دانراوە كەئەو ئافرەتەی كەمناڵی هەیە، دەبێ هەموو پێداویســـتیەكانی بۆدابین بكرێ، وەئازاری دەورنی نەدرێ، قســـەی ناخۆشـــی پێ نەوتـــرێ، هەواڵی ناخۆشـــی پێ نەدرێ. وەلەوكاتەشدا كەژنە تەلاق درا، دەبێ ئەومناڵە لای دایكی بهێڵرێتەوەو دەدرێتەوە بەو، بەوەمەرجانەی كەلەشـــەریعەتی ئیســـلامدا، لەوبوارەدا هاتوون..

٢. پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ لاشـــەی خـــۆی دا: بۆڕونکردنەوەی ئەم بابەتـــە باســـەرنجی ئەم بابەتـــە بدەیـــن. لەســـاڵی (١٨٨١)ی زایینی دا، دکتۆر: (نارکیغیتش) لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوڕێکانی دەچن بۆسەردانی یەکێـــك لەکارگەکانی میکانیکی کیمیاوی. لەوکاتەدا کەلەناو کارگەکەدا دەســـوڕانەوەو ســـەیری ئامێرەکانیان دەکرد. یەکێك لەهاوڕێکانی پێی هەڵخلیسکاو دەستی کەوتە سەرئامێرێك وئەو دەستەی بەتەواوی شێواو پزیشـــکەکان ناچاربوون دەســـتی ببڕنەوە، دوای نەشـــتەرگەری دەستە بڕاوەکەیان خســـتە ناوصندوقێکی تەختـــەی بچکۆلەوەو لەژێر زەویدا شـــاردیانەوە. پاش ئەوەی نەخۆشەکە بەهۆش خۆی هاتەوە. دەستیکرد بەهاوارکردنو ووتی: دەســـتم ئازاری زۆرە. (کەئەمەیان شتێکی ئاسایی یە چونکە خوای گەورە کەئەندامەکانی لاشـــەی مرۆڤی دروســـتکردوە، وە هەمووشـــی پێویســـتە خوێنی بگاتێ لەڕێگەی ئـــەو دەمارەخوێنەی لەدڵەوە بۆی هاتووە، هێـــزی فڕێدانی خوێنی لەدڵەوە بۆئەو ئەندامە دیـــاری کردووە، ئەگەر زۆرتربێ لەوهێزە. ئەوشـــوێنە دەتەقێ وخوێن بەربـــوون ڕوودەدات، خۆئەگەر کەمتربێ، خوێنی ناگاتێو ئەو ئەندامە لەجوڵە دەکەوێ (سُـبْحانَ الخالِـق)!.. جاکاتێ ئەو ئەندامە بۆنمونە ئەم دەستە لەم بەسەرهاتەدا بڕاوەتەوەو لابراوە، تاماوەیەکی زۆر دڵ کاتێ لێـــدەداو خوێن دەنێرێ بۆ ئەو دەســـتە هەربەگـــوڕو هێزەکەی جاران دەینێـــرێ، کەبگاتە ســـەری پەنجەکانی، بەڵام ئێســـتا بڕاوەتەوەو ئەم خوێنە لەم شـــوێنەدا مەجالی ڕۆیشـــتنی نیەو دەبێ بوەســـتێ. جائەم هەمـــوو هێزە بەتوندی لەوشـــوێنە بریـنـــدارە دەداو ئەوئازارە بەهێزە دروستدەکات. خۆئەگەر ئەودووڕینەوەو پێچانە بەهێزە نەبێ، یەکسەر خوێن بەربوون ڕووی دەداو ئەوخوێنەی فڕێ دەدا. بۆیە دوای ماوەیەك ئەمجـــا دڵ ڕادێـــت لەســـەرئەوەی کەئەو ئەندامە بڕاوەتـــەوەو دەگاتە

دڵنیایی کەئیتر ئەو ئەندامە بەولاشەیەوە نەماوەو پێویستی بەخوێن نی‌یـــەو ئەم دڵە ئـــەوکارەی کەپێ ی ســـپێردراوە کەخوێن بگەیەنێتە فـــلاّن ئەندام. بەهێزی ئەوەندە، خیانەتی لێ نەکردوەو ئێســـتا تاوانی ئـــەم نی‌یە کەئەو ئەندامە نەماوەو ئەمجـــا بڕیار دەدات کەبەهێزێکی واخوێن بنێرێ بۆئەو دەستە کەپێویستە بگاتە ئەو شوێنەی بڕاوەتەوە. ئیتر لەوکاتەوە ئەوبریندارە هەســـت بەئارامـــی دەکاتو دەڵێن ئازاری نەمـــاوە!) بـــەلاّم: ئەم کەســـەی ئێمە کەئێســـتا باســـی دەکەین دوای بەهـــۆش خۆهاتنەوەی لەنەشـــتەرگەریەکەی، هاواری دەکردو دەیگوت: دەستم بزمارێکی پێداچەقیوەو شـــتی پیسی پێوەیە(مەبەستی دەستە بڕاوەکـــەی) بـــوو. دکتۆرەکـــە دەڵـــێ: دوای چەند ڕۆژ بـــەردەوام ئەم نەخۆشە هەرهاواری دەکردو دەینالاّندو داوای دەکرد بزمارەکە لەدەستی دەربێنن وئەوپیســـیەی لێ بکەنەوە. ئازارەکەی بەڕادەیەك بوو لەگەڵ ئـــەو هەموو حەب ودەرزی یەی پێمان دەدا وەکو ئازارشـــکێن ســـودی نەبوو. هاوڕێکانی‌و خزمانی تووشـــی دڵەڕاوکێ وترس بوون. هەربۆیە بڕیارییانداو چون بۆئەو شـــوێنەی کەدەستەکەیان خستۆتە زەوی یەوە. صندوقـــە تەختەکەیان دەرهێنا. دەبینـــن بزمارێك چەقیوە بەیەکێك لەپەنجەکانیـــدا (لەوکاتـــەدا کەصندوقەکەیـــان داخســـتوەو بزماریان پێداکوتاوە بەرئەو پەنجەی کەوتوە!). ئەوەبوو بزمارەکەیان دەرهێناو دەســـتەکەیان پاککردەوە لەوپیسیەی کەپێوەی بوو. پاشان خستیانەوە ناوخاکەوە!. بەلاّم ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو. لەوکاتەدا کەئەوان بزمارەکەیان لەدەســـتە بڕاوەکە دەرهێنا. نەخۆشـــە دەســـت بڕاوەکە، لەدوری (١٠) کلم، بەوکەسانەی کەلەوکاتەدا لەلای بوون. ووتی: وائێستا بزمارەکەیان لەدەستم دەرهێناو دەستیان لەپیسی پاك کردمەوە. ئێستا ئازارەکەم هێور بۆوەو پشـــوومدا!!.. هەربۆیە لەشـــەریعەتی ئیســـلامدا

واجبە ئەگەر کەسێك دەستی یان قاچی بڕایەوە، نابێ فڕێ بدرێ، بەڵکو واجبە بەپێ ی گونجان بشۆرێ وپاکوخاوێن لەپەڕۆیەکەوە دەپێچرێ ولەژێرخاکدا دەشاردرێتەوە!! لێرەدا بەبێ دینەکان دەڵێین: باشە ئیتر چ ڕەخنەیەك لەئیسلام دەگرن. کەهەمووی زانستەو ئەوەی هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر باسی کردوەو سەراپای ڕێزی مرۆڤە. ئێستا زانستی نوێ باسی دەکات وئەگەر نەخوێندەواریش بن زانان. ئەوانەشی کەدژی ئیسلامن، ئەگەر هەڵگری بڕوانامەی بەرزیش بن هەرنەزانن. چونکە ئەوەی ئیسلام فەرمویەتی، هەمووی لەسەر بنەمای زانستی یەو ئەمڕۆنا سبەی زانست بەمل کەچی یەوە، هەروەکو(ئەم ڕوداوی دەستە) دەیسەلمێنێ ئەوجا دژبەدینەکە شەرمەزاری بۆدەمێنێتەوە. دەی خوای پەروەردگار سوپاست دەکەین کەهیدایەتت داوین بۆشوێنکەوتنی دینی ئیسلام..

٣. پەیوەندی نێوان هاوسەرو منداڵەکانیان: ژن ومێر لەنێوان یەکتردا، ئەگەر خۆشەویستی چەسپابێ لەنێوانیانداو بەخۆشەویستیەوە بەیەکەوە بژین وبەڕاستی هاوژین بن، نەك بەناچاری بەیەکەوە بژین. ئەوە بەڕاستی پەیوەندیەکی دەرونی بەهێز لەنێوانیاندا دروست دەبێ. کەهەرچی بەدڵی ئەمیاندابێ وئاواتی بۆبخوازێ، بەبێ ئەوەی بەزمان بیدرکێنێ بەدڵی بەرامبەرەکەشیدا دێت. وەلەگەڵ منداڵەکانیشیاندا بەهەمان شێوە ئەوپەیوەندیە دروست دەبێ. نوسەرێك دەڵێ، هاوڕێیەکی فەرمانبەرم بۆی باس کردم، کەچەندین جار لەفەرمانگە لەدڵی خۆمدا ئاواتم بۆئەوە خواستوە کەهاوسەرەکەم فلان کاربکات، یان فلان شتە بکڕێت. کەچومەتە ماڵەوە تەماشادەکەم ئەوکارەی کردوەو ئەوشتەی کڕیوە، هەرلەوکاتەدا کەمن ئەوەم بەدڵدا هاتبوو، ئەویش بەدڵیدا هاتبوو کەمن ئەوشتەم پێویستە.

هەرئەونوســەرە دەڵێ: یەکێکی تر لەوکەســانەی پەیوەندی فکریان لەگــەڵ منداڵەکانیــان زۆر بەهێزە بۆی باس کــردم کە: هەموو جارێك کەکــوڕە بچکۆلانەکەم کەتەمەنی (١٠) ســاڵەو دەچێــت بۆیاری کردن. شــوێنی یاری کردنەکــەی کەمێك دوورە لەماڵەوەمــان، کاتێك بمەوێ بانگــی بکەمەوە بۆماڵەوە، چونکە شــوێنەکەی دوورە، بۆیە پەیوەندی فکــری ئەنجام دەدەم لەگەڵیداو ســەیردەکەم پــاش ماوەیەك دێتەوە بۆماڵەوە، هەندی جاریش کەدوادەکەوێ‌و نایەتەوە، ســەرەتا وامدەزانی کەپەیوەندیەکــەم ســەرکەوتوو نەبووە، بەڵام کەپرســیارم لەکوڕەکەم کردو ووتم: ئایا هەمــوو جارێك کەمنت بیردەکەوێتەوە لەکاتی یاری کردندا یەکســەر دێیتەوە بۆماڵەوە؟! ئەویش لەوەڵامدا ووتی: زۆرجار تۆم دێتەوە یاد، بەڵام لەوکاتەدا یاریەکە زۆرخۆشەو منیش حەزدەکەم یاریەکــە تەواوببێت. هەربۆیە کەیاریەکــە تەواودەبێت ئەمجا دێمەوە بۆماڵــەوە. کەواتــە: پەیوەندی نێــوان ئەم باوك ومناڵــە زۆربەهێزو سەرکەوتووە..

بانگخوازێکــی ناســراویش دەڵێ: هەرخواردنێکــم حەزلێبێت، بەبێ ئەوەی بەهاوسەرەکەم بڵێم ئەو خواردنەم بۆلێبنێت، خۆی ئەو خواردنە لێ دەنێتو دەڵێ، لەدڵما هەستم کرد کەحەزت لەوخواردنەیە!..

٤. پەیوەندی فکری لەنێوان تۆو خەڵکی دا: ئەگەر ســەرنجی ژیانی ڕۆژانەمــان بدەین دەبینین چەندەها نمونەی پەیوەندی فکری تێدایە، بــەڵام زۆرگوێمان پــێ نەداوە. بۆنموونە: وویســتوتە تەلەفۆن بکەیت بۆکەســێك، کەتەلەفۆنەکەت هەڵگرتوەو پەیوەندیت پێوەکردووە، پێی وتوی: منیش وویســتومە پەیوەندیــت پێوەبکەم، واتە: تۆپێش ئەوەی پەیوەنــدی تەلەفۆنی لەگــەڵ بکەی، پەیوەندی فکریــت پێوە کردوە، یــان زۆرجار حەزت بەبینینی کەســێك کردوە، کەچــی بەبێ ئەوەی

بانگهێشتی بکەیت، یەکسەر هاتۆتەماڵتان و وتویەتی بەڕاستی بیرم کردوی وحەزم لەبینیت بوو.

یان: زۆرجار وویستوتە قسەیەك بکەی، بەڵام هاوڕێیەکت پێشت کەوتوەو هەمان ئەوقسانەی کردوە، کەتۆ وویستوتە بیکەیت. لەکوردەواری خۆماندا بەم جۆرە ڕوداوانە دەڵێن: دڵیان بەیەکەوە پاکە، بەڵام خۆی لەڕاستی دا پەیوەندی فکری نێوان مرۆڤەکانە کەلەڕێگەی ووزەوە دەبێت.

ئیماندارانی بەڕێز: زۆرجار کەسانێك هەن، ئەم پەیوەندی یە فیکریەیان زۆربەهێزە، وەکو بەهرەیەك پێیان بەخشراوەو دەتوانن بۆکاری سودبەخش بەکاری بهێنن. وەکو (شوێن هەڵگر) کەلەزەمانی پشوودا دزی دۆزیوەتەوە. یان کەسی ڕاکردوی دۆزیوەتەوە، بەوەی کەبەوجێگایەدا ڕۆیشتوە کەئەو کەسەی پێدا ڕۆیشتوە. کەئەمەش لەڕێگەی بونی ووزەی ئەوکەسەوە کەلەوشوێنە بەجێ ماوە، زانیویەتی. کەکەسانی تر هەستی پێ ناکەن وئەم شوێن هەڵگرە وەکو بەهرمیەك ئەوپەیوەندی فکریەی بەهێزەو دەتوانێ هەست بەو ووزەیە بکات. بۆصاڵحان وخواناسانیش، بەهۆی تەقواو خواناسی یەوە دەبنە خاوەنی کەرامەت، خۆزۆربەمان بەسەرهاتەکەی حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب وسەرکردەی سوپا (ساریە)مان بیستوە، کەکاتێ ڕۆژی هەینی دەبێ وخەلیفەی موسڵمانان حەزرەتی عومەر لەشارەکەی پێغەمبەر لەمەدینەی مونەوەرە، لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ووتاری بۆموسڵمانان دەخوێندەوە، لەوکاتەدا سێ جار لەسەریەك فەرموی: (یاساریَة الجَبَل، الجَبَل) ئەی ساریە ئاگات لەشاخەکەبێ، ئەی ساریە ئاگاداری شاخەکەبە. لەدوای تەواوبونی ووتارو نوێژی هەینی، صەحابەکان عەرزی حەزرەتی عومەریان کرد. باشە قوربان خۆساریەی

سەرکردە والەنەهاوەند لەغەزاو جیهادە. چۆن بوو وابانگت کردو وەکو ئەوەی لەشــتێك ئاگاداری بکەی وابــوو؟! حەزرەتی عومەر فەرمووی: بەڵــێ، هاتەبەرچاوم کەدوژمن پشــتی ســوپای موســڵمانانی گرتبوو خەریــك بوون شــاخەکەیان لێ بگــرن. منیش هاوارم لە (ســاریە)ی فەرماندە کرد. کەئاگاداربێ ونەهێڵێ شاخەکەیان لێ بگرن. بەڵێ دوای نزیکەی مانگێك (ســاریە)ی فەرماندە گەڕایەوە شــاری مەدینەو باسی ئەوەی پرســی کەئایا خەلیفەی موسڵمانان حەزرەتی عومەر سەردانی بەرەکانی جەنگی کردوە لەم ماوەیەی پێشــودا؟! صەحابەکان عەرزیان کرد نەخێر، خەلیفە لەشــاری مەدینە نەچۆتــە دەرەوە، بەڵام بۆچی دەپرســی؟! ســاریە فەرموی: ڕۆژێکی هەینی بوو. لەگەرمەی جەنگدا گوێم لەدەنگی خەلیفە عومەر بوو کەبانگی کردم (یاساريَة الجَبَل، الجَبَل). خێــرا فریاکەوتین ونەمانهێشــت دوژمن شــاخەکە بگرێ، بەڵام دواتر چەند هەوڵمــدا کەس خەلیفەی نەبینیبــوو!! صەحابەکان فەرمویان ســبحان الله ئێمە لەوڕۆژی هەینی یــەدا لەخزمەت خەلیفەدا نوێژی هەینیمان دەکرد، کەلەســەر مینبەر فەرموی: ئەی ســاریە شــاخەکە، شاخەکە!!

بەڵێ ئەمە کەرامەتی ئەولیاو پیاوچاکانەو پەیوەندیە ڕوحیەکانیان لەئەنجامی تەقواو خواناسی دا ئەوەندە بەهێز بووە!...

ئیمانــداران: ڕێگای دوەم بۆپەیوەندی مرۆڤــەکان بەیەکتری یەوە، دەستی مرۆڤی تێدایەو بەپێ ی پێشکەوتنی ژیان وزانست پەیوەندیەکان فراوانتــر بــوون. بەتەلەفــۆن وفاکس، پاشــان مۆبایــل هاتەکایەوە. کەلەڕێگەی هەواو شــەپۆلەکانی دەنگەوە کەخــوای گەورە بۆخزمەتی مرۆڤ دروســتی کــردون.. بەڵــێ مۆبایل وەکــو ئامێرێکی بەســوود، کارئاســانی زۆری بۆخەڵکی کردووە. بەڵام ئەگەر کەســی بەکارهێنەر

وەکو پێویســـت وبەجوانی بەکاری نەهێنیِ، دەیکات بەبەڵاو بەنیقمەت بۆخۆی وبۆخەڵکیش.. لەبەرئەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:

١. مۆســـیقای سەرزەنگی مۆبایل، پێویســـتە جەرەسێکی عادی بێت، نەك گۆرانی، برِوابکەن کەســـی واهەیە کەزەنگی مۆبایلەکەی مۆسیقای وای لەسەرە، کەمرۆڤ ئەگەر لەقەرەباڵغی دا گویێ لیٚ بێت، شەرمەزار دەبێت!!

٢. لەناو مزگەوتو خوێندنگاو نەخۆشخانەو سەردانی فەرمانگەکاندا، مۆبایلەکەت بێدەنگ بکە یـــان دایبخە، بۆئەوەی نەبێتە مایەی ئازارو نارِەحەتـــی بۆخـــۆت وکەســـانی دەوروبـــەرت. خۆئەگـــەر لەناونوێژدا جەرەست بۆهات، ئەوە دەست بکە بەگیرفانتاو مۆبایلەکەت دەربهێنەو دایبخـــەو بیخەرەوە گیرفانـــتو نوێژەکەت بەوە نابرِیێو زۆر باشـــترە لەوەی کەهەتا ســـەلام دانەوە دڵت هەرلای جەرِەســـی مۆبایلەکەت بیێو نەزانی چیتو تۆەو دەورو بەریشـــت مەشغوڵ بکەیو خەڵکی سەرنجت بدەنو بەچاوێکی نامۆ تەماشات بکەن.

٣. بالەکاتـــی پەیوەنـــدی دا قســـەکانت کـــورتو پوخت بـــنو تەنها پەیامەکـــەت بگەیەنەو تەواو، مۆبایل بۆئەوە نییە گفتوگۆی لەســـەر بابەتێکی گرنگ لەســـەربکەی. کەسی واهەیە تاکارتەکەی تەواو دەبێت تێر قسە نابێتو بەرامبەرەکەی بێزار دەکات لەئەنجامی زۆر قسەکردنی دا.. ســـەرەرِای بەفیرِۆچونی ئەو هەموو پارەی کەلەورِێگەیەوە بەفیرِۆ دەچێت.

٤. لەکاتی لێخورِینی ئوتومبێلدا، هەرگیز مۆبایل هەڵمەگرەو وەڵامی پەیوەنـــدی مەدەوە. چونکە دڵت وبیرو هۆشـــت هەرلای یەکیان دەبیٚ وزۆربەی کارەســـاتی ئۆتۆمبێل لەئەنجامی ئەوەوە بووە کەشـــۆفێرەکە مۆبایلـــی بەکارهێناوەو بیروهۆشـــی لای لێخورِینەکە نەماوەو وەختیٚ

بەخۆی زانیوە توشــی کارەساتێکی دڵتەزێن بووە. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کەبەڕاســتی لــەڕوی شــەرعەوە بەکارهێنانی مۆبایــل لەکاتی لێخوڕینی ئوتومبێلدا تاوان وگوناهەو دەبێ موسڵمانان خۆی لێ بپارێزن.

٥. پێویســتە لەبەکارهێنانی مۆبایل دا، کاتــی پەیوەندیەکە ڕەچاو بکرێ، لەکاتی نوێژدا، لەکاتی وەختی نان خواردندا، لەشەوانی درەنگدا، بەیانیان زوو، کاتی ئیسراحەتو پشوو لەهاوینانداا. ئەگەر ئیش وکاری زۆر زەرورو پێویست نەبێ، پێویستە تەلەفۆن بۆکەس نەکەیت..

٦. زەرور نــی یە هەمووکەس لەماڵــدا مۆبایلی هەبێ، ماڵی واهەیە (٦) کەســە، شــەش مۆبایلیــان هەیە. هــی وایان هەیــە دوو مۆبایلی بەژمارەی جیاواز لایە! ئەمە لەکاتێکا کەئەم کەســانە خەڵکانی هەژار یان مامناوەندن لەڕوی ئابوریەوەو هیچ پێداویســتیەکی گرنگیان بەم هەمــوو مۆبایلەنیەو تەنها زیادکردنی مەصرەفێکی بەلاشــە بۆ ســەر گیرفانو ئابوری خۆیان..

بەتایبــەت مناڵ لەقۆناغی ســەرەتاییو ناوەندی دا (بنەڕەتی) هیچ پێویســتی بەوەنــی یــە کەمۆبایلی پێ بــێ وهاندەکــەی بایی چەند وەرەقەیەك دۆلار بێ! کەلەڕوی کۆمەڵایەتیو ئابوریو تەندروستیەوە ئەم مناڵە لێی زیان مەند دەبێ..

زیانەکانی مۆبایل: لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە:

١. بەهۆی ئەوەی کەمۆبایل زۆرکات بەدەست کەسانی نابەرپرسەوەیەو بەناشایســتەیی بەکاردەهێنن، دەیان کێشــەی کۆمەڵایەتــی، تەنانەت کوشتنی لێ دروستبووە!!

٢. مۆبایل بوەهۆی ئابڕوبردنی چەندین کچ و، چەندین ژن لەســەر مۆبایل تەڵاق دراوە.

٣. چەند کچ وکوڕ لەڕێگەی مۆبایلەوە یەکتریان ناسی وزەواجیان کرد،

بەڵام ئـــەوەی بەموبایل زەواج بکات، هەربەموبایلیش (بەتەلەفۆنیش) تەڵاق دەدرێت.

٤. هەنـــدی جـــار مۆبایـــل تەکەبـــورو خۆبـــەزل زانیـــن لەمرۆڤدا دروســـتدەکات، ئەویش بەوەی کەســـی واهەیە مۆبایلێکی هاندی گران بەهـــای پێ یـــە، کەلەبەرچـــاوی خەڵکا بـــەکاری دێنـــێ. تەکەبورێك دەچێتـــە دڵیـــەوە. تەنانەت وای لێ هاتوە، کەســـی واهەیـــە بەتایبەت لەگەنجانی تازەپێگەیشـــتوو، کەڕۆژانەو حەفتانە بەشوێن هاندی گران بەهاوەیەو کامیان دوا مۆدێلی هاندی مۆبایل بێ، چەند گران بێ، ئەوە دەکـــڕێ وکۆنەکەی خۆی کەچەند ڕۆژێکە بەدەســـتیەوەمیەتی، بەزەرەر دەفرۆشێتەوە. کەئەمەش دەبێتە هۆی ئالوودەبونی بەمکارەو بەفیرۆدانی پارەی خۆی، وەکاتی زێڕینی خۆی. بەتایبەت بۆخوێندکاران کەبەڕاستی کاریگەریەکـــی یەگجار زۆری هەیە لەســـەر خوێندن ودەتوانین بڵێین: یەکێ لەهۆکارەکانی دواکەوتنی زانست لەکوردستاندا. کەخوێندکارێکی شەشـــی ئامادەیی بەئەندازەی شەشی سەرەتایی جاران زانستی پێ نیە. یەکـــێ لەهۆکارەکانـــی بەکارهێنانی زیاد لەپێویســـتی مۆبایلە لەلایەن خوێندکارانەوە.

٥. گەنجـــی واهەیـــە داوای لەخاوەن دوکانی هانـــدی مۆبایل کردوە، کەهاندێکی گران بەهای بە (قیســـتی مانگانە) پێ بفرۆشـــێ، بەنرخی زیاتر لەفرۆشتنی حازر، چونکە پارەکەی پێ نیە!. وەپرسیاری حەڵاڵو حەرامی لەڕوی شـــەرعیەوە بۆدەکەن. بەڵام ئەگەر مەسەلەی حەڵاڵو حەرامیش نەبێ (کەقیســـت لەڕوی شەرعەوە دروستە). باشە گەنجێك هێندە بێ پارەبێ وگیرفانی بەتاڵ بێو بێ کارو کەســـابەت بێ، پارەی هاندێکی باشـــی پێ نەبێ، باشـــە مۆبایلی بۆچیە؟! ئەی پاشان چۆن کارتـــی بۆ دەکـــڕێ؟ ئەی دەبێ لەچیدا بەکاری بهێنـــێ؟ دیارە بۆکاری

کۆمپانیاو شـــەریکەو بازرگانی قســـەی پێ ناکاتو هەرقسەی بێ سودو بەلاشـــی پێ دەکات. کەسەر ئێشە بۆ خۆشیو بنەماڵەکەشی وخەڵکیش دروســـت دەکات، لەبەرئەوە بـــەم لێکدانەوەیە، کڕینو پێ فرۆشـــتنی هاندی مۆبایل بەقیستو قەرز بۆئەم گەنجە حەرامە..

زیانەکانـــی مۆبایـــل لـــەڕوی تەندروســـتی‌یەوە: بەپـــێ ی چەنـــد ســـەرچاوەیەکی زانســـتی دەرکەوتـــووە کەلەکاتـــی هاتنـــی پەیوەندی بۆمۆبایل، کۆمەڵێك شەپۆلی کارۆموگناتیسی دەردەچن. ئەم شەپۆلانە بەڕێژەی (٪٤٠) زۆربەخێرایی لەلایەن ســـەرو دەســـتەوە هەڵدەمژرێن. بەپـــێ‌ی ئـــەوەش بوونـــی بورجـــی کۆمپانیاکانی تەلەفۆنـــات، لەکاتی بەکارهێنانیاندا، کاریگەری زیاتریان بۆســـەر ژینگەو مرۆڤەکان هەیە. سەرچاوە زانستیەکان گەیشتونەتە ئەوئەنجامەی کەمۆبایل دەتوانێت ئەو شەپۆلانەی کەلەڕادیۆوە دەردەچێت زۆربەئاسانی بگوازێتەوە بۆسەرمان و(دە) جار زیاتر لەشەپۆلی ئاسایی خۆی بیگەیەنێتە مێشکمان. هەربۆیە کاتێك لەتەنیشـــت تەلەفزیۆن، یان ڕادیۆ، یان کۆمپیوتەرەوە مۆبایلێك دادەنێیت، بەهاتنی تێـــل بۆناو مۆبایلەکەت، دەنگ وڕەنگی ئامێرەکان یەکســـەر دەگۆڕێن. دەرکەوتووە ئەوتیشکانەی کەلەمۆبایلەوە دەردەچن بەهۆی بەرزبونەوەی پلەی گەرمی ناوخانەکە، کاردەکاتە سەر پرۆتینی ناوخانەکانی لەش وڕێڕەوی کارو فەرمانەکانی دەگۆڕێت. بەمەش خانەکە دەست بەدابەش بوون دەکات، بەتایبەتی خانەکانی مێشكو چاوو گوێ. ئـــەم دابەش بونەش لەخانەکاندا نزیك بونەوەیە لەخانەو شـــانەکانی لەشی مرۆڤ.. بەمەش خانەکانی لەش کارو فەرمانی خۆیانیان لێ تێك دەچێت وخێرا بەرەو پیریەتی دەڕۆن. بەڵام لایەنە پەیوەندی دارەکان لەهەرێمی کوردستان بەپاساوی نەبوونی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی تاکو ئێستا هیچ ڕێنمایی وسنورێکیان بۆدانانی ئەو بورجانەی کۆمپانیاکانی

تەلەفۆنات دانە ناوەو بەشـــێوەیەکی هەڕەمەکی بورجەکانی مۆبایلیان لەناوشارو شـــارۆچکەکانی هەرێم بڵاوکردۆتەوە، بەبێ گوێدانە لایەنی تەندروستی وژینگەی مرۆڤەکان..

دکتۆر ســـەروەر جەمال باجەلان، پســـپۆڕی نەخۆشیەکانی مێشك‌و دەمـــار، دەربـــارەی بەکارهێنانـــی مۆبایـــل دەڵێت: پێویســـتە مۆبایل بۆکەمترین ماوەی قسەکردن بەکاربهێنرێت. هەروەها دەبێت هەوڵبدرێت لەجیاتی مۆبایل هۆکارەکانی تری پەیوەندی کردن بەکاربهێنرێ، وەکو: تەلەفۆنـــی نۆرماڵ‌و بەدیلی دیکەی مۆبایل. ئینتەرنێت‌و نامەو ئەوانە. بەکارهێنانی نامە لەتەلەفۆنکردن باشترە.. دەبێت هەوڵبدرێت مۆبایل (٣٠- ٤٠) سانتیمەتر دووربێت لێتەوە بۆئەوەی ئەوشەپۆلانە کەمترین کاریگەریان هەبێت. ئەگەر دووریەکە زۆرتریش بێ باشترە، هەوڵبدەی مۆبایلەکـــەت بەدەســـتەوە نەبێت‌و ســـەماعەی دەرەکـــی بەکاربهێنیت کەجیهازی مۆبایلەکەت لێتەوە دووربێت. لەکاتی خەوتن‌و پشوودانیشدا دوور لەســـەرت دایبنێیت. لەبەرئەوەی کەجەرەســـت بۆهات، یەکســـەر شـــەپۆلەکە نزیك ســـەرت نەبێت. (هەوڵبدەیت مۆبایل بەکارنەهێنیت کاتێك بەشـــەحنەوەیە، لەبەرئەوەی لەکاتی شـــەحن کرندا شەپۆلەکان بەهێزتر دەبن. کەئیشـــت پـــێ‌ی نەبوو هەوڵبدەیـــت بیکوژێنیتەوە)... هەرچەندە هەتا ئێســـتا لێکۆڵینەوە زانســـتیەکان بەتەواوی یەکلاییان نەکردۆتەوە، کەمۆبایل ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەیە بەچ جۆرە وەرەمێکی مێشـــکەوە. یان ســـەرو مل‌و مێشـــکەوە، بەڵام ئاماژەی ناڕاســـتەوخۆی هەیـــە، مۆبایـــل کاردانەوەی کتوپڕو کورتخایەنـــی نیـیە. بەڵکو بەندە لەســـەر گەرمکردنـــی خانەکان. شـــەپۆلەکەی زۆر بەهێـــز نیـیە. بۆیە کاردانـــەوەی درێژخایەنە ئەگەر هەبێت، بـــە بەکارهێنانی زۆر ئینجا شت سەرهەڵدەدات، لەبەرئەوەی مۆبایل هێشتا تەمەنی (١٠ - ١٥) ساڵە.

لەبەرئەوە ئەگەر بۆماوەی (٢٠ -٣٠ -٤٠) ســاڵ بەردەوام بێت لەوانەیە هەندێــك زەرەر دەربکەوێت کەپــێ ی نەزانین لەکاتی خۆی دا. کاتێك پێی بزانین کارلەکار ترازابێت، دوای (٣٠) ســاڵ بەکارهێنانی مۆبایل وەرەم دروستبکات، کەتازە ئەوکاتە ناتوانرێ ڕابگیرێت..

هەروەهــا لەژمارەیەکی گۆڤاری (خاك) دا نوســرابوو: مۆبایل تۆوی پیــاوان لەناودەباتو هۆکارێکــە بۆلەدایکبوونی منداڵی شــێوەتێکچوو شێواو!!.

بەکورتی بۆدورکەوتنەوە لەزیانەکانی مۆبایل لەسەر جەستەو بواری تەندروستیمان. پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین.

١. هەوڵبــدە پەیوەندیەکانــت لەکورتتریــن مــاوەدا تــەواو بکەیت وپەیامەکــەت بگەیەنی، هەوڵبدە قســەکردنت لەســەر مۆبایل بەهیچ جۆرێك لەچارەکە ســەعاتێ تێپەڕنەکات، چونکــە لەوماوەیە بەدواوە زیانەکانی مۆبایل بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکەن.

٢. لەکاتی پەیوەندی دا، دەست لەئاریەلی مۆبایلەکە مەدە کەدەکەوێتە ســەروی ڕووی پشــتەوەی. چونکە ئەمە دەبێتە خولانەوەی شــەپۆلە کارۆموگناتیسیەکانو چەند هێندبوونی زیانەکانی.

٣. ئەگەر شــەپۆل نزم بوو، بەمۆبایل قســە مەکە، ئەگەر هەرناچار بوویت، مەیەڵە پەیوەندی یەکەت (٢٠) چرکە زیاتر بخایەنێت، چونکە لەشــەپۆلی نزمدا ڕێژەی ئەوشەپۆلە کارۆموگناتیسیانەی مۆبایل دەری دەدات (٦ - ٧) ڤات زیاد دەکات.

٤. چەنــدی دەتوانــی مۆبایلەکــەت لەگوێــت دوور ڕابگرە. چونکە چەنــدی لەگوێــت نزیکتربێــت ئەوەنــدە کاریگەری خراپی لەســەر لاشەت بەگشــتیو شانو ملت زیاتر دەبێ وتوشی سەرئێشەو چاوکزیو گــوێ کەڕیو فەقەراتــی مل دەبیو زاکیرەت نامێنێو زۆر زوو شــتت

بیردەچێتەوە.

٥. هەرگیز موبایل لەلای منالی ســاواوە دەمەنێ، چونکە کاریگەری لەسەر ئەومناڵە دروست دەکات.

٦. هەوڵبدە مۆبایل وەکــو ئاگادارکەرەوە، (جەرەس) بەکارمەهێنەو لەپشت ســەرتەوە دایمەنێ بۆئەوەی لەخەو خەبەرت بکاتەوە، چونکە زیانی زۆرت پێ دەگەیەنێ.

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: ڕاستە مۆبایل سوودی زۆرە، بەڵام زەرەریشی زۆرە. زانایەکــی (هینــدی) بەناوی (هاگێرتی) هەســتا بەئەنجامدانی توێژینەوەیەکــی نــوێ دەربارەی مۆبایــل، ئەم زانایــە ماوەیەك بوو چاودێری چۆنیەتی گەشــەکردنی ڕووەکی (ساردۆنیا)ی دەکرد. جارێك شــەپۆلەکانی ڕادیــۆی بەکارهێنا لەم پرۆســەیەدا، کەئەم شــەپۆلانە لەمۆبایل دا بەکاردێن. بــۆی دەرکەوت کەکاریگەریەکی گەورەی هەیە لەســەر کەمبونەوەی گەشــەی ڕووەکەکە. پاشــان هەمان توێژینەوەی لەسەر (کولەکە) ئەنجام دا. کۆمەڵێکی لەناو قەفەسێك داناو کۆمەڵێکی تر لەشــوێنێکی دوور لەقەفەسەکە. شــەپۆلی ڕادیۆشی لەکۆمەڵەکەی دەرەوە دانــا. پاش چەنــد مانگێك ئەو کۆمەڵەیــەی کەلەناو قەفەس پارێزراو بوون لە (٦٠٪) گەڵایان زیاتر گرتبوو وەلە (٧٤٪) لقی زیاتریان دەرکردبوو!..

زانکۆیەکــی هەمان وڵاتیش دەڵێ: ئــەم زیانە تەنها بۆ ڕووەکەکان نییە. ئەوان ڕۆژێك بۆماوەی کاتژمێرو نیوێك مۆبایلیان لەناوشــانەی هەنــگ داناوە. بینیان کەشــاژنی هەنگ هێلکــەی زۆرکەمتر کردبوو، کەمبونەوەیەکی زۆریش ڕوویدا لەژمارەی هەنگەکان!!.

لەکۆتایی دا: مۆبایل وەکو خەڵاتی خوا تەماشــابکەو سوپاسی خوای پەروەردگاری لەسەربکە کەئەو هەوایەو هێڵەکانی گواستنەوەی دەنگی

ئــاوا بۆ خزمەتی تــۆی مرۆڤ دروســتکردوەو ئەوەنــدەی موعجیبی بەدروســتکەری مۆبایلەکە، هەزاران جاری ئەوە ســەردابخە بەرامبەر بەگەورەیــیو دەســەڵاتی ئەو خوایەی کەلەو ئاســمانەدا ڕێژەی هەواو شــەپۆلی دەنگی ئاوا دروســتکردوە. کەدەنگ دەگوازێتەوەو هەموی بۆ خزمەتی مــرۆڤ خوڵقاوە، تاوەکو مرۆڤیش بــۆ چاکەو چاکە خوازی بەکاری بهێنێت.

سەرچاوەکان:

١. ووزە، دەروازەیەك بۆ ئاوێزان بوون. پەری حمە میرزا، ل١٠٥، ل١١٢، ل١١٤، ل١١٦.

٢. رِحْلَةٌ مَعَ الصّادِقين، محمود المصري، ص٣٤.

٣. رَقائِق العريفي، د.محمد عبدالرحْمن العريفي، ص٩٢.

٤. گۆڤاری (ئاونگ) ژمارە: سفر، ئەیلولی ٢٠٠٩، ل٣٨.

٥. ڕۆژنامەی (کۆمەڵ) ژمارە: ٤٩٩، ٢٠١١/١١/٢٩، ل٤.

٦. گۆڤاری (ڕایز) ژمارە:٣، ئۆکتۆبەری (٢٠١٠)، ل٤٠.

# ووتاری دووەم
# بۆ مانگی ڕەجەب
# با ئاگامان لەم
# سێ شتە بێت

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبهِ أَجمَعِينَ:

ئيماندارانی بەڕێز: پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) لەفەرمودەیەکی زێڕینی دا، دەفەرموێ: (اللّهُمَّ إنِّي أعُوذُبِكَ مِنَ الهَمِّ وَالحَزَنِ، وَمِنَ الجُبْنِ وَالبُخْلِ، وِمِنْ عِجْزِ وَالكَسلِ، وَمِنْ غَلَبَةِ الدّيْنِ وَقَهْرِ الرِّجالِ).

بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرمودەیەدا ئاماژەی بەچوارشـت کـردوەو پەنای گرتوە بەخوای پـەروەردگار کەپەنای بدات وبیپارێزێ لەم چوارشـتە لەناوبەرە، پڕوکێنەرە، لەکارخەرە، کەتوشی هەرتاکێك، هەرخێزانێـك، هەرکۆمەڵگایـەكو گـەل ونەتەوەیـەك ببـێ. لەناوی دەبـات وژیانی لێدەکات بـەژان. کەدەتوانین بڵێیـن: یەکێ لەئامانجە هەرەگەورەکانـی ئیسـلام ئەوەیە کەهاتووە ئەمانـە نەهێڵێ یان لانی کـەم زۆر لاوازیان بکات بۆئەوەی مـرۆڤ بتوانێ بەبەختەوەری بژیو وولآت پێشکەوتوبێ. کەدەتوانین بڵێین پێوانەی پێشکەوتنی هەرکەسو خێـزانو گـەلو میللـەتو حکومەتێـك ئەوەیـە کەپارێزراوبێت لەم چـوار بەلا گەورەیە. کەئەوانیش: (خەمۆکـی بوون، ترسو دڵەڕاوکێ، دەستەوسـتانیو لەجوڵەکەوتنو وەسـتانی بواری فیکروبیر، قەرزاری وکەوتنـە ژێرقـەرزەوە).. کەبەداخـەوە ئەمـڕۆ لەجیهانـدا گەلێـك لەمرۆڤـەکان، لەدەوڵەتەکان، لە گەلو نەتەوەکان دەناڵێنن بەدەسـت ئـەم چوارەوە. لەکۆمەڵگای ئێمەشـدا ئەم چوارشـتە، نەخۆشـی تاك تاکی ئـەم کۆمەڵگایەی ئێمەن. دەبینی ئەو هەموو گەنجە بێ ئومێدە هەیە. ئەم هەموو نەخۆشـیـیە دەرونی‌یە کەجاران خەڵکی نەیدەزانی نەخۆشی دەرونی چۆنەو چی‌یە. تەنانەت دکتۆری نەخۆشی دەرونیمان نەبوو. کەس لەوبەشـەدا نەیدەخوێند. نەخۆشخانەی تایبەتی دەرونی نەبوو، چونکە نەخۆشی یەکە بونی نەبوو. یان هێندە کەم بوو شایانی باس نەبـوو. وەچارەسـەری هەرلەخۆیدا بۆدەکرا، کەکەسـێك خەمو

مەراق وخەفەتێکی هەبوایە، بەچاوپێکەوتنی دۆستێکی خۆشەویستی کەلەبەرخوا یەکتریان خۆش دەویست، بەسەردانێك چونە ناومزگەوتو کۆڕو مەجلیسی زیکرو مەوعیزەو خواناسانو دڵ ڕوناکان. ئەوخەم ومەراقەی نەدەماو چارەسەر دەبوو. بەڵام: ئەمڕۆ (پەنادەگرین بەخوا) چەندین گەنج دەبینی لەبەهاری تەمەندایە، کەچی مرۆڤێکی خەماوی، ووره ڕوخاو، ترسنۆك، ترس مەرج نىیە هەرلەدوژمنی خوێن ڕێژو لەناو جەنگ وتەق وتۆقدابێ، بەڵکو ترس لە: هەژارکەوتن، لەوبازاڕەی کەبەناوی ئازادەوە خەڵکی هەژاری هەڵلوشی، ترس لەبەرزو نزمی دۆلار، ترس لەدزو دزی لێکردن، ترس لەئیفلاسی حیزبی ودەرکردن وهەڵوەشانی حیزبەکەی، ڕوخانی دەسەڵاتەکەی، ترس لەخیانەتی برادەرو دۆست، ترس لەخیانەتی دەزگیرانداری، کەپێشتر یان ئێستا پەیوەندی لەگەڵ کەسێکی تر نەبوبێ، پاشان بەخیلی بۆتە دیاردە. کێ یارمەتی کێ دەدات بەبێ بەرامبەر، کێ ئەوەی بۆخۆی پێ ی خۆشە بۆهەموو خەڵکیش ئاوا پێ ی خۆشە؟! ئەی قەرزاری چی بەمرۆڤایەتی کردوە، چەندین وولات واکەوتۆتە ژێر قەرزی زلهێزەکانی جیهانەوەو نەوەکانی داهاتوشی هەرئەبێ خەریکی قەرزدانەوەبن. نەك بنیات نان وپێشکەوتنی وولات. پاشان قەرزاری ڕوی کردۆتە زۆربەی کەسو ماڵو کۆمپانیاکان، قەرزاری بانق کەحەزی لەهەرچی بووە لەئوتومبێل، کەلوپەلی ماڵ دەچێ دەیهێنێ بەقەرزو بەحیساب بە (قیست) دەیداتەوە، کەچی وەختێ بەخۆی دەزانێ پێ ی نادرێتەوەو ئەمجا پارە قەرزەکەی زیادی دەچێتەسەرو پەنابەخوا، توشی ڕیباخۆری دەبێت. وەزۆرجار ئەوەی هەشیەتی لەدەستی دەدات.. دەی باشە چارەسەر چی یە بۆخۆپارێزی لەم بەڵا گەورەیە؟! چارەسەرەکە بەوە دەبێت کەوەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنا بۆپەروەردگارمان ببەین وبڵێین خوایە

پەنات پێ دەگرین وبمانپارێزە لەم چوارشتەو توشی نەبین ونەکەوینە ژێرباری. وەپاشانیش بائاگامان لەم (سێ) شتەبێت وبیانپارێزین:

یەکەم: ژیری وعەقلمان. چونکە بەڕێزان، شـێت ئەوکەســە نی یە کەشــت نازانێ، کەچــاك وخراپ، پاکو پیس، لێــك جیاناکاتەوە، ئەوە نەخۆشــی ئەعصابو دەماری هەیــەو زۆرکات چارەســەری بۆدەکرێ، بەلام شــێتی ڕاستەقینە ئەوکەسەیە، کەعەقلی خۆی داخستوە، خۆکەم نین ئەوکەســانەی کەخودی خۆیانیان بیرچۆتــەوە، لەدەنگ وجولەو ووتــەو توانــاو تەنانەت لەڕۆیشتنیشــدا دەیانەوێ وەکو کەســێکی تر خۆیان بنوێنن، نابینی چۆن دەنگی ناســك دەکاتەوەو لاســایی کەسانی تر دەکاتەوە لەقســەکردندا، لەجولەدا بەلەنجەولار دەڕوات، لەووتەدا، لەجیاتی زمانی شیرینی کوردی، (OK)ی ئینگلیزی بەکاردێنێو هەرئەم ووشــەیەش لەم زمانە دەزانێ!!.. مرۆڤی واهەیە ســەیری تەلەفیزیۆن دەکات، لەتەمسیلەکەوە دەیەوێ لاسایی کەسایەتیەك بکاتەوە. زۆر کوڕ هەیە، بەســەری تاشراوو عەینەکی ڕەشەوەو پانتۆلی تەسکەوە دەیەوێ خۆی بەڕۆشــنبیر نیشــان بــدات. کەچی هیــچ بڕوانامەیەکی نی یە! هەرمۆدێلەی لاســایی کەسایەتیەکە. بەداخەوە ئەمڕۆ لەسەدەی بیست ویەکــدا، مرۆڤ بۆتە کۆیلــە، کۆیلەیەکی مۆدێرن بەدەســت مۆدەوە!! هەرخەریکــی ئەوەیە دوامۆدێلی فلان شــتی هەبێ، تابەدەســتی دێنێ ســەیردەکات بەســەرچوو، مۆدێلێکی ترهات. هەمووشتی قازانجەکەی دەچێتە گیرفانی چەند سەرمایەدارێکەوەو ئەوخەڵکەش کەهەربەشوێن مۆدەوەیە، بۆتە کۆیلەی. بەلام: کۆیلەو عەبدی جاران تامردن لەهەولی خۆڕزگارکردندا بوو. ئاواتی ئەوەبوو پەتی عەبدایەتی لەملی دابکەنێ، یەکێکی وەکو وەحشــی ئامادە دەبێ حەمزەی مامی پێغەمبەر بکوژێ. تەنها لەپێناوی ڕزگاربونی لەکۆیلایەتی بەلام ئەم کۆیلایەتیە بۆمۆدێل

ومۆدکاری. هەرکەس کرایە گەردنی، ڕۆژ بەڕۆژ لەقوڕگی قایمتر دەبێ وهەتا لەناوی نەبات لێ ی نابێتەوە!، لەبەرئەوە تۆی موسڵمان سەربەستی خـۆت مەکوژە، چونکە تۆخـۆت تایبەتمەندی ورەنـگ وبۆنی خۆتت هەیە. واخۆت نیشان بدە. تەنهاو تەنها یەك کەس هەیە لەم جیهانەدا، تایبەتمەنـدی وەکـو تۆی هەبێـت، ئەویش خودی خۆتـی. خۆئەگەر باوەڕنەکـەی چەند گـەورەی وەرە سـەیری پەنجەمۆرەکەت بکە، خۆ ڕۆژانە ئەوە دەبینی کەپەنجە مۆرەکەت لەهیچ مرۆڤێکی تری سەرئەم زەویە ناچێ!! تەماشـای (دەنگە ژێکانت) بکە، بزانە دەنگی تۆ لەهیچ کـەس ناچێ وهی تـۆش لەکەس ناچێ، تەنها ئەوەیـە لەگەڵ هەندێ دەنگا نزیکیەك هەیە. بۆنی لاشـەت، (DNA)ی ناو خوێنەکەت. ئەمانە تەنها هی خۆتن ونەبەخشراون بەکەسی ترو تۆ لەمانەدا تەنها خۆتیو کەسـێکی وەکو تۆنیە. گلێنـەی چاوەکەت، کەگلێنەی چاوی کەسـێك لەکەسێکی تر ناچێ، لەووڵاتێکی وەکو ئەمریکادا، صندوقی پارە هەیە. (قاسـەی پارە) کەداخـرا، تەنها بەوە دەکرێتـەوە کەخاوەنەکەی چاو بخاتەسـەر شـوێنی کلیلەکە، کەپێشـتر ڕەنگی چاوی ئەوکەسەی تێدا تۆمارکراوە، یەکسەر دەکرێتەوە. غەیری چاوی ئەو بەچاوی کەسی تر ناکرێتەوە، کەبەڵگەیەکی زانسـتـیـیە لەسەر ئەوەی چاوی هیچ کەسێك لەهەموو شتێکا وەکو چاوی کەسێکی تر نـیـیە.

دەی کەواتــە حەیفە بەعەقڵی کەسـێکی تــر بیربکەیتەوەو عەقڵی خۆت بوەستێنی. بەڵێ شوێن کەوتن وچاولێکەری. دوو دەردی کوشندەن، دووچـاری هەرگروپ وکۆمەڵگایەك ببنەوە ڕەنج بەخەسـاری دەکەن. لەسـەرەتاوە لەناخـەوە دەیان ڕوخێنێـت، لەڕێگـەی چەکەرەکردنی هەسـتی خۆبەکەم زانینەوە، پاشـان سەرسـام بـوون بەهەرچییەکی بەرامبـەر هەیـە، ئـەو کۆمەڵگەیە یان ئـەو گروپە بـەرەو کۆیلەیی

دەبـــەن لەبیرکردنـــەوەو بیگـــرە تادەگاتە جوڵەو کارکـــردن. وایان لێ دەکەن نەخۆن لەبەرهەمی دەســتی خەڵکانی تر نەبێت.. بیرنەکەنەوە بەعەقڵــی خەڵکی ترنەبێت. کارنەکەن بەپێی نەخشــەو بۆ ئامانجی خەڵکانی تر نەبێت. لەوانەش مەترسیدارتر، دوێنێو ئەمڕۆو سبەینێ نابینن بەچاوی خەڵکانی تر نەبێت. بەلای کەسانی شکست خواردووەوە چاولێکەری ســەرەتایەکە بۆ پێشکەوتنو هەڵسانەوە، بەڵام لەڕاستی دا چاولێکەری ولاســایی کردنەوە، ڕاگەیاندنی ئیفــلاس کردنە لەهەموو ڕوویەکەوە. مامۆستایەکی بەڕێز دەفەرموێ: لەسەردانێکمدا بۆ وڵاتی کۆریای باشــور لەیەکێك لەپەیمانگا پێشکەوتووەکانی ئەو وڵاتە باسی ئەوەیان بۆکردین، ئەوان چۆن پێشکەوتن. مامۆستای یەکێك لەخولەکان گێڕایەوە کەچۆن هەوڵیانداوە لەڕێگەی بیرو کاری خۆیانەوە پێشبکەون، باســی لەوەکــرد کە جارێکیــان باوکی قوتابی یەك گەشــت دەکات بۆ یەکێك لەوڵاتە پێشــکەوتووەکانو دوای گەڕانەوەی پێنوســێکی جوان بــۆ کچە قوتابی یەکــەی دێنێت. بەیانی کچەکــە دەچێتە قوتابخانە، پێنوســەکە نیشــانی قوتابیەکانی تر دەدات وئەوانیش پێی سەرســام دەبن، لەوکاتەدا، مامۆســتاکەیان پێنوسەکە لەو کچۆڵەیە وەردەگرێتو دەیشــکێنێت وپێیان دەڵێت: ئێمە پێویستمان بەپێنوسی باشی وڵاتان نییە. بەڵکو پێویســتە خۆمان پێنوسی باش بۆ خۆمان دروستبکەین!!. ئەم هەســتە ســەرەتای گەشەســەندنی ئابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسی بوو لەو وڵاتەدا.. ئێســتا بابچینە ســەر بەســەرهاتێك کەگوزارشــت لەچارەنوســی ئەوکەسانە دەکات کەبەم جۆرە دەژین. دەڵێن: لەکۆتایی پەنجاکان وسەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوو. گەلانی عێراق فێری خوویەکــی خراپ ببون. ئەویش ڕژانە سەرشــەقامەکان بوو. جا بەهۆ بوایە یان بەبێ هۆ، هەرکەســەو لەڕاســتی خۆیــەوە چەپڵەی لێدەداو

دەیانگـوت: بژی فـلان.. دەڵێن: پیاوێکی کوردیـش، دوای یەکێك لەو خۆپیشاندانانە دەکەوێت وماوەی (دە) ڕۆژێك لەماڵ وون دەبێت. تومەز دەچێت بۆ (بەغدا)، ڕۆژی یانزەهەم، بەخێر تەشریف دێنێتەوە بۆماڵ، لەگەڵ خۆشـی دا (دە، دوانزە) برادەرێکیش دەهێنێتەوە بەمەبەسـتی داوەت کردنیان، بێئاگا لەوەی قرۆشێك لەماڵەکەیاندا نییەو ئەم چەند ڕۆژەش ماڵو منالی بێ پارەو پول بەجێ هێشتوە.. دوای گەیشتنەوەیان بۆماڵەوە، لەخێزانەکەی دەپرسێت: ئەرێ ئافرەت چیمان هەیە بۆ نانی نیـوەڕۆ، میوانمان هەیە؟! ژنەکەش لەسـەرخۆ دەڵێت: پیاوەکە (نانی چەپڵە) بە (چێشتی بابژیەوە)!! جابەڕێزان، ئەمەیە چارەنوسی لاسایی کردنەوەو چاولێکەریو داخستنی عەقڵی خۆو بەبیرکردنەوە بەعەقڵی کەسانی تر.

ئیمانداران: ئێمەی موسـڵمان کەلەبواری تەکنەلۆژیاو پێشـکەوتنی مـاددی دا دواکەوتویـن، دڵنیابـن هـی دینەکەمـان نـی یـە. بەڵکو بەپێچەوانەوە هی پشـت کردنمانە لەئیسـلام وپەیامـی خوا کەوەکو خـۆی تێ ی نەگەیشـتوین یان جێ بەجێمان نەکـردوە، ئەینا بابێین تەماشاکەین بزانین وولاتێکی پێشکەوتوی وەکو (یابان) بەچی گەیشتۆتە ئەوئاسـتەو ئایا هەموی ئیسلام فەرمانی پێ نەکردوە؟! جابابەیەکەوە سەرنج بدەین لەهۆکاری پێشکەوتنی بواری ماددی یابانیەکان:

١. کارکردنی زۆرو خۆماندوکردن: هەرتاکێك لەیابان لەساڵێکدا (٢٤٥٠) کاتژمێـر کاردەکات. واتە: ڕۆژانـە (٧) کاتژمێر بەبەردەوامی. کەئەمە خوا فەرمانی پێ کردوە. (وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ والمُؤْمِنُون). خوای گەورە باسـی (عەمەل وکاروکردەوە) دەکات، نەك دانیشـتن بۆ قسەی زل. پێغەمبەری ئیسلامیش (ﷺ) فەرمویەتی: (اللّهُمَّ بارِك لَأُمَّتي في بُكُورِها). خوایـە بەرەکەت بخەیتە کاری بەیانیانی ئوممەتەکەمەوە.

دەی بابزانین ئێمە بەقسەی خواو پێغەمبەری خوامان کردوەو کارمان کردوە؟! نەخێــر. بەبەڵگەی ئەوەی، بەئاماری ڕاگەیەندراوی وەزارەتی دارایی وئابوری لەهەرێمی کوردستان ساڵی (٢٠٠) ملیار دیناری چاپ. بۆ معاشخۆری (بن دیوار) کەلەژێر دەیان ناوو ناونیشانی وەهمیو خەیاڵی دا موچە وەردەگرنو هەرچــی ئیش وکاربێ نایکەن وهیچ بەرهەمێك پێشــکەش ناکەن وناویان لێناون (بــن دیوار) واتە: بێ ئیشوکار لەبن دیواری ماڵانو مزگــەوتو فەرمانگەکانو بارەگای حیزبەکان کەوتونو تەنها موچە وەردەگرن بەبێ کار!!

بڕوابکــەن ئــەوەی کارنــاکات وموچــە وەردەگرێ، زۆرتــرە لەوەی کەکاری باش دەکات وموچە وەردەگرێ. ئایا ئێمە بەقسەی پێغەمبەری خوامــان کــردوەو بەیانیــان زوو پەلامــاری کارو کەســابەتمان داوەو بەکاروپیشــەیەکەوە خەریــك بویــن؟! یــان تانیوەشــەو نەخەوتوین وبەیانیانیش ســەعات (٩ - ١٠) لەخەو هەڵدەســتین وبەدەم باوێشــك دانەوە بەیانی باش دەکەین. کەتاکی یابانی ئەوکاتە وەختی پشویەتی، چونکە لەبەیانی زووەوە خەریکی کارە!

٢. شــەرمکردنو ڕێــز لەکەســی گەورەتــر لەخۆگرتــن، کەئەمەش فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغيرَنا، ويُوَقِّرْ كَبيرَنا).

٣. خۆپاراســتن لەخەرجی زیــادە: یابانیەکان بەهەموو شــێوەیەك خۆدەپارێزن لەئیسراف وزیادە مەصرەفی لەپۆشاك وخۆراك وخانوودا. ئەوکابــۆو پانتۆڵە شــڕەی گەنجێکی کارکــەری یابانــی کەئەندازیارە لەکارگەیەکدا لەبەری دەکات، گەنجەکانی لای ئێمە بێزیان نایە دەستیشی لــێ بدەن. خــۆلای ئێمە ماڵی واهەیە، پڕی چەنــد کانتۆر جلوبەرگی هەیــە، کەهــی وایان تێدایە یــەك دووجار لەبەرکــراوەو تەواو. بەڵام ئیتر لەبەرناکرێ، چونکە مۆدی بەسەرچوە!!. وەیابانیەکان لەخواردندا

زۆر كــەم خەرجين وئــەوەی لای ئێمە بەژەمێك دەخــورێ ودەڕژێ!،
لای ئــەوان بەشــی چەند ڕۆژێك دەكات، دەی ئەمـــەش هەرفەرمودەی
پێغەمبەری خوایــە (ﷺ) كەئەوی یابانی بەكردار جێبەجێی كردوە،
كەخۆشەویســت (ﷺ) فەرمویەتــی: (ماعالَ مَنْ اقْتَصَدَ). دەســت كورتو
هەژار نابێ ئەوكەسەی كەدەست پێوەگرەو زیادە مەصرەفی ناكات. ئەی
خوای پەروەردگار نەیفەرموە: (وكُلُوا واشْرَبُوا ولاتُسْرِفُوا) بخۆن وبخۆنەوەو
تێروتەســەل بن، بەڵام ئیسراف مەكەن وزیادەڕەوی مەكەن لەخەرجی
كردندا.

٤. ڕەخساندنی بونی هەلی كاركردن بۆ گەنجان وهێزی كار: بەهەزاران
كۆمپانیــاو شــەریكاتی كردۆتــەوە، كــە هەركەس لەبواری شــارەزایی
وپسپۆڕی خۆی دا دەتوانێ كاری تێدابكات. بەڵام لێرە دەرچوی زانكۆو
پەیمانگا ئەبێ لەســەرجادە بســوڕێتەوە، یان لەبارەگایەكی حیزبی دا،
كەئیمانی پێی نیە بۆ بەرژەوەندیو پارە درۆبكات، یابانیەكان بەدەست
ڕەنگینیو پڕ ئیشــیان ئوتومبێلی (نیســان) دروستدەكەن لای ئێمەش
لەبەربێ كاریو دەســت بەتاڵی خەڵكی (درۆی نیسان) دروست دەكەنو
دڵی یەكتری پێ دەتۆقێننو یەكتری پێ مەشغوڵ دەكەن!..

دەی تەماشــاكە كاركردن ودەســت ڕەنگینیەكەی ئەوی تاكی یابانی،
هەرجێ بەجێ كردنی فەرمودەكەی سەروەرمانە (ﷺ) كەفەرمویەتی:
(إِنَّ اللــهَ يُحِــبُّ العَبْدَ المُحْتَرِف) خوای گــەورە ئەوبەندەیەی خۆش دەوێ،
كەخاوەن پیشــەیەو دەســت ڕەنگینە.. كەدەســتی بەخشــینی هەیەو
وەرناگرێ. خۆئاشــكرایە كەپێغەمبــەری خواش (ﷺ) چەندە دوژمنی
درۆ بووە. تەنانەت لەقورئاندا خوای گەورە لەعنەتی لەدرۆزن كردوە،
دەی ئایا خەتای ئیســلامە كەموســڵمانەكە پیشەو ئیشو كاری نیـیەو
دەست ڕەنگین نـیـەو هەرهاوردە دەكاتو هەرگیز دەرزیەكی پێ دروست

ناکـــرێ وخەریکی درۆکردن ودرۆ هەڵبەســـتنە؟! نەخێـــر ئەوە لادانە لەبەرنامە پاکەکەی ئیسلام کەئەوەی هێناوەتە بەرهەم..

٥. خۆبەدەســـتەوە نەدان بۆ زروفـو زەمان: ئەگەر ســـەرنجی وولاتی یابـــان بـــدەی دەبینـــی خاکی یابـــان زۆر بـــێ پیتە. لـــەڕوی ماددەی ئەندامییەوە وەکو نەوتو کانزاکان زۆر هەژارە، وولاتی یابان، بەتایبەت پایتەختەکـــەی (تۆکیـــۆ) زۆرترین بومەلەرزەی لـــێ دەدات. لەجەنگی جیهانی دووەمدا، لەســـاڵی (١٩٤٥)دا هێرۆشـــیماو ناکازاکی وێران بووە. تائێســـتاش شـــوێنەواری ئەوچەکە ئەتۆمیەیان هەرلەسەر ماوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشـــدا هەرتەسلیم نەبوون. دەستی سواڵیان ڕانەخستوەو داوا لەخەڵکی وولاتان بکەن یارمەتیان بدەن وکەم ئەندام وبێ دەست وقاچیان بۆبەخێوبکـــەن، لەیابان، ئەوەی کەدەســـتی نییە، بەقـــاچ کۆمپیوتەر بەکاردێنێو کاری خۆی دەکات. لەگەڵ ئەو هەموو نەهامەتیەی بەسەری هاتوەو ســـالانە بەهۆی بومەلەرزەوە بەســـەری دێ. وەسەرەڕای ئەوبێ پیتیەی خاکەکەی، کەچی بەردەوام بەرهەمی جوانترو ســـەرنجڕاکێش تر پێشکەش بەجیهان دەکاتو ووشەی (یابانی) بۆتە ڕەمزی شتی باشو پتەوو جوانو خۆڕاگر. شـــتە دروستکراوەکانیشیان وەکو مرۆڤەکانیان خۆڕاگرنو بەڕاستی مرۆڤ سودیان لێ دەبینێو لێیان دڵنیایە، چونکە بەبێ غەلو غەش دروســـتکراوەو ئەوپەڕی دڵســـۆزی لەدروستکردنیدا بەخەرج دراوە، ئەمەش هەرفەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کەفەرمویەتی: (إِنَّ اللــهَ يُحِـبُّ إِذا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَـهُ).. بەلام بەداخەوە لای ئێمە هەرخەریکی گۆرانیو ڕەقسو ســـەماو کلیپو ئەم جۆرە شـــتانەین کە نـــە بۆ دنیا باشـــە، نە بۆ قیامەت. ئەوەشـــی کەخەریکی بازرگانی یە، داوا لەوولاتان دەکات کەکامە شـــتی خراپ وبێ کەڵکە ئەوەی بۆبنێرێ. وەوای بۆدروست بکات کەگەیشتە ماڵی کڕیار بسوتێ وکەڵکی نەمێنێ!

خەریکە صەنعەت وکاری ئەوانیش تێك دەدەن. دەی باشــە ئەم کەسە بەناوموســڵمانە، خەتای ئیسلام وموسڵمانیەتیەکەیەتی کەئاوا دەکات؟!
نەخێر، چونکە ئیســلام لەســەرزمانی پێغەمبەرەکەی خۆی لەوجۆرە کەسانە بێ بەری کردوەو پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویەتی: (مَنْ غَشَّــنا فَلَيْسَ مِنّا). وەبۆغەش کردنیش لەکافرو بێ دینیش، ئەویشی حەرام کردوەو فەرمویەتی: (مَنْ غَشَّنا فَلَيْسَ مِنّا). هەرکەس غەش بکات، جاغەش وخیانەتەکە لەهەرکەس بکات، کافربێ یان موســڵمان، لەئێمە نی یە.. ناسنامەی ئیسلامەتیەکەی لێ وەرگیرایەوە، پلەی ئەندامیەکەی نەمــا. کەواتــە کــەس مافی ئەوەی نی یــە کەبڵێ مادام فلان کەســی موسڵمان ونوێژکەرو حاجی، ئاوا غەش دەکاو دەست بڕە، من ئیسلامم لەبەرچاو ناشیرین بووە. نەخێر، چونکە ئەوکەسە پێغەمبەری ئیسلام فەرمویەتی لەئێمە نیەو لەسەر ئێمەی حیساب مەکەن.

٦. یەکــێ لەصیفاتی خەڵکــی یابانی بریتی یــە لەزۆرخوێندنەوە: بــەردەوام خەریکــی خوێندنەوەن لەنــاو پاصدا دەخوێننــەوە، لەناو شــەمەندەفەردا دەخوێننەوە، جاری واهەیە (١٠) ســەعات بەڕێگاوەن، ئەو یابانی یە زۆربەی کاتەکانی بەخوێندنەوەوە بەسەردەبات. زۆربەی ئەوکتێبانــەی لەجیهاندا دەنوســرێن پاش چەنــد هەفتەیەك لەیابان دەیگۆڕنە سەرزمانی خۆیان، بەداخەوە لای ئێمە ئەوتۆزە خوێندەوارە خوێنەرەی هەبوو، ئەویش نەما. ئێستا هەمووکەس خوێندەوارە، بەڵام خوێنــەر زۆرکەمەو ئــەوەش کەدەخوێنێتەوە، تاقەتــی خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەك زیاتری نی یە.

٧. کارکــردن بەشــێوەی گروپ. هەرکۆمەڵە کەســێك یــەك دەگرن وپڕۆژەیەك بۆکارو بەرهەمێکی نوێ دادەڕێژن. نەك بەگروپ خەریکی هەڵپەرکێ بن!! بەگروپ خەریکی دزی وتەزویرکردن بن!!

٨. ڕێزگرتنـــی کەســـی بەتەمـــەن وداهێنـــەر: یابانیەکان ســـەرەڕای پێشـــکەوتنی تەکنەلۆجیاو داهێنانی گـــەورە، پابەندی بەهێزیان هەیە بەکلتـــورو داب ونەریتـــی ڕەســـەنی خۆیانەوەو پارێـــزگاری لێ دەکەن ونایشـــێوێنن. کەچـــی بەداخـــەوە لای ئێمـــە، خەڵـــك پـــێ ی عەیبە لەکوردستانەکەی خۆی دا، لەشارەکەی خۆی دا، لەناو هاوزمانەکەی خۆی دا، جـــل وبەرگی بەڕێزی کوردی لەبەربکات. هی واهەیە پێ ی عەیبە بڵـــێ خەڵکی فلان لادێم، لادێ ی بوون، باب وباپیرانی مەرد، قارەمان، موسڵمان، بەهیمەت، خەریکە ببێتە عەیبەو شەرم کەسێك باسیان بکات. بەداخەوە هێشـــتا کەســـی ناخاڵی واهەیە وادەزانێ پێشکەوتن بەوەیە، واز لەدینـــی بـــاوك وباپیرانت بێنی!! جائەوەی باســـمان کرد لەبواری پێشکەوتن وعەقڵی مرۆڤ ودوربون لەلاسایی کوێرانە، وەنمونەمان بە (یابان) هێنایەوە چونکە زۆرتر لەبەرچاومانەو لەبەرگوێمانە، بۆئەوە باســـمان کرد. کەبەرچاو ڕۆشـــنی بـــێ بۆگەنجانمـــان کەکاتێ دەبینن وولاتمان دواکەوتووە، خەڵکمان لەدواوەی میللەتانە لەبواری تەکنەلۆژیاو گوزەرانی ژیانەوە، ئەوە هی ئەوە نی یە کەدینمان هەیەو موســـڵمانین، بەڵکو هی ئەوەمانە کەبەقسەی دینەکەمان نەکردوەو بەکردار لەژیانی خۆمانـــدا جێ بەجێمان کـــردوە، ئەینا هەرئـــەوەی یابانیە کەدەیکات ئەگەر ئێمەی موســـڵمان بیکەین، هەم دنیامـــان بەختەوەر دەبێ، هەم هەموشـــمان بەعیبادەتو طاعەت بۆ دەنوسرێو بەختەوەری قیامەتو بەهەشتی هەتا هەتایی دەبین.

دووەم: دووەم شـــت کەپێویستە ئاگامان لێ ی بێ، بریتـیـیە لەگرنگی دان بە (ڕوح): ئەویش لەڕێگەی ئیمان وباوەڕەوە، چونکە تۆهەرکەسێك بیت، لەهەرگروپ وکۆمەڵگەیەکدابیت، هێزێکی ڕوحی هەیە کەلەناخی تۆدایەو دەبێت ئاوی بدەیت. بۆئەوەی هاندەرت بێت بەرەوکاری گەورە

چونکــە هێزی باوەڕی ناختە کەهاوکاریــت دەکات ئامانجەکانی ژیانت دیاری بکەیــت. پاڵنەرتە بۆئەوەی کەبەردەوام بیت لەهەڵبژاردنەکانت وهەســتی بەختــەوەرت پێ دەدات چالاکی یەکــت دەداتێ کەبڕانەوەی نی یــە.. هەردوو لێکۆڵەری دەرونی (د.لیس بــاروت ود، لەگەڵ د.نیل کراك دارن) لەکتێبی: (خۆشویســتنی ئەوژیانــەی کەتێ ی دا دەژیت) چەند نهێنی یەکی گرنگیــان تیادا ڕوون کردۆتەوە. کەوادەکات ژیانت مانایەکی ڕوحی هەبێت. ئەوان دەڵێن: (بۆئەوەی ژیانێکی تەندروســت بژیــت، بنەمایەکــی گرنگ هەیە، ئــەم بنەمایە زۆر ســانایە چونکە تەرکیز دەخاتە سەرهەموو کردارە بەبەهاکان وئامانجداریشە، ئەویش باوەڕە. باوەڕ ئەوپەیوەندیە بێ خەوشــەیە کە لەگەڵ خوادا بەستوتە. پەیوەندیەکی ڕوحی بەرزو باڵا لەگەڵ خوادا کەڕوحت پڕدەکات لەباوەڕ. باوەڕیش ئەوەیە کەمرۆڤێکی گەورەو کاریگەر دروســتدەکات. هەروەها ئــەودوو لێکۆڵەرەوە دەڵێن: لەوکاتەوەی کەدەســتدەکەیت بەتێرکردن ودەوڵەمەندکردنــی ڕوحت، ئەوا تۆ لەســەر ئــەو ڕێ یەی کەژیانێکی تەندروســت بژیت، لایەنی دەروونی وکۆمەڵایەتیت تەندروســت بێت. ئەمەش بەهۆی ئەم پەیوەندی یە ڕاستەوە دروست دەبێت، کەبەستووتە لەگەڵ دروســتکارەکەتدا. کاتێك دەرك بەبوونی خوا دەکەیت لەهەموو کاروبارەکانــی ژیانتدا، ئــەوە بەدڵنیاییەوە ژیانێــك دەژی کەپڕپەتی لەبەختــەوەری. کەواتە: خۆپڕچەك کردن بەباوەڕ لەبنەما گرنگەکانی سەلامەتی ڕوح وفیکرو جەستەن پێکەوە. لەدوای ئەمەشەوە هەرشتێکی تر کەڕووبەڕومان دەبێتەوە خێری تێدایە. وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (عَجَبًا لأمرِ المؤمنِ إنَّ أمْرَه كُلَّهُ لهُ خَيرٌ وليسَ ذلكَ لأحَدٍ إلا للمُؤْمنِ إنْ أصَابتهُ سَرَّاءُ شَــكَرَ فكانتْ خَيراً لهُ وإنْ أصَابتهُ ضَرَّاءُ صَبرَ فكانتْ خَيراً لهُ). واتە: حــاڵو باری باوەڕدار زۆر ســەیرو سەرســوڕهێنەرە، هەمووی بەخێر

دەگـــەڕێ بەســـەریدا، ئەمەش تەنهـــا بۆباوەڕدار وایە. ئەگەر تووشـــی خۆشی وخێرێك بوو سوپاسی خوای لەسەر دەكاتو دەبێتە خێر بۆی. ئەگەر تووشـــی بەڵاو نەهامەتیەك بوو، ئارامدەگرێ لەســـەری، دەبێتە خێربۆی..

بەڵێ ئیمانداران: باوەڕو ئیمان ئەم شتانە بەباوەڕدار دەكات:

١. مانایـــەك دەدات بەمرۆڤ بۆژیان وپاڵنەرە بۆی كەهەڵوێســـتێكی ئیجابی بگرێ وخۆشـــی لێ ببینێ وكاربـــكات لەپێناویدا. واتە: دەیكات بەخاوەن مەبدەئو بیروباوەڕ.

٢. ئیمـــان وباوەڕ كۆمەڵـــە بەهاو پێوانەیەكـــە كەپەیوەندی مرۆڤ بەخۆی ودەوروبەریەوە ڕێك دەخات، مرۆڤی ئیماندار، زۆر بەرچاوڕوونە لـــەوەی چۆن ڕەفتار لەگەڵ خۆی وەلەگەڵ دەوروبەریدا بكات وهەموو چاكەو خراپەكانی بۆلەیەك جیاكراوەتەوە..

٣. ئیمـــان وبـــاوەڕ ڕاڤەیەكـــە بۆواقیـــع وپەیوەنـــدی ئـــەم مرۆڤە بەبونـــەوەرەوەو بەوشـــتانەی ئـــەم مرۆڤە لێ ی بەرپرســـیارە، ئیمان وەڵامی پرسیارەكانی ناوناخی دەداتەوەو ڕوحی ئاسودە دەكات. هەربۆیە ئەوانەی كەباوەڕدارنین هەرچەندە لەلایەنی مادی وسامان وبڕوانامەو ناوو ناوبانگەوە لەهیچیان كەم نی یە، كەچی چونكە ڕوحیان عەودالی شتێكەو بەوشتە نەبێ ئارام ناگرێ، كەئەویش ئیمانو بڕوایە. بەڵام ئەم كەسانە ئەوئیمانە ڕاست ودروستەیان نی یە. پەنادەبەن بۆ خۆكوشتن، خۆ نموونەی ئەوانە زۆرن، كەلەلوتكەی دەوڵەمەندی وبڕوانامەی باڵاو، نـــاوو ناوبانگی جیهانی دا بوون. كەچی لەژیان بێزاربوون وبەدەســـتی خۆیان، ژیانی خۆیان كۆتایی پێ هێنا. وەئەمڕۆش كەڕێژەی خۆكوشتن وهەوڵـــی خۆلەناوبـــردن، لەهەموو جیهاندا بەگشـــتی ولەكوردســـتانی خۆشـــماندا بەتایبەتـــی لەچاوســـاڵانی ڕابردودا زیادی كـــردوە. لەگەڵ

ئەوەشــدا ژیانی ئێستای بواری گوزەران وپارەو خانوو ئوتومبێلی باش زۆر هەڵکشاوە لەچاوســاڵانی پێشوودا. کەچی بەپێچەوانەوە، تاخەڵکی لەهەژاری ونەداری وبێ نانی وبێ ئاویدا دەژیان، زۆرکەم خەڵکی پەنای بۆخۆکوشــتن دەبرد. بەڵام ئێســتا کەخەڵکی تێرو تەســەل وپۆشتەو پوختــە لەژیاندا، گیرفانی پڕە، بڕوانامەی هەیە، خوێندەواری باشــی هەیە، تەماشــادەکەی خۆکوشــتن زۆربووە. ئەمە هەمووی لەئەنجامی پشــت گوێ خســتنی ڕوح وتێرکردنی. کەڕوحیش بەئیمــان وباوەڕی ڕاســتەقینە نەبــێ ئــارام ناگرێ وناحەســێتەوە. چونکــە ئەگەر چاو بەبینینی دیمەنی جوان وتافگەو ســەوزایی وشتی جوان دەحەوێتەوەو گــوێ بەبیســتنی دەنگی خۆش وهەســت بزوێنەر ئــارام دەبێ وچێژ وەردەگــرێ وگەدە بەخواردنــی خۆش وتێری لەکاتی خــۆی دا، ئارام دەگرێ وزمان بەقسەکردنو ئەوەی پێ یەتی ئیسراحەت دەکات.. بەڵام خۆ ڕوح بەمانە تێرنابێو ئارام ناگرێ. هەربۆیە دەبێ ئەویش ئیمانو باوەڕ ئارامی بکاتەوە. جا کەهەموو خۆشی‌یەکان هەبوو بۆ چاوو گوێو زمانو گەدەو تەواوی جەستە، بەڵام ڕوح هیچ تام وچێژێکی نەدەکرد. ئەو مرۆڤە هەســت بەبێزاری لەژیان دەکات وچاوەڕێی مردن دەکاتو مردنی لەژیان پێ خۆشــترە، یان هێندە بەپەلەیە بۆجێهێشتنی ژیان، خۆی دەکوژێ!..

سێ یەم: گرنگی بەجەستەو لاشەی خۆت بدە، چونکە عەقڵو ژیری ســاغو بەهێز، لەجەستەی ســاغ وبەهێزدایە. وەئەگەر جەستەو لاشە ســاغ وسەلامەت بوو، مرۆڤ ڕوحیشی پاکتر دەبێتەوەو دەتوانێ زیاتر خواپەرســتی بکاتو بیروباوەڕەکەی بەهێزتربێ، چونکە لاشەی مرۆڤ خاوەنی ووزەیەکی بێ سنوورە. بەڵام هەندێ شت هەیە کەئەم ووزەیە لەناودەبات. وەکو:

١. زۆرخۆری.

٢. زۆرنوستن- زیاد لەپێویست.

٣. وەرزش نەکردن وبەردەوام دانیشتن.

٤. درەنــگ خەوتنی شــەوان ودرەنگ هەســتانی بەیانیان، کەمرۆڤ بێ بەش دەکات لەهەڵمژینــی هەوای پاك وخاوێنی بەیانیان. کەپێش خۆرکەوتــن، پاکترین هەوا هەیەو پێویســتە مرۆڤ بەقوڵی هەناســە هەڵبمژێ وبەم هەناسە وەرگرتنە، لەوهەوا پاك وبێ گەردەی بەیانیاندا، مرۆڤ ووزەی لاشــەی چەند قاتی پێشــوو بەهێــز دەبێت. جائەمەی کەبواری تەندروســتی باسی کردوە. ئیســلام وەکو عیبادەت بۆمرۆڤی موسڵمانی داناوە. ئەوەتا نوێژی بەیانی لەسەر فەرز کردوەو هەمومان دەزانیــن نوێژی بەیانــی دەبێ لەکاتێکا بکرێ، کەخــۆر دەرنەکەوتوە، ئەینــا کەگزنگی دا، ئیتر نوێژی بەیانــی دەفەوتێ، بۆچی؟! بۆئەوەی مــرۆڤ هەوڵبدات لەپێــش خۆرهەڵاتن دا بەخەبەربێ ودەســت نوێژ بگــرێ وهەوای پاك هەڵمژێو چوســتو چالاك بێ وئامــادەی کاربێ. چونکە کەخۆرهەڵات، ئەو هەوا پاکە بەوشــێوەیە نامێنێ ومرۆڤ لێی بێ بەش دەبێ. جاخوای بەبەزەیی بەبەندەکانی ئەونوێژی بەیانی یەی لەسەر فەرز کردوین، کە لەدوو لاوە سودمان پێ دەگەیەنێ.

یەکــەم: عیبادەتی خوا دەکەین وپاداشــتی گەورەی بۆ قیامەت تێدا مسۆگەر دەکەین.

دووەم: لەڕوی جەستەو لاشەمانەوە لێی بەهرەمەند دەبینو ووزەی پێویســت ئەبەخشێتە لاشەمان وبەڕاســتی ئەوڕۆژە لەئیشو کارماندا گورجو گۆڵو چالاك دەبین.

لەکۆتایی ئەم بابەتەدا: دوای ئەوەی کەدڵنیابوین کەئەگەر خزمەتێك نەکەین بەمرۆڤایەتیو شتێ زیاد نەکەین، ئەوا ئێمە زیادەینو نهێنیەك

لەبونمانداو جودی نی‌یە..

دوای ئەوەی زانیمان بەهای ئێمە ئەوئامانجە دیاری دەکات کەهەڵمان بــژاردوەو کاری بۆدەکەیــن، زانیمــان کەخودای گــەورە ڕزقی هەموو باڵندەیەکی داوە، بەڵام بۆی نەخاتە نێو هێلانەکەیەوە. بەڵکو گەیشتن بەئامانــج کارکردنی دەوێ وجیاوازی نێوان ئــارەزوو ئیرادە کارکردن وهەوڵدانە. زۆر گرنگە لەخۆمان بپرســین پاشــان چی؟! دەڵێین: ئیتر کاتــی ئەوەهاتووە، جارێکی تر ڕوحێکی نوێ وشــەماڵێکی فێنك بێت ودڵەکان بەخۆزگەو ئاواتی جوان ودڵنیایی وکامەرانی ئاوەدان بکاتەوە.. لەدونیــای بێ کاریــەوە بۆدونیای بەرهــەم هێنان وداهێنــان هەنگاو هەڵبگرین. لەخودپەرســتی وبەرژەوەندی کەســی یەوە بۆبەرژەوەندی نەتەوەو ووڵاتپەروەری. لەنقوم بوون لەزەلکاوی دواکەوتن ونەزانینەوە بۆجیهانی زانست وپێشکەوتن..تەمەنی ئێمە بەژمارەی ساڵەکان دیاری ناکرێت، بەڵکو بەوکارانەی کەئەنجامماں داوەو بەوهەستانەی کەبۆمان دروســت بوە دیاری دەکرێت. بارێز لەتەمەنی خۆمان بگرین وســوود لەبونــی خۆمــان وەربگرین. چونکە لــەم جیهانەدا تەنهــا یەك جار دەژین ویەك تەمەنمان پێ ســپێردراوە، بابێیــن ڕێز لەعەقڵو تواناو ژیریەکانمــان وەربگرین وچێژو خۆشــی لەژیان وەربگریــن. بابەمانا جوانەکانی ژیان ئاشــنابین وتەنها لەجیهانی بێ گیانی مادە پەرستیدا نەخولێینــەوە. دەرگاکانــی بەختــەوەری وســەرفرازی بدۆزینــەوەو لەدونیایەکی بەهەشــت ئاســادا درێــژە بەژیان بدەیــن.. بامرۆڤەکان بانگهێشت بکەین بۆ خۆشەویستیو میهرو تەباییو هاوکاری ورێزگرتن لەیەکترو دوورکەوتنەوە لەســتەمو ئــازاردان وخواردنی مافی یەکتر، باهەریەکێك لەئێمە ڕۆژانە دڕکێك لەســەر ڕێگا لابەرێتو لەجێگەیدا گوڵێــك بڕوێنێت. باخەندەیەك ببەخشــینو خەمێــك بڕەوێنینەوە.

بادەســتی ئەوکەسانە بگرین کەپێویســتیان بەیارمەتی ئێمە هەیە. با هەموو کوردســتان بەماڵی گەورەی خۆمــان بزانینو خزمەتی بکەین، نــەك تەنها ســنووری تەســکی خانوەکانمان.. با بــۆ ئاوەدانکردنەوەو بنیاتنانــی کۆمەڵگەیەکــی شارســتانیو خــاوەن ژیــارو پێشــکەوتوو هەنگاوبنێینو ڕێگای هەزار میلیش بەیەك هەنگاو دەســت پێ دەکات.. خوای پــەروەردگار بەڕەحمی خۆت، ئیمان وباوەڕێکی بەهێزو تۆکمەو عەقڵێکی کراوەو دڵێکی ئاوەدان وجەستەیەکی ساغو تەندروستمان پێ ببەخشی. اللّهُمَّ آمین.

سەرچاوەکان:

١. گۆڤاری (ڕایز) ژمارە: ٢، حوزەیرانی (٢٠١٠)، ل١٦، ل١٣، ل١٩.

٢. ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە: ٨٠٣، ل٧.

٣. گۆڤاری بڕیار ژمارە: ١٣، حوزەیرانی ٢٠٠٩، ل٣.

# ووتاری سێیەم
# بۆ مانگی ڕەجەب
# دڵی ئارام

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّــلام عَلى سَــيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجمَعينَ:

ئيمانــداران: ووتــەی حەکیمەکان هەمیشــە جێــگای ووردبونەوەو تێرامــان وبیرکردنەوەیە چونکە ئەوان زیاتر لەگەوهەری شــتەکاندا ڕۆدەچنو ڕووکەش وسیمای شتەکان زۆر بەهەند هەڵناگرن.. ووتەیەك کەلەچەندین حەکیمەوە گێڕدراوەتەوەو سەرنجمان ڕادەکێشێ، ئەوەیە کەدەفەرموێ:(خــودای پەروەردگار خەڵاتو خۆشــیەکانی ژیان بخەرە ژێر پێی گەمژەکانو دڵێکی ئارامو پڕلەسوکناییم پێ ببەخشە)!!.

بەڵێ، دڵێکی ئارام: سەرچاوەکانی خۆشبەختی وسەرفرازی وکامەرانی یە، کانگای خەندەی جوان وهیواو ئاوات وخەونی ئەرخەوانی یە.

بەڵێ، دڵێکی ئارام: لانەی خۆشەویستیو سۆزو ئەوین، باوەشی گەرمی ومیهرەبانی ودلۆڤانی یە. دڵێکی دنیا، دڵێکی ئاسودە، دڵێکی موتمەئین، دڵێکی پڕ لەئەڤینە..

دڵێکی ســاف وبێگەرد، دڵێکی ســپی، دڵێکی ڕووناك، دڵێك نازانێت ڕق چی یە، کینە یانی چی، دوژمنایەتی چی یە!.. دڵێك فراوانتر لەزەریاکان، نەرمتر لەهەورە سپیەکان، دڵێك ژوانی هەزاران وبێنەوایان بێت، هەمیشە پەرۆشــی ژیــان وگوزەرانیان بێت، دڵێــك هەر بۆخۆی نــەژی، لەپێناوی هەموو چەوســاواندا درێژە بەژیان بدات، دڵێك هەمــوو ئاواتی ئەوەبێت، فرمێســکەکان بسڕێت، خەندەکان بڕوێنێت، دەســتی میهرو خۆشەویستی بەسەر سەری منداڵە بێ باوکەکاندا بێنێت.

خودایــە من ئەو دڵــەم دەوێت.. نەك دڵێکــی بەردین، ڕەش، کوێر، چــاوی کەس نەبینێ، هەموو ئاواتی تێرکردنی ئارەزوەکانی بێت، نەك دڵێك مەست بوبێت وکەسی بەخەیاڵدا نەیەت، دڵێك بزانێ خۆشی دنیا تەنها پارەو ســامان ومولکی دونیایە. تەنها ڕابواردن وکۆشــك وتەلارو ئوتومبێل وڕەفاهیەتە.

نـــا خودایە گیان باهەموو ئەمانە بۆخۆیـــان بێت. لێت دەپاڕێمەوە، باهەمـــوو خەڵات وخۆشـــی یەکانی دونیا بۆئەوان بێـــت وتەنها دڵێکی ئارام وپاك وسپیم پێ ببەخشە..

بەڵـــێ بەڕێزان: گەورەیی مرۆڤ، بەدڵیەوەیەتی. نەك بەجەســـتەی گەورەوە. وەچاك بون وڕێکوپێك بونی جەســـتەو ئەندامەکانی لاشەش هەرپەیوەســـتە بەچاکـــی وپاکـــی وئارامی دڵەوە، ئەمـــەش فەرمودەی مامۆستای مامۆستایان ودەرون ناسان، سەرداری پێغەمبەران، حەزرەتی محمـــدی مومومصطەفایـــە (ﷺ) کەفەرموی: (أَلا إِنَّ فِي الجَسَـــدِ مُضْغَةً، إِذا صَلُحَتْ، صَلُحَ الجَسَـــدُ كلُّهُ، وإِذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَـــدُ كُلُّهُ، أَلا وهِيَ القَلْبُ). رَواهُ البُخاريُّ.

واتـــە: ئاگاداربن لەناوجەســـتەو لاشـــەدا، پارچەیـــەك هەیە، ئەگەر ئەوپارەچەیە ڕێکوپێك وباش بوو، ئەوا جەســـتەکە هەمووی ڕێکوپێك وبـــاش دەبێ. خۆئەگەر ئەو پارچەیە بۆگەن وخراپ بوو، ئەوا هەموو لاشەو جەستەکە بۆگەن وخراپ دەکات. ئاگاداربن ئەوپارچەیە (دڵە).

بەڵام ئیمانداران: ئێمە کەووشـــەی (دڵ) بەکاردەهێنین، مەبەستمان هەربەشـــە فیزیکیەکەی دڵ نیە کەخوێن دابەشـــی سەرلاشـــە دەکاتو خوێنی پیسی بۆ دەگەڕێتەوە. چونکە ئەم دڵە بۆ ئەم کارە، کەزیندویەتی پێ دەبەخشێ بەلاشە، پشیلەیەکیش هەیەتی، چۆلەکەیەکیش هەیەتی، بەڵکو مەبەست لەدڵ ئەوسۆزو خۆشەویستی‌یەیە کەتیایەتی، ئەوڕەحمو بەزەیی‌یە کەتیایەتی. ئەو میهرەبانی‌و لێبوردەیی‌یە کەدڵ هەڵیگرتوە، کە بەتەعبیری قورئان پێی دەوترێ (فوئاد).. دڵ لەقورئاندا بەتاك (مُفْرَد) (بیست) جار، هاتووە. وەبە (جَمْع) کۆ (١١٢) جار هاتووە. لەبارەی دڵەوە زانایان بەگشـــتی‌و زانایانی پاککردنەوەی دەرون بەتایبەتی زۆرقســـەی جوانیـــان کردوە یەکێ لەوانە (حەکیمی ترمذي)یە کەفەرمویەتی: (فَمَثَلُ

الفُؤادِ في القَلْبِ، كَمَثَلِ الحدقَةِ في سَوادِ العَيْنِ. وكَمَثَلِ المَسْجِدِ الحَرامِ في داخِلِ مَكَّةَ، وكَمَثَلِ اللُّبِّ في داخِلِ اللَّوزِ، والفُؤادُ في وسَطِ القَلْبِ، كَما أَنَّ القَلْبَ في وسَطِ الصَّدْرِ، مِثلَ اللُّؤلُوءِ في الصّدَفِ).

واته: وێنەی بەشـی فوئاد (هەسـتو سـۆز) لەناودڵدا، وەکو گلێنەی چاو وایە لەناو ڕەشایی چاودا. وەوەکو وێنەی مزگەوتی حەڕام (کەعبە) وایە لەناومەککەدا، وە وێنەی کاکڵەیە لەناو بادامدا. فوئاد لەناوەڕاسـتی دڵدایـە. هەروەکو چۆن دڵ لەناوەڕاسـتی سـنگدایە. وەفوئـاد لەناودڵدا وەکو لوئلوئی ناوصەدەف وایە!.. (سبحان الله) چ دەربڕینێکی جوانە! خۆ هەموو کەس بەئاشـکرا هەسـتی بەوەکردوە کەکاتێ خراپەیەکی کردوە، یان هەواڵێکی ناخۆشـی پێگەیشتوە، یان لەڕووی دەرونی یەوە سوکایەتی پێ کراوەو ئازاردراوە، هەستی کردوە ئازارێك لەناوسنگی دایە. کوردەواری خۆمان جوانیان فەرموە کەدەڵێ، بەڕاستی دڵم ئێشا، دڵم تەزی، دڵتەنگ بووم.. فلان کەس دڵی ئازاردام. ئەمانە هەمووی مەبەست پێی ناوەڕۆکی دڵە بەشـە فوئادەکەیەتی. ئەینا زۆرکەس بەئاشـکرا هەست بەو ئازارەی ناوسـینەی دەکاتو دەست دەخاتە سـەردڵی ودەڵێ ئەوێم دێشێ، کەچی کاتـێ لەڕوی پزیشـکەوە پشـکنینی بـۆ دەکرێت، دەبینـی دکتۆر پێی دەڵـێ، هیچ کـەم وکوڕیەك لەدڵیا نـیەو زۆر بـێ عەیبە. ئەمە لەڕوی ڕواڵەتەوە وەکو ئامێرێکی خوێنبەرو خوێنهێنەر کەم وکوڕی نـیە. بەڵام لەناوەڕۆکدا کە (فوئادە)کەیە، ئازاری هەیە، کەئەمە چارەسـەرەکەی بە پزیشـکی بواری جەسـتە ناکرێ ودەبێ ئیمان وخواناسی وپاککردنەوەی دڵو دەرون ئەنجامـی بدات. بەڵێ ئەودڵـەی کەخاوەنەکەی بەختەوەری دونیاو سـەرفرازی قیامەت دەکات دڵی ساغ وپاکە. هەروەکو دەفەرموێ:

﴿ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ  إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ﴾. الشُّعراء: ٨٨ - ٨٩.

زانای گەورەو ناودار پێشـەوا (إِبْـنُ القَيِّم الجَوْزِيَّة) لە (طِـبُّ القُلوُب)دا ص٣٥ دەفەرموێ: (القَلْبُ السَّليم: هُوَ الَّذي سَلِمَ مِنْ أَنْ يَكوُنَ لِغَيْرِ اللهِ فيهِ شِرْكٌ

بِوَجْهِ ما، بَلْ قَدْ خلصت عبوديتُهُ لِلّهِ، إرادَةً وَمَحِبَّةً وَتَوَكُّلاً، وَآنابَةً وَإِخْباتاً وَخَشْـيَةً، وَخَلـصَ عَمَلُـهُ لِلّهِ، فَإِنْ أَحَبَّ أَحَبَّ فِي اللهِ. وَإِنْ أَبْغَـضَ أَبْغَضَ فِي اللهِ، وَإِنْ أَعْطَى أَعْطَى لِلّهِ، وَإِنْ مَنَعَ مَنَعَ لِلّهِ)..

واته: دڵی ساغ کەلەقیامەتا سوود بەخاوەنەکەی دەگەیەنیٚو دەبیٚتەهۆی ڕزگاربونی بریتیـیە لەودڵەی کەسـەلامەتە لەوەی کەهیچ جۆرە شیرکو هاوبەشـیەکی بۆخوای بیٚ شـەریك تیٚدابیٚ. بەهیچ جـۆریٚ لەجۆرەکان، شـیرکی تیٚدانی یـە، نەگەورەو نەبچـوك، بەڵکو بەپوختـیو خالیصیو بـیٚ هیچ جـۆرە ڕوپامایی وڕیاییـەك بەندایەتی بۆخـوای خۆی دەکات، بەندایەتیو عبودیەتی خوا دەکات لەڕوی ئیرادەو خۆشەویسـتیو پشـت بەستنو گەڕانەوەو ترسو بیم، هەمووی هەربۆخوایە. وەئەوەی ئەنجامی دەدات تەنهـاو تەنها لەبەرخاتری خوا دەیکات. ئەگەر کەسـیٚك شـتیٚکی خۆش وویسـت تەنهاو تەنها لەبەرخاتری خوا خۆشی دەویٚت. ئەگەر ڕقی لەکەسیٚك وشتیٚك وکردەوەیەك بوو، هەرلەبەرخوا ڕقی لیٚ یەتی، چونکە خوا پیٚ ی ناخۆشە. ئەمیش ئەوشتەی پیٚ ناخۆشە. ئەگەر شتیٚك ببەخشیٚ، هـەر لەبەرخوا دەیبەخشـیٚ، خۆئەگەر شـتیٚك بگریٚتەوەو نەیبەخشـیٚ، هەرلەبەرخـوا دەیگریٚتەوەو نایبەخشـیٚ. کەدەزانیٚ خـوای گەورە پیٚ ی خـۆش نی یە ماڵو سـامان لەفلاٚن ڕیٚگاوە خەرج بکـریٚ، ئەمیش لەویٚ دەیگریٚتەوە.

بەڵیٚ ئیمانداری بەڕیٚز: جاسـەیریٚکی ناودڵی خۆت بکە. ئەگەر دڵت ئاوابوو، ئەوا دڵشـاد بـەو بزانە ئەو دڵەت سـەلیمەو لەقیامەتا تەنها ئەودڵە سـودت پیٚ دەگەیەنیٚو ئەوی تر لەماڵو سامان ودارایی دونیا، وەلـە کوڕو کـچ وبنەماڵە، هیچی دادت ناداتو سـودت پیٚ ناگەیەنیٚ.. هەروەهـا لەبواری دنیاش دا، ئەودڵە سـودت پـیٚ دەگەیەنیٚ کەئەوەی تیٚدابیٚ. کەپیٚغەمبەری خۆشەویسـتمان (ﷺ) فەرمویەتی: (إذا أَرادَ اللهُ بِعَبْدِه خَيْراً، جعلَ لَهُ واعِظاً مِنْ قَلْبِه، يَأْمُرُه ويَنهاهُ) أَخْرَجَهُ الدَّيْلَمِيُّ.

واتــە: ئەگەر خوای گەورە بیەوێ و ویســتی لەســەربێ کەبەندەی خۆی توشــی خێرو خۆشــی بکات، کەبێگومان خــوای گەورە بەردەوام خێرو خۆشــی بەندەکانی دەوێت، وەلەچەندین ڕێگەوە دەیانخاتە ناو بەختــەوەری وخێرەوە، جایەکێ لەوڕێگایانــە ئەوەیە، کە (ئامۆژگاری کارێکــی لەناودڵــی خۆیــدا بۆدادەنــێ)، ئەوئامــۆژگاری کارە وەکــو مامۆســتایەك لەناودڵی ئەوبەندەیــەدا خەریکی ئامــۆژگاری کردنەو فەرمانی پێ دەکات بەچاکەو هانی دەدات کەفلان خێرو خێراتە هەیە بڕۆ بۆی ولەدەستی مەدە، بەشداری ئەوخێرە بکە، وەئەگەر بێ شەرعی ومونکەرو خراپەیەکیش هەبوو. ئەم مرۆڤە وویستی بۆی بڕواو لێ ی نزیك ببێتەوە، یەك یەك نەهامەتی وخراپەکانی دواڕۆژی ئەوخراپەی دەخاتــە بەرچاوو وای لێ دەکات کەپەشــیمان ببێتــەوە لەوخراپەیە..
ئــەم دڵە وەکو (قیبلەنما) وایە. لەهەرجێگایەکی ســەرزەوی بی (ســێ گۆشەی بەرمۆدا نەبێ)، لەسەر ووشکانی بی یان لەونادەریا، لەئاسماندا لەفرۆکەدابــی، یــان لەژێــرزەوی دا بــی، ئەوقیبلەنمایــە پێت دەڵێ قیبلە کوێ یەو ڕۆژهەڵات وڕۆژئاواو باکورو باشــورت بۆدیاری دەکات، بۆیــە پرس بەدڵــت بکە. (إسْــتَفْتِ قَلْبَكَ). هەروەکو لــەم فەرمودەیەی خۆشەویســتماندا (ﷺ) هاتووە، صەحابەیەك بەناوی (وابِصَه بنِ مَعْبَد) بۆمــان دەگێڕێتەوەو دەفەرمــوێ: (أَتَيْتُ رَسُـول اللـهِ (ﷺ)) ڕۆژێکیان چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کاتێ لەخزمەتیدا دانیشــتم، پێش ئەوەی من قسەبکەمو نیەتی ناودڵم بدرکێنم، خۆشەویست (ﷺ) فەرموی: (جِئْتَ تَسْــأَلُ عَنِ البِرِّ؟!) هاتوی بۆئەوەی پرسیار بکەی لەبارەی چاکەوە، لەبارەی ئەوەی چی خوا پێی خۆشەو حەڵاڵەو ڕێگەپێدراوە، چیش حەرامەو بێ شــەرعیەو قەدەغەکراوە؟ (قُلْــتُ: نَعَمْ) ووتم: بەڵێ ئــەی پێغەمبــەری خوا (ﷺ) لەبارەی ئــەوەوە هاتوم بۆلات، (سُــبْحانَ

اللــه) ئەمە موعجیــزەی پێغەمبەری خوایە. پێش ئەوەی ئەم کەســە قســەبکات، پێغەمبەری خوا فەرمووی بۆئــەوە هاتوی دەربارەی چاکەو حەڵاڵو پاکی بپرسی. دیارە (وابِصَه) نیازی وابوو لەهەمووشتێ بپرسێ دەربارەی حەڵاڵو حەرام. فلان شــتە حەڵاڵە یان حەرامە. کەبەڕاستی ئەمــە ماوەیەکی زۆری دەوێ بۆپرســیارو وەڵام. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەووتە گەوهەرینەکانی خۆی، کەپوختو کورت، بەڵام پڕمەعناو تێگەیەنەربوون. فەرمووی: (إسْــتَفْتِ قَلْبَكَ، البِرُّ ماطمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ واطْمَأَنَّ إِلَيْــهِ القَلْبُ، والإِثْمُ ماحاكَ في النَّفْسِ وتَــرَدَّدَ في الصَّدْرِ، وإِنْ أَفْتاكَ النّاسُ وأَفْتَوْكَ). حَدِيْثٌ حَسَن، رَواهُ الإمام أَحمد.

واتە: پرســیار لەدڵی خۆت بکەو فەتوا لەدڵی خۆت داوابکە- بۆ ئەو شــتانەی کەدەقێکی ئاشکرای شەرعیان لەسەرنیە. وەکو عەرەقو قومارو گۆشــتی بەرازو ئەمانە، کەئەمە پێویســتی بەفەتواو پرســی کەس ودڵی خۆت ناکات. بەڵام ئەوشــتانەی کەدەقێکی شەرعیان لەبارەوە نەهاتووە، وەلەنێــوان حــەڵاڵو حەرامدان، ئەوە بۆ ئەو شــتانە، فەتوا لەدڵی خۆت داوابکەو بزانە چیت پێ دەڵێ، چونکە هەســت کردن بەچاکەو بەخراپە والەناو دڵتایە. ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوهەست کردنەی ڕوون کردەوەو فەرمووی: چاکە ئەوەیە دڵت پێ ی خۆش بێ ودەروونت پشــووبداو، دڵت لێ نەدا. لەبەرئەوەی دواڕۆژی باشەو مەترسی نی یە. گوناهیش ئەوەیە، کار لەدڵــت بکاو لەناو دڵدا هاتووچۆ بکاو دڵ هەســت بەنائارامی بکات، لەبەرئەوەی مەترســی دواڕۆژی هەیە. کەوابوو دڵی خۆت لەهەموو کەس باشتر دەزانێ چاکەو خراپە چی یە. جاهەرچی شتێ دڵت لێی ڕاڕابوو، وە لەناخی خۆتا هەستت بەنائارامی دەکرد. ئەوە وازی لێ بێنە باخەڵکیش فەتــوات بۆبــدەن وبڵێن قەیناکاو حــەرام نی یەو بیکــە. نەخێر، دوای فەتوای خەڵکی مەکەوە کەبۆت حەڵاڵ بکەن. بەڵکو بەقســەی دڵت بکە..

لەفەرمودەیەکـــی تردا کەئیمامی (مُسْــلِم) ڕیوایەتی کردوە، لە (نەواســی کوڕی ســـەمعان)ەوە، کەپێغەمبـــەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (البِرُّ حُسْــنُ الخُلُقِ، والإثْمُ ماحاكَ في نَفْسِكَ وكَرِهْتَ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النّاسُ) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: زۆربەی چاکە بریتی یە لەخوڕەوشـــتی جوان، وەك ڕوخۆشی ویارمەتی دانی خەڵکی، سەردانی خزم...هتد. وەگوناهو خراپە ئەوەیە: کار لەدڵـــت بـــکاو لەناودڵتا جـــێی نەبێتەوەو ئازاری پـــێ بگەیەنێت، هەروەهـــا پێـــت ناخۆش بێـــت کەخەڵکی بـــەوکارە خراپـــەت بزانن‌و ئاگاداربن، حەزناکـــەی کەس پێ بزانێ ودەیشـــاریتەوە. بەپێچەوانەی شتی پاك‌و حەلاڵ‌و شەرعی‌یەوە کەمنەتت بەکەس نی‌یەو سەربەرزانە دەڵێی من ئەوکارەم کردوە، یان خاوەنی ئەوشتەم.

بەڵـــێ دڵی پاك لەســـینەی مرۆڤی ئیماندارو خواناس دا، بەشـــتی جوان وپـــاك وحەلاڵ دڵنیا دەبێت وبەحەرام بێتاقەت ودڵتەنگ دەبێت. هەروەکو لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوەکە: (قالَ رَجُلٌ يارَسُـولَ اللهِ ما الإِثْمُ؟، قالَ: إذا حاكَ في صَدْرِكَ شَئٌ فَدَعْهُ). رَواهُ أَحْمَد.

واتـــە: پیاوێك عـــەرزی پێغەمبەری خوای کـــرد، ئایا بەچیدا بزانم کەفلان شـــتە گوناهەو خراپەو بێ شـــەرعی یە؟ فەرموی (ﷺ) ئەگەر وویستت کارێك بکەی، پارەیەك وەربگری، شتێ بکڕی، لەوکاتەدا هەستت بەقەلەقی ودڵەڕاوکێ دەکردو دڵەکوتێت پێ کەوتبوو، نائارام بوی ئەوە نیشانەی ئەوەیە کەحەرامەو گوناهەو تۆش یەکسەر وازی لێ بێنە..

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەئیســـلام چەند گرنگـــی دەدات بەناوەوەی دڵ‌و دەرونی مـــرۆڤ وپاکی دەکاتەوەو وای لێ دەکات کەنەفسی خۆی چاودێربێت بەسەرخۆیەوە، کەئەمەش پێچەوانەی یاســـا دەستکردەکانی مرۆڤە (کەحیساب بۆبونی غەیب وچاودێری خوایی نـــاکات) کەمرۆڤ ئەگەر بڕوای بەغەیب وخوای پەروەردگار نەبێت تەنها

لەچاودێــری دەرەكــی دەترســێو ئەگەر زانــی چاوی كامێرای شــاراوەی لەســەرنیــیەو پۆلیسو ئاســایش ئاگای لێ نیــیە. لەخراپە درێغی ناكات.. بەڵێ بەڕاســتی دڵــی ئارام وپاكوخاوێن زۆر گەورەیەو مرۆڤ لەســایەیدا بەختەوەر دەبێت. وەمرۆڤی دڵئارام وپاك هەم خۆی ئاسودە دەبێت وهەم خەڵكیش لەدەستی ئاسودە دەبن. سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن: (سەهلی كوڕی عبدالله) زانایەك بوو. چوو بۆعێراق بۆخوێندنی زانســتی شەرعی. لەبەغــدا ژورێكی بەكرێ گــرت، ژورێكی فوڕی بچــوك، كەبەفوڕ دیوارو ژێرەكەی سواغ درابوو. ڕۆژێكیان خزمێكی سەردانی شاری بەغدای كردبوو. ســەردانی ئەم فەقێ یەی كردو ووتی: دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆناو خزمان، دەتەوێ باســی چ هەواڵێكت بۆ ببەمەوە؟ ســەهل گوتی: زۆر بیری دایكم دەكەم. دەمێكە بەخزمەتی نەگەیشتوم ودڵم نایە دەرس وخوێندنەكەم لای ئەم مامۆستا بەڕێزو شارەزایە بەجێ بێڵم وجێگاكەم بگیرێ، جالەبەرئەوە ســەلامم بەدایكــم بگەینەو نامەیەكیشــی بۆدەنوســم، بەڵكــو نامەكەی پــێ بگەیەنی. خزمەكەی ووتی: زۆرباشــە خێرا نامەكە بنوســە چونكە كاروانچیەكان ئامادەبون ودەبێ بڕۆم. (ســەهل) دەســتی كرد بەنوســینی نامەكەو مەرەكەبی ئەو زەمانەش ماوەیەكی زۆری پێدەچوو هەتاووشــك دەبۆوەو ئەگەر پەلەی لێبكرایەو زوو بپێچرایەوە، ووشەكان تێك دەچوون وتێكــەڵ دەبوون. جالەبەرئەوەی هەلگری نامەكە پەلەی بوو. ســەهلیش دەیویســت نامەكە جوان بێو ووشەكان تێكەڵ نەبن. ناچار هەندێ خۆڵە ووردەی لەدیواری ژورەكە كڕاندو گڵەكەی بەكاغەزەكەوە كرد بۆئەوەی زوو ووشك ببێتەوە. ئەوجا پێچایەوەو دایە دەستی خزمەكەیو فەرموی: ئەم نامەیە بگەیەنە دەستی دایكمو سەلامی پێ بگەیەنە (دیارە باوكی وەفاتی كردووە).. (ســبحان الله) بۆ شــەوەكەی سەهل خەون بەپێغەمبەری خواوە دەبینێ وپێغەمبەری خوا (ﷺ) پەرداخێك شــیردەداتە دەســت ســەهلو

دەفەرموێ: ئەم پەرداخە شــیرە بخۆرەوە، بەڵام پێش ئەوەی بیخۆیتەوە، ئــەم تۆزە گڵو خۆڵەشــی تێبکە!! ســەهل ووتــی: خۆم ودایــك وباوكم بەقوربانــت بین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ ئەدەبی نەبێ لەحزورتا، باشــە بۆدەبێ ئەوشــیرە پاکە، خاوێنە، ئەوخۆڵــەی تێبکرێ؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەی باشە چۆن تۆش چاکەکانت تێکەڵ بەخراپە دەکەیت وچــۆن ئەومافەت بەخۆتدا خۆڵو گڵی ئەم خانــووە کەبەکرێت گرتووە، بەبێ پرســی خاوەنی بیخەیتە سەر کاغەزەکەت، ئەی چی وەڵامی خاوەن خانووەکە دەدەیتەوە لەقیامەتدا؟! (اللهُ أكبر) لەعەزەمەتی ئەم ئیســلامە. چــۆن لەبچوکترین ماف خواردنی خەڵکــی بەناڕەوا دەپێچێتەوەو ناهێڵێ مرۆڤی پاك ودڵڕوناك بەسەریدا تێبپەڕێ.. بەڵێ ئەمە دڵی خاوێنە، ئەمەیە وویژدانــی زیندوو. کەتەنها بەئیمان پەیدا دەبێو هێندە پاکە نابێ تۆزێ گڵو خۆڵی خانوویەکی کرێ ی بەناحەق تێکەڵ ببێ، چۆن کۆمپیوتەرێك، ووردترین ڤایرۆس، کەهیچ چاوێك هەستی پێناکات، ئەم دەیخوێنێتەوەو ئاماژەی پێدەکاتو ئەگەر دژەڤایرۆسی بۆ بەکار نەهێنرێ، لەناوی دەباتو خەڵــەل لەکۆمپیوتەرەکەدا دروســتدەکات. ئیمانی پــاك وپاڵافتەش. دڵی خاوێنیش ئاوایەو ئەوەی چاوی خەڵك نایبینێ وهەرحیسابی بۆناکات لای ئەم دیاردەبێ وکاریگەری لەسەر دروست دەکات ودەبێ خێرا خۆی لێ پاك بکاتەوە. بەڕاستی بەزەییم بەوکەس ولایەن وفیکرانەدا دێتەوە کەئیسلام وخواناسی ودینداری بەکۆنەپەرستی وبێ دینی ولادینی بەپارێزەری مافی مرۆڤ دەزانن، بەڕاستی خەڵەتاون وەخەڵەفاون!!. خوای گەورە هیدایەتی هەموو ئەوکەســانە بدات کەلەئیســلام دورکەوتونەتەوەو کارێکی وابکات کەبێنەوە سەرشەقامە ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام ولێی وردببنەوەو بەوردی تێی بگەن وهەرلەدورەوە بەنەزانی دژایەتی نەکەن..

بەڵــێ بەڕێــزان: غەیری ئیمــان بەخــوا، بەقیامــەت، بەتەرازوی

کردەوەکان، هیچ هێزو شتێکی تر وویژدان لەناخی مرۆڤ دا دروستناکات، ویژدان بەعیلم وزانســـتو بڕوانامەی بەرز دەســـتناکەوێ. چونکە زۆر زانــاو هەڵگــری بڕوانامەی باڵا هەیە، لەئاســتی فەقیرو هەژاردا هیچ ویژدانێکی نی یەو بگرە لەجیاتی لەزەحمەت ڕزگاری بکات، ئەوەندەی تر قوڕبەسەری دەکات. سەرنجی ئەم ڕوداوە بدەن، کەهی دێرزەمان نیە. بەڵکو لەبەرواری (٢٠١٠/٥/١٢) لەهەرێمی کوردســـتانی خۆمان ڕویداوەو لەبەرحورمەتی ناوچەکەو کەســـە باش وچاکەکانی ئاماژەی ڕاستەوخۆ بەناوی شـــوێن وکەسەکان نادەین، کەهەرچەندە لەوبەروارەدا لەگۆڤارو ڕۆژنامەکان بڵاوکرایەوە. دکتۆرەیـــەك، لەگەڵ ئەوپەڕی حورمەتماندا بـــۆ هـــەوڵو ماندوبونـــی هەموو براو خوشـــکە پزیشـــکەکان ئەوانەی دڵســـۆزانە لەخزمەتی نەخۆش ودەردەداراندان وهەموو هەوڵی خۆیان دەخەنەکار بۆخزمەتی میللەتی موسڵمان، خوای گەورە مۆفەقیان بکات وســـەرفراز بن، ئـــەم دکتۆرەیە. بەناوی: (م، أ). لەنەخۆشـــخانەی (ك) ی ئەهلی لەســـلێمانی. نەشـــتەرگەری (کۆڵۆن)و(ڕیخۆڵە کوێرە) بەبڕی (ملیۆنێك وپێنج سەد هەزار) دینار، بۆهاووڵاتی (محمد أحمد) تەمەن (٥٤) ســـاڵای دانیستوی کەلار دەکات. دوای (٢٦) ڕۆژ لەنەشتەرگەریەکە، نەخۆشەکە بەردەوام هەســـتی بەئازاری زۆر دەکردو دەیگوت: هەست دەکەم مقەســـتێك لەســـکمدایە!! چونکـــە بەردەوام هەســـتی بەئازارو تەنگەنەفەسی دەکرد. پاشان لەتاوی ئازارو ناڕەحەتی سەردانی هەمان دکتۆرە دەکاتەوە کەنەشـــتەرگەریەکەی بۆئەنجامداوەو دوای ئەشـــعەو ســـۆنەر دەردەکەوێ، بەڵێ ڕاســـتە مقەســـتێك لەســـکی نەخۆشەکەدا، بەجێ ماوە!!، ئەمە تائێرەی باســـەکەمان ڕەنگە تاڕادەیەك ئاسایی بێ، کەڕەنگە بگونجێ هەڵەی ئاواش ڕووبدات، (بەڕاســـتی نابێ ڕوشبدات). بەڵام بەهەرحاڵ مرۆڤ لەهەرئاســـتێکدابێ قابیلی هەڵەیەو دەگونجێ

هەڵـــەی گەورەش بکات. بـــەڵام ئەوەی جێگەی ئەســـەفە ئەوەیە: ئەم دکتۆرەیە لەجیاتی داوای لێبوردن وگەردن ئازایی لەم نەخۆشە هەژارە بەســـەزمانە بکات وبەخۆداچونەوەیەك بۆخـــۆی وهاوکارەکانی بکات. بەنەخۆشـــەکە دەڵێ: دەبـــێ (٢٢٠) هەزاری تریشـــم بدەیتێ. بۆئەوەی نەشـــتەرگەریەکی ترت بۆبکەمو مقەستەکە لەسکت بێنمەوە دەرەوە!! بەڵێ جارێکی تر عەمەلیاتی دەکاتەوەو (٢٢٠) هەزارەکەشی لێ دەسەنێ ومقەستەکە دێنێتە دەرەوە. کەمقەستەکە (١٥- ٢٠) سم بوە!!

بەڕێزان: جاری واهەیە هاووڵاتیش بەهۆی کزی ئیمانەوە، بێ ویژدانە. ئەوەتا خەڵکانێك هەن کارەبا چەتاڵ دەکەن، یان لەپشـــتی ســـەعاتەوە کارەبا دەدزنو خۆشـــیان بەگوناهبار نازانن. لەکاتێکا خیانەت لەوشتە گشتیانەی کەموڵکی هەموو خەڵکین گەورەترین خیانەت وتاوانە.

ئیماندارانـــی بەڕێز: هەرکات مرۆڤی ئیماندار بوە خاوەنی دڵێکی پاکو ئارام، لەدوای مردنیشەوە پەیوەندیەکانی لەگەڵ خۆشەویستانی ناپچڕێ، بابەیەکەوە گوێبیســـتی ئەم بەسەرهاتەبین. دەگێڕنەوە: دووبرا هەبوون، زۆر موسڵمان وڕێکوپێك بون. خەڵکی هەموو خۆشیان دەویستن وبەدەست وکاســـپی وعەرەقی ناوچەوانی خۆیان دەژیـــان، ئەم دووبرایە بەقەدەری خـــوای گەورە لەیەك ڕۆژداو بەیەك ســـات گیانیان لەدەســـت داو مردن. بەتەنیشت یەکەوە گۆڕیان بۆهەڵکەندراو لەتەنیشت یەکەوە نێژران. ئەو کەســـەی کەگۆڕەکەی بۆهەردوکیان هەڵکەندبوو، (گۆڕهەڵکەن). بۆشـــەو خەونی بەودوو برایـــەوە بینی، کەلەڕۆژەکەیدا قەبـــری بۆهەڵکەندبون بینی ئەو هەموو خەڵکە بۆیان بە پەرۆشن ، لەخەونکەیدا بینی وا ئەم دوو پیاوە لەســـەر جوانترین شێوەن و نور لەنێوچاوانیان دەبارێ، بینی برای یەکەمیان لەلای حۆری وغیلمانی بەهەشـــتەوە پێشـــوازی لێ کراو کەلەکەژاوەیەکی ســـەوزدا ســـوار کراو بەرەوبەهەشت بەڕێ کرا. براکەی

تریشیان بینی بەهەمان شێوە حۆریەکان وغیلمانەکانی بەهەشت پێشوازی لێکراو بەرەوبەهەشت بەڕێ کرا، بەڵام ئەمیان بەپی ڕۆیشتو وولاخی سواریان بۆنەهێنابوو!.. بەڵێ کاتێ گۆڕهەڵکەن خەبەری بۆوە بۆی دەرکەوت ئەمە خەونەو بۆبەیانی ڕۆیشت بۆلای دایکی ئەودوو برایە، بەمەبەستی ئەوەی پرسەی لێ بکاو لەوکارەساتە نارەحەتەشدا، کەلەیەك ساتو یەك ڕۆژدا، دایکێکی بەساڵاچوو، دوو کوڕی گەنجی باش ورەفتار جوانو خواناس لەدەست بداو دووکون ببێتە جگەری. بەڵکو بەگێڕانەوەی ئەم خەونە دڵخۆشکەرە، سەبوری بەدڵو دەرونی بێ ولەئازاری جەرگ سوتانەکەی کەم ببێتەوە. بەڵێ کابرای گۆڕهەڵکەن بەرەو ماڵی دووبراکە بەڕێ کەوت وچوەلای دایکیان وپرسەی لێ کردو پاشان پێ ی ووت: بەڕاستی دایەگیان من هاتوم بۆخزمەتت هەم بۆتەعزیەو هەم پرسیارێکیشت لێ دەکەم دەربارەی ژیان وکاروکردەوەی کوڕەکانت، چونکە بەڕاستی من ئەمشەو خەوم پێوەبینین. هێشتا قسەکەی تەواونەکردبوو، دایکی دووبرایەکە ووتی: پێم بڵێ هاتووی پێت بڵێم کاروکردەوەی کوڕە سوارەکەم چۆن بوە، یان کاروکردەوەی ئەوکوڕەیانم کەبەپێ ڕۆیشت بۆبەهەشتو وولاخی سواریان بۆنەهێنابوو؟!! (أَجِئْتَ تَسْأَلُني عَنِ الرَّاكِبَ أَمْ عَنِ الماشي؟!) کابرای گۆڕهەڵکەن سەری سوڕماو دەمی ووشك بوو، چاوی ئەبڵەق بوو، لەبەرخۆیەوە ووتی: خۆئەوەی من بینیومە ئەویش بینیویەتی. خۆئەمە هەربەلاشە لەکوڕەکانی دابڕاوە، ئەینا خۆهەرلەگەڵیان دەژی.. بۆیە ووتی: دایەگیان هاتوم لەحاڵی هەردوکیان بپرسم، من لەوەتێنەگەیشتم بۆچی ئەوبرایەیان بەسواری بەرەوبەهەشت ڕۆیشت. بەڵام ئەی بۆچی ئەمیان کەهەربرای ئەوەو هەربەیەکەوە ژیان ومردن، بەپێ ڕۆیشت و وولاخی بۆنەهات؟! دایکەکە فەرموی: (أَما الرَّاكِبُ فَكانَ يَأْتِي إلى المَسْجِدِ قَبْلَ الآذانِ، وأَما الماشي فَكانَ يَأْتِي إلى المَسْجِدِ بَعْدَ الآذانِ)!!، واتە: ئەوبرایەیان کەبەسواری

بەرەوبەهەشــت ڕۆیشت. ئەوە لەپێش ئەوەدا کەبانگ بفەرموێ، دەچووە مزگەوتەوەو هەمــووکات ئەوەندە دڵی بەمزگەوت ونوێژی جەماعەتەوە بــوو، کاتــێ کەنزیکی بانــگ دەبۆوە ئیتر دەســتی لەئیــش هەڵدەگرت وبەرەومزگەوت دەڕۆیشــت ونوێژی (تَحْيَةُ المَسْـجِدِ)ی دەکرد ئەمجا بانگی دەداو نوێــژ دەبــوو. بەڵام براکــەی تریان، کاتێ کەبانــگ دەبوو، گوێی لەبانگەکــە دەبــوو، ئەمجا وازی لەئیشــەکەی دەهێناو لــەدوای بانگەوە بەرەو مزگەوت دەڕۆیشت.. تەنها لەوکردەوەیاندا جیاوازیان تێدا دەبینم‌و ئاواش بینیم لەقیامەتا ئەوبرایەیان لەپێشــتربوو بۆچونە ناوبەهەشت. هەروەکو لەدنیادا لەپێشــتربوو بۆچونە ناومزگەوت!. بەڵێ بەم شێوەیە ئــەم دایکــە دڵپاکە ئاوا لەدوای مردنیش ئــاگاداری حاڵی کوڕەکانی بوو. بــەڵام: کاتێ ئیمان کزبوو لەدڵــدا، ئەودڵە بەرەو ڕەش بوون دەچێ. وای لێ دێ ئەومرۆڤە دڵ نەخۆشــە، ئەم فەرمودەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بەسەردا جێ بەجێ دەبێت. بابچینە خزمەت فەرمودەکە: (روى إِبْنُ حَبّان في صَحيحِــهِ والَاَصْبَهــانِيُّ: عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ، قالَ: قالَ رَسُــولُ اللــه (ﷺ) إِنَّ اللهَ يَبْغِضُ كُلَّ جِعْظَرِي جَوَّاظٍ، صَخّابٍ في الَاَسْــواقِ، جيفَةٌ بالَّيْلِ، حِمارٌ بالنَّهارِ، عالِمٌ بِأَمْرِ الدُّنيا، جاهِلٌ بِأَمْرِ الَاخِرَةِ).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: بەڕاســتی خوای گەورە ڕقی لەهەمــوو ئەوکەســانەیە کەئەم ڕەوشــتانەیان تێدایــە. (پەنادەگرین بەخــوا)، هەمووکەســێکی توڕەی، قســەڕەقی، دڵ ڕەقــی، بێ بەزەیی، چارەگران، بێ ویژدان، کەبەئازاری کەس ئازاری پێ ناگات وبەخۆشــی کەس دڵخۆش نابێ وڕوویەکی خۆشــی لێ نابینرێ وقســەیەکی خۆشی لێ نابیســترێ. (جائەم کەسە باوك بێ بەرامبەر ژن ومناڵەکەی وابێ، یان ژن بێ بەرامبەر هاوســەرەکەی وابێ، کوڕو کچ بن بەرامبەر دایك وباوکیان. چونکە کەسی واهەیە لەناوخەڵکا وەکو شەکر شیرینە کەچی

بۆژن ومنالەکەی، یان ژن بۆمێردەکەی، ئاوا ڕووتاڵو مۆن وقسـەڕەقە. ئەمەش هەربەر ئەوفەرمودەیە دەکەوێ، چونکە مەرج نی یە بۆهەموو کـەس هەرئاوابـێ، بەڵکو بۆنزیکترین کەس کەپێویسـتیان بەسـۆزو خۆشەویسـتی وڕێزو زەردەخەنەو لوتفـی ئەوهەیە، خراپەو دڵڕەقەو خوای گەورەش ڕقی لەوجۆرە کەسەیە. یان ئەوفەرمانبەرو بەڕێوەبەری دائیـرەو فەرمانگە حکومیەی کەنانی ئەوکورسـی وقەڵەمە دەخواتو ئەگەر میللـەت نەبێ ئەو چ کارەیە. کەچی تائیمزایەك بۆهاوولاتیەك دەکات، دەڵێ ی بێگاری پێ دەکەن وڕوویەکی خۆش وقسەیەکی شیرین لەدەمی نابیسـترێ، هاوولاتی کەئەمە دەبینێ نەفرەت لەحکومەتیش دەکات وچاك وپاکەکەشـی بەرچاو دەکەوێ. پاشـان فەرموی: (جَوَّاظٍ) زۆرخۆر. پارویەکی چەور لەکوێ شك بەرێ خۆی دەگەیەنێتێ. حەقی حەلاڵو حەرامی نی یە. (صَخَّابٍ فِي الْأَسْـواق). هات وهاوار دەکات لەناو بـازاڕدا، دەیکات بەهات وهـاوارو هەرایەك وائەزانـی ئەوبازارە تەنها بەس ئەوی تێدایە. هیچ حیسـاب بۆهەسـتی ئەوخەڵکە ناکات. ئەمە ئەوکەسـانەش دەگرێتەوە کەتەسجیل بەدەنگی بەرز دەکەنەوەو دەبێ هەمـوو دوکاندارو ئەهلی بـازاڕو کڕیار گوێ لەگۆرانی ومۆسـیقاکەی ئەوبگرێ. وەئەوکەسـانەش دەگرێتەوە کەبەئوتومبێل بەبازاڕدا دەڕۆن وتیژڕەوانە لێدەخوڕن وهۆڕینی زۆر لێ دەدەن وهەموو خەڵك سەرنجی دەداو دەڵێ دەبێ ئەم شۆفێرە بۆ ئاوا بکات وئەوناوە دەشێوێنێ!.. (جیفَةٌ بالَّیْـلِ) کەشـەوداهات وەکو کـەلاك لێ ی دەکـەوێ ودەچێتە خەوێکی قوڵەوەو نەوەختی خەوتن شایەتمان وزیکرێك دەکات، نەشەو هەڵدەستێ دووڕکات شـەونوێژ بکات. نەنوێژی فەڕزی بەیانیەکەشی دەکات. بگرە هەرکەخەوتوە نیەتی ئەوەی هێناوە نوێژی بەیانی نەکات، وەکو کەلاك لـێ ی دەکەوێ و لەناو جێگاکەیدا بۆگەن دەکات وبەدەم باوێشـکەوە،

وەڕسی وبێتاقەت لەخۆیو لەژیان ولەژینگەو لەخەڵکی لەخەو هەڵدەستێ وشەڕ بەخەڵکی دەفرۆشێ، بەپێچەوانەی ئەهلی ئیمانەوە کەبەیانی بۆنوێژی بەیانی هەڵدەستێ ویادی خوا دەکاتو دەستنوێژ دەگرێ ونوێژ دەکات وزیکری خوا دەکات ولەخوا دەپاڕێتەوەو چوستو چالاکو ڕوخۆش ودڵخۆش لەگەڵماڵو منداڵو دەوروبەرو هاوکارانی دا ڕووبەڕودەبێو ڕۆشنایی لەدەم وچاوی دەبارێ!. (حِمارٌ بالنّهارِ). کەڕۆژیش بوەوە، هەموو هەوڵو هیممەت وغەمی دەبێتە هی گوێدرێژ، کەهیچ غەم وپەژارەو بەرنامەیەکی نی یە بۆژیان، تەنها تێرکردنی سکی نەبێ. واتە: ئەو هەموو هەوڵەی دەیدات لەکاسپی ومعامەلەو کڕینو فرۆشتن خوێندنو سیاسەتو حیزبایەتی وئەم وئەو. هەمووی تەنها بۆئامانجی دەوڵەمەندبوونو پارەزیادکردن وڕابواردن وخۆتێرکردنە. بەڵام هیچ بیری بەلای دین، نیشتمان، فەقیرو هەژار، پێشکەوتنی وولاتەوە نییە. ئامادەیە ئەگەر بۆی بچێتەسەر، چی خواردنی بەسەرچووی وولاتانە. بۆتە ژەهری کوشندە، بیهێنێتە وولاتەکەیەوەو دەرخواردی گەلەکەی خۆی وهاوزمانانی خۆی بداتو توشی سیلو سەرەطانیان بکات وهەمویان بەئازاری درێژخایەنەوە بخاتە گۆڕەوە. تەنها لەپێناوی چەند دۆلارێکدا کەبچێتە گیرفانی خۆیەوە. بەڵێ (حِمارٌ بالنّهارِ). زۆرکەس دەگرێتەوە، با بەشەهادەو خوێندن لەئاستی باڵادابێ، یان بازرگانێکی بەناوبانگ بێ، یان ئەندازیاربێ، مادام هەموو ئاواتی هەردەوڵەمەندبون وپارە کۆکردنەوەیەو ئامادەیە، قوتابخانەیەك، نەخۆشخانەیەك، باخچەیەکی ساوایان، کەمنداڵی پەپولە ئاسای تێدا بەخێودەکرێو پەروەردە دەکرێ، ئامادەیە بەخراپیو موادی خراپ دروستبکاتو پاش چەند ساڵێك بەکەڵك نەمێنێ، لەپێناوی چەند دۆلارێکدا!! بەڵێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (عالِمٌ بِأَمْرِ الدُّنيا، جاهِلٌ بِأَمْرِ الآخِرَةِ). ئەوجۆرە مرۆڤانە

زانان بەکاروباری دونیاو نەزانن بەکاروباری قیامەتو دوارۆژ. کەســی واهەیــە دەزانێ دۆلارێك چۆن بۆچەند ســەنتو فــلانو فلان دابەش دەکرێ، کەچی نازانێ نوێژە ســوننەتەکان چەنــدن. یان زیکری دوای نوێژەکان چۆنە.. ئەگەر لەکاروباری دونیا پرسیاری لێ بکەی، دەڵێ ی پسپۆڕێکی بواری ئابوری یە قسەدەکات، بەڵام کاتێ باسی دینو قیامەت وبنەماکانــی دین دەکات، دەڵێی کەســێکی تازە موســڵمانە لەبەرئەوە پێویستە مرۆڤی موسڵمان، دینو ژین بەیەکەوە ببەستێتەوەو لەهەردوو بــواری دونیاو قیامەتــدا شــارەزابێتو بەرچاو ڕوون بێــتو بەژینی خزمەتــی دینی بــکاتو بەدینی ژینی بکات بەژیــانو دوربێت لەژان.. خوای پەروەردگار لێت دەپاڕێینەوەو دەڵێین:

(رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنيا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّار). اللّهُمَّ آمين.


سەرچاوەکان:

١. مَنْهَج الإِسْلام في تَزْكِيَة النَّفْس - الدكتور محمد خَيْر فاطمَة، ص١٠٢، ص١٠٧.

٢. الوافي في شَرْح الأَرْبَعين النَوَوِيَّة. د.مصطَفى البُغا، محي الدِّين مستو، ص٢٠٤.

٣. شــەرحی الأَرْبَعين النَوَوي بەکوردی. نوســینی: عبدالخالق مسعود، و: باوکی محمد.

٤. نەخۆشیەکانی دڵان. د.عُمَر عبدالكافي، و: عبدالجَليل علي، ل٢٦.

٥. ڕۆژنامەی کۆمەل، ژ: ٤٢٩، ل١.

٦. وَصايا الرَّسُول (A)، الدكتور محمد بكر إسماعيل ج٣ ص٢٥٦، ص٥٣٦.

# ووتاری چوارەم
# بۆ مانگی ڕەجەب

# الإِسْراء والمِعْراج

الحَمْدُلِلّهِ رَبِّ العالَمين، والصّلاة والسَّـلام عَلى سَـيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبهِ أجمَعينَ:

ئیمانـــداران وخواناســـانی بەڕێـــز: لەکۆتایی مانگی (ڕەجـــەب) داین‌و یادی ئیســـڕاو میعراجی پێغەمبەری پێشەوامانە. کەزۆربەی بۆچونەکان لەســـەرئەوەن کەلـــە (٢٧)ی مانگـــی ڕەجەب دا، پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) لەمەککـــەوە چـــووە بۆ قودس‌و لە وێشـــەوە لـــە (مَسْـجِدُ الاقصى) وە، بەرزکراوەتەوە بۆخزمەت خوای پەروەردگارو گەیشتۆتە شوێنێك کەهیچ کەســـێك لەپێغەمبەران پێی نەگەیشـــتووە. کە (ئیسڕا) واتە: شەوڕەوی. بەچونـــی پێغەمبەر (ﷺ) دەوتـــرێ. لە (کەعبەوە) بۆ (مَسْـجِدُ الاقصى). وە (میعراج)یـــش، واتە: بەرزبونەوەی لە (مَسْـجِدُ الَاَقْص)ی وە بۆخزمەت پـــەروەردگاری جیهانیـــان. کەیەك ســـوڕەتی قورئانیش نـــاوی (الاسراء). وەخـــوای پەروەردگار لەســـوڕەتی (الاسراء)»و ســـوڕەتی (النَّجم) دا باســـی ئیســـڕاو میعراجمان بۆدەکات. دەچینە خزمـــەت قورئان کەدەفـــەرموێ:

﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ الأسراء: ١.

لێـــرەدا لەیادی ئـــەو ڕێزلێنانە تایبەتە بـــۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێین:

(بەخ لـــەم یادە ناوازەیـــە.. کەمێژوی پێ ڕازاوەیـــە.. یادی میعراج، میعراجی ئـــەو.. پێغەمبەری خاوەن برەو.. کاتێ چاوان لەنیوەشـــەو.. چووبونە خەو.. ئیســـڕاو میعراجی پێکرا.. بەگەشـــتی ناو ئاسمانەکان، ڕێـــزو ڕەواجـــی پێـــدرا... بۆیە ئێمەش جـــەم بوینـــەوە، والێوەکانمان وازدەکەیـــن، بەرەو (نَجْم) و(أسرا)ی قورئان، بەباڵی ڕوح پەرواز دەکەین. لەگوڵزاری نبوەتدا ئاهەنگی میعراج سازدەکەین.. کاتێ کە مەککە دژوار بوو..دەمی ناحەز چزوی مار بوو... دوانزە ســـاڵی ململانێی پڕکێشـــە کێش... هەزارەها دڕکودڵ‌و ئازارو ئێش، بۆتۆی سەروەر هێنرایە پێش...

ئەودەمــە بوو پــەروەردگار، فەرمانێکی بۆ دەرکــردی... بەموعجیزەی میعراجەکــەت، تاجی ڕێزی خاتەمی پێغەمبەرانی لەســەرکردی... لە (ئایاتی مەکنون)ی خۆی، پیشــانیدای زۆر بەووردی... کۆچی دە ڕۆژی طائیفت... نمونەی پەیامداریتــە... موناجاتی لای باخەکەت... بەڵگەی دڵ کۆڵەواریتە.... سۆزی گەرمی قورئانی تۆ، کەجنۆکەی هێنایە جۆش، دەلیلی شەو بێداریتە.. بۆمیعراجیش میواندار خودای (جەلیل)ە، بوراق دەبێتە وەســیلەو.... جبریلی ئەمین دەلیلە... ئەو شەوەش وەك شەوی قەدر.... شــەوی تار بوو بەچراخان... فریشــتەکان بۆپێشوازیت، بەڕیز وەستان. چونکە قوربان، سەفیربووی بانگ کرایتەوە.... زوير بووی، دڵ درایتەوە... بەیەك (لەمحە)، سنوری ئاسمانت بڕیو.... هێشتا جێگەکەت گەرم بــوو، کەبۆزەوی گەڕایتــەوە... لەکەعبــەوە بەڕێکەوتی... بۆڕاق چەشنی پەروانە بوو....فەلەسطین ڕێزی پێدراو (قودس) سەفارەتخانە بوو، لەوێ ئیمامی نوێژێکی سەرجەم پێغەمبەرانە بوو... ئەی ڕێبواری میعراجی دوور.... ڕێگات بڕی، ئاســمانەکان بەبێ ســنوور... فریشتەی نور، (کۆتا سیدرە)و (بەیتی مەعمور)... عەقڵی ئادەمی پەی نابا بەئەو گەشتە ئاسمانیە... ئابەو ڕێزو میوانی یە... بێ تە (صدیقی ئەبوبەکر) تێناگا بەو ئاسانیيە...

بەمیعراجی ڕێزو شکۆ، چویتە خزمەت خودای باری.... بۆسەرزەوی هاتیتــەوە، نوێژت هێنــاوە بەدیاری.... تامیعراجی ئیمانداربێ، پاشــی خۆت بۆیادگاری... کاتێ گەشتی میعراجی تۆ، لەمەککەدا بوو بەهەواڵ... بت پەرســتی بــاوەڕ بەتاڵ... قەبەو زلو عەقڵ منــاڵ. بەتوانجی تاڵ، لێــت کەوتنە قاڵ.... تا ئەوانەی باوەڕدار بوون، مل کەچی پەروەردگار بــوون، ووتیان هەرچی بڵێ وایە. چونکــە پێغەمبەری خوایە، چونکە پێغەمبەری خوایە...

ئیمانـــداران: ئەگەر کەمێـــك ووردبینەوە لەدروســـتکراوەکان وژیان بەگشتی، ئەوا دەبینین کەهەمیشەو بەردەوام (أَسْباب) و(مُسَّبَبات) لەگەڵ یەکدی دەســـت لەملانن ولەسەروشـــیانەوە (مُسَـبِّب) بالآدەستو بڕیار بەدەســـتەو هاوســـەنگی دەخاتە نێوانیانەوەو ئاشتیان دەکاتەوە لەگەڵ یەکیداو ژیان بەوســـوننەتە گەردوونیە بەڕێوە دەبات. لەم سۆنگەیەوە ئەگـــەر بمانەوێـــت کەمێـــك بەچـــاوی دڵو وەك کەســـێکی مـــل کەچ لەبەردەم وەحی وپەیامی خوادا لەبابەت ومەسەلەی (ئیسراو میعراج)، شـــەوڕەوی‌و بەرزبونـــەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بڕوانیـــن‌و بدوێین، ئەوا بەشـــێوەیەکی جوانتر هەمان ئەو پێشـــەکیەی سەرەوە بەدی دەکەین. بێگومان ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین دەگەینە ئەوبڕوایەی کەهەموو (عـــروج)و بەرزبونەوەیەك بـــۆ (نزول)و دابەزینێـــك دەبێتو هەموو نزول و دابەزینێکیش پێویستی بەعروج‌و بەرزبونەوەیەك هەیە، وەك چۆن بەرزبونەوەی هەڵمی ســـەر دەریـــاکان بۆداباارینی باران وبەفرەو بەرزبونەوەی (خۆر) یش، بۆ نازڵ بونی تیشـــك وڕوناکی وگەرمی یە، ئەگەر تەماشـــای میعراج وشەوڕەوی پێغەمبەریش (ﷺ) بکەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کەئەو میعراج‌و بەرزبونەوەیە بۆدابەزاندنی شتێك بوو کەخوای بەخشندەو میهرەبان بڕیاری لەسەر دابوو، بۆسەلماندنی ئـــەم ووتەیەش کـــە: (هەموو عـــروج وبەرزبونەوەیـــەك، بۆنازڵ بون ودابەزینـــی شـــتێك دەبێـــت وهەروەهـــا داواکـــردن وچاوەڕوانیکردنی هەرنزول‌و دابەزینێکیش، پێویســـتی بەعروج‌و بەرزبونەوەیەك هەیە) ئەوا: لێرەداو لەم ووتارەدا- بەویستی خوا ئاماژە بەچەند نموونەیەکی بەرجەستەو دیاری ناو قورئانی پیرۆز دەکەین:

یەکەم: میعراج وبەرزبونەوەی حەزرەتی (نوح) بۆسەرچیای (جودی)، بۆنـــازڵ بون‌و دابەزینی ئاشـــتی‌و خێرو بەرەکەت بوو، بۆســـەرخودی

حەزرەتــی نوحو گەلەکــەی. وەك خوای گــەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾و﴿ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ هود: (٤٤ و٤٨).

دووەم: میعــراجو بەرزبونــەوەی حەزرەتی (موســا) بــۆ (میقات)و بۆسەرچیای (طور) بۆدابەزینی (أَلْواح) بوو.

ســێیەم: میعراجــی یارانی ئەشــکەوت (أَصْحــابُ الكَهْــف) بۆچیای (ئانجیلۆس) بۆســەرلوتکەی ئەوشــاخە بەرزە، بۆ دابەزینی ڕەحمەتو کرانــەوەی دەروی خێــرو دەرفەتی ژیانو ئاســودەیی بوو. وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (فَأْووا إِلى الكَهْفِ يَنْشُرْلَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ، ويُهَيِّ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ مِرْفَقاً) الكَهْف:١٦

چــوارەم: میعراجــی حەزرەتــی ئیبراهیم بۆ (میقــات)و میعراجی هاجەرە خاتوون بۆ ســەر تەپۆلکەکانی (ســەفاو مــەڕوە) بۆدابەزینی ئاوی (زەمزەم) بوو..

پێنجەم: میعراجی حەزرەتی عیســا، بۆئاســمان. بۆ دابەزاندنەوەی ئاشتیو عەدالەتو مەحەببەتو خۆشەویستی‌یە بۆسەر زەوی..

شەشەم: میعراج وبەرزبونەوەی حەزرەتی (محمد) (ﷺ) بۆ ئەشکەوتی (حەڕا)بــۆ دابەزینی وەحیو قورئانو هەروەها ئیســڕاو میعراجی ئەو سەروەرە بۆسەرو ئاسمانەکان و(سَيْدَرَةَ المُنْتَهَى) بۆ نازڵ بوون ودابەزینی خەڵاتی مــەزن وبەنرخی نوێژ بوو، وەك ئەڵقەی وەســڵو پەیوەندی نێــوان خوداو بەندەو بۆئــەوەی کەئێمەی شــوێن کەوتوانی بەلایەنی کەمــەوە ڕۆژی پێنــج جــار میعراجێکــی ڕوحی ومەعنــەوی بکەین بۆحزوری پەروەردگار.. ڕون وئاشکرایــە زۆربەی ئەودیاری وخەڵاتانەی

کەپێشتر نازڵ کرابوونە سـەر زەوی وخەڵات وپێشکەشـی پێغەمبـەر (ﷺ) ومرۆڤایەتی کرابوون. تەنهـا میعراج و بەرزبونەوەیەکی ڕۆحی ومەعنەویـان بۆکرابـوو، بەڵام دیـاری خەڵاتی ئەمجـارەو ئەوخێرو بەرەکەتەی کەدەبوو دابەزێتەسەر زەوی وپێشکەش بەپێغەمبەر (ﷺ) وئوممەتەکەی بکرێت. پێویسـتی بەعـروج وبەرزبونەوەیەکی ماددی ومەعنەوی وجەسـتەیی وڕوحی هەبوو. بۆیە خوای گەورە سـەروەری ئازیزمانی دەعوەت وبانگهێشت کرد بۆئاسمان وبەرزی کردەوەو گەشتێکی (شەوانەی ئاسمانی) بێ وێنەی پێ کردو لەوێ خەڵاتەکەی پێ بەخشی. چونکە ئەوخەڵاتە زۆر لەوەگەورەترو بەنرخ ترو گرانبەهاتر بوو، کەبێ عروج وبەرزبونەوەیەکی جەستەیی وڕوحی نازڵ بکرێتو دابەزێنرێتە خوارەوە. بەڵێ، بۆ ئەم مەبەسـتە گـەورەو مەزنەش، خوای حەکیمو کاربەجێ ومیهرەبان، سـاتێکی گرنگی وەك شـەوی هەڵبژارد، شەوێکی هاوشـێوەی (شـەوی قەدر)و شـەوی دابەزینی قورئان وپەیامی ژیان. چونکە شەو دەرفەتی ژوان وبەیەك گەیشتنی عاشقان وخۆشەویستانە. شـەو سـاتی ویصاڵـی دڵـداران ودڵنەوایيکردنـی دەردەدارانە. شـەو میعادگای ئازیزان وتامەزرۆیانی دیداری حەبیبانە، بۆیە لەشەوی کش ومـات وبێ هـەراو غەوغاو لەمیوانداریەکی بێ وێنـەو، بەهاوڕێیەتی جوبریلی ئەمینی وەحی وحزوری ڕوحی پاکی پێغەمبەران (سـەلامی خوایان لێ بێ)و لەئاهەنگو کەڕنەڤاڵی پۆلی فریشتە نەزیهوپاکەکاندا، ئەم میوانداری وسـاتی بەخشـینی دیاری وخەڵاتەی سـازکرد، چونکە ئەوخەڵاتە گەورەترو بەنرختر لەوە بوو کەلەناو غەوغاو هەراو دەنگە دەنـگو ژاوە ژاوی ڕۆژدا ئەوعروجـەی پێ بکرێـت وئەوخەڵاتەی پێ ببەخشـرێت. کەخەڵاتی گەورەو گرانبەهای نوێـژ بوو. نوێژ بەمانای دوعاو نزاو ڕازو نیازکردن لەگەڵ خواو بەمانای ئەوشـەعیرەو ڕوکنە

ئاینی یـــه، کەڕۆژانە ئەنجامی دەدەین). چونکە لەڕۆژدا دەرفەتی ڕازو نیازی مەحبوبان کەمترەو مەشـــغەڵەت دەرفەتی ئەوە نادات کەئاشـــق ومەعشـــوقەکان باشـــتر ئاگایان لەیەکتربێـــتو دڵو چاویان تەنها لای یەکتربێـــت. بۆیـــە بۆئەو بۆنە گرنگەو ســـاتی بەخشـــینی ئەوخەڵاتە مەزنەو ســـازدانی دیدار بۆ حەبیبو خۆشەویستەکەی، خودای وەدودو میهرەبان پێویستی بەکەشو ساتەوەختێکی ئیمانی وڕوحی مەعنەویو عیرفانـــی هەبـــوو. دیارە کەئەو حاڵەتەش (ئەگـــەر نەڵێین تەنها) ئەوا دەتوانین بڵێین زۆرتر لەشـــەودا دروســـت دەبێت ودەست دەکەوێت. بۆ ئەهلی نیازو حەبیبو عوششاقان. مەحوی گوتەنی:

هەرلەتاریکی شـــــــــــەوایە، ڕێ دری ئەهلی نیاز
ڕازی دڵ ئیفشابکەن، خـــــــەڵوەتگەهی خاسانە شەو
تێبگەن بۆچی بەجانن طـــــــــــالبی شەو عاشقان
نیوەشەو بوو وەعدەگـــــــــــاهی هاتنی جانانەشەو
هێندە ساحێب سیڕڕە میعراجو شـــەوی قەدرو بەرات
خاصەجاتی ئەونو، مومتازە بەم ئەسرارانەشـــــــەو

لەم ڕوانگەیەوە بەتێڕامانو سەرنجدان لەئیسڕاو میعراجو شەوڕەوی پێغەمبەر (ﷺ)، پێویســـتە ئێمـــەش ئەوەبزانین کەئەگەر دەمانەوێت خێرو خەڵاتێکمان لەئاســـمان ولەلایەن خوای بەخشندەو میهرەبانەوە بۆدابەزێت ودەســـتبکەوێت، ئـــەوا دەبێت ئێمـــەش بەحەتمی (بەڕوح وگیانمـــان) میعراجێك بکەیـــنو بەرزببینەوە بۆئاســـمان. ئەومیعراج وبەرزبونەوەیەش باشتروایەو بەڵکو هەوڵ بدرێت کەزۆرتر لەشەودا بێت. ئێمەش بەئیسڕاو شەوڕەوی وشەوبێداری و(تَهَجُّد). میعراجێکی مەعنەوی وئیمانی بەڕوح وگیانمان بکەین. بۆئەوەی شایستەی ئەوخێرو خەڵاتە مەزنەبین.. کەواتە: هەموو نزولو دابەزینێك پێویستی بە (عروج) یێك

هەیە. ئیدی ئەونزول وعروجە ماددی بێت یان مەعنەوی. ڕێو شوێنێکی سەرەکیش بۆ تاکی باوەڕدار بۆ ئەو میعـراجو بەرزبونەوەیەو عروج کردنی ڕۆحی مەعنەوی، نوێژەو لەساتی نوێژکردندایە واتە: نوێژ وەك یەکێك لەمەزنترینو ناسکترین بەندایەتیەکانو ئەڵقەی وەصڵی نێوان خوداو بەندە، پەیژەی عروج کردنو بەرزبونەوەیە بۆئاسـمانو باڵۆنو کەشـتی فەزایی ڕوحە بۆ گەشتی ئاسمانیو مەعنەویو ڕازو نیازکردن لەگەڵ پەروەردگارو پاکبونەوە وەکو فریشتەکان وداوای نزولی ڕەحمەت وخێـرو بەرەکەت لەپەروەردگاری خاوەن فـەزڵو عەتا.. نوێژ میعراج وکڕنوش بـردن وچۆك دادانـە لەحزوری پـەروەردگارو عەرزکردنو پێشکەش کردنی (تَحِيّات) و(بَرَكات) و(صَلَوات) و(طَيِّبات)ە، بۆ خوای تاکە مەعبودو پەرسـتراو، نوێژ ئەگەر بەقوڵـی وبەڕوحەوە بەرپا بکرێت، ئەوە میعراجی ئیماندارانەو هەرنوێژێکی کەسـی باوەڕدار میعراجێکی مەعنەوی وڕوحی ئیمانی وعیرفانی یە بۆگەیشـتن بەمەقامی (سَيْدَرَةِ المُنْتَهَـى) ونزیـك بونەوەیە لەخوای گەورە بەئەندازەی (قابَ قَوْسَـيْنِ أَوْ أَدْنَى). دواجارو لەبەرئەوەی کەباسـکردن لەمەسەلەو بابەتێکی گرنگی وەك (ئیسڕاو میعراج) بابەتێکی ئێجگار قوڵەو پێویستی بەمەعریفەو توانایەکـی زۆرهەیەو عەقـڵو دڵێکی مەزنی دەوێـت تاوەکو مەغزاو ماناو چێژە شـاراوەکانی ئاشکرا بکات. (مەحوی) شاعیری دونیا جوان وناسکەکەی مەعنەویەت وعیرفان دەفەرموێت:

(هێندە صاحیب سیڕڕە میعراجو شـــەوی قەدرو بەرات..
خاصەجاتی ئەونو، مومتازە بەم ئـــــــەسرارانە شەو)

بەڵێ ئیمانداران: بەڕاستی ئیسڕاو میعراجی فەخری عالەم حەزرەتی (رَسُولُ الله) (ﷺ) بەسەدان وانەی گرنگمان فێردەکات. بۆنموونە: ووشەی (أَسْرى) هەرخـۆی مانای (لَيْلاً)ی تێدایە. وەووشـەی (لیْلاً) بەنەکیرەیی

هاتوه، کەمانای (تَقْلیل) زۆر کەم دەگەیەنێ. واتە: ئەم ئیسراو میعراجە ماوەیەکـی زۆر زۆرکەمـی لەڕوی زەمەنەوە خایاندووە. باشـە بۆ ئەو ماوە کەمـە؟! لەبەرئـەوەی خوای پـەروەردگار نیشـانی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی خۆی بدات، کەلەوکاتەدا کەتوشی ئەوپەڕی ناڕەحەتی ببوو. سێ ڕوداوی دڵتەزێن ڕوی تێکرد:

١. لەناوماڵەکەیدا: خاتوو خەدیجەی هاوسـەری وەفادارو پشتیوانی وەفاتی کرد، کەهەرچەندە لەدەرەوەی ماڵ توشـی ئەشکەنجەو ئازاری دەرونی وجەستەیی ببوایە لەلایەن موشریکەکانی مەککەوە، کەدەهاتەوە بۆماڵەوە، خاتوو خەدیجە دڵی دەدایەوەو هەروەکو یەکەمجار کەوەحی بـۆ هات، خاتوو خەدیجە فەرموی: مەترسـە خوای گەورە هەرگیز تۆ توشی خراپە ناکات، چونکە تۆ خاوەنی کۆمەڵێ ڕەوشتی بەرزو باڵای. بەڵێ بەوەفاتی خەدیجە زۆردڵگران بوو.

٢. لەنـاو مەککەدا: مردنی (أَبوطالبی) مامـی، کەهەرچەند ئیمانی نەهێنا بەڵام بەڕاستی پشـتیوان ودڵسۆزێکی ڕاستەقینەی پێغەمبەری خوابوو (ﷺ)، بەمردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر غەمبارو مەحزون بوو. تەنانەت ئەوساڵەی کە (خاتوو خەدیجە) و(أَبوطالب) تێیدا مردن پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەبەردەوام گەشبین بوەو هەرگیز هیچ خەمێك چۆکی پێدانەداوە. بەڵام ئەم دووخەمە، لەدەست چونی ئەم دووکەسە دڵسۆزە، پشتیوانە ڕاستگۆیە، ئەوەندە کاریگەری لەسەردانا. کەوای کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم سـاڵەی ناونا (عامُ الحُزْن) سـاڵی ماتەمینی. تەنانەت هەتاقیامەت لەسیرەدا هەربە (عامُ الحُزْن) تۆمارکراوە.

٣. لەدەرەوەی مەککەدا: ئەوەبوو کەچوو بۆ (طائف)و لەگەڵ سەرکردەو سەرۆك هۆزەکان قسەی کردو داوای موسڵمان بوون ویارمەتی لێکردن، کەچی ئەو نامەردانە، نەك هەرموسڵمان نەبوونو وەڵامیان نەدایەوەو

خانەدانیان نەنواند، بەڵكو زۆر نامەردانانە، بێ ویژدانانە، بێ دەرکانە، بەقسەی ساردو سوك وەڵامیان دایەوەو پێی پێدەکەنینو منداڵو هەرزەو شـێتو گەمژەکانیان خستە شوێنی وبەردبارانیان کردو قاچی پیرۆزی خوێنی پێداهاتە خـوارەوە. خۆ مرۆڤ دڵی دەبێ بەئاو کاتێ پاڕانەوە بەکوڵەکەی لەحـزوری پەروەردگاریدا دەردەبـڕێ ودەفەرموێ: (اللّهُمَّ إلَيْكَ أَشْـكُوا ضَعْفَ قُوَّتِي، وقِلَّةَ حيلتى، وهَواني عَلى النّاس، أَنْتَ رَبُّ المُسْـتَضْعَفِينَ وأَنْتَ رَبِّي....هتد).

ئالـەم کاتەدا دوای ئـەوەی هەموو دەرگاکانی لەسـەداخران. هێزی کوفـری مەککـە تەوقیان دابـوو، ڕۆژ بەڕۆژ فشـاریان لەسـەرخۆی وهاوەڵانـی دروسـت دەکـرد. ئالەم کاتـەدا خوای گەورە لەبەشـێکی زۆرکەمی شـەوێکدا ئەوگەشـتەی پێ کردو دڵنیای کـرد. هەرچەندە تەنگانەکان گەورەبن، خەمەکان بەهێزبن، ئەگەر خوا وویسـتی لەیەك ساتەوەختی شەودا، دەرگای ڕەحمەت دەکاتەوەو خەم وئازارەکان لادەباو پێغەمبەرەکەی دەگەیەنێتە شـوێنێك کەهیچ مرۆڤێك وفریشـتەیەك، تەنانەت جوبریلیش نەیگەشـتوێ. دەی بائێمـەی ئیمانداریش، یادی ئیسـراو میعراجی ئەمسـاڵمان بکەین بەڕۆژی ڕزگاربون لەخەمەکان، لەحوزنەکان، لەنەخۆشـی یە دەرونی‌یەکان. وەرن بابەرەو گەش بینی بڕۆین، دڵمان خۆش بێ بەڕەحمەتی خوا، دڵنیابن هەرچەندە شەوگار تاریك بێ، لەوشـەوە تاریکـەدا، ڕوناکی بەدی دێ.. تۆ لەڕۆژدا غەمبار دەبی، خوا لەشـەودا ئاسـودەییت پێ دەبەخشێ.. لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: (إِنَّهُ هو السَّـميعُ البَصير..) جاسەرنج بدەن. (إِنَّ): بۆ تەئکیدە، (هُـو): هەربۆ زیاتر لەدڵنیابوونو تەئکیدکردنەوەیە لەسەری. (السَّميعُ) خوایـەك کەدەبیسـتێ، دەنگی هەمـوو زیندەوەران دەبیسـتێ، دەنگی هەمـوو ئەوانە دەبیسـتێ کەهـاواری بۆدەبەن. کەداوای سـەرکەوتنو

ســەرفرازبونی لێ دەکــەن. (البَصیـر) خوایەك کەبینایەو هەمووشــتێ دەبینــێ لەگەردوندا. چونکە خالیقە هەرچــی مەخلوقە دەبینێ. چی وردو گەورەیــە. چــی لەســەرزەوی‌و ژێــرزەوی‌و ناو دەریاو بۆشــایی ئاســمانەکان‌و تەواوی بونەوەردا هەیە. خــوای گەورە هەمووی لەیەك کاتدا چاوی لێیە. زۆریش ئاسانە بۆخوا. (ولِلّهِ المَثَلُ الاَعْلی) زۆر ئاسانتر لەو کامێرا بچوکەی کەلەسـوچێکی ناو هۆڵێکی گەورەدا دانراوەو چاو نایبینێ. کەچی هەرشــتێ لەوهۆڵەدا بجوڵێتــەوە ئەوکامێرایە تۆماری دەکات!.. جاکەوابــوو ئەی ئیمانــدار، غەمباربە. خۆت بەبێ کەس وبێ پشــتیوان مەزانە. خــۆت بەتەنها نەیەتە بەرچــاو. چونکە تۆئیمانت بەپەروەردگارێك هێناوە، کەبەردەوام گوێ ی لێتەو دەنگت دەبیســتێ، پێویســتی بەمۆبایل وئامێری پەیوەندی نی‌یە، ئەگەر دەمیشت بدورن ونەهێڵن قسەبکەی، تۆ کەلەناو دڵتەوە هاوارت بۆخوا برد، خوای گەورە دێــت بەهاناو هاوارتــەوە. تۆی ئیماندار بــڕوات بەخوایە کەدەتبینێ، چــاوی لێتە، چاودێریــت دەکات. بۆیەك چاوتروکانــێ لێت غافڵ نی یە. ئیتر بۆچی ئەترســی؟ بۆچی غەمبار دەبی؟ نەخێر، پشــت بەخوا ببەســتەو دڵنیابە لەدوای ناخۆشــی یەوە خۆشــی یە. لەدوای شکست ســەرکەوتنە، لەدوای هەژاری دەوڵەمەند بونە. لەدوای بێ دەســەڵاتی، بەدەسەڵات بونە. (وتِلْكَ الاَیّامُ نُداوِلُها بَیْنَ النّاسِ).

بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوسەفەرەی ئیسراو میعراج دا، کۆمەڵێ دیمەن ومەشهەدی نیشان درا. کەبەدرێژی لەفەرموده زێڕین‌و پیرۆزەکانی دا بۆی باس کردوین. ئەگەر یەکێ بپرســێ ، باشــە بۆچی هەر ئەمانەی نیشــان درا؟ لەوەڵامدا دەڵێین: (والله أعلم)، خوای گەورە زاناتــرە بەوەی کە بۆچی ئەم دیمەنانەی نیشــانی خۆشەویســتەکەی، حەزرەتــی محمــد (ﷺ) داوە. وەئەوەندەی ئێمەش لــێ ی تێبگەین،

ئەوەیە: کاتێ کەسـەیری فەرمودەکەی دەکەیت وئەودیمەنانە دەبینی. بۆمان دەردەکەوێ، کەئەم ئومەتی ئیسلامە، ڕۆژگارێك، بەڵکو زۆربەی کاتی بەگیرۆدە بوون بەم شـتانەوە بەسەردەبات وپێیان گرفتار دەبێ وئەو ئوممەتە عەظیمە بەهۆی ئەم شـتانە دەپوکێتەوە. بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە. لەسەرداری یەوە دەبێتە کلك وپاشکۆ، وەکو کەفی سەردەریای لـێ دێ، کەنیـە هیچە. کەهەشـە پوچە!.. کەبەداخـەوە ئەمڕۆ ئێمە بەچاوی خۆمان دەبینین، لەودیمەنانەی کەنیشـانی خۆشەویسـتیمان، محمد (ﷺ) دراو بۆی باس کردوین. ئەمانە بوون:

١. غەیبەتکاران: کەنینۆکی درێژیان هەبوو، لەمس دروسـت کرابوو. دەمو چـاوی خۆیـان پێ دەڕنیـەوە. بەڵێ غەیبەت ئاوا مرۆڤ سـوك دەکات، بۆیە هەرکات موسڵمانان خەریکی غەیبەت کردنی یەکتری بوون وباسـی یەکتریان دەکرد بەخراپە. ئەوا دەموچاویان وەکو ئەوکەسەی لێ دێ، کەدەم وچاوی هەموو دارِندراوەو گۆشـتی پێوە نەماوەو ڕووی ناوکۆمەڵگای نی یە!.

٢. فەرمـوی کۆمەڵـە کەسـانێکم بینـی کەلچ ولێویان بەمقەسـت دەبڕیـن، جوبریل فەرموی: ئەوانە: (خُطَباءُ الفِتْنَة)، ئەو ووتاربێژانەن کەووتارەکانیـان، دەبێتـە هـۆی چەواشـەکردنی گـەل ومیللەت، جا ووتاربێژی سەرمینبەری مزگەوت بێ، کەئیسلام وەکو خۆی نەگەیەنێ وبەنەزانی لەجیاتی ڕەحمەت بۆخەڵکی ببێتە زەحمەت وبەقسەی ڕەق وزبرو فەتوای توندی وا کەئیسـلام لێی بێ بەریە. خەڵکی لەئیسـلام دووربخاتەوە.. یان ئەوسەرکردە سیاسی وحکومیانەی کەبە ووتارەکانیان فیتنـەو ناکۆکـی لەناومیللەتـدا بەرپادەکەن ولەئەنجامـی ووتارێکی شـەڕانگێزیاندا بەهەزاران خەڵك دەبنە قوربانی.. کەبەڕاستی جیهانی ئیسلامی فەوتاوی ئەوجۆرە بەناوسەرکردە، سەرشێتانەیە. کەبەئارەزوی

خۆیان قسەدەکەن وبڕیار دەدەن وخەڵکی دەفەوتێنن. ئەوانە پێویستە لەلایـەن میللەتـەوە لابدرێن ولـچ ولێویان بکرێ وبخرێنـە زبڵدانی مێژووەوە..

٣. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: دیمەنێکی تر کەبینیم ئەوەبوو کە (بەردێکـی بچکۆلە، گایەکی گەورەی لێ هاتەدەرەوە، جاهەرچەندە گایەکە دەیویسـت بچێتەوە ناوبەردەکەوە، تـازە نەیدەتوانی وگایەکە لەبەردەکە زۆرگەورەتر بوو. جوبریل فەرموی: ئەوە نمونەی قسـەیە، کەلەدەم دێتەدەرەوە، ئەوقسـەیە لەودەمە بچوکـە دێتەدەرەوە، بەڵام دوایـی دەبێتە شـتێکی گەورەو دەنك وباسـێکی گـەورەو هەرچەندە بتەوێ، قسـەکەت وەرگریتەوەو لێی ڕزگاربی ناتوانی وتازە لەدەستت چوو. دەی موسـڵمان دەبێ ئاوا حیسـاب بۆقسـە بـکاو هەرلەخۆیەوە قسـە فڕێ نەداتو پاشـان گیربخوات پێـوەی ونەزانێ چۆن خۆی لێ ڕزگاربـکات.. ئـای ئەمـڕۆ چۆن موسـڵمانان گیرۆدە بوون بەدەسـت قسـەوەو چەندین خێزان بەهەڵەشـەیی پیاوێك هەڵدەوەشی، چونکە بەبی حیساب بۆکردن قسە فڕێ دەدات وتەڵاق دەخوات وپاشان نازانێ چۆن قسـەکەی وەربگرێتەوەو چی بکات. دەی با لەمڕۆوە سنورێك بۆ زمانمان دابنێین، قسە هەتا نەیبێژین نەیوێژین!...

٤. پێغەمبەری خۆشەویسـتمان فەرموی: کۆمەڵە کەسـانێکم نیشان درا، کـە گۆشـتی پاك وخاوێن وجـوان وڕێکوپێـك لەبەردەمیان بوو. کەچـی لەوخواردنە پاکەی بەردەم خۆیان نەدەخواردو دەچون لەولاوە لەپەنا کەلاوەو دیواردا بەدزی یەوە گۆشـتی بۆگەن وکەلاکی تۆپیویان دەدۆزیەوەو دەیانخوارد!! ووتم: ئەی جوبریل ئەم سەرگەردانانە کێن؟! فەرموی: ئەوانـە زیناکارانن.. ئەوژن وپیاوانەن کەهاوسـەری حەڵاڵی خۆیـان هەیـە. کەچی لەوحەڵاڵـەو پاکەی خۆیان خۆیـان تێرناکەن

ودەڕۆن لەكاری ناشەرعی وبۆگەنی دا، بەزینا خۆیان بەتاڵ دەكەنەوە. (فِعْـلاً) ئەوانە ئەوخواردنە پاكــە ناخۆن وئەوزینایە كەپڕە لەبۆگەنی، لەبۆگەنی داوێن پیسی وئایدزو هەڵوەشان خۆیان تێردەكەن!.

٥. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: دیمەنێكی تر كەبینیم ئەوەبوو، كۆمەڵە كەسێك لەناودەریایەكی خوێندا مەلەیان دەكرد. كاتێ دەیانویست بێنە دەرەوە، بــەرد لەناودەمیان دەدراو دەخرانــەوە ناوخوێنەكەوە. ووتم: ئەوانــە كێن؟ جوبریــل فەرموی: ئەوان ڕیباخۆرەكانن، ئەوكەســانەن كەسووخۆرن، كەبەڕاستی ڕیباخۆری كەوتنەناو ئەوبەحرە خوێنەوەیە، خوێنــی خەڵكــی. كــەزۆر بەزەحمەت مــرۆڤ لەڕیباخــۆری ڕزگاری دەبێ، ئێســتا لەسەرئاســتی نێودەوڵەتی ڕیبا بەئاشكرا دەخورێ، بەڵام فەرمودەكــەی پێغەمبــەری خوایان (ﷺ) هەرلەدنیــادا پێش قیامەت بەســەردا هاتوە، كەئەوەتــا هەموو ئەوكۆمپانیــاو بانقانەی كەبەڕیبا كاردەكەن، ئیفلاســیان كردو بەســەدان بانق لەئەمریــكاو بەریطانیاو فەڕەنســا هەرەســیان هێناو هیچیان نەماو لەبەحــری خوێندا غەرق بوون. لەم كوردســتانە ئازیزەی خۆشماندا، ئەگەر ووریانەبین خەریكە لەزۆر بواردا ڕیبا دێتە ناوگیرفانو ماڵو معامەلەكانمانەوەو پێویســتی بەوە هەیە بەبێ گەڕانەوە بۆشەرع هەنگاو نەنێین.

٦. پێغەمبــەری پێشــەوامان فەرمــوی: كەســانێكم نیشــان دران كەڕاكشــابوون وبــەردو تاوێری گەورەیان بەســەردا دەخرایەوە خوارو ســەری پان دەكردنەوە، دیســان چاك دەبونەوەو دوبارە ســەریان پان دەكرایەوە. ووتم: ئەوانە كێن؟! جوبریل فەرموی: ئەوانە ئەوكەسانەن كەنوێژناكــەن. بەتایبەت نوێژی بەیانیان لەوناوجێگایە نایەنەدەرەوە. بەداخەوە ئەمڕۆ ئوممەتی ئیسلامی نوێژنەكەری تێدا پەیدابووە، ئای چەنــد جێــگای داخە. ماڵــی واهەیە تەنها مامــە حاجیەكو حاجی

ژنێــك نوێژی تێــدادەكات. ئەوی تــری هیچ. بەڵێ مــرۆڤ كەنوێژی
نەكرد پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگاری دەپچڕێ، مێشــكی بۆگەن دەبێ،
ئەوســـەرەی كەمرۆڤ بەبیرلێكردنەوەیەكی ســـادە لەســـەرو مێشـــكو
گوێولوت و زمانو قورگــو لیكەڕژێن وزمانەبچكۆلە. هەرئەم بەشـــەی
كەبەســـەرەوە دیارە، ئەگەر لێ ی ووردبببیتەوەو ســـەرنجی خۆت بدەی
(وفِي أَنْفُسِــكُمْ اَفَلا تُبْصِرونَ). بۆت دەردەكەوێ ئەو خوای پەروەردگارە چی
پێ بەخشــیوی. ئای هەریەك لەو ئەندامانە. بگرە پارچەیەكیان، نەك
چــاوت، بەڵكــو تەنها بــرۆو برژانگت، تەنها بۆری فرمێســكت. ئەگەر
تامردن ســـەرت لەســـوژدەدابێ بۆخــوا. ناتوانی حەقی سوپاســـی ئەو
تاڵــە موانە بدەیت. ئەی چاوەكە خــۆی. كەتەنها بۆچەند دەقیقەیەك
چاوت لەسەر یەك دابنێ وئەمجا بزانە ئەگەر بۆهەمیشە ئاوا بویتایە
چیت دەكرد!. تەنها لیكی ناودەمت ووشــك بێ، ژیانت كۆتایی پێ دێ
ئەگــەر هەمــوو خواردنی دنیات لەبەردەم بێ، چونكە شــل نابێتەوەو
قوت ناچێت بۆت!.. جاتوخوا ســـەرێك ئەوەنـــدە بێ هۆش وگۆش بێ،
زركەتاڵێكی بۆش بێ، بێ جۆشو خرۆش بێ، هەرموستەحەقی ئەوەنی
یە كەبەتاوێرو بەردی گەورە پان بكرێتەوە؟!!...

ئەی باشـــە كێ ســـەرفرازە، ڕزگاری بووە. ئەوكەسەی كەپێغەمبەری
خــوا (ﷺ) لــەو گەشـــتەی ئیســـراو میعراجـــەی دا باســـی كـــردوەو
فەرمویەتی: كۆمەڵە خەڵكێكم بینی كە شـــتیان دەچاندو هەركەدەیان
چاند دەســـتبەجێ ســـەوز دەبـــوو دەڕوا. وەیەكســـەر پێ دەگەیشـــتو
درووێنەیـــان دەكردو بەرهەمەكەیان هەڵدەگرت، پێغەمبەری خوا (ﷺ)
دەفەرموێ: پرسیم ئەمانە كێن، ئاوا كاریان پڕبەرەكەتەو ئاوا ڕەنجیان
بەزوویـــی دەبێتە گەنج؟! جوبریل فەرموی: (هؤلاء المُجاهِدُونَ فِي سَــبيلِ
اللــهِ).. ئەوانە تێكۆشـــەرانی ڕێگای خودان، كەهەموو هیـــواو ئاواتیان

خزمەت كردنە بەم ئیسلامە. شەووڕۆژ بیریان لای ئەم نورو ڕەحمەت وبەرەكەتەیــە. كەچــۆن بیگەیەنن بەخەڵكی تر وەكو چۆن گەیشــتوە بەمان. ژیانی خەڵكی بەم ئیمانو ئیســلامە بەختەوەر بكەن. هەروەكو چۆن بۆخۆیان لەســایەو سێبەری ئیسلامدا ئاســودەیی دڵو دەرونیان دەســتكەوتوە. جائەم تێكۆشــانە لەپێناوی خواداو بۆگەیاندنی پەیامی خــوا كەقورئانــەو ســوننەتەكانی پێغەمبــەرە (ﷺ)، خوێنی خۆیان دەبەخشن، ماڵو سامانی خۆیان دەبەخشن، تەمەنی جوانیو گەنجیەتی خۆیان فیدا دەكەن، قەڵەم ونوســینیان دەكەنە خزمەتكاری ئیســلام. شــەهادەو پۆســت وپلەیان هەمووی دەكەنە فیدای گەیاندنی ئەم نورو ڕەحمەتە بەهەموو شوێنێ. بانگەواز بۆئیسلام دەكەن (بالْحِكْمَةِ والمَوْعِظَةِ الحَسَنَة). دەبنە دەســتی خێرو شیفاو بەدەرمانی دەرمانخانەی ئیسلام، نەخۆشــیو ڤایرۆسو میكرۆبی ئەم ســەرزەویە لەناودەبەن. فرمێسك لەچاوی غەمباران دەســڕن وزەردەخەنە دەخەنە ســەرلێوانیان... هەر بۆیە (خَيْرُ الناس)ن، چونكە (أَنْفَعُهُمْ لِلْناس)ن...

بەڵــێ ئیمانداران: هەموو ئەم موعجیزەی ئیســڕاو میعراجە بەڕوح و بەلاشــە بوەو تەنها بەڕوحو خەون نەبووە، بەڵكو بەتەواوی لاشــەی پیــرۆزی ئەو ســەفەرە گەورەی كردووە. وەماوەیەكــی زۆرزۆر كەمی لەشــەوێكدا خایاندوە. (لَيْلاً) بەنەكیرەیی بۆ تەقلیلە. جائەگەر كەسێك بڵــێ: باشــە چۆن ئەمە عەقڵ دەیگرێو بۆی دەســەلمێ كەشــتی ئاوا ڕوبدات. كەســێك لەمەككەوە بچێت بۆقودس لەفەلەسطینو پاشان بۆ سەرو هەر حەوت ئاسمانەكانو بۆ حزوری خواو (سُبْحانَهُ وتَعالى) وبینینی ئەو هەموو مەشــهەدەو پاشان گەڕانەوەی بۆشوێنی خۆی هەرلەهەمان شــەودا؟! لەوەڵامدا بەوجۆرە كەســانە دەڵێین: ئەگــەر ئیمانت بەخوا هەیە، ئەوە بۆخوا زۆرئاســانە، لەئاسان ئاســانترە. ئەوخوایەی كە بۆ

ئیبراهیم، ئاگرێکی کرد بەساردێکی سەلامەت کەنەك نەیسوتێنێ، بەڵکو هێندەش ساردنەبێ کەبیبەستێ، ئەوخوایە کەگۆچانی داری ڕەق و ووشکی کرد بەمارو سیحری ساحیرانی بەتاڵکردەوە، هەرئەو خوایە بۆراقی بۆپێغەمبەرە خۆشەویستەکەی حەزرەتی محمد (ﷺ) ئامادەکردو وەکو سەبەبێك بۆی نارد کەسواری پشتی بێو پێغەمبەر (ﷺ) لەوەسفیدا دەفەرموێ: ئەوەندەی چاو بڕبکات بەیەك هەنگاو بۆراق دەیبڕی. ئەگەر بۆئەمەشیان دەڵێی تۆبڵێی شتی واهەبێ؟! ئەوە ئەگەر بڕوات بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) هەبێ، دیسان دەیسەلمێنی ودڵنیای ئەوەی ئەوسەروەرو سەرداره فەرمویەتی وبینیویەتی. بەلای موسڵمانی ڕاستەقینەوە، لەوە بێگومان ترە کەمرۆڤ بەچاوی خۆی بینیبێتیو دەستی لێ دابێ، خۆپەنابەخوا ئەگەر کەسێك ئیماندار نەبێ، پێی دەڵێین: ئایا بڕواتان بەزانستی فیزیا هەیە؟! ئایا لەفیزیادا ئەویاسایەتان بیستوە کەدەڵێ: خێرایی (سورعەت) چەند زۆربێ، کات (زەمەن) ئەوەندە کەم دەبێتەوە، سورعەت وخێرایی بۆراق زۆربوو. کاتی کەمی دەویست. ئایا باوەڕدەکەن کەتیشك ٣٠٠ هەزار کلم لەیەك چرکەدا دەبڕێ؟! خۆئاشکرایە (خۆر) نەوەد ملیۆن میل لەزەوی یەوە دوورە، کەچی تیشکەکەی بە (٨) دەقیقەو نۆ چرکە دەگاتە ئێمە. دەی ئەمە هەرپەروەردگارمان کە (الله) یە ئەوتوانایەی پێ بەخشیوە. هەربەو ئاسانی یە بۆراقیش بۆحەزرەتی محمد (ﷺ) دابین دەکاتو ئەو سەفەرەی ئاوا بۆ ئاساندەکات. خۆئەگەر بۆراقت نەدیووە، ئەی خۆئینکاری ناکەی لەوفڕۆکەیەی کەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دروستیکردوە. کەلە توانایدایە بەکەمتر لەکاتژمێرێك بگاتە هەرجێگایەکی جیهان کەبیەوێت! ئاژانسو سەرچاوەکانی هەواڵ بلاویان کردۆتەوە، ئەوجۆرە فڕۆکەیە ناوی (دارپا)یەو خێراییەکەی

بەشێوەیەکە کەلەســەروی خێرایی دەنگەوەیەو لەتوانایدایە بەکەمتر لەکاتژمێرێك بگاتە هەرجێگەیەکی جیهان کەبیەوێت. سوپای ئەمریکا بڵاویکردۆتــەوە ئەوان ئەو فڕۆکەیان تاقیکردۆتەوەو لە (نیویۆرکەوە) تاکو ویلایەتی (لۆس ئەنجیلۆس) ماوەی (١٢) خولەکی پێ چووە!! ئەم فڕۆکەیە لەیەك کاتژمێردا (١٣) هەزار میل دەبڕێت!!

بەڕێزان: ئەگەر (٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر باسی فڕۆکەیەکی ئاوا بکرایە کــەس بڕوای نەدەکرد، کەچــی ئەمڕۆ ئەوە مرۆڤــە فڕۆکەیەکی ئاوا دروستدەکات!! خۆ بەدڵنیاییەوە تا کۆتایی دونیا زانیاری مرۆڤ دەگاتە ئەو ئاســتەی کەفڕۆکەیەکی وا، کەشــتیەکی ئاســمانی وا ئاوا دروست بکات. کەلەماوەی چەند خولەکێکدا هەموو ســەرزەوی بگەڕێ وبڕواتە ئاســمانیش وبێشەوە. هێشتا چەند دەقیقەیەك تێنەپەڕی بێ وبەهۆی ئەو هەموو ئامێری تۆمارەی پێوەی دەبەســترێ، هەرچی بێتە ڕێگای دەســت بەجێ تۆماری دەکات. جائەگەر ئەمە مرۆڤ بتوانێ دروســتی بکات، ئایا بۆخالیقی ئەومرۆڤەو مێشــكو هزری ئەو مرۆڤە، ئەبێ چ گرانیەکی تێدابێ، کەئەو سەفەرو گەشتە بەخۆشەویستەکەی. پێغەمبەرە نازدارەکەی حەزرەتی (محمد) (ﷺ) بکات؟!.بەڵکو بۆئێمەی موســڵمان شانازی و جێگای فەخرە کە پێغەمبەرەکەمان یەکەم کەسە کەسەفەری ئاســمانی کردو لەکورتترین کاتدا گەورەترین و سەرســوڕهێنەرترین گەشتی ئەنجامداو گەڕاشەوە جێگاکەی خۆی. ئەوە ئیسلامە ئاوا عەقڵی مرۆڤ دەکاتەوەو ئاســۆی بیری ڕۆشــن دەکاو بەبەرەکەتی ئەم ئیمانە وای لێ دەکات، کەبڕوا بەشــتی وابکات وبەلایەوە سەلماوو ئاسایی بێ، کەخەڵکی بێ ئیمان (١٤٠٠) ساڵ دوای ئەوە هێشتا وایان بەچاو نەدیوەو تــازە بەتازە هەوڵی فڕۆکەو ڕۆکێتی چونەســەر مانگ وئەســتێرەکان دەبیســتێ!! ومرۆژێکیش دێ، مرۆڤ بەچاوی خۆی دەبینێ، درێژترین

ســەفەر لەچەند خولەكێك تێپەڕ ناكات. دەی ئێمە لەســەدان ساڵەوە بــاوك وباپیرانمــان ئەمەیان زانیــوە، چونكە بڕوایــان بەموعجیزەی ئیســراو میعراجی ئەوپێغەمبەرو پێشەوایەمان بووە (هەزار صلاوەتی لەســەربێ). پاشــان هەربەوكەســانە دەڵێین كەخۆیان بەزانست خواز دەزانن‌و حەزدەكەن هەموو شــتێ بەڵگەی زانســتی لەســەربێ، پێیان دەڵێین: گوی بگرن بۆ (كریسی مۆریسۆن) ڕەئیسی ئەكادیمیەی علومی ئەمریكــی، كەدەڵــێ: لەكەوندا ڕەنگــی واهەیە غەیــری ئەوڕەنگانەی كەئێســتا ئێمە لەكەوندا دەبینین. واتە غەیری ڕەنگی ســورو ســەوزو زەردو شــین وهتد.. غەیــری ئەم ڕەنگانە ڕەنگــی تریش هەیە، بەلام چاوی ئێمە نایبینێ!!

كەواتە: عیلم دەڵێ: ڕەنگی واهەیە لەگەردوندا غەیری ئەو ڕەنگانەی كەئێســتا چاو دەتوانێ بیانبینێ. دەبــا گوێبگرین بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەدەفەرموێ: (ثُمَّ انْطَلَقَ بِي، حَتَى إِنْتَهَى إِلى سِـدْرَةِ المُنْتَهى، ويَغْشِـيَها أَلْوانٌ ماأَدْرى ماهِيَ) رَواهُ البُخاريُّ.

كەواتــە: ئێمــە بەشــانازیەوە دەڵێین: هەرچــی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموبێتی ڕاســتەو هەرچی گومان‌و دوودڵی بێ نیمانە. گرنگ ئەوەنیێــە چی دەفەرموێ، گرنگ ئەوەیە دڵنیابین كەئەو فەرمویەتی. چونكە بەدڵنیاییەوە ڕۆژێك ئاوا زانست بەمل كەچیەوە دەیسەلمێنێ‌و ئەوكات ســەرفرازی‌و ســەربڵندی بۆ ئێمــەی موســڵمان دەمێنێتەوە. كەئەوەی خەڵكی ئەمڕۆ دەیزانێ، ئێمە لەوكاتەوەی فاممان كردۆتەوەو ئیســلاممان ناســیوە، زانیومانە!.. خوای گەورە لەسەر ئیمان‌و ئیسلام ڕاگیراوو دامەزراومان بكاتو لێی دەپارێینەوەو دەڵێین:

(رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنيا حَسَنَة وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وِقِنا عَذابَ النّارِ) اللّهُمَّ آمين.

**سەرچاوەکان:**

**١. قورئانی پیرۆز.**

**٢. ڕۆژنامــەی یەکگرتوو، ژمــارە: ٧٩٨ لــە ٢٠١٠/٧/٨، ل١٠، وەژمارە: ٨٦٤ لە ٢٠١١/١١/١٤.**

**٣. فرمێسکی گوڵ. م.غریب پێنجوێنی، ل٩٣.**

